شه رحی

# بُلوغُ المَرَامِ مِنْ أدِلَّةِ الأحْكَام

للحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني رحمه الله تعالى

به پێنووسی
نوری فارس حه مه خان

سه رپه رشتی چاپ
محمود أحمد محمد

(به رگی دووه م)

# شەرحی

# (( بُلُوغُ المَرَامِ

# مِنْ

# أَدِلَّةِ الأَحْكَام

للحافظ أحمد بن على بن حَجَرِ العَسْقَلاَنِىَ -رَحِمَهُ الله تعالى-))

به پێنووسی:

نوری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ:

محمود أحمد محمد

﴿بەرگی دووەم﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

*************************************************


- ناوی کتێب: شەرحی (( بُلُوغ المَرَامِ مِنْ أَدِلَّةِ الأَحْكَام )) للعَسْقَلاَنِی
- نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان
- چاپی: یەکەم
- تیراژ: ٢٠٠٠
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٧٠٥)ی پێدراوە.
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- کۆمپیوتەرو دیزاین: ( نیان حسین )
- لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.

## ٣- نامەی تەرم
## كِتَابُ الجَنَائِزِ

{بڕوانــە: تــاجول ئوصـول بـەكوردى/١، زنجـيرە: ١٩١ هـەتا زنجـيرە: ٢٢٩، لــەژمارە: ١٠٠٨وە هــەتا ژمــارە: ١١٦٩ + تەجريــدى بوخــارى/٢، زنجــيرە: ٢٩، لەژمارە: ٥٩٨ ەوە هەتا ژمارە: ٦٦٥ + فيقهى ئاسان، بەرگى يەكەم، زنجيرە: ١٠٢، لاپەڕە: ٢٨٤ چاپى ئێران + رياض الصالحين/٢، زنجيرە: ١٤٤ هـەتا زنجيرە: ١٦٥، لەژمارە: ٨٩٤ ەوە هەتا ژمارە: ٩٥٥} .

٥٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اَللَّذَّاتِ: اَلْمَوْتِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع/١٢١٠}:

ئـەبو هـورەيرە (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (زۆر يـادى مـەرگ بكـەن، ئـەو مەرگـەى كەهـەموو خۆشـييەك تێـك دەداتو تێكـدەرى هـەموو خۆشـييەكە!). {تـاج/١، زنجيرە: ١٩١، ژمارە: ١٠١٣ چاپى چوارەم} .

٥٥٦- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ اَلْمَوْتَ لِضُرٍّ يَنْزِلُ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلْ: اَللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ اَلْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ اَلْوَفَاةُ خَيْرًا لِي} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريــدى بوخــارى/٥، ژمــارە: ١٨٦٦ = ٥٦٧١ فــتح البــارى. مــسلم شيحا/٦٧٥٨}:

ئەنـەس (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ئەگـەر يـەكێكتان دووچـارى زيانـێ بـوو، بامـەرگ بەئاوات نـەخوازێ، ئەگـەر هـەر زۆرى بـۆ هـاتو چـارى نـەبوو، مـەرگى خـۆى

بەئاوات خواست، با ئاوا بڵێ: ئەی خودایە! هەتا ژیانم باشترە بۆم ئەوا بم ژێنە، کەیش مردنم باشتر بوو بۆم بمرێنە!). {تاج/١، زنجیرە: ١٩١، ژمارە: ١٠٠٨ – ش/د/ت/ن}. لەگێڕانەوەیەکی تاجدا دەفەرموێ:

قەیس گوتی: چووم بۆلای خەبباب، لەحەوت لاوە سکی خۆی داخ کردبوو، ژنەوتم لێی دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یاساخی کردووە لێمان کە مەرگ بەئاوات بخوازین، ئەگینا مەرگی خۆمم بەئاوات دەخواست.

٥٥٧– وَعَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ} رَوَاهُ اَلثَّلَاثَةُ وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٦٦٦٥، الصحيح المسند: ١٧٢. ترمذى رقم: ٩٨٢. نسائى: ١٨٢٩. ابن ماجة رقم: ١٤٥٢}:

بورەیدەی کوڕی حوصەیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان کاتێ دەمرێ ناوچەوانی جوانـاو دەردەدا). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٣، ژمارە: ١٠١٩}. ئیبنو حیببان بە صەحیحی داناوە.

٥٥٨– وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَا: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ، وَالْأَرْبَعَةُ.

{پوختەی موسلیم ٤٥٣ = ٢١٢٠ شیحا = مسلم ٩١٦. أحمد رقم: ١١٠٠٦. أبوداود رقم: ٣١١٧. ابن حبان رقم: ٣٠٠٣}:

ئەبو سەعیدی خودریو ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو کەسانەتان کە لەسەرە مەگدانو لەحاڵەتی گیانەڵادان «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»یان بدەن بەگوێداو ئەم وشە پیرۆزەیان، لەوکاتە ناسکەدا، یاد بخەنەوەو لەبەرچاویان بیڵێن، سابەشکوو ئەوانیش چاو لەئێوە بکەنو بیڵێنو بەر ئەو فەرموودە پیرۆزەیە

بكەون، كە دەفەرموێ: «مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ». واتە: هەرکەسێ دوا گوتەی وشەی پیرۆزی «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ» بێت، دەچێتە بەهەشت).
{تاج/١/٥٠٥، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٤، ١٠١٥ چاپی چوارەم}.

٥٥٩- وَعَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اقْرَؤُوا عَلَى مَوْتَاكُمْ يس} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{ضعيف الإرواء: ٦٨٨. أبوداود رقم: ٣١٢١. نسائي في الكبرى رقم: ١٠٩١٣. ابن حبان رقم: ٣٠٠٢}:

مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوورەتی یاسین لەسەر مردووەکانتان بخوێنن‌و لەسەر ئەوانەیشتان کەوان لەحالاتی سەرەمەرگا).
{تاج/١، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٨ — د/ن/ئەحمد/ئیبنو حەببان بە صەحیحی داناوە}. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ١٥٩}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێش ڕۆژی حودەیبییەدا موسوڵمان بوو، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودی (بیعة الرضوان) بووە، فەرموودەی لەصەحیحەین‌و سونەنی ئەربەعەدا هەیە، لەبەصرە نیشتەجێ بووە، ئەم زاتانەو کەسانی تریش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە:- عەمری کوڕی مەیموونی ئەزدی‌و ئەبو عوثمانی نەهدی‌و حەسەنی بەصری، دوو فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، لەئاخرو ئۆخری جێنشینی موعاوییەدا، مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ).

مەعقیل دەفەرموێ: لەکاتی پەیمانی خۆشنوودیدا، لەحودەیبییە من لقێ لەدرەختەکەم لەدەموچاوی پێغەمبەر دوور دەخستەوە، دەفەرموێ: ژمارەی موسوڵمانەکان (١٤٠٠) هەزارو چوارسەد پیاو بوو.

دەڵێن: لەدوا مەرگی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی عومەری کوڕی خەطابدا، خەڵکی دەچوون لەلای ئەو درەختەدا کەناسراوە بە (شَجَرَةُ الرِضْوَان - درەختی خۆشنوودیی) لەوێدا نوێژیان دەکرد، کاتێ عومەر ئەمەی بیستەوە، هەڕەشەی لێ کردن‌و فەرمانیدا درەختەکەیان بڕی!!

٢- موحیببی طەبەری (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەپەڕاوی (الأحكام)و لەشوێنانی تریشدا دەفەرموێ:

(خوێندنی سوورەتی یاسین هەم بۆ مردوو، هەم بۆ کەسێ لەسەرە مەرگدا بێ، سوودو قازانجی هەیە).

٥٦٠- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {دَخَلَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى أَبِي سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَقَدْ شُقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ اَلرُّوحَ إِذَا قُبِضَ، اتَّبَعَهُ الْبَصَرُ" فَضَجَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ، فَقَالَ: "لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ. فَإِنَّ اَلْمَلَائِكَةَ تُؤَمِّنُ عَلَى مَا تَقُولُونَ". ثُمَّ قَالَ: "اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي اَلْمَهْدِيِّينَ، وَافْسِحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ، وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی مسلم ٤٥٦ = ٢١٢٦ شیحا = مسلم ٩٢٠ + پوختەی موسلیم ٤٥٢، ٤٥٨}:

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات، بۆلای ئەبو سەلەمە کەمێردم بوو، ئەبو سەلەمە گیانی دەرچوو بوو، چاوی داچەقا بوو، جا پێغەمبەر (درووودی

خودای لەسەر بێ) چاوەکانی لێك نانو فەرمووی: (کاتێ گیان دەکێشرێ، چاو شوێنی دەکەوێ، تابزانێ بۆ کوێ دەچێ، جا لەم کاتەدا، هەندێ کەس لەکەسو کارەکەی کردیان بەفیژەو هەراو نزای خراپیان لەخۆیان کرد).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نزای باش بکەن، نزای خراپ مەکەن لەخۆتان، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن، فریشتە ئامینی لەسەر دەکەن، ئەنجا فەرمووی: {اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي اَلْمَهْدِيِّينَ، وَافْسِحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ}.

ئەمە دەقی ئەم نزایەیە لەصەحیحی موسلیما/شیحا ژمارە: ٢١٢٧ — وە بەو دەقەی کە مامۆستای دانەر دەڵێ، زۆر گەڕام لەموسلیمدا نییە). ئەمەیش واتای نزاکەیە بەزمانی شیرینی کوردی:

ئەی خودایە! لە ئەبو سەلەمە خۆش بەو پلەو پایەی لەناو ئەو بەرێزانەدا کەخۆت رێگەی راستت نیشان داونو رێنماییت کردوون بۆ پەیرەوی راستی، پلەو پایەی لەناو ئەم زاتانەدا بەرز بکەرەوە، وەخۆت سەرپەرشتیو سەرەوکاری ئەو کەسوکارەی بکە کە لەپاشی بەجێماون، وە لەئێمەیشو لەویش بەسۆزو بەمیهرەبانی خۆت خۆشبە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان! وەگۆڕەکەشی گوشاد بکەو پڕی بکە لەنوورو رووناکی بۆی!).

{ریاض/٢، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ٩١٩} + {تاج/١، زنجیرە: ١٩٢، ژمارە: ١٠١٧، ١٠١٦ چاپی چوارەم}.

٥٦١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهَا): {أَنَّ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حِينَ تُوُفِّيَ سُجِّيَ بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٨٩٣ = ٥٨١١ + پوختەی موسلیم ٤٥٧ = شیحا ٢١٨٠ = مسلم: ٩٤٢}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) کەعائیشە دایکی موسوڵمانانە، دەفەرموێ:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ مەرگ بوو بەمیوانی، دایان پۆشی، بەشاڵی یەمانی). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٢، ژمارە: ١٠٦٣ + تاج/٣٣٦/٣، ژمارە: ٢٩٦٢، زنجیرە: ٥٧}.

(ڕوونکردنەوە):

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کاتێ مردوو گیانی دەردەچێ، واباشە جلەکانی لەبەری دابکەنرێ هەتا بەهۆی ئەو جلانەوە ئەندامەکانی دەق نەگرێ. وەپاش ئەوە بە چەرچەفێ، یا بەپارچەیێ خام، یاشاڵ، یاشتێ تر، هەموو لەشی داپۆشرێ، هەتا شەرمگای دەرنەکەوێ.

٥٦٢- وَعَنْهَا {أَنَّ أَبَا بَكْرٍ اَلصِّدِّيقَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَبَّلَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعْدَ مَوْتِهِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بخاری: ٣٦٧٠}:

ئەم فەرموودەیە لەبوخاریدا زۆر درێژە، بەژمارە: ٣٦٦٧ دەست پێ دەکا، بە ژمارە: ٣٦٧٠ دێتە کۆتایی، سەرەتای ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بەمیوانیو مرد، لەوکاتەدا ئەبوبەکری باوکم، لەسونح بوو، کەناوی شوێنێکە لەعەوالی مەدینە، یەك میل لەمزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە دوورە، عومەری کوڕی خەطاب هەڵسا وتارێکی داو گوتی: بەخودا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەمردووە، وەلەوە دوا عومەر دەیگوت: بەخودا لەڕاستیدا ئەوە قسەی دڵم بوو، هەروا عومەر لەوتارەکەیدا گوتی: بەخودا، خودای گەورە پێغەمبەر زیندوو دەکاتەوەو دەستو پای ئەو پیاوانە دەبڕێ کە دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئێجگاری مردووە. جا ئەبوبەکر لەم کاتەدا هاتەوەو چووە سەر تەرمەکەی پێغەمبەر

کە بەشاڵێ، داپۆشرابوو، سەری هەڵدایەوەو نێوانی هەردوو چاوەکانی پێغەمبەری ماچ کردو فەرمووی: بەباوکم‌و بەدایکمەوە بەقوربانت بم، چی بەزیندوویی‌و چی بەمردوویی، چەندە پاك‌و نازداری! بەو کەسەی کەگیانی منی بەدەستە، هەرگیز خودا لەجیهاندا دووجار ناتمرێنێ...تاکۆتایی فەرموودە). {بڕوانە: تاج، بەرگی (٣) سێیەم لاپەڕە/٥٤١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٦ چاپی چوارەم}.

٥٦٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {نَفْسُ اَلْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ، حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{صحيح الجامع: ٦٧٧٩. أحمد رقم: ١٠٦٠٧. ترمذی رقم: ١٠٧٨، ١٠٧٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گیانی موسوڵمان، لەپاش مردنی، بەندو گیرۆدەی ئەو قەرزەیە، کەوا لەسەری، هەروا دەمێنێ‌و پایەی بەرزی بەریزی خۆی لێ قەدەغە دەبێ، هەتا قەرزەکەی سەری بۆ دەدرێتەوە!). {ریاضی صالحين بەکوردی/٢، زنجیرە: ١٥٩، ژمارە: ٩٤٣}.

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی ئەم فەرموودەیە، کەپێشەوا تەرمەزی بە فەرموودەیەکی حەسەنی دائەنێ، موسوڵمان لەگۆڕا شادنابێ بەدڵخوازی خۆی ئەگەر قەرزار بوو، هەتا قەرزەکەی بۆی نەدرێتەوە. جا من وادەزانم کە بەم دوو شێوەی دواوە، مردووی قەرزار، لەئۆباڵی قەرزەکەی رزگاری دەبێ، بەیەکێ لەم دوو شێوەیە:

١- قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە، لەلایەنی کەسوکارەکەیەوە، یالەلایەنی برادەرو دۆست‌و هەرکەسێکی ترەوە بێ دەبێ.

٢- خاوەن قەرزەکە، لەبەر ڕەززای خودا گەردنی ئازاد بکا، هەر لەم ڕوانگەیەوە، کە کەسێ لەگەڕەکا، یالەخزمو دۆستو برادەران کەدەمرێ، وا پەسەندە ئەوەی کە دەیناسێ، گەردنی ئازاد بکا، ئەگەر کێشەیێ لەنێوانیاندا نەبوو، وەك مافی سامانیو خوێنیو شتی وا.

٥٦٤- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ فِي اَلَّذِي سَقَطَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَمَاتَ: {اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِـي ثَـوْبَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٢/٢٩، ژمارە: ٦٠٨ = ١٢٦٥، ١٢٦٦، ١٢٦٧، ١٢٦٨، ١٨٣٩، ١٨٥١ فتح الباری = پوختەی موسلیم ٦٨٩ = ٢٨٨٨ = مسلم ١٢٠٦}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەتجریدو تاجو پوختەی موسلیما:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پیاوێ لەحەجی مالاوایيدا، کەناودارە بە حەججەتول وەداع، لەکێوی عەرەفە، لەخزمەتی پێغەمبەردا بوو، لەوشترەکەی کەوتە خوارەوە، ئەستۆی شکاو مرد، ئەم پیاوە خەریکی حەج بوو، کە لەوشترەکەی بەرەوە بوو، لەئیحرامدا بوو، پێغەمبەر خۆیشی لەئیحرامدا بوو، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (بەئاوو بەمۆرد پاك بیشۆرن، لەدوو لۆ جلەکەی بەری خۆیدا، کەدوو پەشتە مالّی ئیحرام بوو، کفنی بکەن، بەلاّم حەنووتو بۆنی خۆشی لێ مەدەنو سەریشی بەکفنەکەی دامەپۆشن، چونکە ڕۆژی قیامەت کەخودا زیندووی دەکاتەوە بە بەرگی ئیحرامەوە زیندووی دەکاتەوەو وەك حاجیات لەبیەیکە دەکات). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٦، ژمارە: ١٠٨٠ چاپی چوارەم}.

٥٦٥- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {لَمَّا أَرَادُوا غَسْلَ اَلنَّبِيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالُوا: وَاَللَّهُ مَا نَدْرِي، نُجَرِّدُ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) كَمَا نُجَرِّدُ مَوْتَانَا، أَمْ لَا؟.....} اَلْحَدِيثَ، رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ.

{حسن، سنن أبي داود: ٣١٤١. الصحيح المسند: ١٥٣٨. أحمد ٦/٢٦٧}:

**تەواوی ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:**

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵانو پەیڕەوانی بێ) فەرمووی: کەویستیان تەرمەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بشۆرن، گوتیان: نازانین ئایا کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) رووت بکەینەوە، وەك چۆن مردووی ترمان رووت دەکەینەوە، یاخود ئەم هەر بەجلەکانیەوە بیشۆرین، جا لەسەر ئەمە کەقسەیان یەکی نەگرت، خودا خەوی لێ خستن، خەوێکی واقورس، کە یەك بەیەکیان سەریان بەسەر سینگیانا شۆڕ بۆوە، ئینجا قسەکەرێ، لەگۆشەیەکی ماڵەکەوە، قسەی لەگەڵ کردن، بەبێ ئەوەی کەبزانن کێیە، گوتی پێیان: تەرمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر بەجلەکانی خۆیەوە بیشۆرن، جائەوانیش هەڵسانو چوون بەلای تەرمەکەوەو هەر بەجلەکانیەوە شۆردیان (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوەکەیان دەکرد بەسەر کراسەکەیداو لەسەر کراسەکەوە دەستیان لە لەشی دەخست. عائیشە دەیگوت: تازە لەدەستم چوو ئەگەر عەقڵی ئێستام ئەوسا بوایە، دەبوو ژنەکانی بیانشۆردایە!. {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٢، ژمارە: ١٠٦٥ — د/ئیبنو حەببان/حاکم — سند صحیح}.**

٥٦٦- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {دَخَلَ عَلَيْنَا اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَنَحْنُ نُغَسِّلُ ابْنَتَهُ، فَقَالَ: "اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ"، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ.فَقَالَ: "أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوايَة: (إِبْدَأْنَ بِمَيَا مِنِها وَمَوَاضِعِ الوُضُوءِ مِنْها) وَفِي لَفْظ للبخاري: (فَضَفَّرْنا شَعْرَهَا ثَلاثَةَ قُرُون، فَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا).

{تجريدى بوخارى/٢٨/٢، ژمارە: ٦٠٦ = ١٢٥٣ فتح البارى. پوختەى موسليم ٤٦٧ = ٢١٧٠ شيحا = مسلم ٩٣٩}:

**ئوم عەتىَ (رەزاى خوداى لىَ بىَ) فەرمووى: كاتىَ زەينەبى كچى پێغەمبەر (دروودى خودا لەسەر پێغەمبەرو هەموو هاوسەرو منداڵەكانى بىَ) مرد، كۆمەڵىَ ژن بووين، خەريكبووين تەرمەكەيمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆى (دروودى خوداى لەسەر بىَ) لەو كاتەدا هاتە ژوورەوە بۆلامان، فەرمووى: (بەئاوو بەمۆرد سىَ جار، يان پێنج جار، يازياتريش بيشۆرن، ئەگەر لەپێنج جار زياتريشتان بەپێويست زانى، وەلەدوا دەستا ئاوەكە هەنىَ كافووريشى تىَ بكەن، كاتێكيش لەشۆردنەكەى بوونەوە، ئاگادارم بكەن).**

**جا كەلىَ بووينەوە، پێمان گوت: قوربان لەشۆردنەوەى تەرمەكەى زەينەب بووينەوە، فەرمانت بەچييە بفەرموو:**

**جا حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بىَ) كراس (إزار)ەكەى خۆى هەڵدا بۆمانو فەرمووى: (بيكەن بەژێر كراس بۆى) واتە: لەژێر كفنەكەيەوە، لەسەر گۆشتەوە بيكەنە بەرى، بۆ پيرۆزىو وەرگرتنى پيتو فەڕو پيرۆزى لێى).** {تاج/١، زنجيرە: ٢٠٣، ژمارە: ١٠٧٠}.

**(ڕوونكردنەوە):**

**بەهرەكانى لەم فەرموودەيە وەردەگيرێن:**

**١- ئەم فەرموودەيەو چەند فەرموودەيەكى ترى ساغو صەحيحو دروست، بنەمايەكن لەبنەماكانى خۆپيرۆز كردنو خۆ مووفەڕك كردن، بەشۆێنەوارو ئاسەوارو شمەكى پياوچاكان.** {بڕوانە: ژمارە: ٥٥٤ + تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٦٠٩، ٦١٠ + پوختەى موسليم ژمارە: ١٩٧ ژياننامەى موعاوييەى كوڕى ئەبو سوفيان}.

**٢- زەينەبى كچى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىَ) لەخەديجەى كوبرايە، كە يەكەم هاوسەرى پێغەمبەر بوو، كچە گەورەى پێغەمبەرە،**

راجیایی لەوەدا هەیە کە زەینەب گەورەترە، یاقاسمی برای، یەکەم کچی پێغەمبەر بووە کەشووی کردووە، شووی کرد بە ئەبولعاصی کوڕی رەبیع، کەپورزای خۆی بوو، کە کوڕی هالەی کچی خووەیلید بوو، کە خووەیلید باوکی خەدیجەو هالەیە.

زەینەب لەگەڵ باوکی خۆیو لەگەڵ باوکی مێردەکەیدا، لەمەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، لە ئەبولعاصی مێردی کوڕێكو کچێکی بوو، کوڕەکە ناوی عەلی بوو، مێرد منداڵ بوو مرد، کچەکە ناوی ئومامە بوو، ما هەتا لەدوا مردنی فاطیمەی زەهرای پووری، شووی کرد بەعەلی کوڕی ئەبو طالیب.

مێردەکەی زەینەب، زۆری خۆشدەویست، زەینەب لەژیانی باوکیدا، وەك لەم فەرموودەیەدا دیارە، لەساڵی هەشتی کۆچیدا، مەرگ بوو بەمیوانیو، بەجێی هێشت جیهانی کۆنەچاڵ.

٣- ژمارەی شۆردنەکانی مردوو تاك بێ، وەك سێو پێنجو حەوت.

٤- بۆنی خۆش بۆ مردوو بەکاربهێنرێو بکرێتە دوا ئاوەوە، یابکرێ بەکفنو گۆڕەکەیەوە.

٥- بەلای ڕاستی مردووەکەو ئەندامەکانی دەسنوێژ دەست بکرێ بەشۆردنی، وەك دانەر، لەکۆتایی ئەم ژمارەیەوە دەڵێ. {تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٠٦ = ١٢٥٤ فتح الباری} + {مسلم شیحا رقم: ٢١٦٦ هەتا ٢١٧١}.

لەگێڕانەوەیەکی بوخاریو موسلیمدا، دەڵێ:

ئوم عەتێ، واتە: دایکی عەتێ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ شۆردنی تەرمی زەینەبی کچی، فەرمووی پێمان: (لە ئەندامە راستەکانیەوەو لەئەندامەکانی دەسنوێژیەوە دەست بکەن بەشۆردنی!).

ئـوم عـەتێ فەرمووشـی (لـە گفتەیـەکی بوخاریـدا)، لەسـەر فـەرمانی پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) فژەکەیـشیمان شـانەکردو کردمـان بەسێ پەلکەو بەپشتیدا شۆڕمان کردەوە.

٥٦٧- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كُفِّـنَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَـحُولِيَّةٍ مِـنْ كُرْسُـفٍ، لَـيْسَ فِيهَـا قَمِـيصٌ وَلَـا عِمَامَةٌ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختـــەی بوخـــاری/٢، ژمـــارە: ٦٠٧ = ١٢٦٤ فـــتح البـــاری. پوختـــەی موسلیم/٤٦٨ = ٢١٧٦ شیحا = مسلم/٩٤١}:

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودو سـڵاوو ڕەحمـەتی خـودای گـەورەو سـەروەری لەسـەربێ‌و سـەرو مـاڵ‌و منـاڵ‌و بـاوك‌و دایك‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی خاکی بەرپێی سەردانکارانی ئارامگای پیرۆزی بێ) لەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکـەدا کفـن کـرا، نـەکراس‌و نە مێزەریان تیادا نەبوو). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٢، ژمارە: ١٠٦٦ چاپی چوارەم}.

٥٦٨- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اَللَّهِ بْـنِ أُبَـيّ جَاءِ اِبْنُهُ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). فَقَالَ: أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيـهِ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری بەکوردی بەرگی/دووەم، ژمارە: ٦٠٩ = ١٢٦٩، ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦ فتح الباری. پوختـەی موسـلیم ژمـارە: ١٦٣٦ = شـیحا/٦١٥٧ = مسلم/٢٤٠٠}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، سـەرۆکی ناپاکـەکانی مەدینـە مـرد، عەبـدوڵڵای کوڕی ئەم عەبدوڵڵایە، کە یەکێ بوو لەهاوەڵە ڕاست‌و دروستـەکانی حـەزرەت (درووودی خودای لەسـەر بـێ) هـات بـۆلای پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر

بێ) عەرزیکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم پێ بدە، تا بیکەم بەکفن بۆ باوکم، بەڵکوو بە پیرۆزی ئەو کراسەی تۆوە، سزای لەسەر سووك ببێ، ئەویش کراسێکی خۆیی پێدا، لەپاشا داواشی لێ کرد، کە نوێژی مردووشی لەسەربکا.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا کەبچێ نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکا، بەڵام عومەری کوڕی خەتاب هەڵسا، جلەکەی پێغەمبەری گرتو عەرزیکرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! تۆ خودا رێگەی ئەوەی پێ نەداویت ئیتر نوێژی چۆن لەسەر دەکەیت؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەوەی عومەر، فەرمووی: (خودا منی کردووە بەسەرپشكو خاتر خۆی کردووم لەکردنی ئەم کارەداو دەفەرموێ پێم:

{اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ – التوبة/٩/٨٠}.

واتە: تۆ ئەی موحەممەد! ئارەزووی خۆتە، داوای لێخۆشبوون بکە بۆیان، یان مەیکە، ئێمە رێگەی ئەوەت لێ ناگرین، بەڵام ئەوە بێ سوودە، چونکە نەوەك جارو دووجار، بەڵکوو ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، خودا لێیان خۆش نابێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی من لەحەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەم!!).

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئاخر ئەمە ناپاكو مونافیقە.

قسەبەر (راوی) دەڵێ: جا کاتێ کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەری کرد، خودا ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ – التوبة/٩/٨٤}. واتە:

بەهیچ شێوەیێ، نابێ نوێژی مردوو بکەی لەسەر هیچ کامێ لەوان کاتێ کەدەمرن، وەلەسەر گۆڕەکەیان رامەوەستە بۆ نزاکردنو پاڕانەوە بۆیان).
{تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٧ سوورەتی تەوبە}.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەستی دانەر لەپیادەکردنی ئەم فەرموودەیە لێرەدا ئەوەیە کە: (کراس دەست دەدا بۆ کفن!).

٥٦٩- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح الجامع/١٢٣٦. احمد رقم: ٢٢١٩. أبو داود رقم: ٣٨٧٨. ترمذی رقم: ٩٩٤. مابن حبان رقم: ٥٤٢٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (جلوبەرگی سپیش لەبەربکەن، چونکە ئەویش گەلێ جلی چاکە بۆ ئێوە، وە هەروەها بیکەن بەکفنیش بۆ مردووەکانیشتان!). تەرمەزی ئەم فەرموودەی بەساخ (صەحیح = دروست) داناوە.

٥٧٠- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحْسِنْ كَفَنَهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم. جنائز/٢١٨٢ شیحا = پوختەی موسلیم/٤٦٩ = مسلم/٩٤٣. أبو داود. جنائز/٢١٤٨. نسائی. جنائز/١٨٩٤، ٢٠١٣}:

لەپوختەی موسلیما، ژمارە (٤٦٩) دەفەرموێ:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوتارێکا، باسی ئەوەی کرد، کە پیاوێ لە هاوەڵانی مردووەو، لە کفنێکی ناشایستەدا کفن کراوە، وە بەشەویش

نێـژراوە، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هەرِشـەی لـەوەکرد کەمردوو لەشەودا بنێژرێ، چونکە لەشـەودا لەبـەر کـەمی ئامـادەبوان، کـەمتر نوێژی لەسەر دەکرێ، مەگەر لەبەر ناچاری مـرۆڤ ئـەوە بکـا، ئـەوە قـەیناکات کە لەشەودا مردوو بنێژرێ).

هـەروەها خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کاتـێ یەکێکتان تـەرمی بـرای موسـوڵمانی خـۆی کفـن دەکـا، بابـەجوانی کفنـی بکـا).
{تاج/١، زنجیرە: ٢٠٥، ژمارە: ١٠٧٢}.

مەبەست ئەوەیە کفنێکی تێرو تەسەل بۆ مردوو بکرێ.

٥٧١- وَعَنْهُ (رضی الله عنه) قَـالَ: {كَـانَ اَلنَّبِـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) يَجْمَعُ بَيْنَ اَلرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحَدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِـدٍ، ثُـمَّ يَقُـولُ: "أَيُّهُـمْ أَكْثَـرُ أَخْـذًا لِلْقُرْآنِ؟"، فَيُقَدِّمُهُ فِي اَللَّحْدِ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری بـەکوردی = مختـصر صـحیح البخـاری، بـــەرگی دووەم، ژمـــارە: ٦٤٠ = ١٣٤٣، ١٣٤٥، ١٣٤٦، ١٣٤٧، ١٣٤٨، ١٣٥٣، ٤٠٧٩ فتح الباری شرح صحیح البخاری}:

لە تەجریدی بوخاریدا (ژمارە: ٦٤٠) ئەمە دەقەکەیەتی:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) شـەهیدەکانی شـەڕی ئوحـودی، دوو پیـاو، دوو پیاو، دەخستە ناو یەك لۆ جلەوە لـەباتی کفـن، ئـەوجا دەیفـەرموو: (کامـەیان لەم دووانە، زیاتر قورئانی لەبەربوو، ئەوەیانی لـە ئەلحەدەکـەدا دەخـستە لای قیبلەوە!).

وە فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لـەڕۆژی قیامـەتا، مـن خـۆم ئاگاداری ئەمانە دەکەمو دەبم بەشایەت بۆیانو شایەتییان بۆ دەدەم کە گیانی شیرینی خۆیان، لەپێناوی خودادا بـەخت کـردووە، لەپاشـدا فـەرمانی فـەرموو

کەهەر بەخوێن‌و خوڕەکەی خۆیانەوە ناشتیانن، نە شۆردران‌و نە نوێژیان لەسەرکرا). {تاج/١/٥٣٣، زنجیرە: ٢٠٤، ژمارە: ١٠٧١ چاپی چوارەم}.

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەم چەند بڕیارانەیە:

١- لەکاتی ناچاریدا، دوو مردوو لەیەك کفندا کفن دەکرێن.

٢- هەروا دوو مردوو لەیەك گۆڕدا دەنێژرێن، هەروا زیاتر لەدوانیش لەکاتی ناچاریدا. لەم دوو کاتەدا مەرجە کە هەردوو مردووەکە موسوڵمان بن، وەپیاو بن، یا هەردووکیان ژن بن، یا ئەگەر ژن‌و پیاو بوون نامەحرەم نەبن، بەهەرحاڵ، نێوانێ خۆڵ، بۆ ناوبڕ لەبەینیانا ببێ.

٣- لەکاتی وادا کێ قورئانی زیاتر لەبەربێ، ئەوە پێش دەخرێ.

٤- شەهید ناشۆرێ‌و بەخوێن‌و جلەکەیەوە دەنێژرێ.

٥- نوێژی مردوو لەسەر شەهید ناکرێ.

(تێبینی)

شەهید جۆری زۆرە، نزیکەی چل جۆری هەیە، مەبەست لەوشەهیدە کە نە دەشۆرێ‌و نە نوێژی مردووی لەسەر دەکرێ‌و بەجل‌و بەرگەکەی خۆیەوە دەنێژرێ، شەهیدی مەعرەکەیە، کە لەپێناوی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، یان لەکاتی بەرگری لە موسوڵمانان شەهید دەکرێ، دەنا جۆرەکانی تر، بەس لەدوا رۆژدا بەشەهید دادەنرێن، لەدنیادا هەرچی بۆ مردووی ئاسایی بکرێ بۆ ئەوانیش دەکرێ، واتە: کفن دەکرێن، دەشۆرێن، نوێژیان لەسەر دەکرێ. {بڕوانە: ریاض الصالحين/٣/٢٣٠، زنجیرە: ٢٣٥، ژمارە: ١٣٥٣ هەتا ژمارە: ١٣٥٧ چاپی دووەم. تاران}.

٥٧٢- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَمِعْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: "لَا تُغَالُوا فِي اَلْكَفَنِ، فَإِنَّهُ يُسْلَبُ سَرِيعًا"} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{ضعيف الجامع/٦٢٤٧. ابو داود رقم: ٣١٥٤}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەکفندا زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەزوویی رووت دەکرێتەوە، بەبێ سوود خاك دەیڕزێنێ). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٥، ژمارە: ١٠٧٤ چاپی چوارەم}.

٥٧٣- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهَا: {لَوْ مُتِّ قَبْلِي لَغَسَّلْتُكِ} اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الإرواء/٧٠٠. أحمد/٦/٢٢٨. ابن ماجة/١٤٦٥. ابن حبان/٦٥٨٦}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە (مسند أحمد)و (صحيح ابن حبان)دا:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەرمێکی بەڕێ کردبوو، بۆ گۆڕستانی بەقیع، لەوێوە تەشریفی هاتەوە بۆلای من، من کە تەشریفی هات سەرم دەئێشا، سەرم ژانی دەکرد، لەتاوانا دەمگوت: ئای سەرم! ئای سەرم!).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵکوو من وای سەرم!) فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر تۆ لەپێش منا بمریت، چی زیانێکی نییە بۆت، خۆم تەرمەکەت دەشۆرمو ئەوجا بەدەستی خۆم کفنت دەکەمو نوێژی مردووت لەسەر دەکەمو ئەوسا لەگۆڕستان دەتنێژم!).

منیش عەرزیم کرد: بەخودا من واگومان دەبەم: کاتێ ئەوانەم بۆ ددەکەیت کەخۆت فەرمووت، کە گەڕایتەوە بۆ هۆدەکەی من لەپاش ناشتنی تەرمەکەم، لەوێ لەماڵەکەی منا، لەگەڵ یەکێ لەهاوسەرەکانتا زەماوەند دەکەیت، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زەردەخەنەیەکی کرد. ئیتر بەرە بەرە نەخۆشییەکەی سەرەمەرگی دەستی پێکرد تا لەئوەنجاما وەفاتی کرد.

(ڕوونکردنەوە):

١- بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٦٥ = ٧٢١٧ فتح الباری شرح صحیح البخاری هەروا (ریاض الصالحین/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ٩١٦} + {ژمارە: ٥٦٥ لەم کتێبە}.

٢- بەڵگەیە لەسەرئەوە کە ژن‌و مێرد، دەتوانن تەرمی یەکتری بشۆرن‌و کفنی بکەن‌و نوێژی لەسەر بکەن.

٥٧٤- وَعَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ فَاطِمَةَ عَلَيْهَا اَلسَّلَامُ أَوْصَتْ أَنْ يُغَسِّلَهَا عَلِيٌّ رَضِيَ اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ.

{دار قطنی/٢/٧٩/١٢}:

ئەسمائی کچی عومەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی فاطیمەی کچی پێغەمبەری خودا کە هاوسەری عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ) ڕاسپێری کرد بۆ عەلەی مێردی، کاتێ فاطیمە دەمرێ، عەلی تەرمەکەی بشۆرێ، وە عەلیش وایکردو ڕاسپێرییەکەی فاطیمەی بەجێ هێنا.

(ڕوونکردنەوە):

١- فاطیمەی زەهراء (ڕەزای خودای لێ بێ) کچی حەزرەتی پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو منداڵ‌و هاوسەرو هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان‌و پەیڕەوانی بێ. ئامین خودایە!)

فاطیمە هاوسەری پێشەوا عەلیە، یەکەم هاوسەریەتی، بەکچی شووی پێ کردووە، هەر ئەو شووەی کردووە، هەتا ما ژنی عەلی بوو، کەمرد عەلی تەرمەکەی شۆرد، عەلی ژنی تری بەسەر نەهێنا، عەلی لەپاش مەرگی فاطیمە ژنی تری هێناوە.

فاطیمه دایكی حەسەن‌و حوسەینە، نەنكە گەورەی هەموو سەیدەكانە، چونكە حەسەن‌و حوسەین باپیرە گەورەی هەموو سەیدەكانن. نەوەی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو نەوەو وەچەی پیرۆزی بێ) هەر لەڕێگەی فاطیمەوە ماون، لەمناڵەكانی تریەوە، نەوەو وەچەی پێغەمبەر نەماون، بەپێی تەمەن، كچەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو كچە پاكیزەكانی بێ) ئەمانەن:

١- زەینەب، لەخەدیجەی كچی خووەیلیدە، كە یەكەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، زەینەب یەكەم كچی پێغەمبەر بوو، یەكەم ككچی پێغەمبەر بووە كەشووی كردووە، شووی كرد بە ئەبولعاصی كوڕی رەبیع، كەپوورزای خۆی بوو، كوڕی هالەی كچی خووەیلید بوو، كەخوشكی خەدیجەی دایكی زەینەبە لەگەڵ پێغەمبەردا، لەمەككەوە كۆچی كرد بۆ مەدینە، بەڵام مێردەكەی لەمەككە مایەوەو موسوڵمان نەبوو، كاتێ ئەبولعاص موسوڵمان بوو، پێغەمبەر بەبێ مارەبڕینی تازە، زەینەبی دایەوە پێی، زەینەب لە ئەبولعاص كچێك‌و كوڕێكی بوو، كوڕەكە ناوی عەلی بوو، بەگەنجی مرد، ئەم عەلی كوڕی زەینەبە، لەرۆژی رزگاركردنی مەككەدا، كە لەمێژوودا ناسراوە بە (فەتحی مەككە) لەپاشكۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بوو، زەینەب كچێكیشی هەبوو، ناوی ئومامە بوو، ئەو كچەزایەی پێغەمبەر بوو، كەجاروبار لەنوێژدا دەیكردە قەڵادۆشكانی، كاتێ فاطیمەی پووری مرد، ئومامە شووی كرد بەعەلی كوڕی ئەبو تالیب، خاتوو ئومامە كوڕێكی لەعەلی بوو، ناوی موحەممەد بوو، ساڵی هەشتی كۆچی زەینەب بەمەرگی خودا مرد، ئوم عەتێ‌و چەند ژنێكی تر شۆردیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی سەرپەرشتی شۆردنەكەیی كرد، كراسەكەی خۆی هەڵدا بۆ ژنە مردوو شۆرەكان، كە لەژێر كفنەكەوە، لەسەر گۆشتەوە بیكەنە بەری، ئەوانیش وایان كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامادەی شۆردن‌و كفن كردنی تەرمی ئوم

کولثوومی کچیشی بووە، وەخۆی پارچە پارچە کفنەکەی ئوم کولثوومی هەڵ دەدا بۆیان، لەسەر ئەم شێوەیە:

لەیلای کچی قائیفی ئەل – ئەقەفییە، فەرمووی: ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کۆچی دوایی کرد، خۆم یەکێك بووم لەو ژنانەی کە دەیان شۆرد، پێغەمبەر خۆی لەلای دەرگاکە دانیشتبوو، کفنەکەی ئوم کولثوومی پێ بوو، پارچە پارچە دەیدایە دەستمان: لەپێش پێشا کراسەکەی دایە دەستمان، ئینجا سەرکراس، ئینجا سەرپۆش، ئینجا سەردەریی، لەپاش ئەمانە هەموو چەرچەفێکی ئاودامانیان لەتەرمەکەیەوە پێچا، ئوم کولثووم کە روقیەی خوشکی مرد، شووی کرد بەئیمامی عوثمان، ئەویش لەساڵی نۆی کۆچیدا لەلای عوثمان مرد. زەینەب لەپێش بیعثەت (ناردنی پێغەمبەر)دا بە دە ساڵ لەدایك بووە، نزیکەی (٣٠) سی ساڵ ژیاوە). {بڕوانە: ژمارە: ٥٦٦ لەپێشەوە رابورد}

٢- **روقیە**، ساڵی (٣٣) سیی‌و سێ لەتەمەنی پێغەمبەر روقیە لەدایك بووە، واتە (٧) بەحەوت ساڵ لەپێش بوونی پێغەمبەر، بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دایك بووە. هاوسەری ئیمامی عوثمان بوو، عوثمان لەپێشا کۆچی پێ کرد بۆ حەبەشە، منداڵێکی لە عوثمان بوو ناوی عەبدوڵلا بووو، روقیە زۆر جوان بوو، دوو کۆچی کردووە، لەغەزای بەدردا کۆچی دوایی کردووە، نزیکەی بیست ساڵێ ژیاوە، دووەم کچی پێغەمبەر بووە.

٣- **ئوم کولپووم** (رەزای خودای لێ بێ) لەپاش مەرگی روقیەی خوشکی، ساڵی (٣) سێی کۆچی شووی کرد بە عوثمان، لەساڵی نۆی کۆچی لەلای عوثمان مەرگ بوو بەمیوانی، منداڵی نەبوو لێی.

٤- **فاطیمەی زەهراو**، راجیایی سەبارەت بەساڵی لەدایکبوونی هەیە، هەندێ دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمەنی چل‌و یەك

سالْ بووه، کەفاطیمە لەدایك بووه، هەنێ تر دەفەرموون: تەمەنی (٣٥) سیی‌و پێنج سالْ بووه، کەفاطیمە لەدایك بووه، دیارە کەفاطیمەو براو خوشکەکانی، بێجگە لە ئیبراهیمیان، هەموویان لەدایکە خەدیجە بوون، کە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بووه، فاطیمە شوووی کرد بەعەلی تەمەنی (١٥) پازدە سالْ بوو، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشەش مانگ فاطیمەیش دەمرێ. لەئیمامی عەلی (٣) سێ کوڕی بووه: حەسەن‌و حوسەین‌و موحسین، موحسینیان بەمنالْی دەمرێ، هەروا (٢) دوو کچیشی لێی دەبێ کەبریتین لە زەینەب‌و ئوم کولثووم.

٥٧٥- وَعَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) -فِي قِصَّةِ الْغَامِدِيَّةِ الَّتِي أَمَرَ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِرَجْمِهَا فِي الزِّنَا- قَالَ: {ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَصُلِّيَ عَلَيْهَا وَدُفِنَتْ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ١٠٣٩ = ٤٤٠٧ شیحا = مسلم ١٦٩٥}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەی چیرۆکی ماعیزو ژنە غامیدییەکەیە، لەصەحیحی موسلیما، بەتایبەتی لەوەرگەڕانی پوختەی موسلیمدا، ژمارە (١٠٣٩ = ٤٤٠٧ شیحا) دەفەرموێ:

بورەیدەی کوڕی حوصەیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆرو ستەمم لەخودی خۆم کردووه، داوێنپیسیم کردووه، دەمەوێ کەتۆ لەم تاوانە بەپێی یاسانامەی خودا پاك‌و خاوێنم بکەیتەوه، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەیەکەمجاردا ڕەتی کردەوه، جا بۆ سبەینێ، ماعیز هاتەوە خزمەتی، گوتیەوه: ئەی پێغەمبەری خودا! من داوێنپیسیم کردووه، پاکم بکەرەوه، بۆجاری دووەم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕەتی کردەوه، وەلامی نارد بۆ هۆزەکەی‌و

پرسیاری لێ کردن: (ئایا کەموکوڕی لەهۆشی ماعیزدا دەبینن؟ ئایا نەنگێکی تیادا دەبینن؟).

گوتیان: ئەوەی کە ئێمە ئاگام لێیەتی: ماعیز هۆشی تەواوە، بەپێی بۆچوونی ئێمە لەپیاوباشانی ئێمەیە، جا بۆ جاری سێیەم ماعیز هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان پێغەمبەر ناردیەوە بۆلای هۆزەکەی، وەپرسیاری لەبارەی ماعیزەوە لێ کردنەوە، دیسان گوتیانەوە: هیچ کەموکورتیو نەنگیێ، گومان نابەین، نە لەخۆیا، نە لەعەقڵیدا، جا بۆ جاری چوارەم ماعیز هاتەوە، چەسپاندی کەپیاوێکی ژندارەو لەگەڵ ئەوەیشا داوێنپیسی ئەنجامداوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، کەبەردەباران بکرێ، هەتا دەمرێ، چاڵێکی بۆ هەڵکەنرا، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەردەبارانیان کرد هەتا مرد.

فەرمووی: ژنێکیش لەهۆزی غامید هات، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! من ژنی مێرددارمو داوێپیسیم کردووە، بەجێبەجێ کردنی حەدی شەرعی خودا پاکم بکەرەوە، پێغەمبەریش گەڕاندیەوەو حەدی شەرعی بەسەردا جێبەجێ نەکرد، جا بۆ سبەینێ، ژنەکە هاتەوەو گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! بۆچی دەمگەڕێنیتەوە؟ ڕەنگ بێ وەك چۆن ماعیزت گەڕاندەوە، منیش بگەڕێنیتەوە، دەی سوێند بەخودا سکم پڕە لەداوێنپیسی!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی کەهەر واز ناهێنیتو ناتەوێ نهێنی خۆت بپۆشیت، دە ئێستا بڕۆ هەتا منداڵەکەت دەبێ!).

فەرمووی: جا کە ژنەکە منداڵەکەی بوو، لەپارچەیێ پەڕۆدا، مەلۆتکەکەی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەرو گوتی: ئەمە منداڵەکەمە بوومە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (دە ئێستەیش بڕۆ، شیری پێ بدەو بەخێوی بکە، هەتا لەشیر دەبڕێتەوە!) جا کاتێ ژنەکە منالەکەی گەورە کرد، هەتا لەشیر بڕییەوە، منالەکەی هێنایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەتێ نانی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە منالەکەمە، ئەوەتا لەمەمك بڕیومەتەوەو ئەوەتا نانو ئاو دەخوات.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منالەکەی دایە دەستی پیاوێ لە موسوڵمانان کەسەرپەرشتی بکا، تاگەورە دەبێ. ئەوجا فەرمانی کرد چاڵێکیان بۆ ژنەکە هەڵکەند، قوڵییەکەی هەتا سەرسینگی بوو، وەفەرمانی کرد بەخەڵکەکە، بەردەبارانیان کرد لەوکاتەدا خالیدی کوڕی وەلید، بەردێکی هێنا کێشای بەسەری ژنەکەدا، خوێنەکەی فیچقەی کرد، چوو بەدەموچاوی خالیددا، لەسەر ئەوە خالید جمێنی بەژنەکەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جمێنەکەی خالیدی بیست، کەدای بەژنەکە، فەرمووی: (هێواش! ئەی خالید! جنێوی پێ مەدە، بەوکەسە کەگیانی منی بەدەستە، دیارە کە ئەو کەسە گیانی منی بەدەستە، بەس خودای گەورەو سەروەرە، ئەم ژنە، کە ئەمکارە ناشایستەی ئەنجام داوە، تەوبەیەکی جوانی وەهای کرد، ئەگەر باجگرو گومرگخۆریش تەوبەی وا جوان بکەن، خودا لێیان خۆش دەبێو تەوبەکەیان قەبووڵ دەکا!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو: تەرمی ژنەکەیان ئامادە کرد، وەك شۆردنو کفن کردن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، وەهاوەڵانیش نوێژی مردوویان لەسەر تەرمەکەی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی مردووی لەسەر تەرمی ماعیزیش کرد، وەلاشەی

مـاعيزو ژنەکەشـيان لەگۆڕسـتانی موسـوڵمانان ناشـت). {تـاج/٣، زنجـيرە: ٩٣، ژمارە: ٢٣٦١ چاپی چوارەم} + {ئەبوداوود. حدود: ٤٤٤٠}.

(ڕوونکردنەوە):

آ- بـۆ داسـتانی بـەردەبارانی مـاعيزی ئەسـلەمیو ئـەم ژنـە غاميدييـە، بڕوانـە: صـەحيحی بوخـاری بەشـەرحی فـەتحولباری ژمـارە: ٦٨٢٠، کـە لـەم ژمـارەدا دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژی لەسـەر تەرمەکەی ماعيز کرد، هەروا بڕوانە: {بوخاری: ٦٨٢٤، ٦٨٢٥، ٦٨٢٦}.

ب- ئـەوەی خـۆی بـە موسـوڵمان بزانـێو خـوا بـەخوای خـۆی بزانـێو شايەتی بدا کەموحەممەد پێغەمبەری خودايە، ئيتر باگوناهی گەورەو تـاوانی زليش ئەنجام بدا، وەك: پياوکوشتنو خۆکوشتنو کردنی داوێپيسیو حيـزیو دزی، بانوێـژيش نـەکاو بـەڕۆژووش نـەبێو ئەرکـە ئايينەيـەکانی تـريش جێبەجێ نەکا، مـادام لەئـەهلی قيبلەيـەو خـۆی بـە موسـوڵمان دەزانـێ، ئـەم کۆمەڵە بڕيـارە سـەبارەت بـەم جـۆرە کەسـانە چەسـپاوە کەئێـستا ئـەم جـۆرە کەسانە هەر زۆر زۆرن:

١- وەك موسوڵمان تەرمەکەی دەشۆرێو کفـن دەکـرێو نوێـژی مـردووی لەسەر دەکرێو لەگۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێ، ئيتر خۆی بەمـەرگی خـودا مردبـێ، يـان کوژرابـێ، يابەحـەددو لـەژێر داری حـەددا مردبـێ، کەسـووکاری دێنی گۆڕەکەی دەکەن.

٢- تەعزێو پرسەی بۆ دادەنرێو سەرەخۆشی لەکەسوکاری دەکرێ.

٣- راسپێری جێبەجێ دەکرێ، خێرو حەسەناتی بۆ دەکرێ.

٤- کەسوکارەکەی کەلەپووری لێ دەگرن.

٥- ژنەکەی چوار مـانگو دە شـەو ماتـەمی بـۆ دەگـرێ، ئەگـەر دووگيـان بوو، ئەوە تاسکەکەی دادەنێ ئەگەر لەو ماوەدا سکەکەی دانەنا.

٦- بۆ کەلەپوور بەرەکانی دروستە کەحەجی بۆ بکەن، عەمرەی بۆ بکەن، مزگەوتو بیرو پردو شتی وای بۆ وەقف بکەن، تەنانەت دروستە کەنوێژو رۆژووی بۆ قەزا بکەنەوە، قوربانی بۆ بکەن.

ج- لەکاتی جێبەجێ کردنی حەددی شەرعیدا، دەبێ ئەم خاڵانە بەوردی ڕەچاو بکرێ:

١- ئەگەر حەددەکە پەیوەندی بە مافی مرۆڤەوە نەبوو، وەك حەددی داوێنپیسی، واباشە، دادوەر بەئاماژە تێی بگەیەنێ کەنهێنی خۆی ئاشکرا نەکاو تەوبە بکاو لەسەر ئەو بابەتە نەڕوا.

٢- نابێ پێلێنەر شێت بێ، یاهۆشی زەدەدار بێ.

٣- بۆ جێبەجێ کردنی حەددی داوێنپیسی ئەم چوار شتە پێویستە:

آ- موسوڵمانەتی.

ب- رەسیدە بوون.

ج- چوار شایەتی دادپەروەر یا پێلێنانی کەسەکە خۆی.

د- بۆ بەردەباران، دەبێ هاوسەری هێنا بێ، یان شووی کردبێ. {بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٢١٦، ژمارە: ١١١٢}.

٥٧٦- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {أُتِيَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِرَجُلٍ قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٨٠ = ٢٢٥٩ شیحا = مسلم/٩٧٨}:

جابیری کوڕی سەموورە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تەرمی پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەیکانێ خۆی کوشتبوو، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی مردووی لەسەربکا، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەرنەکرد). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٦، ژمارە: ١١١١ — م/د/ت/ن}.

نەوەوی دەفەرموێ: بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئـەم کابرایـە نوێـژی نـەکردووە، هـەتا ببـێ بەپەنـد بـۆ هـەموو کەسـێ، کـە خۆکوشـتن، کـارێ زۆر خراپـە، دەنـا سـەحابەکانی پێغەمبـەر نوێـژیان لەسـەر تەرمی ئەم خۆکوژە کردووە.

٥٧٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) -فِي قِصَّةِ اَلْمَرْأَةِ اَلَّتِي كَانَـتْ تَقُـمُّ اَلْمَسْجِدَ- قَالَ: {فَسَأَلَ عَنْهَا اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَـالُوا: مَاتَـتْ، فَقَـالَ: "أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي"؟ فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا فَقَالَ: "دُلُّـونِي عَلَـى قَبْرِهَـا"، فَـدَلُّوهُ، فَصَلَّى عَلَيْهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَزَادَ مُسْلِمٌ، ثُمَّ قَالَ: {إِنَّ هَذِهِ اَلْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اَللّٰهَ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلَاتِي عَلَيْهِمْ}.

{پوختەی بوخـاری = تجریـدی بوخـاری/١، ژمـارە: ٢٨٠ = ٤٥٨، ١٣٣٧، ٤٦٠ فـتح البـاری شـرح صـحیح البخـاری. پوختـەی موسـلیم/٤٧٩ = ٢٢١٢ مسلم/شیحا = مسلم/٩٥٦}:

ئەمە دەقەکەیەتی لە ژمارە (٤٧٩)ی پوختەی موسلیمدا بەکوردی:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ژنێکـی ڕەش، یـا لاوێ، مزگـەوتی دەمـاڵی، خزمـەتی مزگـەوتی دەکـرد، کاتـێ دەمـرێ، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئاگـای لێ نابـێ، هـەتا ڕۆژێ هـەواڵی دەپرسـێ، دەڵێن: مردووە، دەفەرموێ: (ئەی بۆچی هـەواڵتان بـەمن نـەدا؟). گـوتی: وەك بڵێی کاری ئەو مردوومیان بەسووك گرتبێ وابوو، پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن).

جا کەگۆڕەکەیان پێ نیشاندا، نوێـژی مـردووی لەسـەر گۆڕەکـەی کـرد). ئینجـا فـەرمووی: (ئـەم گۆڕانـە سـیخناخن لـەتاریکیو، لەبـەر تـاریکی زۆر، خاوەنەکانیان وەك لەتاریکستانا بن وایە بەڵام خـودای تـەواناو شـکۆمەند، بـە مەرحەمەتی خۆی، بەهۆی ئەم نوێـژەوە کـەمن کـردم لەسـەریان، گۆڕەکانیـان

بۆ رۆشن دەکاتـەوە!). {تـاج/١، زنجيرە: ١١٨، ژمـارە: ٧١٥ + زنجيرە: ٢١٢، ژمـارە: ١١٠١}.

(روونکردنەوە):

١- نوێژ لەسەر گۆڕی مردوو دروستە.

٢- واباشـە ئەگـەر دەکـرا، نوێـژی تـەرم بەجەماعـەت بکـرێ، چـونکە پێغەمبەر بەجەماعەت نوێژی تەرمی لەسەر ئەم قەبرە کرد.

٣- ئەگـەر لەپێـشا نوێـژی تـەرمیش کرابـێ، دروسـتە کـە نوێـژی تـەرم لەسـەر گۆڕەکـەی بکرێتـەوە، بەتایبـەتی ئەگـەر تـازە نێـژرابوو، وە ماوەیـەکی زۆری بەسەردا تێ نەپەڕیبوو.

٤- بەڕاسـتی ئـەم فەرموودەیـە دەقـە لەسـەر ئـەوە کـە زیکـرو نوێـژو قورئانخوێندنو پاڕانەوەو نزا بۆ مردوو، بەتایبەتی لەسـەر گۆڕەکـەی سـوودو قازانجی هەیە. پێویـست بـەو هـەموو تەکەلووفـە ناکا، کـە هەنـدێ کـەس، بـۆ پشتیوانی بۆچوونی هەڵەی خۆیان، بەرپەرچی ئـەم جۆرە فـەرموودە راسـتو دروستو راشکاوە دەدەنەوەو تـەئویلی وایـان دەکـەن، کـە مەگـەر هـەر لەگـەڵ بیری چەوتی خۆیاندا بچەسپێ. {بڕوانە: تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ١٥٩ هەتا کۆتایی ئەم ژمارەیە، لەگەڵ روونکردنەوەکەیدا}.

٥٧٨- وَعَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَنْهَى عَنِ اَلنَّعْيِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{حسن، صحيح الترغيب والترهيب: ٣٥٣١. أحمد: ٢٣٦٥٩. ترمذی: ٩٨٦}:

حوذەيفە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جڵـەوگیری کـردووە لـەوە، کـە لەسـەر بـاوی سـەردەمی نـەفامی، پەیامی مەرگی مردوو رابگەیەنرێ).

٥٧٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَعَى اَلنَّجَاشِيَّ فِي اَلْيَوْمِ اَلَّذِي مَاتَ فِيهِ، وَخَرَجَ بِهِمْ إِلى الْمُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢/٢٦، ژمارە: ٦٠٣ = ١٢٤٥، ١٣١٨، ١٣٢٧، ١٣٢٨، ١٣٣٣، ٣٨٨٠، ٣٨٨١ فتح البارى. پوختەی موسليم/٤٧٥ = ٢٢٠١ مسلم/شيحا = مسلم ترقيم (محمد فؤاد عبدالباقى): ٩٥١}:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو ڕۆژەدا کە نەجاشی تیادا مرد، کە پاشای ئەو سەردەمەی وڵاتی حەبەشە بوو، وە پاشایەکی باش بوو، بەتایبەتی بۆ کۆچبارە موسوڵمانەکان، ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیامی مردنی ئەوی بەهاوەڵانی ڕاگەیاند، فەرمووی: (ئەسحەمە کە بەندەیەکی باشی خودا بوو، ئەمڕۆ مرد).

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەرچوون و ڕۆیشتن بۆ نوێژگاکە {بڕوانە: ژمارە: ٥١٨} لەوێ، لەنوێژگاکە، هاوەڵەکانی لەپشتی خۆیەوە ڕیزکردن و نوێژی تەرمی نادیار (صلاة الغائب)ی بەکۆمەڵی لەسەر نەجاشی کرد، لەنوێژەکەدا چوار ئەڵڵاهوئەکبەری لەسەری کرد). {تاج/١/٥٣٨، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٦}.

(ڕوونکردنەوە):

١- جاڕهەڵدان بەبۆنەی مەرگی کەسێکەوە، لە یاسانامەی ئیسلاما، دوو جۆری هەیە: {بڕوانە: مغنی المحتاج/١، ص٣٥٧. فصلٌ أقلُّ القبر حُفرةٌ...}.

یەکەم: ناڕەوایەکە، ئەوەیە لەسەر شێوەی کۆنی نەزانی بێ، کە بۆ شانازی و شتی وا بێ، ئەمەیان نادروست و ناڕەوایە، وەك لەپێشەوە لەژمارە (٥٧٨)دا ڕابورد.

دووەم: بۆ ئەوەبێ کە خزم و کەسوکارو دۆست و برادەران ئامادەی ڕێ و ڕەسمی بەڕێکردن و نوێژ لەسەرکردن و پرسەو سەرەخۆشی بن، ئەمەیان

قەیدی نییە، هەتا ئەم جۆرە شتانە لەڕێگەی کەناڵەکانی دەنگو ڕەنگو نووسینیشەوە بێ، قەیدی نییە، چونکە بەنیازێکی پاکی ئایینیە، پەیوەندی بە باوو نەریتی ناشیرینی سەردەمی نەزانییەوە نییە، ئەوەتا پێغەمبەر خۆی پەیامی مەرگی نەجاشی بەهاوەڵانی ڕاگەیاند هەتا نوێژی لەسەر بکەن.

٢- نەجاشی نازناوی پادشایانی حەبەشەیە، هەروەك چۆن ڕۆم بە پادشایانی خۆیان دەڵێن: قەیسەر، وە ئێرانینان بە پادشای خۆیان دەڵێن: کیسرا، حەبەشەیش بەپادشای خۆیان دەڵێن: نەجاشی.

٣- نوێژی تەرم لەسەر مەزهەبی شافیعی چوار ئەللاهوئەکبەری تیادەکرێ لەسەر ئەم شێوەیە {بڕوانە: ریاضی صالحین بەکوردی، بەرگی دوو، زنجیرە: ١٥٧}:

یەکەم: ئەللاهوئەکبەری تەحەڕوم، لەدوایەوە سوورەتی فاتیحە دەخوێنرێ.

دووەم: لەپاش خوێندنی فاتیحە ئەللاهوئەکبەری دووەم دەکا، ئەوجا نزای باش بۆ مردووەکە دەکا.

سێیەم: لەپاش نزاکردن ئەللاهوئەکبەری سێیەم دەکاو لەپاشی سڵاوات لەسەر پێغەمبەر دەدا.

چوارەم: لەپاش سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ئەللاهوئەکبەری چوارەم دەکاو ئەوسا بەلای ڕاستو بەلای چەپا سڵاو دەداتەوە.

٥٨٠- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قال: سَمِعْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا، لَا يُشْرِكُونَ بِاَللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا شَفَّعَهُمْ اَللَّهُ فِيهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٨٣ = ٢١٩٦ مسلم/شيحا = مسلم ترقيم/ محمد فؤاد عبدالباقی/٩٤٨. أبو داود. جنائز: ٣١٧٠. ابن ماجة. جنائز: ١٤٨٩. تحفة الأشراف: ١٣٥٦} + {رياض/٢، زنجيرە: ١٥٦، ژمارە: ٩٣٢}:

کورەیب: ئازادکراوی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەقودەید، لە عوسفان، کوڕێکی ئیبنو عەبباس مرد، ئیبنو عەبباس فەرمووی پێم: ئەی کورەیب! دەرچۆ بڕۆ بزانە ئەو خەڵکەی کۆبوونەتەوە لەسەر ئەم تەرمە چەندێکن؟ فەرمووی: منیش دەرچووم تەماشام کرد کۆمەڵێ خەڵك کۆبوونەتەوە لەلای، هاتمەوە بۆلای‌و هەواڵەکەم پێی گوت، فەرمووی: بەزەینت چل کەس دەبن؟

گوتم: بەڵێ، دەبن. فەرمووی: دەی کەواتە تەرمەکە دەرکەن‌و بیبەن بۆ گۆڕستان، چونکە من بۆخۆم لەدەمی پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەر پیاوێ لە موسوڵمانان، کە دەمرێ، چل پیاو – کە هیچ شەریك‌و هاوبەش‌و هاوەڵ بۆ خودا پەیدانەکەن – نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن، بێگومان کەخودا تکایان لێ گیرا دەکا بۆ ئەو مردووە!). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٤، ژمارە: ١١٠٧ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەم جۆرە شوێنەدا، وشەی (رجل - پیاو) بۆ تەغلیبە، چونکە لە یاسانامەی خودادا، بەپێی باوی دامەزراوی ناو کۆمەڵ، زوربەی کات رووی دەم لەقسەو گفتوگۆدا، لەپیاوانە، بەڵام لەڕاستیدا، هەموو گفتوگۆو بڕیارێك، وەکوو یەك نێرو مێ دەگرێتەوە، مەگەر بەڵگەیێ، یا نیشانەیێ هەبێ، کە دەقەکە تایبەت بکا بەلایەکیانەوە، لەیەکێ لەدوو ڕەگەزەکە، کەواتە: لەم بابەتەدا ژنیش هەروەهایە، چ تکابکا بۆ کەسێ، چ کەسێ تکای بۆبکا. {بڕوانە: تەجرید/١ بەکوردی، ژمارە: ١٣}.

٢- کورەیبی کوڕی ئەبو موسلیمی هاشمی، هەم کۆیلەی ئازادکراوی ئیبنو عەباس بوو، هەم شاگردو فەقێی بوو، تا سەردەمی جێنشینی ئیمامی عوسمان ژیاوە، گێڕانەوەی لەزۆر لەهاوەڵانەوە ئەنجامداوە، وەك: ئوم فەضل‌و مەیموونەی خوشکی ئوم فەضل‌و عائیشەو ئوم سەلەمەو ئوم هانیئ.

فەقێی زۆریش لەوەوە گێڕانەوەیان ئەنجامداوە، موسای کوڕی عوقبە دەفەرموێ: باری وشترێ کتێبی ئیبنو عەبباس، کوڕەیب لەلای ئێمە داینابوو. پیاوێکی بتمانەی متمانە پێکراوبوو، لەپیاوانی شەش پەڕاوەکەیە، کە بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجەن.

واقیدیو کەسانی تریش دەفەرموون: لەمەدینە مردووە، ساڵی نەوەتو هەشتی کۆچی، لەکاتی جێنشینیی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکدا. {بڕوانە: تهذيب التهذيب لابن حجر العسقلاني، مجلد/٨، ص٤٣٣، ژمارە: ٧٨٣}.

٢- بڕوانە پوختەی موسلیم ژمارە (٤٨٢ = ٢١٩٥ شیحا).

٥٨١- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّيْتُ وَرَاءَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ وَسْطَهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری بەکوردی/٢، ژمارە: ٦٣٦ = ١٣٣١ فەتحولباری. پوختەی موسلیم ٤٧٤ = ٢٢٣٢ شیحا = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٩٦٤}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجەماعەت نوێژی مردووم لەسەر تەرمی ئوم کەعب کرد، کە لەزەیستانیدا بەسەر مناڵەوە مردبوو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنوێژەکەدا، لەناوەڕاستی تەرمەکەدا ڕاوەستابوو). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٠، ژمارە: ١٠٩٨ — ش/د/ت/ن + تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢١٤ = ٣٣٢، ١٣٣١، ١٣٣٢ فتح الباری + أبو داوود. جنائز: ٣١٩٥. ترمزی. جنائز: ١٠٣٥. نسائی. حیض: ٣٩١}.

٥٨٢- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {وَاَللَّهِ لَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى اِبْنَيْ بَيْضَاءَ فِي اَلْمَسْجِدِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم بەکوردی/٤٧٨ = ٢٢٥٠ شیحا = مسلم ترقيم: محمد فؤاد عبدالباقي ٩٧٣}:

عائیـشه (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: کاتـێ سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمانی حەقی بەجێهێناو مـرد، هاوسـەرەکانی حەزرەت (دروودی خودا لەسەر خۆیو رەزای خودا لەکەسوکارو هاوسەرەکانی بێ) ناردیان بەشوێن تەرمەکەیدا، کە بیهێنن بۆ مزگەوت، هەتا هاوسەرەکانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نوێـژی مـردوو لەسـەر تەرمەکـەی بکـەن، ئـەوانیش وایـان کـردو لـەناو مزگەوتـدا، لەبـەردەمی هۆدەکـانی هاوسەرەکانی پێغەمبـەردا تەرمەکـەیان دانـا، کـە دەرگـای هۆدەکانیـان لەسـەر مالّی مزگەوت بوو، وە هاوسەرەکانی حەزرەت نوێـژی تـەرمیان لەسـەری کـرد، ئەوجا لەدەرگای جەنائیزەوە، تەرمەکەیان لەمزگەوت بردە دەرەوە، کەدەچوو بەسەر جێگە دانیشتنەکاندا، جا هـەواڵ گەیـشتەوە بـە هاوسـەرانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کـە خەڵکەکـە ئـەم کـارەی ئـەوانیان پـێ جـوان نەبووە، وە گوتوویانە: گوایە جاران تـەرم نـەدەبرا بۆنـاو مزگـەوت، کـە ئەمـە گەیـشتەوە بـە عائیـشە فـەرمووی: زۆر بەپەلـە ئـەو خەڵکـە نـەنگ لەشـتێ دەگرن، کە زانستیان لەبارەیەوە نییە؟! ئەوەیان لەئێمـە کـردووە بەشـوورەیی، کە تەرم ببرێ بۆ مزگەوت، چی زوو لەبیریان چوو!! بـەخودا پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەناو مزگـەوتا، نوێـژی کـرد لەسـەر تـەرمی سوهەیلو لەسـەر تـەرمی براکـەی، کـە هـەردووکیان کـوڕی بـەیضاء بـوون!).

{تاج/١، زنجیرە: ٢١١، ژمارە: ١١٠٠ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- نوێـژی تـەرم لـەناو مزگـەوتاو لـەدەرەوەی مزگەوتـدا دروسـتە، بەتایبـەتی ئێـستا دۆخ گـۆڕاوە، لەمزگـەوت نوێژەکـە بکـرێ باشـترە، چـونکە ئەگەر نوێژخوێنەکان دەستنوێژیان نەبێ، لەمزگەوت مەودای دەستنوێژگرتن زۆرەو بەئاسـانی دەسـتنوێژ دەگـیرێ، ئەگـەر زۆریـش بـن لەمزگـەوت جێگـەی

فراوان هەیە، ئێستا لەمەککەو لەمەدینەیش، هەر لەناو مزگەوتا، نوێژ لەسەر تەرم دەکرێ، لەپاش کردنی نوێژە فەرزەکان بانگەواز دەکرێ بۆی.

٢- کوڕەکانی بەیضاء سێ برابوون، ناویان سەهلو سوهەیلو صەفوان بوو، دایکیان ناوی دەعد بوو، لەبەرئەوەی کە سپیکەلە بوو، نازناوی بەیضاء بوو، باوکیان ناوی وەهبی کوڕی رەبیعە بوو. سوهەیلیان لە موسوڵمانە پێشینەکان بوو، کۆچی کرد بۆ حەبەشە، گەڕایەوە بۆ مەککە، لەمەککەوە کۆچی کردەوە بۆ مەدینە، ئامادەی جەنگی بەدرو جەنگانی تریش بووە، لەساڵی نۆی کۆچی لەمەدینە مردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی لەناو مزگەوتەکەی خۆیدا لەمەدینە کرد.

٣- سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێ بێ) لە عەشەرەی موبەششەرەیە، واتە: لەو دەکەسەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مژدەی بەهەشتی پێیان داوە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، لەتەمەنی چواردە ساڵیدا ئیسلام بووە، ئامادەی غەزای بەدر بووە، هەروا هی غەزاکانی تری پاش بەدریش بووە، نزای گیرا بوو، یەکەم کەس بوو کە یەکەم تیری لەڕێگەی خودادا هاویشت، لە کۆچکارە هەرە پێشینەکانە، دووسەدو حەفتا فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا بیستی هەیە، لە موسلیمدا بیستو سێی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو لایە، واتە: پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، لەسەردەمی ئیمامی عومەردا، لەسەر دەستی سەعددا مەدائین ئازادکرا، کووفەی دروست کرد، عومەر کردی بە فەرمانداری سەر وڵاتی عێراق، لەپەنجاو حەوتی کۆچیدا مردووە، لەبەقیع بەخاك سپێرراوە، هاوسەرەکانی پێغەمبەر، نوێژی تەرمیان لەسەر تەرمەکەی لەناو مزگەوتا کردووە، وەك لەم فەرموودەیەدا ئەمە روون دەبێتەوە. {بڕوانە: تەجریدی

بوخاری/١، ژماره: ٢٦ + تاج/٣، زنجیره: ١٢، لەژماره: ٣٣٢٦ وە هەتا ژماره: ٣٣٣١}.

٤- ئەم فەرموودەیە لەموسلیمدا، بەسێ جۆر لە عائیشەوە دەیگێڕنەوە، ئەم گێڕانەوەی ئێرە پوختەی دوو گێڕانەوەکەی تریشی واتیادا، بۆیە حافظی موندیری ئەمەیانی هەڵبژاردووە بۆ موختەصەری صەحیحی موسلیمەکەی کە بەواتا: (پوختەی صەحیحی موسلیمە).

٥٨٣- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: {كَانَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا، وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ خَمْسًا، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُكَبِّرُهَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَالْأَرْبَعَةُ.

{پوختەی موسلیم/٤٧٦ = ٢٢١٣ شیحا = مسلم ترقيم محمد فؤاد عبدالباقي/٩٥٧. أبو داود. جنائز: ٣١٩٧. ترمذی. جنائز: ١٠٢٣. نسائي. جنائز: ١٩٨١. ابن ماجة. جنائز: ١٥٠٥. تحفة الأشراف: ٣٦٧١}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری زەیدی کوڕی ئەرقەم وابوو، لەنوێژی تەرما، کاتێ نوێژی دەکرد، لەسەر تەرمەکانمان، چوارجار ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، جارێ کەنوێژی لەسەر تەرمێ کرد، پێنج ئەڵلاهوئەکبەری کرد، کەبۆ ئەمە لێیم پرسی؟ زەید فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار ئاوای دەکرد).

(ڕوونکردنەوە):

بەشێوەی گشتی ئێستا چوار ئەڵلاهوئەکبەر لەنوێژی مردوودا دەکرێ، وەك لەپێشەوە لەژمارە (٥٧٩)دا ڕوونکراوەتەوە. {بڕوانە سەرەتای زنجیرە: ١٥٧، ریاض/٢}.

جا ئەگەر کەسێ پێنج ئەڵلاهوئەکبەری کرد، با لەدوای ئەڵلاهوئەکبەری چوارەم سڵاو نەداتەوە، بەڵکوو دووبارە بۆ مردووەکە

بپاڕێتەوە، ئەوسا ئەڵلاهوئەکبەری پێنجەم بکا، ئەوجا سڵاو بەلای راستو بەلای چەپدا بداتەوە.

٥٨٤- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) {أَنَّهُ كَبَّرَ عَلَى سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ سِتًّا، وَقَالَ: إِنَّهُ بَدْرِيٌّ} رَوَاهُ سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ. وَأَصْلُهُ فِي "اَلْبُخَارِيِّ.

{صحيح، أحكام الجنائز ص١١٣. بوخاری. مغازی: ٤٠٠٤}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) کەنوێژی کرد لەسەر تەرمی سەهلی کوڕی حەنیفی ئەنصاری، پێنج جار ئەڵلاهوئەکبەری کرد، وەبۆ پاساوی ئەم زیادەیە، کە ئەڵلاهوئەکبەری پێنجەمە، فەرمووی: چونکە سەهل ئامادەی جەنگی بەدر بووە، هەرکەسێکیش ئامادەی ئەو بەهرە گەرمیێ بووبێ، مافی زیادە رێزی هەیە، لەهەموو کارێکا کەبۆ رێزو قەدربێ).

٥٨٥- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا وَيَقْرَأُ بِفَاتِحَةِ اَلْكِتَابِ فِي اَلتَّكْبِيرَةِ اَلْأُولَى} رَوَاهُ اَلشَّافِعِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{أخرجه الشافعي في مسنده (١/٣٨٥)}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پاسای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ نوێژی مردووی لەسەر تەرمی مردووەکانمان دەکرد، چوار ئەڵلاهوئەکبەری دەکرد، لەپاش ئەڵلاهوئەکبەری یەکەم سوورەتی فاتیحەی دەخوێند).

شافیعی بەڕشتەیەکی لاوازی بێ هێز ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.

٥٨٦- وَعَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اَللّٰهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: {صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ فَاتِحَةَ الكِتَابِ فَقَالَ: "لِتَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ"} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری بەکوردی = تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٣٧ = ١٣٣٥ فەتحولباری}:

تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: لەسەر تەرمێ لەپشتی ئیبنو عەبباسەوە، نوێژی مردووم بەجەماعەت (بەکۆمەڵی) کرد، ئیبنو عەبباس پێشنوێژبوو، لەپاش ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژ دابەستن سوورەتی فاتیحای خوێند، کە دێباچەو سەرەتای قورئانی پیرۆزە، لەپاشا کە لەنوێژەکە بووەوە، فەرمووی: (بۆیە وام کرد، هەتا موسوڵمانان بزانن کە خوێندنی فاتیحا لەنوێژی مردوودا، یاساو ڕەفتارو ڕێبازی پێغەمبەر خۆیەتی). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٨}.

٥٨٧- وَعَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {صَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى جَنَازَةٍ، فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ: "اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنْ اَلْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ اَلثَّوْبَ اَلْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَأَدْخِلْهُ اَلْجَنَّةَ، وَقِهِ فِتْنَةَ اَلْقَبْرِ وَعَذَابَ اَلنَّارِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٤٧٧ = ٢٢٢٩ شیحا = مسلم محمد فؤاد عبدالباقی/٩٦٣ + ترمذی. جنائز: ١٠٢٥. نسائی. طهارة: ٦٢، ١٩٨٢، ١٩٨٣}:

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد، ئەمەم لەنزاکەی لەبەرکرد، کەبۆ ئەو مردووەی کرد، فەرمووی:

{اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنْ اَلْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ اَلثَّوْبَ اَلْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَأَدْخِلْهُ اَلْجَنَّةَ، وَقِهِ فِتْنَةَ اَلْقَبْرِ وَعَذَابَ اَلنَّارِ}.

واتە: خودایە! ئەی پەروەردگارم! لێی خۆشبەو ڕەحمی پێ بکەو سەر ئاسوودەی هەردوو جیهانی بفەرموو، لێی ببورەو میوانەو ڕێزی بگرەو گۆڕی

گوشادکەو، بەئاوو بەبەفرو بەتەرزە بیشۆرەو، لەگوناھ پاك پاکی بکەرەوە، وەك چۆن جلێکی سپی پاك رابگریو لەچڵك دووری بگری ئاوا، وە ماڵێ لەماڵەکەی خۆی باشترو خێزانێ لەخێزانەکەی خۆی باشترو هاوسەرێ لە هاوسەرەکەی خۆی باشتری پێ بدە، بیبەرە بەھەشتی بەرینو پەنای بدە لەسزای گۆڕو لەسزای ئاگری دۆزەخ).

عەوف فەرمووی: تەنانەت ئەم پاڕانەوەو نزایەم ئەوەندە بەدڵ بوو، خۆزگەم خواست کە ئەو مردووە من بوومایە). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٩ + ریاض/٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ٩٣٥}.

(ڕوونکردنەوە):

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە، لەپیاوانی صەحیحەینە، واتە: لەبوخاریو موسلیمدا، گێڕانەوەی هەیە، یەك فەرموودەی لەبوخاری شەریفدا هەیە، کە ژمارە: ١٢٨٤ی تەجریدی بوخارییە = ٣١٧٦ فتح الباری تەرقیمی/محمد فؤاد عبدالباقی، ئەشجەعییە، واتە: لەهۆزی ئەشجەعە، یەکەم شەڕگە کە ئامادەی بووە، غەزای خەیبەرە، لەڕۆژی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا، ئاڵای هۆزی ئەشجەع بەو بوو، لەشام نیشتەجێ بوو، راوی لەعەوفەوە لەچینی دووەمی موسوڵمانان کەپێیان دەگوترێ: تابعین (پەیڕەوان = شوێنکەوتوان) راوی عەوف لەم چینەوە زۆرە، ئەبو هورەیرەیش گێڕانەوەی لە عەوفەوە هەیە، ساڵی حەفتاو سێی کۆچی، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا، کۆچی دوایی کردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٥٨٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ يَقُولُ: "اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا، وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا، وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا، وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا، وَأُنْثَانَا، اَللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى

اَلْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى اَلْإِيمَانِ، اَللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ، وَالْأَرْبَعَةُ.

{صحيح، سنن أبي داود: ٣٢٠١ وَلَمْ يَرْوِهِ مُسْلِمٌ}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەسەر تەرمێ نوێژی مردووی دەکرد، دەیفەرموو:

{اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا، وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا، وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا، وَكَبِيرِنَـا، وَذَكَرِنَـا، وَأُنْثَانَا، اَللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى اَلْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَـى اَلْإِيمَـانِ، اَللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ}.

واتــە: ئـەی خودایــە! لەزینــدوو مردوومــان خۆشــبە، هــەروا لــەدیارو نادیارمـانو، لـە گـچکەو گـەورەمانو، لـەنێرو مێمـان، پـەروەردگاری گـەورەو سەروەرمان! ئەوەی کە لەئێمە دەیژێنی، لەسەر ئیسلامەتی بی ژێنـەو ئـەوەی لەئێمە دەیمرێنی لەسەر ئیمانو باوەڕ بەخوداو پێغەمبەر بیمرێنە، خودایـە! لەپاداشی باشی ئەم مردووە بێ بەشمان مەکەو لـەپاش ئـەویش سـەرگەردانو سەرلێشێواومان مەکە!). {ریاض/٢، ژمارە: ٩٣٦، زنجیرە: ١٥٧} {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٩٠ — رَوَاهُ أصحَابُ السُّنَنِ بِسَنَدٍ صحيحٍ}.

(ڕوونکردنەوە):

بەپێی سەرچاوەکانو راڤەنامـەکان، ئـەم فەرموودەیـە ئیمـامی موسـلیم نەیگێڕاوەتــەوە، ئــەوەی کــە لــە ئەصــڵەکەدا، دەفــەرموێ: موســلیمیش گێڕاویەتەوە، هەڵەی نووسیارە، یـا هەڵـەی پێنووسـی دانـەرە، خـودا لەهـەموو لایێ خۆش بێ.

٥٨٩- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: {إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى اَلْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ اَلدُّعَاءَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{حسن، صحيح الجامع/٦٦٩. أبو داود رقم: ٣١٩٩. ابن حِبّان رقم: ٣٠٧٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ لەسەر مردوو نوێژدەکەن، بەسۆزی دڵو بەدڵێکی پاكو بەکوڵی دڵ بۆیبپاڕێنەوە!).

(ئەبو داوود گێڕاویەتەوە، هەروا ئیبنو حببان، ئیبنو حببان بە صەحیحی داناوە). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ٩٣٧ + تاج/١، زنجیرە: ٢٠٨، ژمارە: ١٠٨٥}.

(ڕوونکردنەوە):

زاناکان دەفەرموون: گرنگ ئەوەیە کە نوێژخوێن لەسەر تەرم بەکوڵی دڵو بە جەخت بۆ مردووەکە بپاڕێتەوە، ئیتر هەر نزاو پاڕانەوەیێ هەڵبژێرێ دەبێو پەسەندە.

٥٩٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی موسلیم/٤٧٠ = ٢١٨٣ شیحا = مسلم (محمد فؤاد عبدالباقی)/٩٤٤. تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٣٣ = ١٣١٥ فەتحولباری تەرقیم محمد فؤاد عبدالباقی}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دەستو برد لەبەرێکردنی تەرمی مردوو بکەنو زوو بەزوو بیبەن بۆ گۆڕستانو لەرێ خێرا بڕۆن، چونکە حاڵ لەم دووخاڵە بەدەرنییە:

ئەگەر خۆی مرۆڤێکی باش بێ، ئەوا ئێوە دەیبەن بەسەر خێرو خۆشیدا.

خۆ ئەگەر خۆی مرۆڤێکی باش نەبێ، ئەوا ئەوە شەڕێکەو زوو بەزوو لەکۆڵی خۆتانی دەکەنەوە. {تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١١٩} + {ریاض/٢/٣٧٠، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ٩٤١}.

٥٩١- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {"مَنْ شَهِدَ اَلْجِنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ". قِيلَ: وَمَا اَلْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: "مِثْلُ اَلْجَبَلَيْنِ اَلْعَظِيمَيْنِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {حَتَّى تُوضَعَ فِي اَللَّحْدِ}.

{تجريدى بوخارى/٢، ژماره: ٤٣٦ = ١٣٢٣، ١٣٢٤، ١٣٢٥ فتح البارى شرح صحيح البخارى ترقيم محمد فؤاد عبدالباقى. پوختەى موسليم/٤٨١ = ٢١٨٦ شيحا = مسلم/٩٤٥. نسائى. جنائز: ١٩٩٤. أبو داود. جنائز: ٣١٦٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ ئامادەی بەڕێکردنی تەرمێ ببێ هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ، ئەوە قیراتێکی بۆ هەیە، وە هەرکەسێ لەگەڵیا بێ هەتا دەنێژرێو بەخاك دەسپێررێ، ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە). گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو قیراتە چەند دەبن؟ فەرمووی: (بەقەد دوو کێوی گەورە دەبن!). {ریاضی الصالحین بەکوردی/٢، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٩٢٩ + تاج/١، زنجیرە: ٢١٠، ژمارە: ١٠٩٧ چاپی چوارەم}.

لەگێڕانەوەی ژمارە (٢١٨٧ شیحا)دا، ئەمەی پترە:

(هەتا دەنرێتە ناو گۆڕ).

٥٩٢- وَلِلْبُخَارِيِّ: مِنْ حَدِيث أبى هرير (رضى الله عنه){مَنْ تَبِعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلِّى عَلَيْهَا وَيُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطَيْنِ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ}.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٤٤ = ٤٧، ١٣٢٣، ١٣٢٥ بوخارى}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: هەرکەسـێ لەبـەر رەزای خـودا، شـوێن تـەرمی موسـوڵمانێ بکـەوێ، وە لەگەڵیـدا بـێ هـەتا نوێـژی لەسـەردەکاو لەناشـتنی دەبێتەوە، لەهەمان کاتا ئەمە لەبـەر خـاتری خـودا بکـاو بـاوەڕی بـەوە هـەبێ کەئـەوە خواپەرسـتییەکی باشـەو مایـەی پاداشـی چاکە، ئـەوە بـەدوو قـیراط پاداشەوە دەگەڕێتەوە، کە هەر قیراتەیان بەقەد کێوی ئوحود دەبێ!

بـەڵام ئەوکەسـەی کەنوێـژی لەسـەر بکـاو پـێش ئـەوەی کـە تەرمەکـەی بنێـژرێ بگەڕێتـەوە، ئـەوە بەیـەك قـیراط پاداشـەوە دەگەڕێتـەوە. {ریاضـی صالحین/٢، زنجیرە: ١٥٥، ژمارە: ٩٣٠ + تاج/١، زنجیرە: ٢١٠، ژمارە: ١٠٩٧}.

(ڕوونکردنەوە):

قیراط بەپێی وڵات دەگۆڕێ، لـەلای خـەڵکی مەککە دەکاتـە (١/٢٤) یـەك لەسەر بیستو چواری دینـارێکی زێـڕ، لـەلای خـەڵکی عێـراق ددەکاتـە ($\frac{1}{2}$)ی دینارێکی زێڕ، هەروا لەلای شەرعزانەکان، هـەروا لەحەدیسیـشا بـەپێی شـوێن نرخـی دەگـۆڕێ. تەماشـای ئـەم جێگەیـە بکـە: {ج/١، ص/٢٧٢ عمـدة القـاریٔ للعلأمَةِ العینی، شرح صحیح البخاری ط/١ بیروت}.

٥٩٣- وَعَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) { أَنَّـهُ رَأَى اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ} رَوَاهُ اَلْخَمْـسَةُ، وَصَـحَّحَهُ ابْـنُ حِبَّانَ، وَأَعَلَّهُ النَّسَائِيُّ وَطَائِفَةٌ بِالْإِرْسَالِ.

{صحیح، الإرْواء: ٧٣٩. بیهقی رقم: ٦٦٥٩. دار قطنی رقم: ٤٠٩ في العلل. ابو داود: ٣١٧٩. ابن ماجة: ١٤٨٢. ترمذی: ١٠٠٧. نسائی: ٢٠٨٣}:

سالی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەحمەتو رەزای خـودا لـەخۆیو لەباوکیو لەباپیری بێ) دەفەرموێ: بـاوکم ئیبنـو عومـەر فـەرمووی: بەچاوی خۆم دیومە کـە ئـەم زاتانـە، کاتـێ لەگـەڵ تـەرما دەرۆیـشتن بۆسـەر گۆڕسـتان

لـەپێش تەرمەکـەوە دەڕۆیـشتن: پێغەمبـەرم دیـوە لـەپێش تەرمەکـەوە دەڕۆیـشت، هـەروا ئەبوبـەکرو عومـەریش، دیومـە کـە ئـەوانیش لەپێـشی تەرمەکەوە دەڕۆیشتن، کە لەگەڵی دەچوون بۆسەر گۆڕستان). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١١٦ چاپی چوارەم}.

ئەم فەرموودەیە ئەم پێنج فەرمووده شوناسه گێڕاویانەتەوە: ئەحمەدو ئـەبو داوودو تەرمـەزیو نەسـائیو ئیبنـو ماجـە. هـەروا ئیبنـو حـەببانیش، ئیبنـو حـەببان بەصـەحیحی دانـاوە، بـەڵام نەسـائیو تاقمـەیێ تـر دەڵـێن: عیللەتی ئیرسالی واتیادا.

٥٩٤- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَـمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٢، ژمـارە: ٦١٣ = ١٢٧٨ فـتح البـاری. پوختـەی موسلیم/٤٧١ = ٢١٦٤ شیحا = مسلم/٩٣٨}:

ئوم عەتیێ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمـەی ژنـان، جڵـەوگیریمان لێکـراوە، لـە شـوێنکەوتنی تـەرم، کـە لـەکاتی بەڕێکردنـدا لەگەڵیـدا بـچین بـۆ گۆڕستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاساغ نەکراوە لێمان کە لەگەڵ تەرمدا بڕۆین بۆسەر قەبران!). {تاج/١، زنجیرە: ٢١٨، ژمارە: ١١٢١}.

(ڕوونکردنەوە):

واتە: چوونی ژنان لەگەڵ تـەرمی مـردوودا بـۆ گۆڕسـتانو ئامـادەبوونی ڕێو ڕەسمی ناشتنی تەرم، لەلایەن ژنانەوە، ناباشـە، واتـە: کەراهـەتو ناباشـی هەیە، بەڵام حەرامو نادروست نییە. {ریاض/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ٩٣١}.

٥٩٥- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى تُوضَعَ}. مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ.

{تجريـدى بوخـارى/٢، ژمـاره: ٦٣١ = ١٣١١، ١٣١٠ بوخـارى. پوختـەى موسليم/٤٧٢ = ٢٢١٩ شيحا = مسلم/٩٥٩. أبو داود. جنائز: ٣١٧٤}:

ئـەبو سـەعيدى خـودرى (رەزاى خـوداى لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەفەرمویٚ: (كە تـەرمتان بينـى هەڵسن لەبـەرى، هەتا تىٚ دەپەڕیٚ، ئـەو كەسەيشى دواى دەكـەویٚ، بـا دانەنيشێت تـا تەرمەكـە دادەنرێ لەلاى گۆڕەكەى!). {تاج/١، زنجيرە: ٢٢٠، ژمارە: ١١٢٦ چاپى چوارەم}.

لەپوختەى موسليما، ژمارە (٤٧٢ = شيحا ٢٢١٩) ئەم فەرموودەيە ئاوايە:

جـابيرى كـوڕى عەبـدوڵلا (رەزاى خودايـان لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: تـەرمیٚ لەلامانەوە رەت بوو، پێغەمبەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـىٚ) لەبـەرى هەڵسا، ئێمەيش لەبەرى هەڵساين، ئينجا گوتمان: قوربان! ئەى پيغەمبەرى خودا! خۆ ئـەوە تـەرمى جوولەكـە بـوو؟ فـەرمووى (دروودى خـوداى لەسـەر بـىٚ): (لەڕاسـتيدا مـردن بەسـامو شـكۆيە! لەبەرئـەوە كـە تـەرمتان بينـى لەبـەرى هەڵسن!).

(روونكردنەوە):

ئـەم فەرموودەيـەو چـەند فەرموودەيـەكى تـرى دروسـتى لـەم بابەتـە، بەڵگەيەكى رۆشنن لەسەر رێزگرتنـى تـەرمى مـردوو، چـى تـەرمى موسـوڵمان بـىٚ، چـى تـەرمى ناموسـوڵمان بـىٚ، وەك تـەرمى مەسـيحىو جوولەكـەو نەتەوەكانى تر.

٥٩٦- وَعَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) {أَدْخَـلَ الْمَيِّتَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرَ، وَقَالَ: هَذَا مِنَ السُّنَّةِ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد.

{صحيح، سنن أبي داود: ٣٢١١}:

ئەبو ئيسحاق (رەحمەتى خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: حاريث رايـسپارد كـە عەبـدوڵلاى كـوڕى يەزيـد نوێـژى لەسـەربكا، ئـەم عەبـدوڵلاى كـوڕى يەزيـدە هـاوەڵى پێغەمبـەرە، لەتەمـەنى حەڤـدە سـاڵيدا ئامـادەى غـەزاى حودەيبييـە

بـووه، جـا عەبـدوڵڵا کـە نوێـژی لەسـەر تەرمەکـەی حاریـث کـرد، ئـەوجا لەپێیینی گۆڕەکەوە، تەرمەکەی داهێڵایـە نـاو گۆڕەکـەوەو فـەرمووی: (ئەمـە سوننەتی پێغەمبەر خۆیەتی سەبارەت بەداهێڵانی تـەرم بـۆ نـاو گۆڕەکـەی!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣٥}.

٥٩٧- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) قَالَ: {إِذَا وَضَعْتُمْ مَوْتَاكُمْ فِي الْقُبُورِ، فَقُولُوا: بِسْمِ اللَّـهِ، وَعَلَـى مِلَّـةِ رَسُـولِ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)}. أَخْرَجَـهُ أَحْمَـدُ، وَأَبُـو دَاوُدَ، وَالنَّـسَائِيُّ، وَصَـحَّحَهُ ابْـنُ حِبَّانَ، وَأَعَلَّهُ الدَّارَقُطْنِيُّ بِالْوَقْفِ.

{صحيح، الإرواء: ٧٤٧} + {أحمـد رقـم: ٤٨١٢. أبـو داود رقـم: ٣٢١٣. نسائي في الكبرى رقم: ١٠٩٢٧}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ مردووەکانتان دادەنێن لەناو گۆڕەکانیاندا بڵێن: باسْمِ اللّهِ وَبِاللّهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللّهِ). واتە:

بەپیرۆزی نـاوی خـوداو بەپـشتی خـوداو لەسـەر سـوننەتی پێغەمبـەری خودا، ئەم تەرمە دائـەنێین لـەناو ئـەم گۆڕەدا). {تـاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمـارە: ١١٣٦}.

٥٩٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا):أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

{أبو داود رقم: ٣٢٠٧ صحيح الجامع: ٤٤٧٨، الصحيح المسند/١٥٧٧}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شکاندنی ئێسکی مردوو، وەك ئـەوە وایـە کـە لـەحاڵی ژیانیدا بیشکێنی!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٣، ژمارە: ١١٤٣}.

٥٩٩- وَزَادَ ابْنُ مَاجَهْ مِنْ حَدِيثِ أُمِّ سَلَمَةَ: {فِي الْإِثْمِ}.

{ضعيف الجامع/٤١٧٠}:

ئیبنو ماجە لەڕێگەی ئوم سەلەمەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، ئەم زیادەیەی هەیە: (شکاندنی ئێسکی مردوو، لەتاوانا وەك شکاندنی ئێسکی زیندوو وایە، بەڵام لەتۆڵە سەندنو دەستەبەریو ضەمانا وانییە).

٦٠٠- وَعَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أَلْحَدُو ا لِي لَحْدًا، وَانْصِبُوا عَلَى اللَّبِنِ نُصْبًا، كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٤٨٧ = ٢٢٣٧ شیحا = مسلم ٩٦٦. نسائي. جنائز: ٢٠٠٧. تحفة الأشراف/٣٨٦٧}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

عامیری کوڕی سەعد فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی باوکم، لەو نەخۆشییەدا، کەتیادا مرد، رایسپارد، فەرمووی: گۆڕی لادرم بۆ لێ بدەنو، بەخشتی کاڵ لای پشتم بگرن، پێغەمبەریان چۆن لێکرد، لەکاتی ناشتنیدا، منیش هەروەها لێبکەن!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣٠ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

مردوو بەدوو شێوە لەناو گۆڕەکەیدا دەنێژرێ، بەپێی خاکی وڵاتەکە، بڕیاری شێوەیێ لەو دوو شێوەیە ئەدرێ:

١- لادڕ (لەحد) کە ئەوەیە قەبرەکە بەقەد باڵایێ قووڵ دەکرێ، ئەوجا لەتەختی گۆڕەکەدا، لەبەری قیبلەیەوە، بەدرێژایی گۆڕەکە، بنکەنێ (قوموشێ) هەڵ دەکەنرێ، کە ئەوەندە ببێ، کە لەشی مردووەکە، لەسەر شانی ڕاست، بەدرێژی بگرێ، ئەوجا لای پشتی مردووەکە، بەخشتی کاڵ هەڵ دەچنرێ، یا بەتەختە دار، یا بەتەختە بەرد. ئەوجا قەبرەکە بە خۆڵەکەی خۆی پڕ دەکرێتەوە.

٢- گۆڕیچە (شِقّ) کە ئەوەیە لەتەختی گۆڕەکەدا، لە ناوەڕاستیدا، بەدرێژایی گۆڕەکە، جۆگەلەیێ هەڵبکەنرێ، بەئاسانی جێگەی مردووەکەی

تیادا ببێتەوە، کە بەدرێژی لەسەر لای ڕاست، بەرەو قیبلە درێـژبکرێ، ئـەوجا بەخشتی کاڵ، یا بەتەختە دار، یا بەتەختە بەرد، یا بەهەرشتێ تـر، کەدەست بـدات، تەختـە پۆش بکـرێ، جاری واهەیـە، گۆڕیـچەکە ئـاوا دروسـت دەکـرێ: لەتەختی گۆڕەکەدا، جۆگەلەیێ دروسـت دەکـەن، ئـەملاو ئـەولای، بەبـەرد، یا بەشتێ تری لەبار، هەڵ دەچنرێو ئـەوجا تـەرمی مردووەکـەی ڕووەو ڕووگـە لەسەر شانی ڕاست، لەسەر باری درێژی تیـادا دادەنـرێو ئـەوجا تەختـە پـۆش دەکرێ، کەمێ بەرزتر لەتەرمەکە، تا بەرلەشی نەکەوێ.

٦٠١– وَلِلْبَيْهَقِيِّ عَنْ جَابِرٍ نَحْوُهُ، وَزَادَ: {وَرُفِعَ قَبْرُهُ عَنِ الْأَرْضِ قَدْرَ شِبْرٍ} وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{انظر الإرواء: ٧٥٦. بيهقي في سننه ٤٠٧/٣. ابن حبان رقم: ٦٦٣٥}:

پێـشەوا بەیهـەقی وێنـەی ئـەم فەرموودەیـە لـەجابیرەوە دەگێڕێتـەوە ئەمـەی زیـاترە: (گۆڕەکـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەقـەد بستێ لەزەوییەکە بەرزەوە کرابوو!).

٦٠٢– وَلِمُسْلِمٍ عَنْهُ: (رضى الله عنه) {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ}.

{پوختەی موسلیم/٤٨٩ = ٢٢٤٢ شیحا = مـسلم/٩٧٠. أبـو داود. جنـائز: ٣٢٢٦. ترمذی. جنائز: ١٠٥٢. نسائی. جنائز: ٢٠٢٦. تحفة الأشراف: ٢٧٩٦}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوکی) دەفـەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە گەچکاریکردنی گۆڕو لـە دانیـشتن لەسـەریو لەدروسـتکردنی خـانوو گومـەزو چـەترو شـتی وا لەسەری). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١١٣٩}.

٦٠٣– وَعَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ): {أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) صَلَّى عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، وَأَتَى الْقَبْرَ، فَحَثَى عَلَيْهِ ثَلَـاثَ حَثَيَـاتٍ، وَهُـوَ قَائِمٌ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيّ.

عامیری کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناشتنی تەرمی عوسمانی کوڕی مەظعوون بوویەوە، نوێژی لەسەرکردو ئەوجا چوو بەهەردوو دەستی سێ مشت خۆڵی هەڵدایە سەر گۆڕەکە، بەڕاوەستانەوە سێ مشتە خۆڵەکەی هەڵدایە سەری).

(ڕوونکردنەوە):

١- عامیری کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خودای لێ بێ) یەکێکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، لەگەڵ ژنەکەیدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە لەپاشا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەدرییە، واتە: ئامادەی جەنگی بەدر بووەو یەکێکە لەو بەدرییانە کە لە قورئان‌و سوننەتدا موژدەی گەورەیان پێ دراوە، لەهەموو غەزاکانی تری پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشداری کردووە، دوو فەرموودەی لە صەحیحی بوخاریدا هەیە، لەکاتی ئاژاوەکەی سەردەمی پێشەوا عوثماندا (ڕەزای خودای لێ بێ) عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) شەوێ هەڵدەستێ بۆ شەونوێژ، لەپاش شەو نوێژەکەی دەخەوێتەوە، جادێنە خەوی، پێی دەڵێن: هەڵسە لەخودا بپاڕێرەوە، کە لەم ئاژاوەیە پەنات بدات، هەروەك بەندە باشەکانی خۆی لەم ئاژاوەیە پەناداوە، ئەویش هەڵدەستێتەوەو نوێژدەکاو نزادەکا، جا لەپاشا نەخۆش دەکەوێ، ئیتر لەماڵ دەرناچێ تا ئەو ساتەی تەرمەکەی دەبەن بۆ گۆڕستان، چەند گوتەیێ لەساڵی وەفاتی کراوە، ڕەنگ بێ ساڵی سیی‌و حەوتی کۆچی، کۆچی دوایی کردبێ (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ). {بڕوانە: تەجرید/١، ژمارە: ٥٥٤}.

٢- عوثمانی کوڕی مەظعوون، لەکۆچکارانە، چواردەهەم پیاوە کە موسوڵمان بووە، دوو کۆچی کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشە، لەم کۆچەدا خۆی‌و سائیبی کوڕی بوون، یەکەم کەس بوو لە کۆچکاران (موهاجیرین) کە لەمەدینە مردووە، لەگۆڕستانی بەقیع نێژراوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە مردوویی ماچی کرد، وەبۆی دەگری، کاتێ ئیبراهیمی کوڕی

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەمرێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بچۆ بۆلای پێشینی باشی خۆمان: عوسمانی کوڕی مەظعوون!) پێغەمبەر بەردێکی گەورەی لەلای سەری عوثمانەوە داناو فەرمووی: دەیکەم بەنیشانەو گۆڕی براکەمی پێ دەناسمەوە).

عوثمانی کوڕی مەظعوون برای شیریی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گۆڕەکەی بەکێلێ نیشانە کردبوو، زۆرجار سەری لێ دەدا لەگۆڕەکەی، لەسەردەمی نەزانیشدا عوسمان مەیو بادەی نەدەنۆشیو لەخۆی حەرامکردبوو، لەساڵی دووەمی کۆچیدا لەمەدینە مرد. {بڕوانە: تەجرید/٥، ژمارە: ٦٠١ + تاج/١، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١١٣٤}.

٣- ئەم فەرموودەیە بەلگەیە لەسەر: کە سوننەتە بۆ ئامادەبووان بەشداری لەداپۆشینی تەرمی مردوودا بکەن، بەلایەنی کەمەوە سێ مشت خۆڵی بکەن بەسەردا، لەشەرحەکاندا ئاماژە بۆ ئەوەکراوە، کە لەگەڵ هەموو مشتە خۆڵێکا، تا سێ جار بڵێو ئەم ئایەتە بخوێنێ: {مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى – طه/ ٥٥/٢٠}. واتە:

لەخاك بوونو دەبنەوە بەخاكو لەخاك دەرتان دەکەینو دەتانکەینەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی.

٦٠٤– وَعَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ وَقَالَ: "اِسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ، فَإِنَّهُ الْآنَ يُسْأَلُ"} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ الْحَاكِم.

{صحيح الجامع: ٩٤٥، الصحيح المسند: ٩١١}:

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لەناشتنی تەرمی مردووەکە دەبۆوە، لەلای گۆڕەکەیدا رادەوەستاو دەیفەرموو: ئادەی بپاڕێنەوە بۆ ئەم برایەتان، داوای

لێخۆشبوونو داوای دامەزرانو راگیرکردن لەسەر ئیمانو باوەڕی بۆبکەن، چونکە ئێستاکە فریشتە دێنە لایو پرسیاری لێ دەکەن: خودات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئایینت چییە؟). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٥، ژمارە: ١١٥٥}.

٦٠٥- وَعَنْ ضَمْرَةَ بْنِ حَبِيبٍ أَحَدِ التَّابِعِينَ قَالَ: {كَانُوا يَسْتَحِبُّونَ إِذَا سُوِّيَ عَلَى الْمَيِّتِ قَبْرُهُ، وَانْصَرَفَ اَلنَّاسُ عَنْهُ، أَنْ يُقَالَ عِنْدَ قَبْرِهِ: يَا فُلَانُ! قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ. ثَلَاثُ مَرَّاتٍ، يَا فُلَانُ! قُلْ: رَبِّيَ اللَّهُ، وَدِينِيَ الْإِسْلَامُ، وَنَبِيِّ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} رَوَاهُ سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ مَوْقُوفًا.

{مقطوع، الإرْواء: ٣/٢٠٥}:

ضەمووروەی کوڕی حەبیب (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە پیاوێکە لە تابیعین، فەرمووی: جاران هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوەڵانی بێ) کاتێ لێ دەبوونەوە لەناشتنی تەرمی مردوو، وە گۆڕەکەیان تەواو رێك دەخست، وە دەیانویست کە بگەڕێنەوە، حەزیان لەوەبوو، کە کەسێ لەلای سەری گۆڕەکەیدا بڵێ: ئەی فیسارە کەس! بڵێ: (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ، لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ، لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ) ئەی فیسارە کەس! بڵێ: پەروەردگاری من یەزدانی پاکە، ئایینم ئیسلامە، پێغەمبەرم موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە).

سەعیدی کوڕی مەنصور بە مەوقووفی گێڕاویەتەوە.

٦٠٦- وَلِلطَّبَرَانِيِّ نَحْوُهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي أُمَامَةَ مَرْفُوعًا مُطَوَّلاً.

{الطبراني في الكبير (٨/٢٤٩)، رقم: ٧٩٧٩}:

ئەمەیش وەرگەڕاوی دەقی ئەم فەرموودەیەیە، راگوێزی دەکەین لە پەڕاوی (سُبُلُ السَّلاَم شرحُ بُلُوغِ المَرَامِ مِنْ جَمْعِ أَدِلَّة الأَحْكام) کە شەرحی ئەم کتێبە پیرۆزەی ئیمامی عەسقەلانییە:

دانـەری سوبولولسەلام دەڵێ: لـەفظـی ئـەم فەرموودەیـە ئاوایـە: ئـەبو ئومامە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی:

(کاتێ مردم ئەوەم بۆ بکەن، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەئێمە کەبۆ مردووی خۆمانی بکەین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کردو فەرمووی: (کاتێ برایەکی ئایینی ئێوە دەمرێو بەخۆڵ لەگۆڕەکەیدا داتان پۆشیو لەناشتنەکەی بوونەوە، با یەکێکتان لەلای سەری گۆڕەکەیەوە بوەستێو ئەوجا بڵێ: ئەی فیسارە کەسی کوڕی فیسارە ژن، واتە: بەناوی خۆیو بەناوی دایکیەوە زبانگی بکا، وەك ئەوە بڵێ: ئەی نەریمانی کوڕی رێحان! ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا کەبەم شێوەیە کە بانگی کرد، مردووەکە گوێی لێیەتی بەلاّم وەلاّم ناداتەوە، ئەوجا با دووبارە بڵێ: ئەی فیسارە کەسی کوڕی فیسارە ژن! جا مردووەکە لەناو گۆڕەکەیەوە دەڵێ: ئادەی رێنماییمان بکە، بەر رەحمەتی خودا بکەویت، بەلاّم ئێوە هەست بەوە ناکەن، جا با تەڵقین خوێنەکە بڵێ: ئەی برای مردوو! یا ئەی خوشکی کۆچکردوو! یادی ئەو پەیمانە بکە، کە لەجیهانا کردبووت لەگەڵ خودای خۆتا، کە ئەم شایەتییەیە: شایەتی دەدەم: کە بەس خودا خودایە، بێجگە لە ئەڵلاّخودای تر نییە، هەروا شایەتی دەدەم بەزمانو باوەڕ دەکەم بەدڵ کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری رەوانەکراوی خودایە، وە یادی ئەوە بکەرەوە کەتۆ یەزدانی پاکت بەخودای خۆت قەبووڵ کردووەو ئیسلامت بۆ ئایینی خۆت هەڵبژاردووە، وەهەروا قورئانت داناوە بە پێشەوای خۆت، جا مونکیرو نەکیر، کەدوو فریشتەن لەگۆڕا مردوو تاقی دەکەنەوە، کە گوێیان لەم قسانە دەبێ، کە هاتوون بۆ تاقی کردنەوەی مردووەکە، دەستی یەکتری دەگرنو بەیەکتری دەڵێن: بابرۆین، بۆچی بەخۆڕایی لای ئەمە دانیشین، ئەمە وەلاّمی خۆی خراوەتە سەر زاریو قەواڵەو بەڵگەی خۆی لەگەڵیەتی) پیاوێکیش گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا!

ئەی ئەگەر تەڵقینخوێن زناوی دایکی مردووەکەی نەزانی چۆن؟ فەرمووی: (با بەناوی دایکە حەواوە بانگی بکاو بڵێ: ئەی فیساری کوڕی حەوا!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٥، ژمارە: ١١٥٦}.

دانەر حافیظی عەسقەلانی دەفەرموێ: ئیسنادی ئەم حەدیثە صالحە.

(ڕوونکردنەوە):

کورت و پوخت: بەکورتی پەتی: (تەڵقین لەمەزهەبی شافیعیدا سوننەتە، وە ئەم تەڵقینەی ئێستا، لەوڵاتی خۆمانا دەخوێنرێ کارێ پەسەندو جوانە، بڕوانە موغنی موحتاج/١، لاپەڕە: ٣٦٧ الجنائز. فصل، أقلُ القبرِ حُفرَةٌ، هەروا ئیعانەتو تالیبین، بەرگی دوو، لاپەڕە: ٢٧٥ فصل في الصلاة على الميت).

٦٠٧- وَعَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الْحَصِيبِ الْأَسْلَمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. زَادَ اَلتِّرْمِذِيُّ: {فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْآخِرَةَ}.

{پوختەی موسلیم/٤٩٦ = ٢٢٥٧ شیحا = مسلم/٩٧٧. أبو داود. أشربة: ٣٦٩٨. نسائی. جنائز: ٢٠٣١}:

بورەیدەی کوڕی حوصەیبی ئەسلەمی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەپێشا، جاران من نەییم لێ دەکردن لەدێنیو سەردانی گۆڕستان، بەڵام ئەوا ڕێگەی من دراوە کەدێنی گۆڕی دایکم بکەم، کەوابوو ئێوەیش لەمەولا دیدەنیو سەردانی گۆڕستان بکەنو دێنی گۆڕی مردووەکانتان بکەن، چونکە دیمەنی گۆڕو گۆڕستان، یادی قیامەت تازە دەکاتەوە!).

ئەوەی کەدانەر، مامۆستا عەسقەلانی داینەوە بەزیادەی تیرمزی (١٠٥٤) لە ژمارە (٤٩٥)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی شەشەمی کۆچی تەشریفی رۆیشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی، کەوا لەئەبواء، لەسەر گۆڕەکەی گریا بۆیو ئەوانیشی کـردە گریـان کـە لەگەڵیا بـوون، ئـەوجا خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (داوام لە پەروەردگارم کرد کەڕێگەم پێ بدا کـە بـۆ دایکـم بپاڕێمـەوەو، داوای لێبووردنو لێخۆشبوونی لەخودا بۆ بکەم، ڕێگەی ئەوەی پی نەدام، بەڵام داوام لێی کرد کەڕێگەم پێ بدا کەدێنی گۆڕەکەی بکەم، ڕێگەی ئەوەی پێمـدا، کـەوا بـوو ئێـوەیش لەمـەودوا دیـدەنی سـەردانی گـۆڕو گۆڕسـتان بکـەنو شـتی وا سوننەتە، چونکە دیمـەنی گـۆڕو گۆڕسـتان یـادی مـردنو رۆژی ژینـەوە تـازە دەکاتـەوەو، جیهـان لەبەرچـاوی مـرۆڤ دەخـاو دوارۆژو قیامـەت لـەلا شـیرین دەکـا!). {تـاج/١/٥٧٨، زنجـیرە: ٢٢٧، ژمـارە: ١١٦٢ چـاپی چـوارەم} + {تـاج/١، زنجیرە: ٢٢٨، ژمارە: ١١٦٧}.

٦٠٨- زَادَ ابْنُ مَاجَهْ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ مَسْعُودٍ: {وَتُزَهِّدُ فِي الدُّنْيَا}.

{ضعيف الجامع: ٤٢٧٩. ابن ماجة: ١٥٧١}:

لەگێڕانەوەی ئیبنو ماجەدا، بۆ ئـەم فـەرموودەی بورەیـدە، کەموسـلیمو تەرمەزی بەو شێوەی سەرەوە گێڕاویانەتەوە، دەفەرموێ:

ئیبنـو مەسـعوود ئـەوەی زیـاترە: (چـونکە دێنـی گۆڕسـتان پەنـدی لێ وەردەگیرێو یادی دوارۆژ نوێ دەکاتەوەو جیهان لەبەرچاو دەخات).

٦٠٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) لَعَنَ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ.

{ترمذی ١٠٥٦. ابن حبان ٣١٧٨}:

لەتاجول ئوصولدا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نـەفرینو لەعنـەتی خـودا، لـەو ژنانـە بـێ، کـە

دەچن بۆ سەردانی سەرقەبرانو لەوێ دەیکەن بەبێ شەرعیو شینو شەپۆڕو ناشوکری، وەنەفرینو لەعنەتی خودا لەو کەسانەیش بێ کەمزگەوت لەسەر گۆڕ دروست دەکەن، وە لەو کەسانەیش بێ کەچرای لەسەر دائەنێنو گڵۆپی بۆ هەڵدەکەن!). (ئەبوداوودو تیرمیزیو نەسائی ئەم فەرموودەیان بەڕشتەیەکی دروست (بەسەنەدێکی صەحیح) گێڕاوەتەوە). {تاج/١/٥٨٠، زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٥ چاپی چوارەم = چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- رای بەهێزی زانایان ئەوەیە: کەبۆ ژنیش وەك پیاو دروستە سەردانی گۆڕستان بکا، بەمەرجێ سەرنەکێشێ بۆ کاری بێ شەرعی، وەك ئەوە لەسەر گۆڕەکە بیکا، بەشینو شەپۆڕو گریەو زاری، یابیکا بەمەهانەی خۆڕازاندنەوەو دەرچووونی ناشەرعی.

**کورتو پوخت:** (بۆ ژن واباشە بەتەنها نەچێ، یان ئەگەر بەتەنها چوو دڵنیابێ، لەبەر فەرەبالغیو زۆری سەردانکەران تووشی گێرەو کێشەی رەوشتیو ئایینی نابێ!). {بڕوانە: غاية المأمون – شرح التاج الجامع للأضول – مبحث زيارة القبور والدعاء لأهلها – الباب الثالث عشر فى الجنائز، المجلد لأول ص٣٨١}.

٦١٠– وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلنَّائِحَةَ ، وَالْمُسْتَمِعَةَ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ.

{ضعيف لإرواء: ٧٦٩. أبوداود رقم: ٣١٢٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەعنەتو نەفرینی کردووە لەسەر دۆلکەبێژو لەوژنەیش کەگوێی لێ دەگرێ).

سەردولکەبێژ: ژنی شێوەنگێڕ. {تاج/١، زنجیرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٣٠}.

٦١١- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ لَا نَنُوحَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٦٢٨ = ١٣٠٦، ٤٨٩٢، ٧٢١٥، بوخارى. مسلم/شيحا ٢١٦٠ = مسلم ٩٣٦}:

ئوم عەتىَ (دايكى عەتىَ) فەرمووى: ئەوكاتەى كەئێمەى ژنان، پەيمانمان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، لەسەر پابەندبوون بەدەستوورەكانى ئيسلامەوە، پێغەمبەر (درووودى خوداى لەسەر بىَ) بەتايبەتى، پەيمانى ئەوەى لىَ وەرگرتين: كەشيوەنو زارى نەكەينو ڕێگەى شيوەنكردنى نەداين. بەڵام پێنج ژنمان نەبىَ كەسمان ئەم پەيمانەمان نەبردەسەر، ئەوانيش ئەمانەن: دايكى سولەيمو دايكى عەلاو كچەكەى ئەبو سەبرەى ژنى موعازو دووژنى تر). {تاج/١، زنجيرە: ١٩٥، ژمارە: ١٠٢٩}. (بۆ چۆنێتى پەيمان بەستن لەگەڵ پێغەمبەردا، بڕوانە: تاج/١، زنجيرە: ٨، لاپەڕە/٤٠ چاپى چوارەم لە ژمارە: (٥٥)وە هەتا ژمارە: ٦٠).

٦١٢- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = پوختەى بوخارى = مختصر صحيح البخارى/٢، ژمارە: ٦١٨ = ١٢٨٧، ١٢٩٠، ١٢٩٢، بوخارى. شيحا ٢١٤٠ = مسلم ٩٢٧. بڕوانە: پوختەى موسليم ژمارە: ٤٦٥ = ٢١٥٣ شيحا}:

ئەم فەرموودەيە لە تجريدى بوخاريدا ئاوايە:

كاتىَ پێشەوا عومەر (رەزاى خوداى لىَ بىَ) پێكراو ئەبو لوئلوئەى مەجووسى لەبەرنوێژيى نوێژى بەيانيدا، لەمزگەوتەكەى پێغەمبەردا، چەند برينێكى كاريگەرو سەختى لىَ كرد، كەبوون بەهۆى شەهيد بوونى، صوهەيبى رۆمى هاوارى لىَ هەڵسا دەيگوت: ئاى براڕۆ! عومەريش فەرمووى: ئەوە چۆن وادەڵێيت، ئەدى نازانى كە پێغەمبەر (درووودى خوداى لەسەر بىَ) ڕێگەى

شتی وای نەداوە، ئەوەتا دەفەرموێ: (مردوو لەگۆڕەکەیدا، بەهۆی ئەو گریانەوە کە لەسەری دەکرێ، ئێش‌و ئازار دەدرێ).

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەر (رەزای خودای لێ بێ) بەو پێکرانە مرد، قسەکەی عومەرم گێڕایەوە بۆ عائیشە: کەگوایە مردوو سزاو ئەشکەنجە دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەسوکارەکەی بۆی دەکەن).

عائیشە (رەزای خودا لەهەموویان بێ) فەرمووی: رەحمەتی خودا لە عومەر، عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەڵام یان باش لەیادی نەماوە، یان بەهەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر (دروودو سڵاو سەڵاواتی خوداو فریشتەو پەری‌و مرۆڤی لەسەر بێ‌و، سەرو ماڵ‌و حاڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ) وەهای نەفەرموو، نەی فەرموو کە موسوڵمان بەهۆی گریانی کەسوکاری، ئێش‌و ئازار دەدرێ، بەڵام فەرمووی: کافرو بێباوەڕ کە کەسوکاری بۆی دەگرین، خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش‌و ئازاری گرانتر دەکا!!).

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەقی ئایەتی قورئانتان بەسە، بۆ بەڵگەو شایەتی راست‌و دروستی ئەم قسەیەی من، کە بەدەق دەفەرموێ: {وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – الأنعام/١٦٤}.

واتە: (هیچ کەسێ، باگوناهباریش بێ، باروگووناهی کەسێکی تر، جگە لەباروگوناهی خۆی، هەڵناگرێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٦، ژمارە: ١٠٣٣ + زنجیرە: ١٩٧و ١٩٨ + فیقهی ئاسان بەرگی/١، لاپەڕە/٢٧٥ + تجرید/٢، ژمارە: ٦١٩و ٦٢٠}.

٦١٣- وَلَهُمَا: نَحْوُهُ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٢٠ = ١٢٩١. مسلم/ شیحا ٢١٥٤ = مسلم ٩٣٣}:

ئەمە دەقێکی ئەم فەرموودەیە لە پوختەی بوخاریدا:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری ئازیزو نازدارم بیست، دەیفەرموو: (درۆ بەدەم منەوە، وەك درۆ بەدەم کەسی ترەوە نییە، هەرکەسێ، بەئارەزوو، بەدەم منەوە، درۆ هەڵبەستێ، با جێی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکات).
{پوختەی موسلیم ١٨٦٢ = شیحا/٥} + {تاج/١، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤و ١٢٥} .

موغیرە فەرمووی: هەروەها لێیم ژنەوت کە دەیفەرموو:

(هەر مردوویێ، شینو شەپۆرو زاری لەسەر بکرێ، بەهۆی ئەو شینو شەپۆرو زاریەوە، سزاو ئازار دەدرێ!). {تاج/١، زنجیرە: ١٩٦، ژمارە: ١٠٣١} لە تاجا ئاوایە:

(ئەو کەسەی شیوەنی لەسەر بکرێ، لەسەر ئەو شیوەنەی کە لەسەری دەکرێ، ئازارو سزا دەدرێ!).

٦١٤- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {شَهِدْتُ بِنْتًا لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) تُدْفَنُ، وَرَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) جَالِسٌ عِنْدَ اَلْقَبْرِ، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدْمَعَانِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری بەکوردی/٦١٧ = ١٢٨٥، ١٣٤٢ بوخاری}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ تەرمی ئوم کولثوومی کچی پێغەمبەردا، چووین بۆ سەرقەبران، فەرمووی: پێغەمبەرم بینی لەسەر لێواری گۆڕەکە دانیشتبوو، تەماشایم کرد: هەردوو چاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هۆن هۆن فرمێسکیان پیادا دەهاتە خوارەوە).

٦١٥- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تَدْفِنُوا مَوْتَاكُمْ بِاللَّيْلِ إِلَّا أَنْ تُضْطَرُّوا} أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ. وَأَصْلُهُ فِي "مُسْلِمٍ"، لَكِنْ قَالَ: زَجَرَ أَنْ يُقْبَرَ اَلرَّجُلُ بِاللَّيْلِ، حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ.

{صحيح الجامع: ٧٢٦٨. ابن ماجة: ١٥٢١. پوختەی موسلیم ٤٦٩ = ٢١٨٢ شیحا = مسلم ٩٤٣}:

**دەقی ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە لە ژمارە: (٥٧٠)دا بەتەواوی رابورد.**

٦١٦- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرٍ -حِينَ قُتِلَ- قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "اصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا، فَقَدْ أَتَاهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ"} أَخْرَجَهُ الْخَمْسَةُ، إِلَّا النَّسَائِيَّ.

{أحمد ١٧٥١. أبوداود: ٣١٣٢. ابن ماجة: ١٦١٠. ترمذی ٩٩٨}:

**عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری طەییار (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کەپەیامی مەرگی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب گەیشت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەغەزای مۆتەدا لەشام شەهید بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نان دروست بکەن، بۆ خێزانەکەی جەعفەر، چونکە ئەوان تووشی خەمو خەفەت بوونو نایان پەرژێتە سەرنانو ئاو!). {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٦، ژمارە: ١١٥٩ + بەرگی/٣، لاپەڕە: ٦٢٦، زنجیرە: ١٨ لە فەرمووده ژمارە: ٣٣٥٢وه هەتا ژمارە: ٣٣٥٦ + بەرگی/٤، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٤٦٤٠ هەتا ٤٦٤٢ چاپی چوارەم}.**

٦١٧- وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُعَلِّمُهُمْ إِذَا خَرَجُوا إِلَى اَلْمَقَابِرِ أَنْ يَقُولُوا: {اَلسَّلَامُ عَلَى أَهْلِ اَلدِّيَارِ مِنَ اَلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اَللَّهُ بِكُمْ لَلَاحِقُونَ، أَسْأَلُ اَللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم/شیحا ٢٢٥٤ = مسلم ٩٧٥ + پوختەی موسلیم ٤٩٧ = ٢٢٥٣ شیحا}:

**سولەیمانی کوڕی بورەیدە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: باوکم فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی فێردەکردین، کە چووین بۆ قەبران، کاتێ گەیشتینە لایان بڵێین:**

{اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلِ اَلدِّيَارِ مِنَ اَلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اَللَّهُ بِكُمْ لَلَاحِقُونَ، أَسْأَلُ اَللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ}.

واته: سڵاوتان لێ بێ، ئەی دانیشتوانی ئەم خانەیانە! لە موسوڵمانو خاوەن باوەڕتان، ئێمەیش خوایار بێ، هاکا پێتانەوە نیشتینو هاتین بۆلاتان، داوای ئاسودەییو خێرو خۆشی لەخودا دەکەین، بۆ خۆشمانو بۆ ئێوەیش!).

{تاج/١، زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٣ چاپی چوارەم}.

٦١٨- وَعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {مَرَّ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِقُبُورِ اَلْمَدِينَةِ، فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: "اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ اَلْقُبُورِ، يَغْفِرُ اَللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالْأَثَرِ"} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَقَالَ: حَسَن.

{ضعيف، سنن الترمذی: ١٠٥٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆڕستانەکەی مەدینەوە تێ پەڕی، ڕووی تێ کردنو فەرمووی:

{اَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ اَلْقُبُورِ، يَغْفِرُ اَللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالْأَثَرِ}.

واتە: درووود لەئێوە ئەی دانیشتوانی ئەم گۆڕستانە! خودا لەئێمەیشو لەئێوەیش خۆش بێ، ئێوە پێشینەو پێشڕەوی ئێمەنو، بەشوێن ئێوەدا ئێمەیش دێین!). {ترمذی سند حسن} + {تاج/١، زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٥}.

٦١٩- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری = مختصر صحيح البخاری = تجریدی بوخاری بەکوردی/٢، ژمارە: ٦٦٥ = ١٣٩٣، ٦٥١٦ بوخاری}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جمێن بەمردووەکان مەدەن، چونکە ئەوان ڕووبەڕوو

بوونەتەوە لەگەڵ کردەوەی لەوەپێشی خۆیان، کە لەجیهانا کردوویانە، چ چاك، چ خراپ، وەبەپێی ئەو کردەوە پێشینەی خۆیان پاداشی خۆیان وەردەگرن کەواتە جنێوەکەی ئێوە کاریَ بێهودەیە). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٧، ژمارە: ١٠٨٢ چاپی چوارەم = ج/٤}.

٦٢٠- وَرَوَى اَلتِّرْمِذِيُّ عَنِ اَلْمُغِيرَةِ نَحْوَهُ، لَكِنْ قَالَ: {فَتُؤْذُوا الْأَحْيَاءَ}.

{صحيح الجامع: ٧٣١٢. الصحيح المسند ١١٣٤. الترمذى رقم: ١٩٨٢}:

تەرمەزی (رەحمەتی خودای لێ بیَ) دەگێڕێتەوە لەموغیرەی کوڕی شوعەیبەوە، دەفەرمویَ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیَ) دەفەرمویَ: (جنێو بەمردوو مەدەن، چونکە شتی وا کاری بێهودەیە، نەزیانی بۆ مردووەکە هەیەو نەقازانجو سوودی بۆ کەسیَ هەیە، بەلاَم ئازاری کەسوکاری مردووەکە دەدا، شتی وایش کاری نابەجایە).

## (ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ)

ئەم نامەی تەرمە (٦٢٠ – ٥٥٤ = ٦٦) شەستو شەش فەرموودەی واتیادا، لە ژمارە: (٥٥٥)ەوە هەتا ژمارە: (٦٢٠). بەپشتی خودای گەورە بڕیارەکانی بابەتی تەرم، لەبەر ڕووناکی ئەم فەرموودانەی ئەم باسەو، بەپێی بەهرە وەرگرتن لە (کتاب الجنائز)ی مەجمووعی ئیمامی نەوەوی لەم جێگەیەدا وإعانة الطالبين والموسوعة الفقهية الكويتية، دەنووسین، چونکە بەڕاستی ئەمە فیقهێکی عەمەلییە، ڕۆژانە مەردوم بەهرەی لێ وەردەگرن.

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## باسی مردنو تەرمو مردوو

١- یادی مردوو بەزۆری سوننەتە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (اذكروا هَادِمِ اللَّذّاتِ) یادی مردن بکەنەوە، کەهەموو خۆشیەك تێکدەشکێنێ!)

چونکە یادی مردن دل نەرم دەکاتو چاو رۆشن دەکاتەوە، وا لەمرۆڤ دەکا، کەپشت بەخۆشیو غەررایی دونیا نەبەستێ، بەڵکوو وادانێ جیهان کێڵگەی دوا رۆژە، هەتا ژیانی جیهان بکا بەپردو پەیژەیێ بەرەو بەهەشتی بەرین بیبات.

٢- مەرگ بەئاوات خواستن کارێ هەڵەیەو نابەجایە، ئەگەر مرۆڤ هەر ناچار بوو، زۆری بۆ هات، لەبەر پیری، یالەبەر ستەمی رۆژگارو مەترسی لەسەرناموس‌و دین، با لەکاتی وادا، لەخودای داناو تواناو میهرەبان داوا بکا کە لەژیانو مردن، لەمانو نەمان، کامیان باشترە بۆی ئەوەیانی بۆ هەڵبژێرێ.

٣- لەکاتی سەرەمەرگا، ئەم شتانە نیشانەی مردنە لەسەر ئیمان، خوا بەنسیبمانی بکا:

١- لەکاتی رۆح دەرچوونا، ئارەقو جواناوی ناوچاوانی مرۆی موسوڵمان، بەڵگەو نیشانەی مردنە لەسەر ئیمانو باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەر.

٢- گوتنی شایەتومانو کەسێ ئاخر قسەی وشەی {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه بێ}.

٣- خەڵك لێی رازی بنو شایەتی باشی بۆ بدەن.

٤- وا باشو سوننەتە، کەوشەی پیرۆزی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) لەکاتی گیانەڵادا، کەمردووەکە هێشتا هۆشی بەخۆی ماوە، یادی نەخۆشەکە بخرێتەوەو چەند جارێ لەلایا، بەحەکیمانە، بەینە بەینەو ناوبەناو لەلایا، بەدەنگێکی لەبار، بگوترێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) بەڵکوو ئەویش بیڵێ، بەئومێدی ئەوە کەدواقسەی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) بێت.

٥- سوننەتە بۆ نەخۆشی کەشەنگ، کەئومێدی بەژیانی دونیا تەواو کزو لاواز بوو، گەردن ئازادی لەگەڵ کەسوکارو خزمو دۆستو برادەرو دەرودراوسێ دا بکاتو وەسێتی شەرعی بکا، تەنانەت حەزی لەچی گۆڕستانێکە دیاری بکا، کێ بیشوات، کێ نوێژی لەسەر بکات، ناوی بڵێ.

٦- خوێندنی سوورەتی (یاسین) سوننەتێکی گەورەیە، کەبخوێندرێ لەلای نەخۆش، بەتایبەتی لەسەرەمەرگا، ئەگەر چەند جارێکیش دووبارە بکرێتەوە قەیناکا، خۆزگە لەنەخۆشخانەکان حافظ قورئانێکیان دائەنا، بەس بۆ خوێندنی یاسین بەسەر نەخۆشا.

٧- ئەمەیش کۆمەڵێ بڕیاری دامەزراوی ئەم کاتی نەخۆشینی سەرەمەرگەیە، کەوا لەڕێگەی هەمووماناا:

١- سەردانی نەخۆش بەشێوەیەکی گشتی سوننەتە، بەتایبەتی لەکاتی سەرەمەرگا، بۆ گەردن ئازادیو شتی تری وا.

٢- نزای باش بۆ نەخۆشەکە، وەك داوای شیفاو ئیمانو رەحمی خودا.

٣- ئوموێدی بەژیان بەهێز بکا، با لەژیانیش نائومێد بووبێت.

٤- ئەگەر ئەکرا نەخۆشەکە لەسەرەمەرگا رووی لەقیبلە بێو لەسەر لای ڕاست بێ.

٥- ئاو بتکێنرێتە دەمی، دەمی بەلۆکەیێ تەڕ بکرێ چونکە ئاو سەرچاوەی ڕەحمەتە.

٦- دەوری چۆڵ نەکرێ، کەسوکاری لەدەوری بنو زۆر بۆی باش بنو تەحەموولی بکەن.

٧- تازەکردنەوەی تەوبەو پەشیمانی.

٨- ئارام گرتن لەژێر ئەمری خوادا.

٩- ئومێدو هیوای بەرەحمەتی خودا گەورەبێو باوەڕی وابێ کەخودا لێی خۆش دەبێ. (حسن الظن بالله عندالموت).

١٠- داوای دوعای خێری لێ بکرێ، چونکه لەحەدیثا دەفەرموێ: دوعای نەخۆش وەك دوعای فریشتە وایە گیرایە.

٨- کەسوکاری مردووەکە، دەبێ لەکاتی مەرگی مردووەکەیانا لەسەرخۆبن‌و ئارام‌و ئۆقرە بگرن‌و نزای باش بکەن‌و نزای شەڕ لەخۆیان‌و لەمردووەکەیان نەکەن، وەك ئەوە بیکەن بەقیژە قیژو براڕۆو باوکەڕۆو شتی وا، بەڵکوو بۆ مردووەکەشیان‌و بۆ خۆشیان نزای باش بکەن‌و ناسوپاسی‌و ناشوکوری نەکەن‌و خواحافیزی لێ بکەن، وەك ئەوە بڵێن: باوەگیان! خواحافیزت بێ لەمەینەتی دونیا رزگارت بوو، یا دایەگیان خۆزگەم بەخۆت بە موسوڵمانی ژیایت، بە موسوڵمانی مردیت، خوایار بێ بە موسوڵمانی دەچیتەوە دیوانی خودا، جێگەت بەهەشتی بەرینە، بەپشتی خوا.

٩- کاتێ مردووەکە بەتەواوی گیانی دەرچوو، سوننەتە ئەمانەی بۆ بکرێ.

١- بەهێواشی، کەسێکی دڵسۆزی، چاوەکانی لەیەك بنێ، دەمی بنوقێنێ.

٢- ئەندامەکانی لەجومگەکانیدا نەرم بکرێن، لەتەنیشت لەشی مردووەکەوە درێژبکرێن‌و ڕێك بخرێن‌و هەر دووقاچی بنرێن بەیەکەوە، نەبادا رەق‌و زەق ببن.

٣- بەهێمنی بەهێواشی جلەکانی لەبەری دابکەندرێ‌و، هەوڵ بدرێ جلەکانی نەدڕێندرێن.

٤- بە چەرچەفێ، یان بە پۆپەشمێنێ، یان بەشتێ تر، تەرمەکەی داپۆشرێ، هەتا کاتی شۆردن‌و کفن کردن.

٥- دەستوبرد لەبەرێ کردن‌و ناشتنی بکرێ‌و ببرێ بۆ گۆڕستان، بۆشاری خامۆشان، لەوێ تاقە ئاودەمی کاروکردەوەکانی خۆیەتی.

١٠- دروستە مردوو ماچ بکرێ، وەبۆنی خۆشی پێوە بکرێ، بەتایبەتی بۆنی خۆش بکری بەکفنەکەیەوە.

١١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گیانی مردوو بەندو گیرۆدەی دەستی ئەو قەرزەیە، کەوا لەسەری).

کەواتە: تا زوو قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە ئەوە باشترە، پێغەمبەر نوێژی مردووی لەسەر مردووی قەرزار نەدەکرد، ئەگەر خاوەن قەرزەکە لەبەر رەزای خودا، بەدڵ، گەردنی مردووەکە لە قەرزەکە ئازاد بکا، گەورەترین خێرو چاکەیە.

١٢- ئەگەر کەسێ مرد، خێرێ گەورەیە، کەخزمو کەسوکارو دۆستو برادەرو دەرودراوسێو ناسیاوەکانی، لەبەر رەزای خودا، گەردنی ئازاد بکەن، مەگەر لەکاتێکا، کە قەرزێکی زۆر، یاکێشەیێ لەنێواندا هەبێ، لەکاتی وایشدا، مرۆڤ دەتوانێ بڵێ: لەهەموو شتێ گەردنی ئازاد بێ، لەو قەرزەم نەبێ کەوا لەسەری، یا ژنەکەی بڵێ: لەهەموو شتێ گەردنی ئازاد بێ، بەلاّم لەمارەییەکەم گەردنی ئازاد نەبێ، کەمافێکی ماڵی خۆیەتی لە کەلەپوورەکەی.

١٣- ئەوانەی لەکاتی حەجو عەمرەدا، یا لەکاتی عەمرەدا، بە بەرگی ئیحرامەوە دەمرن، لەرۆژی ژینەوەدا، بە بەرگی ئیحرامەوە، بەدەم لەبێەیکە کردنەوە زیندوو دەبنەوە، خەڵك خۆزگەیان پێ دەخوازن، کەخودای گەورە، ئەو شانازییە گەورەیەی بەنسیب کردوون، ئەم جۆرە کەسانە، ئەوە بۆ مردووی ئاسایی دەکری بۆ ئەوانیش دەکرێ، دەشۆرێن، کفن دەکرێن، نوێژیان لەسەر دەکرێ، دەنێژرێن، بەلاّم تەنها بەکفنەکەیان سەریان داناپۆشرێ، ئیتر لەهەموو شتێکی تردا وەك مردووی ئاسایی وان.

١٤- سوننەتەو خێرێکی گەورەیە، ئەوانەی کەیاساو رێساو دەستوورەکانی مردوو بەرێ کردنو مردوو شۆردنو کفن کردنو تەرم ناشتنو گۆڕ هەڵکەندن دەزانن، چی لەرەگەزی نێر بێ، چی لەرەگەزی مێ بێ، بەرەبەرە خەڵکی تریش فێر بکەن، چونکە بڕیاری پەیوەندی بەمرۆڤەوە دوو

بەشــن، بەشــێکیان پەیوەنــدی بەژیانیەوەیــەتی، بەشــێکیان پەیوەنــدی بەمردنیەوەیەتی، کە ئەم بڕیارو ئەحکامانەن، کەوان لێرەدا.

١٥- شۆردنی مردوو فەرزە، مەرجە مردوو شۆرەکە موسوڵمان بێ، دەبێ بەئاوی رووتی پاك بێ، واباشە بەئاوی ساردی ئاسایی بێ، ئەگەر لەبەر پێویستی بەئاوی شلەتێن بشۆرێ کارێ نایابو پەسەندە، لەکاتی شۆردنی شەرمگادا، دەستی بەپەڕۆیێ بپێچێ، یاکیسەیێ، یادەستکێشێ لەدەست بکا، دەبێ پەڕۆکە یادەستکێشەکە پاك بێ، وا باشە چەند کەسێ یاریدەی مردووشۆرەکە بدەنو بەردەستی بکەن، مەگەر لەبەر پێویستی، دەنا دەبی چاوی خۆیان لەتەماشای لەشی مردووەکە بگرنو هەوڵ بدەن لەپاش تەواوبوونی غوسڵەکەی دەسنوێژێکی تەواوی بۆ بگرنو ئیتر ئەو دەسنوێژەی نەشکێندرێ.

١٦- سوننەتە جارەکانی شۆردنی تەرم تاك بێ، وەك سێ، یا پێنج، یا حەوت، وە لەسێ جاریش کەمتر نەبێ، سوننەتە دواجاریان بۆنی خۆشی لەگەڵدا بێ، وەك مۆرد، وە لەکاتی شۆردندا، توند هێز بخرێتە سەرسکی، تاسکی چۆڵ بێو لەپاش غوسڵەکە شتی لێ دەرنەچێ، تاکێشەیێ دروست نەبێ.

١٧- پێویستە شۆردنی مردوو، یا لەناو هۆدەی تایبەتیدا بێ، یاپەردەی بۆ بگیرێتەوە، سوننەتە زیادەڕەوی لەسەرفی ئاو نەکرێ، هەروا لەکفندا.

١٨- لەپێشا دەسنوێژێکی تەواوی بۆ بگیرێ، ئەوجا دەست بکا بەشۆردنی مردووەکە، سوننەتە شۆردنی مردووەکە، بە ئەندامەکانی دەسنوێژی لای ڕاست دەست پێ بکا، لەسەریو لەدەموچاوییەوە دەست بەشۆردنی تەرمەکە بکا، وەهەوڵ بدا چڵكو شتی وای لێ بکاتەوە، وە پاك پاك بیشۆرێ، تەنانەت ژێر نینۆکەکانی پاك بکاتەوەو ئاوی پیا بکا، ئەگەر نینۆکی درێژ بوو. سوننەتە شۆردنی مردوو بەخۆڕایی بێو بۆ ڕەزای خودا بێ، بەڵام ئەگەر

مردووشۆرەکە کرێیش وەربگرێ دەبێ، یاخاوەنی مردووەکە بەخششێکی پێ بدا دروستەو ناباشی تیادا نییە، بگرە شتی وا دەبی بەهۆی ئەوە گەردنی مردووەکە لەمنەت رزگار ببێ.

١٩- حەرامە ناوی مردوو بەخراپە ببرێ، یاباسی خراپەی بکرێ، وەك کەسێ بڵێ: لەوەلاتر بڕوات ئارەقخۆر بوو، یاشەلاتیو سەرسەری بوو، یانوێژکەر نەبوو، شتی وا نادروستە، شتی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی ناوە یارمەتیو کۆمەکی شەیتان، کە دەفەرموێ: (لاتعینوا الشیطان علیه).

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەق فەرمانمان پێ دەکا: (خراپەی مردووی خۆمان بەهیچ شێوەیێ باس نەکەین، بەلام باسی چاکەیان بکەین).

٢٠- دەبێ پیاو پیاو بیشوات‌و ژن ژن بیشوات، بەلام دروستە ژن‌و مێرد تەرمی یەکتری بشۆرن‌و یەکتری کفن بکەن‌و سەردانی گۆڕی یەکتری بکەن‌و خێرو حەسەنات بۆ یەکتری بکەن‌و نوێژ لەسەر تەرمی یەکتری بکەن.

٢١- لەمەزهەبی ئێمەدا، کە مەزهەبی ئیمامی شافیعییە، دروستە: کەژن، یا پیاو، تەرمی منداڵ، نێربێ، یا مێ، بشۆرێ، بەمەرجێ منداڵە مردووەکە، نەگەیشتبێتە ئەو تەمەنە کە تەماعی تێ بکرێ‌و ئارەزووی نێرو مێیی ببزوێنێ.

٢٢- قژە سەری ژنی مردوو شانە دەکریو پاك پاك دەشۆرێ‌و ئەگەر پێویست بوو بکرێ بەپەلکەو بەپشتی سەریدا شۆڕ بکرێتەوە.

٢٣- منالی لەبار چوو، دەشۆرێ‌و کفن دەکرێ‌و لەگۆڕستان دەنێژرێ، ئەگەر دەنگی لێوە هات، یاجووڵەیەکی وای کرد کەنیشانەی ژیان بوو، ئەوا نوێژیشی لەسەر دەکرێ.

٢٤- ئەگەر پارچەیێ لەمردوو جیابۆوە، وەك دەستی، یاقاچی، یاسەری، یا دۆزرایەوە، ئەوە دەشۆرێو کفن دەکرێ، واتە: دەپێچرێو لەپارچەیەکەوەو نوێژی لەسەر دەکرێو لەگۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێ. لەمەجمووعی پێشەوا نەوەویدا، دەفەرموێ:

لەشەڕی (الجمل)دا، دەستێ لەچنگی باڵندەیێ لەسەر شاری مەککە کەوتە خوارەوە، بەئەنگوستیلەکەیدا ناسییانەوە، کە دەستی عەبدولڕەحمانی کوڕی عتابی کوڕی ئوسەید بوو، شۆردیانو کفنیان کردو نوێژیان لەسەری کرد، سەری ئیمامی حوسەینیش عەرەبەکان بڕیانو شار بەشار دەیانگێڕا، بردیانە شام، دەڵێن: ئێستا لەمیصرە.

٢٥- جۆری شەهید زۆرن، دەگەنە چل جۆر، تەنیا شەهیدی جەنگی بێباوەڕان ناشۆرێو نوێژی لەسەر ناکرێو بەجلە خوێناویەکانیەوە دەنێژرێ.

ئیمامی عومەر کەشەهید کرا، لەمیحرابی مزگەوتەکەی پێغەمبەردا لەمەدینە، لەجەنگا نەکوژرا، بەڵکوو کابرایەکی ئێرانی مەجووسی بەنامەردی شەهیدی کرد، لەبەر ئەوە هەم شۆراو هەم کفن کراو هەم نوێژی لەسەر کرا، هەروا ئیمامی عەلیو ئیمامی عوسمانیش، شۆرانو کفن کرانو نوێژیان لەسەر کرا، گەرچی بەکوشتن کوژراون.

٢٦- مەرجە مردووشۆرەکە موسوڵمان بێ، عاقڵ بێ، شێت نەبێ، واباشو نایابە کە جێگەی متمانە بێو سرقایمو زمان پاك بێو، دەم شڕو حەیابەرە نەبێ، بەڵکوو ئەمیندارو سرپۆش بێ.

٢٧- ئەگەر ژن مێردی خۆی شۆرد، یا پیاو ژنی خۆی شۆرد، دەبێ کیسەیان لەدەستدا بێ، هەتا دەسنوێژی مردووەکە نەشکێ.

٢٨- کەسێ کەسێ بکوژێ، نابێ بیشوات، نابێ نوێژی لەسەر بکات، یان بەشداری لەناشتنیدا بکات، دیارە کە کەلەپووریشی لێ وەرناگرێ.

٢٩- نيّت بۆ شۆردنی مردوو، بۆ نوێژ كردن لەسەری مەرجە، لەسەرەتای دەستپێكردن بەشۆردنی مردووەكەوە پێویستە نیّت بهێنێ، ئەوەندە بەسە، لەكاتی ئاوپیاكردنی پاكدا، بڵێ: نیّتمە ئەم مردووە دەشۆرم.

٣٠- لەهەندێ حاڵەتدا وەك سووتاندنی زۆر، یان پلیشانەوە لەژێرتایەی ئوتومبیلدا، مردوو ناشۆرێ، بەڵكوو تەیەمومی بۆ دەكرێ، بەڵام ئافرەت لەزەیستانیدا مردبێ، یا لەبێنوێژیدا، دەشۆرێ.

٣١- پێویست بەكردنی نینۆكی مردوو ناكات، هەروا پێویست بەلابردنی مووی زیادەی هەندێ شوێنی لەشی ناكات، وەك تاشینی مووی بەری‌و لابردنی مووی بنباخەڵی‌و قرتاندنی مووی بەرسمێڵی، بەڵام كردنیشیان حەرام نییەو دروستە.

٣٢- ئەو شتانەی كە لە مردووەكە دەكرێتەوە، وەك موویێ بەدەم شانەكردنی قژیەوە هەڵكەنرابێ، یانینۆكێ، باشتر ئەوەیە بكرێنە ناو كفنەكەی‌و لەگەڵیدا بنێژرێن، یا لەشوێنێكا بشارێنەوە، ئەگەر منالێ، یا پیاوێ خەتەنە نەكرابوو، صەحیحی گوتەكان ئەوەیە كە خەتەنە ناكرێ.

٣٣- سوننەتە بۆ كەسێ مردوو بشوات، خۆشی لەپاشا غوسڵێكی تەواو بكات‌و پاك پاك خۆی بشۆرێ.

٣٤- مرۆی لەشپیس، یان ژنی بێنوێژ، كە لە سووری مانگانەدا بێ دروستە مردوو بشۆرن، یان بەشداری لەشۆردنیدا بكەن، وەشتی وا ناباشی نییەو قەیدی نییە، بەڵام سوننەتە مردوو شۆرو یاریدەدەرەكانی لەشیان پاك بێ‌و دەسنوێژیان هەبێ.

٣٥- كاتێ شۆردنی مردووەكە تەواو بوو، بەخاولییەك یان بەشتی تری وا، جەستەی وشك بكرێتەوە، هەتا كفنەكە نەژاكێ‌و یەكسەر كفن بكرێ.

٣٦- موسوڵمان كەمرد، بازۆر تاوانباریش بووبێ، وەك ئەوە عەرەقخۆر بووبێ، یا داوێنپیس بووبێ، یا خۆی كوشتبێ، یا لەژێر داری حەددا مردبێ،

یابکوژبێ و کوژرابێتەوە لەتۆڵەدا، یا هەرتاوانێکی گەورەی تری ئەنجام دابێ، مادام ئەهلی قیبلە بووەو بە موسوڵمان دانراوەو جاڕی زەندیقی خۆیی نەداوە، موسوڵمانی لەم جۆرە، وەك موسوڵمانی باش، ئەمانەی دواوەی بۆ دەکرێ:

١- دەشۆرێ.

٢- کفن دەکرێ.

٣- نوێژی لەسەر دەکرێ.

٤- لە گۆڕستانی موسوڵمانان دەنێژرێ.

٥- پرسەو سەرەخۆشی لەکەسوکاری دەکرێ.

٦- ژنەکەی ماتەم و پرسەی بۆ دائەنێ، ئەگەر سکی نەبوو چوار مانگ و دە شەو ماتەمی بۆ دەگرێ، ئەگەر ژنەکەی سکی هەبوو: کام لەدانانی سکەکەی و لەماوەی چوار مانگ و دە شەوەکە، زیاتر بوو لەوی تریان ئەوەندە ماتەمی بۆ دەگرێ.

٧- خێرو ئیسقات و حەسەناتی تری بۆ دەکرێ، حەج و عەمرەو قوربانی بۆ دەکرێ، دوعاو نزای باشی بۆ دەکرێ، باسی چاکەی دەکرێ، گوێ لەخراپەی کەڕ دەکرێ. بەڵکوو کەسوکاری دەتوانن ڕۆژووی بۆ بگێڕنەوە، نوێژی بۆ قەزا بکەنەوە، سەردانی گۆڕی بکەن، وەك مەولەوی دەفەرموێ:

ڕاستە ئەعمالی قەبیحی زۆر کرد

بەڵام چووزانی، ئیمانی نەبرد؟

٨- دروست نییە جمێنیان پێ بدرێ.

٩- دەبێ باسی چاکەیان بکرێ و باسی خراپەیان نەکرێ، مەگەر بەپێی یاسانامەی خودا، وەك کاتی شایەتی و شتی تری لەم بابەتە.

دیاره كه ئەم جۆره سوننەتانە كە لەم بڕگەیەدا باسمان كرد لەخاڵی (١)وه هەتا خاڵی (٩) بۆ مردووی باشی بێ تاوان باشترو شایانترن کەبۆیان بکرێن.

٣٧- سوننەته بەشێوەی گشتی، مردوو باش بێ، یا خراپ، ڕێزی بگیرێ، هەروا ڕێزی کەسوکاری بگیرێو بەهیچ جۆرێ نابێ هەستی زیندوو بەهۆی نەنگو خراپی مردووەکەیانەوه بڕووشێنرێو، باس نەکرێ بۆ کەس، وەنابێ لەم لایەنەوه هەستی کەسوکاری زامار بکرێ، یان ئابڕوویان بڕووکێنرێ.

٣٨- کفن کردن فەرزی کیفایەیە، لەماڵی مردووەکە دەکرێ ئەگەر ماڵی هەبوو، بەڵام ئەگەر کەسێ تریش بیکا دەبێ، با ماڵیشی هەبێ، سوننەته کفن بۆنی خۆشی پێوه بکرێو پاك بێ، سوننەته کفنێکی تێروتەسەل بێ، سوننەته ڕەنگی کفن سپی بێ، گەرچی ڕەنگی تریش دەبێو دروستە، کفنەکە لەسێ پارچە کەمتر نەبێ، زیادەڕەوی لەکفندا ناباشە، چونکە بەزوویی دەبێ بەخۆڵ.

٣٩- شەهیدی شەڕی کافران کفن ناکرێ، هەر بەجلەخوێناوییەکەی خۆیەوه دەنێژرێو پرسەی بۆ دائەنرێو ژنەکەی ماتەمی بۆ دەگرێ، سەردانی گۆڕی دەکرێ، نزای باشی بۆ دەکرێ، خێری بۆ دەکرێ، دروستە حەجو عەمرەو قوربانیو خەتمەی قورئانی بۆ بکرێ، وەك مردووی تری ئاسایی، چونکە ئەمانە هەمووی کە بۆ مردوو دەکرێ لەرەحمەتی خودان، کەسیش بێ نیاز نییە لەرەحمەتی خودا.

٤٠- مرۆڤ کفنی ئامادە دابنێ بۆخۆی دەبێ، بەڵام وا باشە دای نەنێ، مەگەر کفنەکەی مووفەڕك بێ، یا جۆره پیرۆزییەکی هەبێ، فەرزە کە کفنەکەی حەڵاڵ بێ، نابێ ئاورێشم بێ، زۆر کاری باشە مرۆڤ چەند کفنێ بکڕێو لەمزگەوت، یا لەماڵەوەی دایان بنێ، ئەگەر کەسێ مرد بەکاری بهێنێ.

واباشە کفنەکە پاك‌و پوخت بێ، بێ شوبهەبێ، قەوی بێ تەنکی وانەبێ، کە جەستەی مردووەکە لەژێریەوە دیاربێ.

٤١- لەکاتی ناچاریدا دروستە چەند مردوویەك لەیەك کفندا، کفن بکرێن.

٤٢- راگەیاندنی پەیامی مەرگی کەسێ، لەشەرعا ئەم دوو بڕیارەی لەبارەوە هەیە:

١/ دروست نییە، لەسەر شێوازی باوی ناپەسەندی سەردەمی نەزانی، پێشهاتنی ئیسلام، جاڕی مەرگی مردوو بدرێ، کە ئەوان مەبەستیان لەم جۆرە جاڕدانە، شانازی‌و تۆڵە سەندن‌و شیوەن گێڕان‌و شتی تری وابووە، وەك پیاهەڵدان‌و لاواندنەوەو باسی ئازایەتی‌و شتی تری لەم بابەتانە.

٢/ دروستە کە پەیامی مەرگی موسوڵمان، بە پەیوەندیداران رابگەیەنرێ، بەهۆی هۆکارەکانی راگەیاندنەوە، بەنیازی ئەوەی کە ئامادەی رێ‌و رەسمی بەڕێکردنی تەرمەکەبن‌و بەشداری لەنوێژو ناشتندا بکەن‌و، لەکاتی قەومانی ئەو کارەساتە دڵتەزێنەدا، ببن بەهۆو مایەی ئارامی‌و کار ئاسانی‌و بارسووکی‌و سەبووری کەسوکارەکەی، هەتا دەوریان ئاوەدان بێ‌و دەوریان چۆڵ نەبێ‌و هەست بەبێ کەسی‌و تەنیایی‌و غەریبی نەکەن.

پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیامی مەرگی نەجاشی پاشای حەبەشەی راگەیاندو هاوەڵانی خۆی برد بۆ نوێژگاکەو لەوێ نوێژی نادیاری لەسەر نەجاشی کرد، کەناوی ئەسحەمە بوو، کە ئەم جۆرە نوێژە لەسەر تەرمەکە ناکرێ، بەڵکوو لەنادیار دەکرێ، پێی دەگوترێ (صَلاة الغائب).

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیامی مەرگی‌زەیدی کوڕی حاریثەو جەعفەرو عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی راگەیاند، کە لەغەزای مۆتەدا شەهید بوو بوون. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٤٦٤٠ + ٤٦٤١}.

٤٣- بڕیارەکانی نوێژی مردوو:

١- نوێـژی مـردوو فـەرزی کیفایەیـە، یـەك کـەس بیکـا لـەکۆڵ هـەموو دەکەوێ، ئەگـەر کـەس نـەیکا هـەموویان تاوانبـارن، هـەموو فـەرزی کیفایەیـە ئاوایە.

٢- بەیەك کەسیش دێتەجێ، بەڵام سوننەتە بە جەماعەت بکرێ.

٣- نوێژی مردوو بەتاكو بەجەماعەت دەکرێ.

٤- بـەتاك، یـا بەکۆمـەڵ دروسـتە دووبـارە بکرێتـەوە، وەك هاتووەکـان بەرودوا نوێژی لەسەربکەن، نوێژ لەسـەر تـەرمی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم شێوەیە بووە.

٥- نوێژی تەرم کاتی تایبەتی بۆنییە، لەهەموو کاتێکدا دەکـرێ، بـەڵام واباشە بەقەستی لەکاتی ناباشی نوێژدا نەکرێ.

٦- نوێژی تەرم لەمزگەوت دەکرێ، بەڵکوو واپەسـەندە کـە لەمزگـەوت بکرێ، چونکە لەهەموو روویەکەوە مزگەوت لەبارترەو رێگەو جێگەی هەیەو مـەودای دەسـتنوێژگرتن زۆرتـرەو لەبەرئـەوە خـەڵکێکی زۆرتـر بەشـداری لەنوێژەکەدا دەکەن، هەروەك لەشوێنانی تریش دەکرێ، هەروا لەسەر گـۆڕیش دەکرێ.

٧- واباشە نوێژ خوێنەکان لەچل کەس کەمتر نەبن.

٨- واباشە نوێژ خوێنەکان لەکاتی جەماعەتدا لەسێ ریز کەمتر نـەبن، وە هەموویان بـۆی بپاڕێنـەوەو نـزای باشـی بـۆ بکـەنو تکـای لـەلای خـودا بـۆ بکەن کە لێی خۆش بێ، خوا یاربێ تکاکەیان گیرا دەبێ.

٩- نوێـژی مـردوو بـۆ ژنـیش دروسـتە، سـوننەتە ژنـیش نوێـژ لەسـەر تەرمی مردوو بکا، وەك جەماعەتی ئاسایی ریزی ژنـان دەکەوێتـە دواوە، ئـیتر تەرمەکە هی پیاوبێ، یا هی ژن بێ، هی مـەحرەم بـێ، یـا هـی نامـەحرەم بـێ، جیاوازی نییە، بۆ هەردوو رەگەز سوننەتە نوێژی لەسەر بکەن.

١٠- هەموو مەرجەكانی نوێژی ئاسایی مـەرجن بۆ نوێـژی مـردوویش، وەك پـاكی لـەش‌و پۆشـاك‌و جێگـەو دەسـنوێژو رووكردنـە رووگـەو پۆشـینی شەرمگاو راوەستان، ئەگەر توانای راوەستانی هەبوو.

كۆمـەڵێ لـەزانایان دەفـەرموون: نوێـژی تـەرم بـەبێ دەسـنوێژیش دروستە.

١١- ئەگەر تەرمەكە پیـاو بـوو پـێش نوێـژ لـەلای سـەریەوە رابوەسـتێ، ئەگـەر ژن بـوو لەناوەڕاسـتیا بوەسـتێ، دیـارە كـەدەبێ تەرمەكـە، یـا گۆڕەكـە لەبەردەم نوێژ خوێنەكانەوە بێ، دەوری هەنگاوێ لەمەلاكەوە دووربێ.

١٢- لەكاتی نوێژكردندا تەرمەكە لەبەردەمـدا دائـەنرێ، بـەڵام لـەكاتی نوێژی تەرمی نادیاردا تەرمەكە لەهـەر لایەكـەوە بـێ دەبـێ، مـەرج نییـە كـە تەرمە نادیارەكە هەر لەڕووی قیبلەوە بێ.

١٣- ئەگـەر چـەند تـەرمێ ئامـادە بـوون، دروسـتە بەیـەكجار نوێـژیان لەسەر بكرێ، ئێستا لە مەككەو مەدینە وایـە، هـەموویان لەبـەردەم مەلاكـەوە دائەنرێن‌و لەپاش نوێژە فەرزەكان بەجەماعەوت نوێژیان لەسـەردەكرێ، ژن‌و پیاو نوێژیان لەسەردەكەن، وادەبـێ ژمـارەی نوێژكـەرەكان لەچـوار ملیـۆن تـێ پەڕدەكا.

١٤- چۆنێتیی نوێژی مردوو:

آ- نیـّـت فــەرزە، نوێــژ خــوێن بــەرەو قیبلــە لەپــشتی تەرمەكــەوە رادەوەستێ‌و لـەپاش مەلاكـەوە نیـّت دەهێنـێ‌و ئەڵڵاهوئەكبـەری دووەم دەكـاو لەگەڵ هەموو ئەڵڵاهوئەكبەرێكا، هەردوو دەستی هەتا ئاسـتی سـەر شـانەكانی بەرز دەكاتەوە، ئەگەر سوورەتیش لەپاش فاتیحەوە بخوێنێ قەیدی نییە.

ب- لـەپاش ئەڵڵاهوئەكبـەری دووەم سـەڵاوات لەسـەر پێغەمبـەر بـدا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەوجا ئەڵڵاهوئەكبـەری سـێیەم بكـات، لـەپاش

ئەڵڵاهوئەكبەری سێیەم نزای باش بۆ مردووەكەو موسوڵمانان بكاتو داوای لێخۆشبوونی بۆ بكاو ئەوجا ئەڵڵاهوئەكبەری چوارەم بكا.

ج- لەپاش ئەڵڵاهوئەكبەری چوارەم واجبە بەلای راستا سڵاو بداتەوە، وەبەلای چەپیشا سوننەتە سڵاو بداتەوە.

٤٤- نوێژی تەرمی نادیار (صَلاَةُ الغائب) سوننەتە، وەك ئەوە كەسێ دەبیستێ مەلایەكی گەورە، لەشوێنێ دوور مردووە، یا پاشایەكی دادپەروەر لەوڵاتێ تر مەرگ بووە بەمیوانی، سوننەتە ئەو كەسە، لەلای خۆیەوە نوێژی تەرمی نادیاری لەسەربكا، وەك ئەوە نەجاشی لەوڵاتی حەبەشە مرد، كەوا لەكیشوەری ئەفریقیا، پێغەمبەر لەمەدینە نوێژی نادیاری لەسەركرد، كە مەدینە دەكەوێتە كیشوەری ئاسیاوە، واباشە لەكاتی وادا مامۆستاكان لەمزگەوت لەپاش نوێژە فەرزەكان، نوێژی تەرمی نادیار، لەسەر كەسایەتییە موسوڵمانەكان بكەن، هەروا لەكاتی روودانی كارەساتی وەك بوومەلەرزەو تەقینەوەو لافاوو رووخاندا، كە لەناو كۆمەڵگای موسوڵمان روودەدەنو خەڵكێكی زۆری تیادا بكوژرێ.

٤٥- ئامادەی شۆردنو كفن كردنو نوێژكردنو بەرێكردنو ناشتنی تەرم، سوننەتێكی گەورەیە، زۆرجار لەبەر هۆی تایبەت، ئەم جۆرە شتانە كە دەكرێن بۆ مردوو دەبن بەفەرز.

٤٦- رۆیشتن لەگەڵ تەرما، بەپێی حاڵ، بەپێو بەسواری دەبێ، واباشە پیاو چاكان لەپێش تەرمەكەوە بڕۆن، ئەگەر مەودا هەبوو، هەموو كەسێ بەشداری بكا لەهەڵگرتنی تەرمەكەدا، هەروا لەهەڵكەندنی گۆڕەكەو لەبەخاك سپاردنی تەرمەكەدا، سوننەتە سوار لەدوای تەرمەوە بڕوات، كەسێ لەباتی هەڵكەندنی قەبرەكە كرێ وەربگرێ دەبێ، یا لەسەر كێلەكانی شت بنووسێ بەپارە دروستە، چونكە لەلای شافیعییەكان، گەرچی شتی وا ناباشە بەڵام

حەرام نییە، شتیش کە حەرام نەبێ کردنی دروستە، بەڵکوو شتیوا لای حەنەفییەکان مەکرووهیش نییە.

٤٧- لەکاتی تێپەڕبوونی تەرما، ئەم خاڵانە باش‌و پەسەندن‌و کاری شیرینن:

١- نزای خێری بۆ بکرێ، وەك ئەوە بڵێ: خوا لێی خۆش بێ.

٢- ئەگەر هەڵی دەگرت، مەدحی خێری بکاو شایەتی ئەوەی بۆ بدا، کە مرۆڤێکی خوداناس بوو، زانایایەکی گەورە بوو.

٣- کاتێ چاوی بەتەرمەکە دەکەوی بڵێ: {سُبْحَانَ اللهِ الَّذِي لاَيَمُوتُ} واتە: پاکی‌و پیرۆزی‌و بێ گەردی بۆ ئەو خودایە، کە هەرگیز نامرێ، یا بڵێ: {سُبْحَانَ المَلِكِ القُدُّوسِ}.

٤- لەبەر تەرمەکە هەڵسێ، هەتا تێپەڕ دەبێ.

٤٨- ناشتنی مردوو، وەك شۆردن‌و کفن کردن‌و نوێژ لەسەر کردن، فەرزی کیفایەیە، لەگۆڕستان بنێژرێ باشترە، بەلام لەماڵیشا دروستە تەرم بنێژرێ، چونکە پێغەمبەرو ئەبوبکرو عومەر، لەماڵەکەی عائیشەدا نێژراون، وا باشە مردووو لەباشترین گۆڕستان بنێژرێ، کەپیاوچاکانی زۆر لێ بێ.

٤٩- سوننەتە خزم‌و کەسوکار لەیەك شوێندا بنێژرێن، ئەگەر مەودا هەبوو لەنزیك یەکترییەوە بن باشترە.

٥٠- پێویستە هەموو مردوویێ، لەگۆڕێکی تایبەتیدا بنێژرێ، کەسی تری لەو گۆڕەدا، لەگەڵ نەنێژرێ، بەلام لەکاتی ناچاریدا دروستە دوو کەس، یا زیاتر، لەیەك گۆڕدا بنێژرێن، وەك کاتی شەڕو درم‌و داگەوتنی تاعوون‌و بوومەلەرزەو مەرگەساتی تر.

٥١- گۆڕەکەی دروستە مردوویەکی تری تیادا بنێژرێ؟ بۆئەم پرسە، ئەم دوو وەلامە هەیە:

١ـهـەتا لەشـی مـردووی یەکـەم هـەمووی دەڕزیٚو دەبیٚتـەوە بـەخۆڵ، نەگۆشتو نەئێسکی نامێنیٚ، ئەوکاتە دروستە تەرمیٚ تر لەو گۆڕەدا بنێژرێت.

٢- بەشـیٚ تـر لـەزانایانی مەزهـەبی شـافیعی دەفـەرموون: لـەم دوو حاڵەتەدا دروستە مردووی تازە لەگۆڕی کۆندا بنێژریٚ:

آ- بـا مـردووە کۆنەکـە، بـازیٚ ئێـسكو پروسکیـشی مابـیٚ، دروسـتە مردوویەکی تازە لەو گۆڕەدا بنێژریٚو ئەو ئێسكو پروسکی مردووی یەکەمە، لەگۆشەیەکی گۆڕەکەدا، کۆبکرێتەوەو لەویٚ دابنـریٚو مردوویـەکی تـری تیـادا بنێژریٚ.

ب- لــەکاتی ناچــاریدا، ئەگــەر مــردووی یەکــەم ئێــسکی مــابوو، لەگۆشەیەکی گۆڕەکەدا، دائەنریٚو مردووی دووەمی تیادا دەنێژریٚ.

٥٢ـدروستە لەشەودا مردوو بنێژریٚ، بەڵام لەزۆر رووەوە باشتر ئەوەیە کەمردوو بەرۆژ بنێژریٚ.

٥٣- قوڵی گۆڕ واباشە قامەتیٚ بیٚ، هی ژن تۆزیٚ قوڵتر بیٚ، هـەتا نـاوکی قامەتی مرۆڤیش بیٚ دەبیٚو دروستە.

٥٤- رۆیشتنی ژن لەگەڵ تەرمدا، مەگـەر لەبـەر ناچـاری، دەنـا نابـاشو ناپەسەندە، گەرچی حەرام نییە. تەنانەت دروستە مـردوو بنێـژن، گـەڵیٚ جـار منالیٚ لەبار دەچیٚ، ژنان خۆیان لەناو خۆیانا دەیشۆرنو کفنی دەکەنو نوێژی لەسەر دەکەنو دەینێژن، چونکە پیاوان لەماڵ نینو لەئیشو فەرمانن.

٥٥- کاتیٚ تەرمی مردوو دائەهێڵرێتە نـاو گۆڕەکەیـەوە، واباشـە پیـاوان دایبهێڵنـە نـاوی، تەنانـەت ئەگـەر تـەرمی ژنـیش بـیٚ هەروایـە، دەبـیٚ کەسـیٚ تەرمی ژن دابهێڵێتە ناو گۆڕەکەی کـە مـەحرەمی بیٚ، مەگـەر لەبـەر ناچـاری نامەحرەم دایبهێڵێتە ناو گۆڕەکەی.

سوننەتە لەو کاتەدا بڵێن: {باسْمِ اللّهِ وَبِاللّهِ وَعَلَى مِلّةِ رَسُولِ اللّهِ} .

٥٦- پێویستە کاتێ تەرمەکە لەناو گۆڕەکەیدا دائەنرێ، ئەم چەند خاڵە ڕەچاو بکرێ:

١- رووی بکرێتە رووگە.

٢- لەسەر شانی ڕاست بەرەو رووگە دابنرێ، ئەگەر لەسەر شانی چەپیش بەرەو قیبلە دابنرێ، هەردەبێ، بەڵام پێچەوانەی چاکترەو خلاف الأولی یە. وا باشە پێش ئەوە تەرمەکە دابنرێ لەناو گۆڕەکەدا، تەختی گۆڕەکە پاك بکرێتەوە، نەبادا پارچە بەردێکی تیژی تیادا بێ، ئازاری تەنیشتی تەرمەکە بدا، چونکە ئەوەی ئازاری زیندوو بدا ئازاری مردوویش دەدا.

٣- بەتەختە بەردو شتی وا تەختەپۆش بکرێو کونو درزەکانی بەگیاو قوڕو شتی وا بگیرێو ئەوسا بەخۆڵەکەی خۆی پڕ بکرێتەوەو بەقەد بستێ لەزەوییەکە بەرز بکرێتەوە.

٥- سوننەتە گۆڕەکە، بەشتێ نیشانە بکرێ، هەتا کەسوکاری بیناسنەوەو سەردانی بکەن.

لە (عَوْنُ المعبود)ی شەرحی (سُنَنُ أَبِي دَاوُد)دا دەڵێ: (مردووەکان خۆشیان لەناو خۆیاندا، لەدەوروبەری گۆڕەکانیاندا، دێنیو سەردانی یەکتری دەکەنو کۆڕی دانیشتنی لێ دەبەستن).

٦- نووسینی ناوی مردوو لەسەر گۆڕەکەی، یانووسینی شێعرو ئایەتو حەدیثو شتی تر لەسەر گۆڕ، لەمەزهەبی شافیعیو زۆرینەی زانایاندا، کاری ناشایانو ناشایستەو ناباشە، بەڵام ئەبو حەنیفە، کەسەر مەزهەبە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەم جۆرە شتانە دروستە لەسەر گۆڕ بنووسرێو شتی وا قەیدی نییەو، بەبێ کەراهەتو ناباشی دروستن. وەبۆ ئەمڕۆ ئەمە زۆر باشە، چونکە گۆڕستان وا گەورە بووە، دەڵێی ئۆقیانووسە، ناوی مردووەکەی لەسەر نەنووسرێ، گۆڕەکە ناناسرێتەوە.

٥٧- ئەم تەلْقینەی کەئێستا باوە، لەلای مەزهەبی شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ‌و لەخاك‌و پای ئەم زاتە حەشرو نەشر بکرێین) کارێ پەسەندو دروستە، لەبەر ئەم دوو هۆیە:

١- لەبەر کۆمەڵێ فەرموودە، کەبازێکیان لەم پەڕاوی (بلوغ المرام)ەدا، لەپێشەوە، لەم ژمارانەدا (٦٠٤و ٦٠٥و ٦٠٦) ڕابورد.

٢- ئەم تەلْقینە باوبووە، لەناو خەڵکی شامدا، لەسەردەمی پیاوچاکانی شامەوە، شتی وایپش شایانی ئەوەیە کەچاوی لێ بکرێ‌و بکری بەسەرمەشق.

٥٨- تاقیکردنەوەی ناو گۆڕو پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕ، لەلایەنی دوو فریشتەوە، بەناوی نەکیرو مونکەرەوە، هەقەو ڕاستە، یەکسەر لەپاش ناشتنی تەرمەکە، کە مردووەکە دەوری چۆڵ بوو، ئەو تاقیکردنەوەیە، ئەنجام دەدرێ، دوو فریشتە بەفەرمانی خودا دێن بۆلای لەگۆڕەکەیدا دای دەنیشێنن‌و چەند پرسیارێکی گرنگی لێ دەکەن، وەك ئەوە لێی دەپرسن: کەخودای تۆ کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئایینت چییە...؟ لەگەڵ چەند پرسیارێکی تر، جا وەك لە فەرموودەدا دەفەرموێ: با لەپاش تەواوبوونی ناشتن، ئەم دوو شتە ئەنجام بدرێ:

١- ئەوانەی لەوێن، لەگەڵ مامۆستای مەلادا، بەکوڵی دڵ بۆی بپاڕێنەوە، لەسەر گۆڕەکەی تۆزێ ڕاوەستن‌و داوای لێبووردن‌و لێخۆشبونی لەخودا بۆ بکەن‌و داوای ئەوەی لەخودا بۆ بکەن کە بەئاسانی بتوانێ وەڵامی شایانی پرسیارەکانی نەکیرو مونکەر بداتەوە، دیارە کە ئەم خاڵی یەکەمە، لەتەلْقیندا ڕەنگ دەداتەوە!

٢- لەپاش تەواو بوونی تەلْقینەکەو بڵاوە لێکردنی بەرێکەرانی تەرمەکە، یەك دووکەس لەلای گۆڕەکە بمێننەوە، تا دەوری سەعاتێ، بەزیکرو یادی خوداوە خۆیان خەریك بکەن، هەتا مردووەکە بۆن دەگرێ

بەگۆڕەکەیـــەوەو تـــۆزێ هۆشـــی دێتـــەوەو خـــۆی ئامـــادە دەکـــا بـــۆ وەڵامـــی پرسیارەکانی فریشتەکان.

٥٩- گۆڕەوشار هەقەو ڕاستەو لە فەرموودەی ڕاستو دروستدا، باسی سامو شکۆی گۆڕەوشار کراوە، کەم کەس لێی ڕزگاری دەبێ، واباشە لەپاش ناشتنی تەرمەکە بەتایبەتی نزای ئەوەی بۆ بکرێ: کەخوای گەورە بەسۆزو میهرەبانی خۆی گۆڕەو شاری بۆ سووك بکاو وەڵامی فریشتەکان بە باشیو بە ئاسانی بداتەوە.

٦٠- دێنیو سەردانی گۆڕی مردوو، بۆ پیاو بەکۆی دەنگ سوننەتە، لەلای حەنەفییەکان ژنیش سوننەتە، بەمەرجێ بەهۆی ئەو سەردانەوە مەترسی ئاژاوەی ڕەوشتی نەبێ، بەتایبەتی بۆ کەسوکاری مردووەکە زۆر سوننەتێکی گەورەیە کە سەردانی بکەن، بەپێی شەرعی خودا، وا باشە لەکاتی سەردانەکەدا، دێنیکەر ئەم خاڵانە ڕەچاو بکا، هەتا سەردانەکەی، سوودی بۆ خۆشیو بۆ مردووەکەیش بەپێی شەرع هەبێ:

١- لەشی پاك بێو بەدەستی بە دەسنوێژەوە بچێ بۆ سەردانی گۆڕ، چونکە دەسنوێژ بۆ خوێندنی نزاو پاڕانەوەو دەوری قورئان سوننەتە. بەدەق لە (إعانة الطالبين)دا دەفەرموێ: (سوننەتە کەدێنیکەری گۆڕستان دەسنوێژی هەبێ).

٢- سڵاو لەدانیشتوانی هەموو گۆڕەکان بکا، کاتێ دەگاتە سنووری گۆڕستانەکە. ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەگەیشتنە ناو سنووری گۆڕستان، سوورەتی فاتیحەو سوورەتی (قل هو الله)و سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و سوورەتی (قل أعوذ برب الناس)ی بخوێننو پاداشو خێرەکەیان ببەخشن بەدانیشتوانی ئەو گۆڕستانە پێیان دەگات – إعانة الطالبين/٢، ص١٦١).

ئەوجا کە دەگاتە لای مردووەکەی خۆی سڵاوی لێ بکا، وەخۆی بەهۆی شێوەی سڵاوکردنەکەیەوە بناسێنێ پێی، وەك ئەوە ئەگەر مردووەکە باوکی بوو، دێنیکارەکە بڵێ: سڵاوت لێ بێ ئەی باوکی بەڕێزم، ئەگەر کوڕی بوو، وە ناوی کاوە بوو، دێنیکارەکە بڵێ: سڵاوی خوات لێ بێ ئەی کاوە! ئەی کوڕی شیرینم، ئەگەر برای بوو، وەناوی حاجی موحەممەدی حاجی فارس بوو، بڵێ: سڵاوت لێ بێ، ئەی حاجی موحەممەدی حاجی فارس، ئەی برای خۆشەویستم، ئەگەر مردووەکە هاوسەری بوو، وەناوی حاجی زەکێ بوو، بڵێ: سڵاوت لێ بێ، ئەی حاجی زەکێ ئەی هاوسەری بەڕێزم، سڵاوت لێ بێ ئەی عەلی، ئەی برای جوانە مەرگم، سڵاو لێ بێ، ئەی عائیشە ئەی خوشکی گەورەم، وە بەئاسایی لە گۆڕی مردووەکەی خۆی نزیك ببێتەوە، وەك دانیشتنی دنیایان کەچۆن پێکەوە لەدونیادا دادەنیشتن، بەڵام ئەگەر قورئانی لەسەر خوێند ئەوە باشترەکە دابنیشێ، چونکە قورئانخوێندن جگە لەناو نوێژدا بەدانیشتنەوە باشترە، وەکی تر دێنیکەر خۆی سەرپشکە لەدانیشتنو لەوەستانو بەرابەر رووی مردووەکەی لەناو گۆڕەکەیدا.

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) کە دەچوو بۆ سەردانی گۆڕی پێغەمبەرو هەردوو هاوەڵەکەی، کە دەگەیشتە لایان دەیفەرموو:

١- السَّلَامُ عَلَيْكَ يارسول اللهِ = سڵاو لەتۆ ئەی پیغەمبەری خودا!

٢- السَّلَامُ عَلَيْكَ يا أَبَا بَكْرٍ = سڵاو لەتۆ ئەی ئەبوبکر!

٣- السَّلَامُ عَلَيْكَ يا أَبَتَاهْ = سڵاو لەتۆ ئەی باوکی ئازیزو خۆشەویستم!

٣- ئەوجا نزای باش بۆ مردووەکەی بکاو بۆی بپاڕێتەوەو بەرابەر رووی مردووەکە، لەم کاتەدا، یادانیشێ، یا ڕابوەستێ، وەنزای باش بۆ خۆشی بکا.

٤- ئەوەی کە دەڵێن: کەسێ لەشەوی هەینیدا، یان لەمانگی ڕەمەزاندا بمرێ، لێپرسینەوەی نییە، ئەوە قسەیەکی بێ بەڵگەیە دروست ئەوەیە کەلێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ، کەواتە باکەس بەقسەی وا دەستەخەڕۆ نەبێ.

٥- چەند دەتوانێ قورئان لەسەر گۆڕەکە بخوێنێو لەپاش خوێندنی قورئانەکە، نزای باش بۆ خۆیو بۆ موسوڵمانانو بۆ مردووەکەی خۆیو بۆ هەموو مردووەکانی گۆڕستانەکە بکا، وەك ئەوە بڵێ: «اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لَنَا وَلَهُمْ وَلاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُمْ وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُمْ»: خودایە! لەئێمەیشو لەوانیش خۆشبە، لەپاداشی باشی بەجێهێنانی مافی ئەم مردووانە لەسەرمان، بێ بەشمان مەکەو، لەپاش ئەوان تووشی ئاژاوەو فەرتەنەو ئاشووبمان مەکە).

باشترین شت بۆ نەخوێندەوار زیکرو یادی خوداو خوێندنی سوورەتی فاتیحەو سوورەتی (قل هو الله)یە، ئەگەر چەند جارێکیش دووبارەیان بکاتەوە زۆر باشە.

لەمەجمووعی نەوەویدا دەفەرموێ:

{... وَيُسْتَحَبُّ أَنْ يَقْرَأَ (يعنى زائر القُبُور) مَا تَيَسَّرَ مِنَ القُرْآنِ وَيَدْعُوَ لَهُمْ عَقِبَهَا، نَصَّ عَلَيْهِ الشَّافِعِيُّ وَاتَّفَقَ عَلَيْهِ الأَصْحَابُ}.

واتە: سوننەتە بۆ کەسێ سەردانی گۆڕستان بکا، چەندە بۆی دەکرێ، قورئانیان بۆ بخوێنێو لەپاشا نزای باشیان بۆ بکات، ئەوجا دێنیکار کە لەخوێندنەکەی لێ بوویەوە، پاداشەکەی ببەخشێ پێیان، یا ببەخشێ بەمردووەکەی خۆی، یا بەهەموویان.

٦- ئازاری مردوو دروست نییە، کە ئەمەیش لەم چەند خاڵەدا، لەدواوە، ڕەنگ دەداتەوە:

آ- شێلانو پێ لێنانو دانیشتن لەسەر گۆڕەکەی.

ب- بێڕێزی کردن بەگۆڕەکەی، وەك ئەوە پیسایی پیا بکرێ، یان زبڵو خاشاك لەسەر گۆڕەکەی فڕێ بدرێ، یان میزو پیسایی پیا بکرێ.

ج- شکاندنی ئێسکی مردووەکە، وە زامار کردنو بڕینی جەستەی، بەبێ هۆیەکی ڕەوا، تاوانێکی گەورەیە، هەروا ئەتکردنی، بەبڕینی لووتو گوێو لچو لێو.

د- ئەوەندە هەیە، ئەوەی کە لەم سەردەمەدا هەیەو پێی دەڵێن: (تەشریحی لەشی مردوو = توێکاری جەستەی مردوو) یان پێی دەگوترێ: (نەقڵی ئەندامی مردوو = گواستنەوەی ئەندامی مردوو بۆ زیندوو).

وەك چاندنی گورچیلەو دڵی مردوو، لەجەستەی زیندوویەکا، بۆ هەندێ مەبەستی پزیشکیو کۆمەڵایەتیو بۆ دۆزینەوەی تاوان، زۆر لەزانا گەورەکانی سەردەم، مۆڵەتی شتی وا دەدەن، لەگەڵ بەمەرج گرتنی مەرجی تایبەت، بۆ هەموو کردارێکی نەشتەرگەری لەم بابەتە، چونکە ئەم جۆرە کردارانە پەیوەندیان بە بەرژەوەندی گشتییەوە هەیە، لە یاسانامەی خودایشدا، بەرژەوەندی گشتی پارێزراوە، تەنانەت گەڵێ جار، کرداری توێکارییەکە، بەرژەوەندی مردووەکەیشی واتیادا، وەك ئەوە بوختانی بۆ کراوە، کرداری توێکارییەکە دەری دەخا کە ئەو بوخاتە درۆیە.

هـ- شکاندنی کێلی گۆڕ، کەشەرع مۆڵەتی ئەوەی نەداوە.

٧- شەرم کردن لەمردوو، مرۆڤ کە دەچێ بۆ گۆڕستان، دەبێ بەرگێکی بەڕێزی شەرعی بپۆشێ، وادانێ، کە مردووەکان دەیبینن. حەزرەتی عائیشە، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو، وەکچی ئەبوبکری صەدیق بوو، دەفەرموێ: (کاتێ عومەری کوڕی خەطاب لەگەڵ پێغەمبەرو ئەبوبکردا، لەهۆدەکەی مندا نێژرا، ئیتر بەبێ پۆشینی تەواوی جلەکانم نەچووم بۆ سەردانیان).

بۆیە عائیشە بەرگی تەوواوی پۆشیوە، چونکە عومەر بیانییە، ئەو شەرمەی لەبیانی دەکرێ لەخۆیی ناکرێ.

دیاره مەبەست لەبەرگی شەرعی، هەم بەرگی پیاوەو هەم بەرگی ژنە، حەرامە بۆ پیاو، کە دەچێ بۆ سەردانی گۆڕستان، ساعەتی ئاڵتوونی لەدەستدا بێ، یان بەرگی ئاوریشمی لەبەردا بێ، یان مرۆڤ بە بەرگی بووكو زاواوە بچێ بۆسەر گۆڕی مردووی خۆی!

٦٠- دروست کردنی چەترو هۆدەو مزگەوت، لەسەر گۆڕ دروست نییە، پێویستە لەسەر لایەنی دەسەڵات شتی وا قەبووڵ نەکا، وە ئەگەر شتی وا رووی دا تێکی بدات، شتی وا بۆ خودی مردووەکەیش ناباشە، لەوانەیە ببێ بەهۆی ئازار بۆی، لەشێوەی کفنی حەرامو کفنی ئاوریشم وەهایە.

٦١- هەڵبەستنی گۆڕ بەتەختەو بەردو بەقاڵبی کۆنکرێتی، ئەگەر زیادەڕەوی تیانەکرێ، لەلای کۆمەڵێ لە زانایانی مەزهەبەکان دروستە، بەمەرجێ بۆ ئەم جۆرە مەبەستە بێ، لەبەر ئەوە بی کە هەڵنەدرێتەوەو مردووی تری تیادا نەنێژرێ، چونکە هێشتا کەسوکاری دێن بۆ سەردانی.

٦٢- ئەم جۆرە شتانەی دواوە بۆ گۆڕ سوننەتن:

١- لەپاش ناشتنی تەرمەکەو ڕێکخستنی گۆڕەکە بەتەواوی کەمێ ئاوی لێ بپرژێنرێ، دەبێ ئاوەکە پاكو سارد بێ.

٢- وردە چەوی لەسەر دابنرێ، بەڵام سوتاندنی داری عوودو بخوور لەسەر گۆڕ زۆر ناباشە، چونکە ئاگر نیشانەی دۆزەخە.

٣- دوو کێلی بۆ بکرێ، یەکێ لەسەرینیو یەکی لەپایینیو واباشە بەرد بن.

٤- لەپاش ناشتن، ئەگەر کەمێ گوڵاویش لەگۆڕەکە بدرێ، بۆ ڕێزی فریشتەکان، کارێ دروستە، دەنا نا.

٥- ڕێزگرتنی گۆڕ سوننەتە، سەردانیکاری وادابنێ، کە دەچێ بۆلای، لەکاتی ژیانیدا.

٦- دروسته ڕێحانەو نێرگزو گوڵو گیای بۆنخۆشی تری تەڕ، لەسەر گۆڕ دابنرێ، چونکە هەتا تەڕاییی‌یان تیابێ، یادو زیکری خودا دەکەن‌و بەوە باری مردووەکە سووک دەبێ‌و گۆڕەکەیان پێ مووفەڕک‌و فەڕدار دەبێ.

هەروەک دروستە، بۆ هەمان مەبەست، ڕێحانەو نێرگزو گیاو گوڵ، لەسەر گۆڕ بنێژرێ، یان دارو درەخت‌و نەمام لەپاڵ گۆڕدا بنێژرێن، وەلەکاتی وادا، حەرامە بردنی ئەو گوڵو دارو نەمامانەی کە لەسەر گۆڕ دانراون، یان نێژراون، هەتا وشک دەبن، بەڵام دروستە بەری داری سەر گۆڕ بخورێ، وەک بەری دار توویێ لەگۆڕستان نێژرابێ.

٧- لە (إعانة الطالبين)دا دەفەرموێ:

١- کەسێ بۆ باوک‌و دایکی خراپ بووبێ، لەپاش مەرگیان، نزای زۆریان بۆ بکا، خودا لێی خۆش دەبێ‌و بەڕۆڵەیەکی بەوەفاو بەئەمەکداری دادەنێ بۆیان.

٢- سەردانی گۆڕ واباشە لە ڕۆژی هەینیدا بێ، چونکە هەرکەسێ لەڕۆژی هەینیدا، سەردانی گۆڕی مردوو بکا، مردووەکە ئاگای لێیەتی.

٣- هەموو شەوێ، گیانی مردوو دێ بۆ ئاسمانی یەکەم‌و بەرابەرماڵەکەی خۆی ڕادەوەستێ‌و داوا لەکەسوکاری دەکا، یەکە یەکە، کەیادی خێری بکەن، نزای باشی بۆ بکەن، خێری بۆ بکەن، سکاڵای حاڵی خۆیان دەکەن‌و پێیان دەڵێن: ڕەحمێکمان پێ بکەن، خودا ڕەحمتان پێ بکا، پێش ئەوەی کەئێوەیش بێن بۆلای ئێمە.

٦٣- مردوو باش بێ، یان خراپ بێ، بەمەرجێ لەسەر ئیسلامەتی مردبێ‌و خۆی بە موسوڵمان دانابێ، سوننەتە بەپێی حاڵ ئەمانەی بۆ بکرێ:

١- ئیسقاتی بۆ بکرێ.

٢- قوربانی بۆ بکرێ.

٣- حەج، یان عەمرەی بۆ کرێ.

٤- لەبۆنەکانا، خێرو حەسەناتی بۆ بکرێ.

٥- هەمیشە ناوی بەباشە ببرێ.

٦- بەهیچ جۆرێ، باسی خراپەی نەکرێ، نەڵێن: لەوەلاتر بڕوا، ئارەقخۆر بوو، یاقومارچی بوو، یادز بوو، یانوێژنەکەر بوو، بەڵکوو دەبی وادابنێین، کە ئەو مردووە برامانە، یاخوشکی ئیمانیمانەو تووشی کێشەیەکی گەورە بووە، ئەوەندەی دەتوانین رزگاری بکەین، وەك ئەوە بڵێین: لەخودا بەزیاد بێ لەسەر ئیمان مردووە، یان دراوسێیەکی بێوەی بوو، یان رۆژی هەینی، یامانگی رەمەزانی بەنسیب بوو، یا لەو گۆڕستانە پیرۆزەدا نێژراوە یاسوپاس بۆ خودا، ماڵو منالی باشی هەیە، خێرو چاکەی بۆ دەکەن، رەحمەت لەو داناو زانایەی کە دەفەرموێ:

(من لەباتی ئەوەی لەعنەتێ لەشەیتان بکەن، سلاّواتێ لەدیاری پێغەمبەر دەدەم).

من دڵنیام لەوەی: کە هەیە عەرەقخۆر بووەو لەسەر ئیمان مردووە، ئەوەندە خەڵك لەپاش مەرگی، زەمیان کردووە، لەسەر عەرەقخواردن، ئەو پاك بۆتەوەو غەیبەتکەرەکانی تووش بوون!! وەك لە فەرموودەدا، لەپێناسەی موفلیسی ئۆمەتی پێغەمبەردا، باسی شتی واکراوە. بەمە دەڵێن:

(نوێژکەر کردیو ئارەقخۆر بردی!!)

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحيم

## ٤- نامەی زەکات

## كِتَابُ الزَّكاة

٦٢١- عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) بَعَثَ مُعَاذًا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى اَلْيَمَنِ...} فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ، وَفِيهِ: {أَنَّ اَللَّـهَ قَـدِ اِفْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَـائِهِمْ، فَتُـرَدُّ فِـي فُقَـرَائِهِمْ} مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری = پوختـەی بوخـاری/٢، لاپـەڕە: ٩٢، ط/١، ژمـارە: ٦٦٦ = ١٣٩٥، ١٤٥٨، ١٤٩٦، ٢٤٤٨، ٤٣٤٧، ٧٣٧١، ٧٣٧٢ بوخاری. پوختـەی موسـليم = موختەصـەری صـەحيحی موسـليم/٢، ژمـارە: ٥٠١ = ١٢١ شيحا = مسلم/١٩}:

**ئـەم فەرموودەيـە لەپوختـەی موسـليمو پوختـەی بوخـاریو ريـاض الصالحينو تاجول ئوصولدا ئاوايە:**

**ئيبنو عەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لـەباوكی بێـت) فـەرمووی: كاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) موعـازی كـوڕی جەبـەلی نـارد بـۆ يەمەنو كردی بەسەركارو مامۆستايان، لەسەر ئەم شێوەيە فەرمانی پێ كردو پێی فەرموو:**

**(ئەوا تۆ دەچيت بۆ ناو گـەلێك، كـە ئـەهلی كيتـابنو خـاوەنی نامـەنو، خـاوەن عـيلمو زانـستنو بەشـی خۆيـان هۆشـيارن، لەبـەر ئـەوە بەنەزاكـەت گوفتوگۆيـان لەگەڵـدا بكـە، كاتـێ دەچـيتە ناويـان لەپێـشدا داوايـان لێ بكـە، كەشـايەتی بـدەن: كـە هـەر خـودا خودايـەو خـودای تـر نييـەو، مـن كـە موحەممەدی كوڕی عەبـدوڵلام، پێغەمبـەری خـودام، ئـەوجا ئەگـەر بـۆ ئەمـە بەگوێيان كردی، ئەوا پێشيان بڵێ: كەخودای گەورە – لەهەموو شەوو ڕۆژێكا – پێنـج نوێژی داناوە لەسەريان، جا ئەگەر بۆ ئەمەيش بەگوێيان كردی، ئەوا**

پێیـان بڵـێ: کـەخودای گـەورە زەکـاتی دانـاوە لەسـەریان، کـە لـە داراو دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو دەدرێتەوە بەنەداراو هەژارەکانیان، جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بەگوێیان کردی ئەوا نەکەیت بچیت نایابی سامانو ماڵەکانیان هەڵبـژێریو لـەباتی زەکـات وەری بگـرێ، بـەڵکوو مـاڵی مامناوەنـدی لـەباتی زەکـات وەربگـرە، وەخۆشـت لەناڵـەو نـزای سـتەملێکراوان بپـارێزە، چـونکە ئاهونزوولەی ستەمبار تیرێکی کوشندەیەو، لەگەڵ لەکەوان دەرچوو، بڕستی سـتەمکار دەبـڕێو، هـیچ شـتێ بـەری نـاگرێ، تـاخۆی دەگەیەنێتـە بارەگـای پـەروەردگار!). {ریـاض/١/١٩٥، زنجـیرە: ٣٦، ژمـارە: ٢٠٨ + تـاجول ئوصـول بەکوردی/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١١٧٥ لاپەڕە: ٤ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

بۆ بابەتی زەکات بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١- تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، لاپـەڕە: ٣، زنجیرە: ١ لـە ژمـارە: ١١٧٥وە هەتا زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ١٢٩٤وە هەتا لاپەڕە: ٦٩.

٢- ریـاض الـصالحین/٣، زنجیرە: ٢١٦ لاپـەڕە: ١٤٦ لـە ژمـارە: ١٢٠٦وە هـەتا ژمارە: ١٢١٤.

٣- فیقهـی ئاسـان/١، زنجـیرە: ١١٣ هـەتا زنجـیرە: ١٣٦ لـە لاپـەڕە: ٣١١ هـەتا لاپەڕە: ٣٥٢.

٤- تجریـدی بوخـاری بـەکوردی/٢، لاپـەڕە: ٩٢ لـە زنجـیرە: ٣٠وە هـەتا زنجیرە: ٣٢، لە ژمارە: ٦٦٦وە هەتا ژمارە: ٧٢٧.

٥- پوختەی موسلیم بەکوردی. زنجیرە: ٣٨٩ هەتا زنجیرە: ٥٧٠ لـە ژمـارە: ٥٠١وە هەتا ژمارە: ٥٧٠.

٦٢٢- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا بَكْرٍ اَلـصِّدِّيقَ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) كَتَبَ لَهُ {هَذِهِ فَرِيضَةُ اَلصَّدَقَةِ اَلَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَـى

اَلْمُسْلِمِينَ، وَاَلَّتِي أَمَرَ اَللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ اَلْإِبِلِ فَمَا دُونَهَا اَلْغَنَمُ فِي كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى فَإِنْ لَمْ تَكُنْ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٍ فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلَاثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ اَلْجَمَلِ فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا اَلْجَمَلِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلَّا أَرْبَعٌ مِنَ اَلْإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا.

وَفِي صَدَقَةِ اَلْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةِ شَاةٍ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ فَفِيهَا شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلَاثِمِائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ اَلرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةٍ شَاةً وَاحِدَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ، إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا.

وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ اَلصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، وَلَا يُخْرَجُ فِي اَلصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ، إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اَلْمُصَّدِّقُ، وَفِي اَلرِّقَةِ فى مائتى درهم رُبُعُ اَلْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ مِنَ اَلْإِبِلِ صَدَقَةُ

اَلْجَذَعَةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ اَلْحِقَّةُ، وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنِ اِسْتَيْسَرَتَا لَهُ، أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ اَلْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ اَلْحِقَّةُ، وَعِنْدَهُ اَلْجَذَعَةُ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ اَلْجَذَعَةُ، وَيُعْطِيهِ اَلْمُصَّدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژماره: ٦٩٤ = ١٤٥٣، ١٤٥٤، ١٤٥٥ بوخاری}:

**پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی خۆیدا، کە منی کرد بە سەرکاری سەر زەکاتی وڵاتی بەحرەین و ناردمی بۆ ئەوێ، ئەم زەکاتنامەی نووسی بۆم، کەبەپێی ئەم یاساو دەستووره کەوا لەم زەکاتنامەیەدا، زەکاتیان لێ وەرگرم:**

**بەناوی یەزدانی بەخشندەو میهرەبان**

**ئەمە دەستوورو یاسای زەکاتدانی فەرزە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودای گەورە داینـاوە لەسەر موسوڵمانان، جا هەر موسوڵمانێ لەسەر ئەم شێوە ڕێکوپێکە، داوای زەکاتی شەرعی لێ کرا، ئەوا با بەسەر ڕاستی بیدات، بەڵام هەرکەسێ داوای زیاتری لێ کرا، با زیادەکە نەدات. وشتر لەپێنج سەرەوە هەتا دەگاتە بیست و چوار سەر، زەکاتەکەی بەمەڕ یان بەبزن دەدرێ، مەڕەکە نێر بێ، یان مێ بێ، هەروا بزنەکە نێر بێ یان مێ بێ دەبێ، جا لەهەموو پێنج سەر وشترێ، مەڕی یان بزنێ زەکاتی لێ دەکەوێ، لە دە سەر وشتر دوو بزن، یان دوو مەڕ، یان بزنێك و مەڕێکی زەکات لێ دەکەوێ، یان لەپازدە سەر وشتر سێ بزن، یان سێ مەڕ، یان بزنێك و دوو مەڕ، یان مەڕێك و دوو بزن، زەکاتی لێ دەکەوێ، لەبیست وشتر چوار بزن، یان چوار مەڕ، یان چوار سەر لەمەڕوبزنی لێ دەکەوێ.**

دەبێ مەڕی زەکات تەمەنی ساڵێکی تەواو بێ یازیاتر بێ، بزن دەبێ تەمەنی دوو ساڵ بێ یا زیاتر بێ، نێریش دەبێ، واتە: بەران‌و سابرین دەدرێن بەزەکاتدا، وە لەکەرتی نێوان دوو ژمارەیش هیچ ناکەوێ، کەرتی نێوان دوو ژمارە، وەك شەش‌و حەوت‌و هەشت‌و نۆ، کەوان لەنێوانی پێنج‌و دەدا، یان یازدەو دوازدەو سیازدەو چواردە، لەنێوانی دەو پازدەدا، وەهەروەها کەرتەکانی تری نێوان پازدەو بیست‌و بیست‌و پێنج.

بەڵام وشترەکان کەبوون بە (٢٥) بیست‌و پێنج سەر هەتا دەبن بەسیی‌و پێنج سەر، گوێرەکە وشترێکی مێنگەی یەك ساڵەیان لێ دەکەوێ، ئەگەر کەسێکیش گوێرەکە وشتری مێنگەی یەك ساڵەی نەبوو، بەڵام پارێنە وشترێکی نێرەی دووساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، وە کە بوون بە (٣٦) سیی‌و شەش سەر، هەتا دەبن بەچل‌و پێنج سەر، پارێنە وشترێکی دووساڵەی مێنگەیان زەکات لێ دەکەوێ.

وە کەبوون بە (٤٦) چل‌و شەشە سەر هەتا دەبن بە شەست سەر، نێونە وشترێکی سێ ساڵەی بەرکەڵیان، زەکات لێ دەکەوێ.

وە کەبوون بە (٦١) شەست‌و یەك سەر، هەتا دەبن بە (٧٥) حەفتاو پێنج سەر، وشترێکی مێنگەی چوار ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ.

وە کەبوون بە (٧٦) حەفتاو شەش سەر، هەتا دەبن بەنەوەد سەر(٢) دووپارینە وشتری مێنگەی دوو ساڵانەیان زەکات لێ دەکەوێ.

وە کەبوون بە (٩١) نەوەدو یەك سەر، هەتا دەبن بە (١٢٠) سەدو بیست سەر، دوو نێونە وشتری سێ ساڵەی بەرکەڵیان زەکات لێ دەکەی، بەڵام کاتێ لە (١٢٠) سەدو بیست سەر زیاتر بوون، ئەوا لەهەموو چل سەرێ، پارێنە وشترێکی مێنگەی دوو ساڵەیان زەکات لێ دەکەوێ، وە لەهەموو پەنجا سەرێ، نێونە وشترێکی سێ ساڵەی مێنگەی بەرکەڵیان زەکات لێ دەکەوێ، وە

هەركەسێ تەنیا چوار سەر وشتری هەبوو، ئەوە زەكاتیان لێ ناكەوێ، مەگەر خاوەنەكەیان بەئارەزووی خۆی، خەزبكا زەكاتیان لێ بدا.

زەكاتی مەڕو بزنیش، كە بەدەمی خۆیان بلەوەڕێن‌و بۆ دەرەوە ببرێن‌و بەلەوەڕی كەژو دەشت‌ودەر بژین‌و بەئالیك‌و ئالفی ماڵەوە نەژین، ئاوایە:

كەبوون بەچل سەر، هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر، ئەوا مەڕێ، یابزنێ، زەكاتیان لێ دەكەوێ. وە كە لە سەدو بیست سەر، زۆرتر بوون، هەتا دەبن بەدووسەد سەر، ئەوە دوو مەڕ، یادوو بزن، یان مەڕێك‌و بزنێك، زەكاتیان لێ دەكەوێ، وە كەلە دووسەد سەر، زۆرتر بوون، هەتا دەبن بەسێ سەد سەر، سێ مەڕ، یاسێ بزن، یاسێ مەڕو بزن، زەكاتیان لێ دەكەوێ، وە ئەگەر لە سێ سەد سەر زیاتر بوون، ئەوا لەهەموو سەد سەرێ، مەڕێ، یابزنێ، زەكاتیان لێ دەكەوێ.

بەڵام ئەگەر مەڕو بزنی مرۆڤێ، كەبەدەمی خۆیان لەدەشت‌و دەر دەلەوەڕان، یەك سەر، یاسەرێ زیاتر بوو، لەچل سەر كەمتر بوون، ئەوە زەكاتیان لێ ناكەوێ، مەگەر خاوەنەكانیان خۆی حەزبكا كە زەكاتیان لێ بدا، نەماڵی جیا كۆ دەكرێتەوە، نەماڵی كۆش جیا دەكرێتەوە لەترسی زەكات، وە هاوبەشانیش لەناو خۆیانا، بەرێكوپێكی، كەم‌و زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەكتری، هەركەسێ بەئەندازەی بەشی خۆی لەسەرمایەكەدا، زەكات دەدا. ئاژەڵی پیری ددان لەدەما نەماوو ئاژەڵی زەدەداری نەنگدار، نادرێن بەزەكات، هەروا سابرێن‌و بەرانیش، مەگەر بەئارەزووی زەكاتدەر خۆی. لەزیو چل یەك دەكەوێ، بەڵام هەتا نەگاتە دووسەد درهەم زەكاتی لێ ناكەوێ، كە گەیشتە دووسەد درەم پێنج درەم زەكاتی لێ دەكەوێ، بەڵام ئەگەر كەسێ، سەدو نەوەد درەمی زیوی هەبوو، ئەوا زەكاتی لێ ناكەوێ، مەگەر خاوەنەكەی خۆی ئارەزووی هەبێ. وەهەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە وشترێكی مێی چوار ساڵە، واتە: ژمارەی وشترەكانی لەشەست‌و یەك كەمتر نەبوو، وە لەحەفتاو

پێنجیش زیاتر نەبوو، بەڵام وشتری مێی چوارساڵەی نەبوو، بەڵکوو نێونە وشتری مێچکەی سێ ساڵەی هەبوو، ئەوا وشترێکی مێی سێ ساڵەی لێ وەردەگیرێ، لەگەڵ دوو مەڕ، یان لەگەل دوو بزندا، ئەگەر مەڕو بزنی هەبوو، یان لەگەڵ بیست درەمی زیوی رووتدا.

وەهەرکەسێ زەکاتەکەی دەیکردە نێونە وشترێکی مێچکەی سێ ساڵە، بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵکوو پارێنە وشترێکی مێی چوار ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام زەکات وەرگرەکە، یابیست درەم، یان دووسەر مەڕ، یان دووسەر بزن سەرباقی دەداتەوە! {تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ١١٩٤ + ١١٩٧+ زنجیرە: ٥، ژمارە: ١١٩٨ + زنجیرە: ٦، ژمارە: ١١٩٩} + {تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦٩ + ژمارە: ٦٩٤ بلارقم = ١٤٥٠ بوخاری + ٦٩٤ بلارقم = ١٤٥١ + ژمارە: ٦٩٧ = ١٤٥٤ بوخاری + ژمارە: ٦٩٨ = ١٤٥٥ بوخاری}.

(روونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە، بوخاری (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەچەند پارچەیێ گێڕاویەتەوە، کەدانەری ئەم (بلوغ المرام)ە، هەموویانی لەم شوێنەدا کۆکردۆتەوە، وەك لە هێماو ژمارەکانی پێشەوە دەردەکەوێ.

٢- ئەوەی کە دەفەرموێ: (نە ماڵی جیا کۆدەکرێتەوەو، نەماڵی کۆش جیا دەکرێتەوە لەترسی زەکات).

آ- نموونەی ماڵی جیا لەترسی زەکات کۆبکرێتەوە ئاوایە: (سێ کەس هەرکەسەیان چل سەر مەڕیان هەیە، کە کۆی مەڕەکان دەکاتە سەدو بیست سەر، ئەگەر جیاجیا بن، سێ سەریان لێ دەکەوێ، بەڵام ئەوان بێن هەرسێ ڕانەکە تێکەل بکەن، ئەوسا هەمووی دەکاتە سەدو بیست سەر، یەك سەر زەکاتیان لێ دەکەوێ، بەم فێڵە شەرعانە، دووسەر قازانج دەکەن).

ب- نموونەی ماڵی کۆیش لەترسی زەکات جیا بکرێتەوە، ئاوایە: (دوو کەس یەکی سەدو یەك سەر مەڕیان هەیە، لەبەر ئەوەی مەڕەکان تێکەڵن،

دەكەنە (١٠١ + ١٠١ = ٢٠٢) دووسەدو دوو سەر، دەی لە دووسەدو دووسەر، سێ مەڕ زەكات دەكەوێ، ئەوان دێن جیاجیان دەكەنەوە، هەریەكی (١٠١) سەدو یەك مەڕیان هەیە، كەواتە هەریەكەی مەڕێ زەكاتیان دەكەوێ، بەم فێڵە شەرعانە، بەهەردووكیان مەڕێ قازانج دەكەن).

٦٢٣- وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعَثَهُ إِلَى اَلْيَمَنِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا أَوْ عَدْلَهُ مُعَافِرَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَاللَّفْظُ لِأَحْمَدَ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَأَشَارَ إِلَى اِخْتِلَافٍ فِي وَصْلِهِ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أحمد: ٢٣٠/٥ رقم: ٢٢٣٦٣. أبوداود: ١٥٧٦ ترمذی: ٦٢٣ نسائی فی الكبری: ٢٢٤٢. ابن ماجة: ١٨٠٣، ابن حبان: ٤٨٨٦. حاكم ٣٩٨/١}:

موعازی كوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتێ منی نارد بۆ یەمەنو كردمی بەمیرو فەرمانڕەوای سەر ئەوێ، فەرمانی پێم كرد: كە لەهەموو (٣٠) سیی سەر ڕەشە وڵاخێ، گوێرەكە نێرەیەك یاگوێرەكە مێچكەیەك زەكات وەربگرم، وەلەهەموو چل سەرێ، نێونێك زەكات وەربگرم، وە لە هەموو كەسێكی ناموسوڵمان، كەسەرانە بدا، ساڵی دیناری زێڕی لێ وەربگرم، بەمەرجی ڕەسیدە (بالغ) بووبێ، یان بایی دیناری زێڕ، جلوبەرگی مەعافیری لێ وەربگرم). {تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ١١٩٥ چاپی چوارەم}.

(ڕوونكردنەوە):

١- ئەو گوێرەكەی دەست دەدا بۆ زەكات دەبی ساڵێكی تەواو كردبێو پێی نابێتە ساڵی دووەمی تەمەنی، لەمەدا جیاوازی نییە لەنێوانی گوێرەكەی نێرو گوێرەكەی مێنگەدا.

٢- مەبەست لەنێون، لەم شوێنەدا، نێون مانگایە، كەدوو ساڵی تەواو كردبێو پێی نابێتە ساڵی سێیەمی تەمەنی.

٣- مەعافیری جۆرە شاڵێکی تایبەتی بەنرخ بووە، هۆزێ لەیەمەن ئەو جۆرە شاڵەی دروست کردووە، کەناویان (مەعافیر) بووە، وەشاڵەکە بەناوی ئەو هۆزەوە ناوی دەرکردووە، وەك چۆن لەوڵاتی کوردەواری خۆمان دەڵێن: کڵاشی هەورامی، یان قاڵی کاشانی، یان فاسۆنی لەندنی!

٤- ئەم فەرموودەیە تەرمەزی بەحەسەنی داناوە، وە ئاماژەی بۆ ئەوەیش کردووە، کە ڕاجیایی لەوەدا هەیە: کە ئایا ئەم فەرموودەیە موتتەصیلی مەرفووعە، یامورسەلە، چونکە ئەم فەرموودەیە، بەم دوو شێویە دەیگێڕنەوە.

١- ریوایەتی ئیرسال ئاوایە: ئەعمەش لەئەبو وائیلەوە، لەمەسرووقەوە، مەسرووق دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موعازی نارد بۆ یەمەن.... تاکۆتایی فەرموودەکە. تەرمەزی گێڕانەوەی ئیرسالی بەلاوە سەنگین ترە.

٢- ریوایەتی موتتەصیلی مەرفووع، ئاوایە: ئەعمەش لەئەبو وائیلەوە لە مەسرووقەوە، لەموعازی کوڕی جەبەلەوە، موعاز فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی منی نارد..... تا دوایی فەرموودەکە) بۆیە ئەم گێڕانەوەیە مەرجووحە، لەلای تەرمەزی چونکە مەسرووق کەتابیعییە، موعازی نەبینیوە.

٦٢٤- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { تُؤْخَذُ صَدَقَاتُ اَلْمُسْلِمِينَ عَلَى مِيَاهِهِمْ} رَوَاهُ أَحْمَدُ. {صحيح الجامع: ٢٩٠٤} وَلِأَبِي داود: (لاتُؤْخَذُ صَدَقَاتُهُمْ إِلاَّ فِي دُورِهِمْ).
{صحيح الجامع: ٧٤٨٤. أبوداود: ١٥٩١}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشترین جێگەو شوێن کە موسوڵمانان، زەکاتی ماڵاتو ئاژەڵەکانیان بدەن بەزەکات کۆکەرەوەکانی

دەوڵـەتی ئیـسلام، ئاوخۆرگـەی ئاژەڵەکانیانــەو ئــەو جێگایانەیــە، لەچــەمو رووبارو جۆگەو بیر، کەماڵاتو ئاژەڵ دەبرێن بۆ سەریان بۆ ئـاو خواردنـەوە).

مەبەست لەم فەرموودەیە، لەم گێڕانەوەی ئەبو داوودا، دەردەکەوێ کە ئاوایە:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودا لـەخۆیو لەباوکیو لەباپیری بێ) لە پێغەمبەری خوداوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (ئاژەڵو ماڵات نابرێن بۆلای زەکات کۆکـەرەوە، تابەشـە زەکـاتی لێ جیابکاتەوە، بەڵکوو هەموو کەسێ، زەکاتەکەی لـەماڵی خۆیـا لێ وەردەگـیرێ!).

{تاج/٢، لاپەڕە: ٤٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤٠ ج/٤ - چاپی چوارەم}.

٦٢٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَيْسَ عَلَى اَلْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيّ.

{تجریـدی بوخـاری/٢/١٢٥، ژمـارە: ٧٠٢ = ١٤٦٣، ١٤٦٤، بوخـاری. أبوداود: زكاة: ١٥٩٤، ١٥٩٥. پوختەی موسلیم ژمارە: ٥٠٤ = ٢٢٧٠ شـیحا = مسلم ٩٨٢. ترمذی زكاة: ٦٢٨. نسائی زكاة: ٢٤٦٦. ابـن ماجـة زكـاة: ١٨١٢. تحفة الأشراف: ١٤١٥٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بـێ) دەفـەرموێ: (موسـوڵمان لـەم دوو شـتەیدا، زەکـاتی لەسـەر نییە: لەکۆیلەیداو، لەوڵاخی بەرزەیدا).

واتە: ماینو ئەسپو کۆیلە، ژن بێ، یاپیاو، کە سامانو ماڵی کەسـێ بـن، بەمەرجێ ماڵی بازرگانی نەبن، زەکاتیان لێ ناکەوێ.

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٢٢٧٤)ی موسلیم/شیحادا:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (بێجگـە لەسـەرفیترە، بەنـدە (واتـە: کۆیلـە) زەکاتی تری لێ ناکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٩١ — موسلیم/ئەحمەد}.

٦٢٦- وَعَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {فِي كُلِّ سَائِمَةِ إِبِلٍ: فِي أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، لَا تُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا بِهَا فَلَهُ أَجْرُهُ، وَمَنْ مَنَعَهَا فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ، عَزْمَةً مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لَا يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَعَلَّقَ اَلشَّافِعِيُّ اَلْقَوْلَ بِهِ عَلَى ثُبُوتِهِ.

{حسن، صحيح الجامع: ٤٢٦٥. أحمد رقم: ٢٠٠٣٠. أبوداود رقم: ١٥٧٥. نسائي رقم: ٢٤٤٩. حاكم رقم: ١٤٤٨}:

بەهزی کوڕی حەکیم لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی‌و لەباپیری بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەهەموو چل سەر وشترێ کە بەدەمی خۆیان لە لەوەڕی دەشت‌و دەر بلەوەڕێن، گوێرەکە وشترێکی دوو ساڵەی مێچکەیان، زەکات لێ دەکەوێ، وە وشتر لەبابەتی خۆی جیاناکرێتەوە، وەك لەپێشەوە لە ژمارە: (٦٢٢)دا ڕۆیشت، کە نەماڵی جیا کۆدەکرێتەوەو نەماڵی کۆش جیا دەکرێتەوە لەترسی زەکات، یان مەبەست ئەمەیە کەنابێ پیر بەجیاو گەنج بەجیاو لەڕ بەجیاو قەڵەو بەجیا بژمێرێ، بەڵکوو دەبێ ڕانەکە سەرجەم پێکەوە بژمێرێ‌و زەکاتەکەی لەناونجی ئاژەڵەکان بدرێ. ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا هەرکەسێ بەتەمای پاداشی باشی لای خودای گەورە، زەکاتەکەی بدات، ئەوا بە پاداشی چاکی خۆی دەگا، وە ئەوەی کەبیەوێ کە نەیدا، ئەوا ئێمە، خواه نا خواه، زەکاتەکەی لێ دەستێنین، لەگەڵ زیادەدا، واتە: زەکاتەکەی بەزیادەوە لێ دەستێنین، هەتا تەمێ خوار بێ، زەکات فەرزێکە لەفەرزەکانی خودا، وەخودای گەورەو سەروەر خۆی داینـاوە، ئەوەندە هەیە لەزەکاتدا، بەشی خزمان‌و کەسوکاری موحەممەدی پێوە نییەو زەکات بۆ ئەوان دروست نییە).

ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداوودو نەسائیو حاکم گێڕاویانەتەوە، حاکم بەدروستی داناوە، شافیعی سەبارەت بەم فەرموودەیە دەفەرموێ: لەناو زانایاندا، ئەم فەرموودەیە، نەسەلماوە، خۆئەگەر سەلما، ئەوا ئێمەیش رامان لەسەریەتی.

(روونکردنەوە):

بەهزی کوڕی حەکیمی کوڕی موعاوییەی کوڕی حَیدَة القُشَیرِیّ، بەهز تابیعییە، هەندێ ئیحتیتاج بە بەهز دەکەن، هەندێ زانای تر ئیحتیجاجی پێ ناکەن، دەڵێن: چونکە فەرموودەکانی دەنووسیەوە، هەندێ تر لەبەر ئەوە دڵنیانین لە فەرموودەکانی، گوایە یاری شەطرەنجی کردووە، وا پێ دەچێ کە حەکیمو موعاوییە، هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون.

٦٢٧- وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {إِذَا كَانَتْ لَكَ مِائَتَا دِرْهَمٍ -وَحَالَ عَلَيْهَا اَلْحَوْلُ- فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا، وَحَالَ عَلَيْهَا اَلْحَوْلُ، فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ، وَلَيْسَ فِي مَالٍ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ اَلْحَوْلُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَهُوَ حَسَنٌ، وَقَدِ اِخْتُلِفَ فِي رَفْعِهِ.

{صحيح، سُنَنُ أبی داود: ١٥٧٣}:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زیو هەتا نەگاتە دووسەد درەمی زیوین، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا، باوبووەو ئەو جۆرە دراوە زیوینەیە سەوداو مامەڵەی پێ کراوە، هەتا نەگاتە دووسەد درەم، زەکاتی لێ ناکەوێ، جا ئەگەر تۆ دووسەد درەمت هەبوو، وەخەرجت نەکردن هەتا ساڵیان بەسەردا هاتەوە، ئەوسا پێنج درەم زەکاتیان لێ دەکەوێ، زێڕیش هەتا نەگاتە بیست دیناری زێڕو ساڵیان بەسەردا تێ نەپەڕێ، زەکاتیان لێ ناکەوێ،

ئەوسا کە زێڕەکە بوو بەبیست دینارو ساڵیان بەسەردا هاتەوە، نیو دینار زەکاتیان لێ دەکەوێ، وە ئەوەشی لەمە زیاتر بوو، لەزێڕو زیو، کەم بێ، یان زۆر بێ، بەم پێودانەیە زەکاتەکەی دەدرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٩، ژمارە: ١٢١٣ چاپی چوارەم – ئەبوداوود گێڕاویەتەوەو بوخاری بە فەرموودەیەکی دروستی داناوە}.

(ڕوونکردنەوە):

آ- کورت و پوخت: زەکاتی زێڕو زیو چل یەکە، هەروا زەکاتی پووڵو پارەی تر بەهەر ناوێکەوە بێ، وەك: دینارو دۆلارو جونەیهو تمەن و لیرە، وەمەرجی پێویستبوونی زەکات لەزێڕو زیوو پارەدا، ئەم دوو مەرجەیە،

مەرجی یەکەم:

١- ئەگەر زیو بوو کاتێ زەکاتی لێ دەکەوێ، کە ئەندازەکەی لەدووسەد درەم کەمتر نەبێ.

٢- ئەگەر زێڕ بوو، ئەندازەکەی لەبیست مسقاڵ کەمتر نەبێ.

٣- ئەگەر پارە بوو، بایی دووسەد درەم زیو ببێ، یان بایی بیست مسقاڵ ئاڵتوون ببێ.

مەرجی دووەم:

آ- ئەم ئەندازەیە، یان زیاتر لەم ئەندازەیە، لەم سێ شتە، کاتێ زەکاتی لێ دەکەوێ، کە لەلای خاوەنەکەی ساڵی بەسەردا بێتەوەو دوانزە مانگی هەیڤی بەسەردا تێپەڕێ.

ب- ئەم سێ شتە هەرکە گەیشتنە رادەی زەکات، ئیتر کەم بن یان زۆر بن، چل یەکیان لێ دەکەوێ، چاوپۆشی لەکەرتیان ناکرێ.

ج- ئەوەی کە لە کۆتایی فەرموودەکەوە، دەفەرموێ: (هەر ماڵێ، لەلای خاوەنەکەی ساڵی بەسەردا تێنەپەڕێ، زەکاتی لێ ناکەوێ).

ئەمە تەخصیص کراوە، بەزەکاتی دانەوێڵەو میوەهات، چونکە ئەمانە لەسەر خەرمانەکەیان زەکاتیان لێ دەردەکرێ.

د- دانەر حافیظی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبوداوود ئەم فەرموودەیەی دەرهێناوە، هەروا دەفەرموێ: فەرموودەیەکی حەسەنە، بەڵام ڕاجیایی لەوەدا هەیە: کە ئایا ئەمە مەرفووعەو بەرزەوە کراوە بۆ پێغەمبەر، یامەوقوفەو لەسەر عەلی کوڕی ئەبو طالیبو ڕشتەکەی لەسەر عەلی وەستاوەو عەلی کە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، نەیفەرمووە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زیو هەتا نەگاتە دووسەد.......) هەتا کۆتایی فەرموودەکە، بەڵکوو عەلی خۆی فەرموویەتی: (زیو هەتا نەگاتە دوو سەد.....) هەتا کۆتایی.

٦٢٨- وَلِلتِّرْمِذِيِّ" عَنِ اِبْنِ عُمَرَ: {مَنِ اِسْتَفَادَ مَالًا، فَلَا زَكَاةَ عَلَيْهِ حَتَّى يَحُولَ اَلْحَوْلُ} وَالرَّاجِحُ وَقْفُهُ.

{صحيح مَوْقُوفاً، سُنَنُ الترمذي: ٦٣٢، ٦٣١}:

لەتاجول ئوصولا مەرفووعەو بەرزەوەکراوەو دەفەرموێ:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ماڵێکی دەستکەوت، زەکاتی لەسەر نییەو ئەو سامانە زەکاتی لێ ناکەوێ، هەتا لەلای خاوەنەکەی، ساڵێکی بەسەردا تێ نەپەڕێ، ئەوسا زەکاتی لێ دەکەوێ). {تاج/٢، لاپەڕە: ٢٥، زنجیرە: ٦، ژمارە: ١٢٠٥ چاپی چوارەم}.

دانەر مامۆستا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە، بەدوو شێوە دەرهێنراوە، بەمەرفوعیو بەمەوقوفی لەسەر ئیبنو عومەر، گوتەی سەنگینو بەهێز ئەوەیە کە مەوقوف بێ لەسەر ئیبنو عومەر، نەوەك مەرفوع بێ بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

٦٢٩- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَيْسَ فِي اَلْبَقَرِ اَلْعَوَامِلِ صَدَقَةٌ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَالرَّاجِحُ وَقْفُهُ أَيْضاً.

{صحيح سنن أبي داود: ١٥٧٢، بيهقي رقم: ٧١٩٨. نسائي رقم: ٢٤٧٧}؛

لەتاجا ئاوایە، بۆ بەهرەی پتر ڕاگوێزی دەکەم:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەوشترو رەشەوڵاخی باری‌و جووتی‌و ئیشکەر، زەکات ناکەوێ). (شافیعی - الأم)

بەڵام گێڕانەوەکەی ئێرە ئاوایە:

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەرەشەوڵاخی باری‌و جووتی‌و ئیشکەر، زەکات ناکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٦، ژمارە: ١٢٠٣ لاپەڕە: ٢٥ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

دانەر دەفەرموێ: گوتەی سەنگین ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیەیش مەوقووف بێ‌و مەرفوع نەبێ. واتە: وەك چۆن ڕای سەنگین ئەوە بوو کە فەرموودەی ژمارە (٦٢٨) گوتەی ئیبنو عومەر بێ‌و فەرمایشتی پێغەمبەر نەبێ، سەبارەت بەم فەرموودەیەیش، کە بەمەرفووعی‌و مەوقووفی گێڕدراوتەوە، گوتەی هێزدار ئەوەیە کەئەمەیش مەرفووع نەبێ‌و قسەی ئیمامی عەلی بێ‌و مەوقووف بێ لەسەر عەلی.

ئەوەیش کە فەرموودەی مەوقووف لەسەر هاوەڵی پێغەمبەر حوکم‌و بڕیاری مەرفووعی هەیە، باسێ دوورو درێژە، لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین: ئەو شتەی کە بەموقوفی ریوایەت‌و گێڕانەوە دەکرێ، ئەگەر مەودای ئیجتیهادی عەقڵی‌و هۆشکاری تیابوو، ئەوە مەرفوع نییەو گوتەورای خاوەنەکەیەتی، بەڵام ئەگەر مەودای عەقڵکاری‌و کۆششکاری‌و ئیجتیهادی تیا نەبوو، بەواتای ئەوە هۆش‌و ژیری مرۆڤ پەی بەشتی وا نابا، ئەوە ئەو شتە

باسكراوە، حوكمو بڕیاری مەرفوعو بەرزەوەكراوی هەیە، بۆلای پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ).

٦٣٠- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مِنْ وَلِيَ يَتِيمًا لَهُ مَالٌ، فَلْيَتَّجِرْ لَهُ، وَلَا يَتْرُكْهُ حَتَّى تَأْكُلَهُ اَلصَّدَقَةُ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ. وَلَهُ شَاهِدٌ مُرْسَلٌ عِنْدَ اَلشَّافِعِيِّ.

{ضعيف الجامع: ٢١٧٩. ترمذی رقم: ٦٤١. بيهقی رقم: ٧١٣١. دار قطنی ١٠٩/٢. مسند الشافعی ص٩٢}:

عومری كوڕی شوعەیبی كوڕی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص، لەشوعەیبی باوكیەوە، شوعەیب لەباپیرەی خۆیەوە، كە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جاریَ وتاری دەدا بۆ مەردوم، فەرمووی: (ئاگاداربن، هەركەسێ بووبە سەرپەرشتی هەتیوێ، ئەو هەتیوە ماڵی هەبوو، با مامەڵەو سەودای پێوە بكا، تا ئەو ماڵە نەشو نما بكا، وەهەروا بەبی خستنە گەڕ، نەیهێڵێتەوە، تا بەرەبەرە زەكات تەواوی بكات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ١٢٢٤ لاپەڕە: ٣٣ — تەرمەزی/شافیعی/دارە قطنی — سند ضعیف}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە شاهیدێكی هەیە، حەدیثێكی مورسەلە، شافیعی گێڕاویەتەوە، ئەمەیش ئەو شاهیدە مورسەلەیە:

{إبْتَغُوا فِي أَمْوَالِ اليَتَامى لاَ تَأْكُلهُ الصَّدَقَةُ}:

یوسفی كوڕی ماهیك كەتابیعی بوو، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (بازرگانیو سەوداو مامەڵە بەماڵی هەتیووەوە بكەن، دەنا بەرەبەرە زەكات تەواوی دەكات). {مُسنَدُ الشَافِعی}.

٦٣١- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: "اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژماره: ٢٧٠ = ١٤٩٧، ٤١٦٦، ٦٢٣٢، ٦٣٥٩ بوخارى. پوختەى موسليم ٥١٠ = ٢٤٨٩ شيحا = ١٠٧٨ = ترقيم محمد فؤاد عبدالباقى}:

عەبدوڵلاى كوڕى ئەبو ئەوفا (رەزاى خودا لەخۆىو لەباوكى بێ) كەخۆىو باوكى هاوەڵى پێغەمبەر بوون، دەفەرموێ: دەستوورى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) وابوو، كە كەسێ زەكاتى خۆى دەهێنا بۆى، دەيفەرموو: {"اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي فُلَانٍ}:

خودايە! رەحمەتو سۆزو ميهرەبانى خۆت بڕێژە، بەسەر كەسوكارى فيسارە كەسدا) وەناوى كەسەكەى دەهێنا.

باوكيشم كە زەكاتەكەى خۆى بۆ برد، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) هەمان نزاى بۆى كردو فەرمووى: {"اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى}:

خودايە! ڕەحمەتو سۆزو ميهرەبانى خۆت، بڕێژە بەسەر بنەماڵەى ئەبو ئەوفادا. {تاج/٢/٤٢، زنجيرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤١ — ش/د/ن - شەيخانو ئەبو داوودو نەسائى}.

٦٣٢- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلْعَبَّاسَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {سَأَلَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ.

{حسن، سنن أبى داود رقم: ١٦٢٤. ترمذى رقم: ٦٧٨. حاكم ٣/٣٧٥ رقم: ٥٤٣١}:

عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: عەبباسـی مامەی مـن‌و پێغەمبـەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) لـە پێغەمبـەری پرسـی (درودی خودای لەسەر بێ) ئایا دروستە زەکات دەربکەم پێش ئەوەی کەکاتی خۆی بێت؟ پێغەمبەریش (درودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕێگـەی ئـەوەی پێـدا، کەدروستە، زەکات بەرلەوەی کاتی بێ، بدرێ‌و پێش بخرێ.

لەگێڕانەوەیەکی تاجا:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) بەعومـەری فـەرموو: (لـەپارەوە زەکاتی ئەمسالّمان لەعەبباس وەرگرتووە).

٦٣٣- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّـهِ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ اَلْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَـا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ اَلْإِبِلِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ اَلتَّمْرِ صَـدَقَةٌ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختـەی موسـلیم ٥٠٢ = ٢٢٦٥ مـسلم/شـيحا = مـسلم ٩٨٠. تجريـد/٢ لاپـەڕە: ١٠٠، ژمـارە: ٦٧٢ = ١٤٠٥، ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤ بوخـاری. أبـوداود. زكـاة: ١٥٥٨. ترمـذی. زكـاة: ٦٢٦. نـسائی. زكـاة: ٢٤٤٥. تحفـة الأشراف/٢٤٤٠٢}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (زیو لەپێنج ئوقیە کەمتر بـێ زەکـاتی ناکەوێ، پێنج ئوقیـە دەکاتـە دووسـەد درەم، ژمـارەی وشـتریش لـەپێنج وشـتر کـەمتربێ، زەکـاتی لێ ناکـەوێ، دانەوێڵـەو خورمـا لـەپێنج ویـسق کـەمتر بـێ، زەکـاتی لێ ناکـەوێ). {تـاج/٢، زنجیرە: ٧، ژمـارە: ١٢٠٦ چاپی چوارەم لاپـەڕە: ٣٦} . ئۆقیە: چل درەمی زیوی ساغە بەکێشانە، ئـیتر سکەو دراو بـێ، یـازیوی خشڵ، یاخاوبێ، جیاوازی نییە.

٦٣٤- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ: (رضى الله عنه) {لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ مِنْ تَمْرٍ وَلَا حَبٍّ صَدَقَةٌ}. وَأَصْلُ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی موسلیم/٢ ٥٠ + شیحا ٢٢٦٤. تجرید/٢ ژمارە: ٦٧٢}:

ئیمامی موسلیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئەبوسەعیدی خودریەوە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خورماو دانەوێڵە لەپێنج وەسق کەمتربێ، زەکاتی لێ ناکەوێ)

(ڕوونکردنەوە):

١- پێنج وەسق دەکاتە سەد صاع، بەپێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چلو پێنج تەنەکە. واتە: وەسقێ دەکاتە: بیست صاع.

٢- درەمێ شەش دانقە، دە درەم حەوت مسقاڵە، کەواتە: دووسەد درەم، دەکاتە: سەدو چل مسقاڵ.

٦٣٥- وَعَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {فِيمَا سَقَتِ اَلسَّمَاءُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا: اَلْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ: نِصْفُ اَلْعُشْرِ}. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَلِأَبِي دَاوُدَ: {أَوْ كَانَ بَعْلًا: اَلْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي أَوِ اَلنَّضْحِ: نِصْفُ اَلْعُشْرِ}.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧١٤ = ١٤٨٣ بوخاری}:

سالمی کوڕی عەبدوللّای کوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکیو لەباپیری) فەرمووی: ئیبنو عومەری باوکم، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی بەبارانو بەچەمو بەجۆگەو بەکانیو کارێز ئاوبدرێ، یاخود دێمی بێ، باران ئاوی بدا، یاخود رەگەکەی بگاتە ئاوو پێویستی بەئاودانی ئاسایی نەبێ، ئەو بەروبومەی وابێ، زەکاتەکەی دە یەکە، ئەوەیشی کە بەوڵاخی ئاو هەڵگۆز، یاخود بەئاوکێش ئاو بدرێ، زەکاتەکەی نیوەی دە یەکە، واتە: بیست یەکە).

ئەبوداوود لەسالمەوە دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (زەكاتی بەراوو دێمەكار دە یەكە، وە زەكاتی ئەوەی كە بەولاخی چەرخگێڕ ئاو بدرێ، یا زەلام بەچەرخو دۆڵچەو شتی تری وا ئاوی بدات، بیست یەكە). {تاج/٢/٢٦، زنجیرە: ٧، ژمارە: ١٢٠٧ چاپی چوارەم} + {صحیح، سنن أبی داود: ١٥٩٦}.

٦٣٦- وَعَنْ أَبِي مُوسَى اَلْأَشْعَرِيِّ" وَمُعَاذٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهُمَا: {لَا تَأْخُذَا فِي اَلصَّدَقَةِ إِلَّا مِنْ هَذِهِ اَلْأَصْنَافِ اَلْأَرْبَعَةِ: اَلشَّعِيرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالزَّبِيبِ، وَالتَّمْرِ} رَوَاهُ اَلطَّبَرَانِيُّ، وَالْحَاكِم.

{صحيح، الإرواء: ٨٠١. حاكم رقم: ١٤٥٩. طبرانی ٣١٣/٢٠}:

ئەبوموسای ئەشعەریو موعازی كوڕی جەبەل (ڕەزای خودایان لێ بێ) كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كردنی بەكارمەندو ناردنی بۆ یەمەن، فەرمووی پێیان: (لەدانەوێڵەو باخو ڕەز، تەنها لەم چوار جۆرە، زەكات وەربگرن: لەجۆو گەنمو لەمێوژو لەخورماو بەس) (طەبەرانیو حاكم گێڕاویانەتەوە).

٦٣٧- وَلِلدَّارَقُطْنِيِّ، عَنْ مُعَاذٍ: {فَأَمَّا اَلْقِثَّاءُ، وَالْبِطِّيخُ، وَالرُّمَّانُ، وَالْقَصَبُ، فَقَدْ عَفَا عَنْهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ.

{أخرجَهُ الحاكم فی المستدرك: ١٤٥٨. دارقطنی ٩٧/٢}:

موعازی كوڕی جەبەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەترۆزیو خەیارو كاڵەكو شووتیو هەنارو نەیی شەكر، زەكات وەرناگیرێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەكاتی ئەم جۆرە میوەو سەوزەواتەی بەخشیوە).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕشتەكەی بێ هێزو لاوازە.

٦٣٨- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { إِذَا خَرَصْتُمْ، فَخُذُوا، وَدَعُوا اَلثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا اَلثُّلُثَ، فَدَعُوا اَلرُّبُعَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اِبْنَ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{حاكم رقم: ١٤٦٤. احمد رقم: ١٥٧٥. أبوداود رقم: ١٦٠٥. ترمذى رقم: ٦٤٣. نسائى رقم: ٢٤٩١. ابن حبان رقم: ٣٢٨٠}:

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (کاتێ ڕەزی ترێ، یاباخی خورما، خەمڵ دەکەن و دەی قەبڵێنن، سێیەکی بەری باخو ڕەزەکە مەقەبڵێنن و بیهێڵنەوە بۆ وردە پێویستیەکانی خاوەنەکەی، وەکوو لێ بەخشین و لێخواردن و لێ فەوتان، بەلای کەمەوە چواریەکی بۆ بهێڵنەوە).

(ڕوونکردنەوە):

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، ڕاستتر ئەوەیە کە ئەم سەهلی کوڕی حەثمە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مردووە، ئەم تەمەنی حەوت هەشت ساڵان بووە، وە لەهاوڕێ بچووکەکانی پێغەمبەرە، گێڕانەوەی بەجوانی لە پێغەمبەرەوە هەیە، سەهل لەبوخاریدا، سێ فەرموودەی هەیە، بەخەڵکی مەدینە دەژمێردرێ، لەوێش مردووە، (ڕەزای خودای لێ بێ).

٦٣٩- وَعَنْ عَتَّابِ بنِ أُسَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَنْ يُخْرَصَ اَلْعِنَبُ كَمَا يُخْرَصُ اَلنَّخْلُ، وَتُؤْخَذَ زَكَاتُهُ زَبِيبًا} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَفِيهِ اِنْقِطَاعٌ.

{ضعيف، الإرواء: ٨٠٧. أبوداود: ١٦٠٣. ابن ماجة: ١٨١٩. ترمذى: ٦٤٤. نسائى ٥/١٠٩}:

عەتتابی کوڕی ئەسید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی داوە، کە ڕەزیش وەك باخی خورما

خەملّ بكرێ، وە زەكاتەكەشی بەمێوژی وەربگیرێ، وەك چۆن زەكاتی باخە خورما بەخورمایی وەردەگیرێ!) {تاج/٢، زنجیرە: ٨، ژمارە: ١٢٠٨}.

(ڕوونكردنەوە):

١- دانەر دەفەرموێ: رشتەی ئەم فەرموودەیە، پچڕان (انقطان)ی واتیادا، چونكە سەعیدی كوڕی موسەییەب، كەگێڕانەوە لە عەتتابی كوڕی ئوسەیدەوە دەكا، سەعید فریای عەتتاب نەكوتووە.

٢- عەتتابی كوڕی ئوسەید، هاوەڵی پێغەمبەرە، ساڵی ئازادكردنی مەككە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كردی بەكارمەندی سەرشاری مەككە، لەرۆژی رزگاركردنی مەككەدا ئیسلام بووە، كەساڵی هەشتی كۆچی بوو، ئیتر هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مابوو، هەر عەتتاب فەرمانڕەوای مەككە بوو، ئەبوبەكریش لەم پایەدا هێشتیەوە هەتا كاتی مەرگی، عەتتابو ئەبوبكری صەدیق لەیەك رۆژدا مردن، بەڕاستی عەتتاب، پیاوێكی زۆر باشی بەهرەمەند بوو، كاتێ كرا بەكارمەندی سەر مەككە، تەمەنی لەبیست پتر بوو. كاتێ لەسەر حەزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی كوڕی ئەبو طالیب، وازی لەمارە كردنی كچەكەی ئەبو جەهل هێنا، ئەم عەتتابە مارەی كرد، كوڕێكی لەو كچە بوو ناوی عەبدولڕەحمان بوو. {بڕوانە: ژمارە: ٦٢٠ بۆ چۆنێتی مەرگی عەبدولڕەحمانی كوڕی عەتتاب، كە لەدەمی داڵەكە دەكەوێتە خوارەوە}.

ئەنەسی كوڕی مالیك دەفەرموێ: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەتتابی كوڕی ئوسەیدی كرد، بە فەرمانڕەوای سەر مەككە، عەتتاب لەگەڵ موسوڵمانەكاندا، زۆر نەرمو نیان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوانەدا كە گومانبار بوون، توندوتیژ بوو، دەیفەرموو:

سوێندم بەخودا، هەرکەسێ بەبێ مەهانەی ڕەوا، لەنوێژی جەماعەت دوابکەوێ، دەدەم لەگەردنی! چونکە ئەوانەی کەخوو بەتەرکی جەماعەتەوە دەگرن، ناپاكو دوو روون!.

خەڵکی مەککە لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەمە سکاڵایان لەعەتتاب کرد، گوتیان: ئەی پیغەمبەری خودا! تۆ کابرایەکی لادێی لووتو شکت کردووە، بە فەرمانڕەوای سەر دۆستەکانی خودا!؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەخەونا عەتتابم بینی، لەدەرگای بەهەشتا وەستابوو، ئەڵقە ڕێزی دەرگاکەی گرتبوو، هەر لێی دەدا، هەتا کرایەوە بۆیو ڕۆیشتە ناوی).

٦٤٠- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" {أَنَّ اِمْرَأَةً أَتَتِ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَمَعَهَا اِبْنَةٌ لَهَا، وَفِي يَدِ اِبْنَتِهَا مِسْكَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهَا: "أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذَا؟" قَالَتْ: لَا. قَالَ: "أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اَللَّهُ بِهِمَا يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ؟". فَأَلْقَتْهُمَا} . رَوَاهُ اَلثَّلَاثَةُ، وَإِسْنَادُهُ قَوِيٌّ. وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ.

{أحمد ١٧٨/٢ رقم: ٦٦٦٧. ترمذى رقم: ٦٣٧. أبوداود رقم: ١٥٦٣. نسائى ٣٨/٥}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ خۆیو کچێکی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

کچەکەی دووبازنی زێڕی قەوی لەدەستا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (ئایا زەکاتی ئەم دوو بازنانە دەدەیت؟ کچەکە گوتی: نەء، فەرمووی: ئەی حەزدەکەی لەڕۆژی قیامەتدا، خودا لەباتی ئەو دوو بازنە، دوو بازنی ئاگرینت بۆ بکا؟ گوتی: کچەکەیش هەردوو بازنەکەی لەقۆڵەکانی داکەندو هەڵیدان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر

بـێ) وەگـوتـی: ئـەوا هـەردووکیانم بەخـشی بـەخوداو بـە پێغەمبـەری خـودا).
{تاج/٢، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٢٢٠ – ت/د/ن}.

لەتاجدا دەفەرموێ: گفتەکەی ترمزی ئاوایە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەستیانا دوو بازنی زێڕی دی، فـەرمووی: (ئایـا زەکـاتی دەدەن؟) گوتیـان: نـەء، پێـی فـەرموون: ئـەی حـەز دەکەن کەخودا دووبازنی ئاگرینتان بۆ بکات؟ گوتیان: نەء، فەرمووی: کەواتە: زەکاتەکەیان بدەن!)

ئەمەیش لەدواوە: فەرموودەکەی عائیشەیە، کەدانەر دەفـەرموێ: حـاکم بەصەحیحی داناوە، لە (سُبُلُ السَّلَامِ)ەوە ڕاگوێزی دەکەین:

عەبـدوڵڵای کـوڕی شـەددادی کـوڕی ئـەلهادی (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەڵـێ: کۆمـەڵێ بـووین، چـووین بـۆ خزمـەتی دایکـە عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: جارێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) تەشـریفی هاتـەوە، ڕوانـی چـەند ئەموستیلەیەکی قـەوی قـەوی زیـوین وا لەپەنجـەکانما، فـەرمووی: (ئـەی عائیـشە ئەمانـە چـین لەدەستتا؟).

عەرزیمکرد: دروستم کردوون، هەتا خۆمیان پێ بڕازێنمەوە بۆ تۆ، ئەی پیغەمبەری خـودا! فـەرمووی: (درووی خـودای لەسـەر بـێ) ئایـا زەکاتیـان لێ دەردەکەی؟. عائیشە فەرمووی: گوتم: نەخەیر. فەرمووی: (دەی سزای نەدانی زەکاتی ئەمانەت لەدۆزەخا بەسە). حاکم دەفەرموێ: ڕشتەی ئەم فەرموودەیە بەپێی مەرجی بوخاریو موسلیمە.

٦٤١– وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّهَا كَانَـتْ تَلْـبَسُ أَوْضَـاحاً مِـنْ ذَهَبٍ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَكَنْزٌ هُوَ؟ فَـقَالَ: "إِذَا أَدَّيْتِ زَكَاتَـهُ، فَلَـيْسَ بِكَنْـزٍ"}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حسن، صحيح الجامع: ٥٥٨٢. أبوداود رقم: ١٥٦٤. حاكم ٥٤٧/١. دارقطني ١٠٥/٢}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: چەند خڕخاڵێکی زێڕم لەپێدا بوو، بە پێغەمبەرم گوت: ئایا ئەمانەیش بەگەنج (کەنز) دەژمێردرێن؟ فەرمووی: (ئەگەر گەیشتە حەددی زەکاتو زەکاتی لێ دەرکەیت، بەکەنز حسێب ناکرێو خاوەنەکەی بەر هەڕەشە سامناکەکەی خودا ناکەوێ کە لە قورئانا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ — التوبة/٣٤}:

واتە: موژدەی سزایەکی سەختی پڕ ئێشو ئازار بدە بەوانەی کەهەر زێڕو زیو کەڵەکە دەکەنو لەڕێگەی خودادا خەرجی ناکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ١١، ژمارە: ١٢٢١}.

٦٤٢- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَأْمُرُنَا" أَنْ نُخْرِجَ اَلصَّدَقَةَ مِنَ اَلَّذِي نَعُدُّهُ لِلْبَيْعِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَإِسْنَادُهُ لَيِّنٌ.

{أبوداود: ١٥٦٢. ضعيف، الإرواء: ٨٢٧}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (لەنامەیەکا، کە نووسیبووی بۆ کوڕەکانی): لەپاش ئەمە، جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ دەکردین، کەزەکاتی ئەو ماڵە بدەین، کە ئامادەمان کردووە بۆ فرۆشتنو بازرگانی. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ١٢١٨}.

٦٤٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: "وَفِي اَلرِّكَازِ: اَلْخُمُسُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژماره: ٧٢٢ = ١٤٩٩ بوخاری. پوختەی موسليم ١٠٣٣ = ٤٤٤٣ مسلم/شيحا = ١٧١٠ مسلم}:

ئەم فەرموودەيە لەتاجول ئوصول‌و تجريدی بوخاری‌و پوختەی موسليمدا ئاوايە:

ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: خۆشەويست (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: (كان‌و بير، ئەگەر شتيان تی كەوت، يان ڕمان بەسەر شتێكا، شتەكە زامار بوو، يامرد، لەوەدا سووچی خاوەن كان، يان سووچی خاوەنی بيرەكەی تيادا نەبوو، ئەوە ئەو شتە خوێنی نييەو فيڕۆيە، هەروەها ئاژەڵ‌و ماڵات‌و وڵاخيش ئەگەر زيانیٚ بدەن، كەسیٚ زامار بكەن، بەبیٚ سووچی خاوەنەكەيان، خوێنی نييە).

گەنجی كۆنی دۆزراوەيش پێنج يەكی هی زەكاتە. {تاج/٢، زنجيرە: ٩، ژمارە: ١٢١٥ لاپەڕە: ٢٩ چاپی چوارەم}.

(ڕوونكردنەوە):

لەڕوونكردنەوەی ئەم فەرموودەيەدا، لەپوختەی موسليما ئەمەم نووسيوە:

لەڕاستيدا زۆر لەشێوەو وێنەو جۆرەكانی سەوداو مامەڵەو باوو نەريت‌و كێشە كۆمەڵايەتييەكان، لەسەر شێوەی دێرينيان نەماون‌و بەشێوەيەكی تر سەريان هەڵداوە، ئێستا كارەساتی ڕێگەوبان‌و رووخانی كان‌و مردن بەتەزووی كارەباو، رووداوی دڵتەزێنی زۆری تر پەيدا بوون، كەزانا

کۆشکارەکان دەتوانن لەم جۆرە فەرموودانەدا، بڕیارە یاسایی‌و شەرعییەکان بدۆزنەوە.

٦٤٤- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ -فِي كَنْزٍ وَجَدَهُ رَجُلٌ فِي خَرِبَةٍ-: "إِنْ وَجَدْتَهُ فِي قَرْيَةٍ مَسْكُونَةٍ، فَعَرِّفْهُ، وَإِنْ وَجَدْتَهُ فِي قَرْيَةٍ غَيْرِ مَسْكُونَةٍ، فَفِيهِ وَفِي اَلرِّكَازِ: اَلْخُمُسُ "} أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{حسن، صحيح الجامع: ٥٦٥٨. شافعي ٩٦/١ حاكم ٧٤/٢ رقم: ٢٣٧٤. بيهقي رقم: ٧٤٣٧}:

عەمری کوڕی شوعەیب، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، فەرمووی: پیاوێ، لەگوندێکی وێرانەی سەردەمی نەزانیدا (جاهیلیەتی پێش ئیسلام) گەنجێکی دۆزی بۆوە، سەبارەت بەم بابەتە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر شتی وەهات، لەگوندێکی ئاوەداندا، یان لەڕێگەیەکی هاموشۆ پێکراودا، دۆزییەوە، ئەوە بڕیاری دۆزراوەی هەیە، لەبەرئەوە بیناسێنەو، لەڕێگەو جێگەی لەباردا، ناوونیشانی هەڵبدە، ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو، ئەوا هی خۆیەتی‌و بیدەرەوە دەستی، ئەگەر خاوەنی نەبوو، ئەوا دەبێ بەهی تۆ، بەڵام ئەگەر شتی وات، لەگوندێکی کۆنی سەردەمی نەزانیدا، یان لەگوندێکی نائاوەداندا دۆزییەوە، ئەوە لەکاتی وەهادا، پێنج یەکی ئەو دۆزراوەیە هی زەکاتە، هەروەها گەنجینەی دێرینی دۆزراوەیش پێنج یەکی هی زەکاتە).

٦٤٥- وَعَنْ بِلَالِ بْنِ اَلْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَخَذَ مِنَ اَلْمَعَادِنِ اَلْقَبَلِيَّةِ اَلصَّدَقَةَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{أبوداود: ٣٠٦١. ضعيف، الإرواء: ٣١٢/٣ - ٣١٣}:

ئەم فەرموودەیە، لە تاجا ئاوایە، دەیکەین بەراڤەو روونکردنەوە بۆ ئەم گێڕانەوانەی ئێرە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کانەکانی قەبەلییەی (لەناوچەی فورع) بە بەشدا، بەبیلالی کوڕی حاریث، ئەو کانانە هەتا ئێستاکەیش، بێجگە لەزەکات، هیچی تریان لێ وەرناگیرێ. {تاج/٢، زنجیرە: ٩، ژمارە: ١٢١٦ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (٦٤٥ — ٦٢٠ = ٢٥) بیستو پێنج فەرموودەی واتیادا.

٢- زەکات فەرزە، یەکێکە لەپێنج روکنەکانی ئیسلام. لەزۆر شت دەکەوێ، بەشێویەکی گشتی لەم شتانە دەکەوێ:

١- لەگەنمو جۆو برنجو نۆکو نیسکو گەنمەشامیو هەموو دانەوێڵەیەکی تر کە مرۆڤی پێ بژی، وەك هەرزنو زورات...تاد.

٢- لەچوار جۆرە ئاژەڵی ماڵی دەکەوێ کە ئەمانەن: مەڕو بزنو وشترو ڕەشەوڵاخ، گامێشیش هەر بەرەشەوڵاخ دادەنرێ.

لەم رووەوە جیاوازی نییە لەنێوان جۆرەکانی ئەم چوار جۆرە ئاژەڵەدا، وەك مەڕی کوردیو مەڕی عەرەبیو وشتری ئاساییو وشتری ئەفریقی، یان مانگای کوردیو مانگای هۆڵەندی، یان مەڕی شاخدارو مەڕی بێ شاخ، بەڵام مەرجە ئەم چوار جۆرە ئاژەڵە ماڵی بن، لەهیچ ئاژەڵێکی کێوی زەکات ناکەوێ، وەك: بزنە کێوی!.

٣- لە رەزو باخ، واتە: لەمێوژو خورما، زەکاتیان دە یەکە.

٤- لەئاڵتوونو زیوو پارەو پوول، زەکاتیان چل یەکە: (٦٢٧).

٥- لەسامانی بازرگانی، زەکاتی چل یەکە.

٦- لەگەنجی دێرینی سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام پێنج یەکە.

٣- زەکات نابێ لە نایابی سامان بێ.

٤- ئاژەڵ ئەگەر بە لەوەڕی دەشتودەر نەژیو لەماڵەوە بەئالیكو ئاڵف بەخێو بکرێ، زەکاتی لێ ناکەوێ.

٥- ئاژەڵی جووتیو باری، وەك گای جووتو وشتری ئاوكێش زەكاتیان لێ ناكەوێ.

٦-ماڵی هەتیوو شێت زەكاتی لێ دەكەوێ.

٧- سوننەتە زەكات وەرگر، نزای باش بۆ زەكاتدەر بكا.

٨- پێشخستنی زەكات دروستە، بەمەرجی خۆی {بڕوانە: ژمارە: ٦٣٢}.

٩- هەموو جۆرە ماڵێ ڕادەیێ، واتە: ئەندازەیەكی تایبەت دانراوە، بۆ سەرەتای زەكات لێكەوتنی، بەو ئەندازەیە دەگوترێ (نصابی زەكات).

١٠- دانەوێڵەو بەری ڕەزوباخ، زەكاتەكەیان لەسەر خەرمان دەدرێ، كاتێ بەروبوومەكەیان كۆدەكرێتەوە، دە یەكیان زەكات لێ دەكەوێ، ئەم جۆرە ماڵە حەولی نییە.

١١- هەروا زێڕو زیوو پارەی گەنجی دۆزراوە، حەولیان نییە، لەپاش دۆزینەوەیان یەكسەر پێنج یەكیان زەكات لێ دەكەوێ - (ڕكاز - گەنجینەی كۆنی دۆزراوە).

١٢- ترۆزیو خەیارو كاڵەكو شووتیو بامێو تەماتەو كەوەرو توورو سلقو پیازو سەوزەواتی تری لەم بابەتە، ئەگەر نەچوونە خانەی بازرگانی پێ كردنەوە، زەكاتیان لێ ناكەوێ.

١٣- دروستە بەری رەزوباخ خەمڵ بكرێو بقەبڵێنرێو بەپێی خەملاندنو قەبلاندنەكە زەككاتیان بدرێ. سوننەتە سێ یەكی، یان چوار یەكی بەرهەمەكەیان نەقەبڵێنرێ، بمێنێتەوە بۆ وردە مەسرەفی خاوەنەكەی، وەك لێخواردنو لێبەخشینو لێفەوتانو لێبردنو...تاد. زەكاتی ترێو خورما، لە مێوژو خورمای پێگەیشتوو دەدرێ.

١٤- خشڵی ڕەوا ئەگەر ئاسایی بوو، لەڕادەبەدەر نەبوو، وەك لەمەجمووعا دەفەرموێ: دوو گوتەی واتیادا:

آ- گوتەی راستتریان کە خشڵی حەڵاڵی ئاسایی زەکاتی لێ ناکەوێ، ئیتر چی هی پیاو بێ، وەك دانی زێڕو پەنجەی زێڕو ئەموستیلەی زیوینی، وەچی هی ژن بێ، وەك هەموو جۆرە خشڵێکی رەوای ژنان لەزێڕو زیوو موجەوهەرات، بازۆریش بێ زەکاتی لێ ناکەوێ.

ب- بەرامبەر گوتەی ڕاستتر دەفەرموێ: (خشڵ چی هی پیاو بێ چی هی ژن بێ، زەکاتی لێ دەکەوێ!).

**گوتەی پوخت:** (خشڵی ڕەوای ئاسایی، بۆ پیاوو بۆ ژن زەکاتی لێ ناکەوێ، ئەگەر کەسێ بیەوێ زەکاتی لێ بدا، کارێ باش دەکاو لەسەر ئەوە پەسەند دەکرێ!).

١٥- هەر ماڵو سامانێ، بازۆر زۆریش بێ، بەمەرجێ زەکاتی بدرێ، بەگەنجو خەزنەی حەرام دانانرێ، کە لە قورئانا هەڕەشەی سەخت لە خاوەنەکەی کراوە. وەك گەنجەکەی قاروونو کەڵەکەکردنی زێڕو زیوو پارەیێ، کە زەکاتیان لێ نەدرێ!.

## ( یادگاری مارێ )

لەکەرکوك بووم، پیاوێ هەبوو، لە بەگەکانی کەرکوك بوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، خۆیو ژنێکی بوو، تەمەنیان بەرەو پیریی، ملی پێوە نابوو، وەجاخیان کوێر بوو، منالّیان نەبوو، نەکوڕ نەکچ!!

دیاربوو ئەم پیاوە لەتەمەنیدا زەکاتی نەدا بوو، کە دەگاتە ئەو تەمەنە، کەمێ هۆشیار دەبێتەوە، دەیەوێ بچێ بۆ حەجو خۆی پاك بکاتەوە؟ سابەشکم هەرکاتێ بمرێ بەروویەکی سوورەوە بچێتەوە بۆ دیوانی خودای گەورە. وە ئەمە زۆر کەسی وا، شتی وا دەکەنو لەڕاستیشدا کارێ باش دەکەن!

جا کابرای بەگ، بۆ ئەم مەبەستە، دەنێرێ بۆلای خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا مەجیدی قوطب (رەحمەتی خودای لێ بێ) کەسەرۆکی زانایانی

ئایینی بوو، دەنێرێ بۆلای هەتا تەگبیرێکی بۆ بکا. لەسەر راوێژو تەگبیری مەلامەجید، نزیکەی یەك دوو حەفتە، مامۆستا مەلامەجیدو کابراو نووسەرێ، رۆژانە کۆدەبنەوەو، سەرجەمی ماڵی کابرا دەوردەکەنەوەو هەتا لەئەنجاما، ئەندازەی زەکاتەکەی دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کەسەرجەمی زەکاتی سەرجەمی سامانەکەی دەکاتە ئەوەندە!

کابرا تەماشا دەکا، دەبێ ئەندازەیەکی زۆر زۆر پارەو پوول بدا، ئەوسا زەکاتی لەسەر نامێنێ‌و ماڵەکەی پاك‌و خاوێن دەبێتەوەو ئەوسا دەتوانێ، بەدڵنیایی، لەماڵێکی حەلاڵی پەتی بێ گیروگرفت، حەجەکەی ئەنجام بدا.

لەبەرئەوە دەڵێ:

(جا چی بۆ من دەمێنێتەوە، بەخودا نەزەکات دەدەم‌و نەدەچم بۆ ئەو حەجە) وە ئەمە دوابڕیاری دەبێ.

جا وەك من بەگوێی خۆم لەچەندین مامۆستای بەڕێزی متمانە پێکراوم بیست:

١- کابرا ئەو ساڵە کەخۆی ئامادە کردبوو بچێ بۆ حەج، لەگەڵ حاجیانی ئەو ساڵە، کە دەکەونە ڕێ ناچێ بۆ حەج، بەبیانووی ئەو مەهانەیەوە کە باسیمانکرد.

٢- بەلام بەرلەوە حاجیان لەحەج بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك، کابرای حەج نەکەری زەکات نەدەری وەجاخکوێر دەمرێ‌و دونیاو سامانەکەی بەجێ ما بۆ ئەم‌و ئەو.

٣- لەخودی مامۆستا مەلامەجیدی قوطب‌و چەند مەلاو کەسێکی تری بەرێزی خەڵکی کەرکوکم بیست، دەیانگوت:

کاتێ ویستیان گۆڕی بۆ هەڵکەنن، لەناکاوێکا، لەتەختی گۆڕەکەدا، بەرلەوە کەتەرمەکە دابهێڵنە ناوی، شامارێکی رەشی سەیری سامناکی ترسناك پەیدا دەبوو، بەهیچ جۆرێ گۆڕەکەی بەجێ نەدەهێشت، وەهەتا سێ‌و چوار

جار، گۆڕەكە پڕ دەكەنەوەو گۆڕێكی تر هەڵدەكەنن، بەڵام لەناكاوێكا شامارە ڕەشمارەكە پەیدا دەبێتەوە!!

دوایی لەسەر فەرمانی مامۆستا مەلا مەجیدی قوطب، كابرای زەكات نەدەر، لەئاخر گۆڕدا، لەگەڵ ڕەشمارەكەدا دەینێژن. مامۆستا مەلامەجید دەفەرموێ:

(ئەمە كردەوەكەی خۆیەتی، لەگۆڕەكەیدا هاومل‌و هاودەمی دەبێ، لەبەرئەوە چار نییە لەگەڵیدا بینێژن!).

بەختەوەر كەسێ كە كردەوەی خۆی
لەگۆڕەكەیدا، بێ بەچەتر بۆی
چارە ڕەش كەسێ، ژینی جیهانی
دەست خەرۆی بكا، زۆر بەنەزانی
گوێ نەدا بەهیچ بژی وەك خەرگەل
نەترسێ لەخوا، نەشەرمێ لەگەل

مامۆستا مەلا مەجیدی قوطب (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەقیامەتا، ئەگەر خودا لێی پرسیم: مەلا مەجید چۆن خۆت كردووە بەسەرۆكی زانایانی ئایینی كەركووك؟ عەرزی دەكەم: خوایە! خۆت ئاگاداریت ئایا لەكەركووكا لەمن مەلای زاناتر هەبوو؟

## ٢٨- باسی سەرفترە
## باب: صَدَقَةُ الفِطرِ

بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ١٥٠ لاپەڕە ٢٧٦

٦٤٦- عَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {فَرَضَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) زَكَاةَ اَلْفِطْرِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ: عَلَى اَلْعَبْدِ وَالْحُرِّ،

وَالذَّكَرِ، وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ، وَالْكَبِيرِ، مِنَ اَلْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ اَلنَّاسِ إِلَى اَلصَّلَاةِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = پوختەى بوخارى = مختصر صحيح البخارى بالكوردى/٢، ژمارە: ٧٢٥ = ١٥٠٣، ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢، بوخارى. پوختەى موسليم ٥٢٠ = ٢٢٧٥. أبوداود. زكاة: ١٦١١. ترمذى. زكاة: ٦٧٦. نسائى. زكاة: ٢٥٠١، ابن ماجة. زكاة: ١٨٢٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەنێ خورما، یامەنێ جۆ، سەرفترەی دانا، لەسەر هەموو موسوڵمانێ، ئیتر کۆیلە بێ، یا ئازاد بێ، نێرینە بێ، یامێینە بێ، گەورە بێ، یا بچووك بێ، وە فەرمانیشی کرد: کە لەپێش ئەوەدا مەردوم بڕۆن بۆ نوێژی جەژن، سەرفترەکە بدەن.

واتە: واباشە کەسەرفترە، نەکەوێتە دوای نوێژی جەژن، بەڵکوو لەپێشتر بدرێ. {تاج/٢/٣٦، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣٠}.

٦٤٧- وَلِابْنِ عَدِيٍّ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ وَاَلدَّارَقُطْنِيِّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ: {اغْنُوهُمْ عَنِ اَلطَّوَافِ فِي هَذَا اَلْيَوْمِ}.

{ابن عدى فى الكامل ٥٥/٧. دارقطنى ١٥٢/٢ بيهقى ١٧٥/٤، ضعيف، الإرواء: ٨٤٤}:

ئیبنو عەدی‌و دارە قوطنی (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) بەڕشتەیەکی لاواز دەگێڕنەوە لەئیبنو عومەرەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەهۆی پێدانی سەرفترەوە، بەهەژاران‌و پێشیاوان، بێ نیازیان بکەن لەوەی کە لەرۆژی جەژنا، دەرگاو دەرگاو کۆڵان‌و کۆڵان بگەڕێن بۆ سواڵ‌و گەدایی!).

٦٤٨- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَانِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ

شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: {أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ} . قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا أَنَا فَلَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ فِي زَمَنِ رَسُولِ اَللَّهِ. وَلِأَبِي دَاوُدَ: {لَا أُخْرِجُ أَبَدًا إِلَّا صَاعًا} .

{تجريدی بوخاری/٢، ژماره: ٧٢٦ = ١٥٠٦، ١٥٠٨ بوخاری. پوختەی موسلیم ٥٢١ = ٢٢٨١. أبوداود. زکاة: ١٦١٦. ترمذی. زکاة: ٦٧٣. نسائی. زکاة: ٢٥١٠، ابن ماجة. زکاة: ١٨٢٩}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەر بێ) سەرفترەمان بەم شێوەیە دەدا:

لەبری هەموو سەرێ، بچووك بێ، یا گەورە، ئازاد بێ، یاكۆیلە، لەبری هەر سەرێ لەمانە، مەنێ خورمامان لەباتی سەرفترە دەدا، وەیا مەنێ كەشك، یامەنێ جۆ، یامەنی خورما، یامەنێ مێووژ، ئیتر هەر بەم شێوەیە زەكاتی سەرفترەمان دەدا، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) لەو سەردەمەدا، موعاوییە لەشامەوە هات بۆ حەج، یا هات بۆ عەمرە، گەنمیش پەیدا بوو بوو، جا موعاوییە خۆی لەسەر دوانگە قسەی بۆ مەردووم كرد، یەكێك لەقسەكانی ئەمە بوو، فەرمووی: (من وادەزانم كە دوو مست (مودد) لەم گەنمەی شام، هاوتای مەنی خورما دەكا).

ئیتر خەڵكیش ڕەفتاریان بەم قسەیەی ئەو كرد، ئەبو سەعید دەیفەرموو: بەلام من بەش بەحاڵی خۆم، هەتا ماوم هەروەك جاران، مەن (صاع)ێ دەدەم بەسەرفترە، لەهەموو جۆرە خۆراكێ). {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٧، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣١}.

٦٤٩- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {فَرَضَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) زَكَاةَ اَلْفِطْرِ " طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اَللَّغْوِ، وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ،

فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ اَلصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ اَلصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ اَلصَّدَقَاتِ}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمِ.

{صحيح الجامع: ٣٥٧٠. أبوداود: ١٦٠٩، ابن ماجة: ١٨٢٧. حاكم ٥٦٨/١}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرفترەی داناوە لەسەر موسوڵمانان، هەتا ڕۆژووەوان پاك بکاتەوە لەماکی قسەی پڕوپووچو هەرزەگۆیی وە هەتا بشبێت بەخۆراکی جەژنی هەژاران، جا ئەوەی کە لەپێش نوێژی جەژندا بیدات، ئەوە زەکاتێکی گەڵ پەسەندە، وە ئەوەیشی لەپاش نوێژی جەژن بیدات، ئەوە خێرێکە لەخێرەکان). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ١٣٢٩ چاپی چوارەم}.

**(ڕوونکردنەوە):**

بیلالی کوڕی حاریث کە فەرموودەی ژمارە (٦٤٥) ئەو گێڕاویەتەوە، خەڵکی مەدینەیە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کانەکانی قەبەلییەی بە بەشدا پێی، لەڕۆژی ڕزگار کردن، (ئازادکردن - فەتح)ی مەککەدا، ئەو خاوەنی ئاڵای هۆزی موزەینە بوو، کەهۆزی موزەینە بەشێ بوون لە لەشکرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەساڵی پێنجی کۆچیدا، لەگەڵ دەستەیێ لەهۆزی موزەینە بوون بەنوێنەری هۆزەکەیانو هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەرو ئیسلامبوونی خۆیانو هۆزەکەیان ڕاگەیاند، لەپشتی مەدینەوە جێگەیەکی لێ بوو، پێیان دەگوت: (ئەلئەشعەر) لەوێ نیشتەجێ بوو، دوایی گواستیەوە بۆ بەصرە، فەرموودەکانی لە سونەنەکانی ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائیدا هەیە، هەروا لەصەحیحی ئیبنو خوزەیمەو لەصەحیحی ئیبنو حیبباندا هەیە. لەئاخرو ئۆخری جێنشینی موعاوییەدا، لەساڵی شەستی کۆچیدا، لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مردووە (ڕەزای خودای لێ بێ).

## ٢٩- باسی خێرو خێرکردن
## بابُ: صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ

٦٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ....} فَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَفِيهِ: {وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٣٧٤ = ٦٦٠، ١٤٢٣، ٦٤٧٩، ٦٨٠٦، بوخاری. پوختەی موسلیم ٥٣٧ = شیحا ٢٣٧٧ = مسلم ١٠٣١. ترمذی. زهد/٢٣٩١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (حەوت تاقم هەن، خودا لەرۆژی قیامەتدا، دایان دەنی لەژێر سێبەری تەختو بارەگای (عەرش)ی خۆیدا، لەو رۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێکەی تر نییە، بێجگە لەسایەو سێبەری خودا خۆی).

یەکەم: پادشای عادڵو پێشەوای دادپەروەرو کاربەدەستی بەداد.

دووەم: لاوێ لەعیبادەتو خوداپەرستیدا قاڵ بووبێو پێ گەیشتبێو بەرەبەرە گەورە بووبێ.

سێیەم: پیاوێ کەدڵی ئالوودەی مزگەوت بووبێ.

چوارەم: دووکەس کە ساخ لەبەر رەزای خودا یەکتریان خۆش بوێ، لەبەر رەزای خودا، کۆببنەوەو هەر لەبەر رەزای خودایش لەیەکتر جیاببنەوە، لەپاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکەیان.

پێنجەم: پیاوێ کەئافرەتێکی خانەدانی خانوومانی، شۆخو شەنگی جوان، داوای ئیشی خراپی لێ بکاو خۆیی تەسلیم بکا، ئەویش لەبەر ترسی خودا نەیکاو پێی بڵێ: من ئیشی بێ شەرعی ناکەم، چونکە لەخودا دەترسم.

شەشەم: پیاوێ خێرێ بە پەنامەکی بکا، کە ئەم دەستی بەو دەستی نەزانێ.

حەوتەم: کەسێ کەبەتەنیا خۆی بێو یادی خودا بکاو دڵی گەرم ببێو فرمێسك بەچاوەکانیدا، لەترسی خودا سەر رێژ بکاو هۆن هۆن بێتە خوارەوە). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٣٧٦} + {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٨١ چاپی چوارەم}.

٦٥١- وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {كُلُّ اِمْرِئٍ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ حَتَّى يُفْصَلَ بَيْنَ اَلنَّاسِ} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.

{ابن حبان رقم: ٣٣١٠. الحاكم. رقم: ١٥١٧، صحيح الجامع: ٤٥١، الصحيح المسند: ٩٢٨}:

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (لەرۆژی قیامەتا، هەموو کەسێ لەسایەی سێبەری خێرکردنو ماڵبەخشینی خۆیدا دەبێ، هەتا دادگاییو مەحکەمەی بەندەکانی خودا تەواو دەبێو خەڵکی بەهەشتو دۆزەخ جیادەکرێنەوە).

(ڕوونکردنەوە):

وشەی پیاو لەم جۆرە شوێنانەدا، بۆ نموونەیە، لەبەر ئەوە مەفهوومی نییە، کەواتە: ئەم حەوت تاقمەو ئەوکەسەی کە لەرۆژی قیامەتدا، لەسێبەری خێرکردنی خۆیدا دەبێ، مەرج نییە ئەم بەهرانە هەر بۆ پیاو بێ، بەڵکوو ئەم جۆرە کەسانە ژنیش وەك پیاو دەگرنەوە. (بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٥٣٧).

٦٥٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَيُّمَا مُسْلِمٍ كَسَا مُسْلِمًا ثَوْبًا عَلَى عُرْيٍ كَسَاهُ اَللَّهُ مِنْ خُضْرِ اَلْجَنَّةِ، وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ أَطْعَمَ مُسْلِمًا عَلَى جُوعٍ أَطْعَمَهُ اَللَّهُ مِنْ ثِمَارِ اَلْجَنَّةِ، وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ سَقَى مُسْلِمًا عَلَى ظَمَإٍ سَقَاهُ اَللَّهُ مِنْ اَلرَّحِيقِ اَلْمَخْتُومِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَفِي إِسْنَادِهِ لِينٌ.

{ضعيف الجامع: ٢٢٤٩. أبوداود: ١٦٨٢. ترمذى: ٢٤٤٩. نووى فى المجموع ٢٢٧/١ إسناده جَيِّدٌ}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ، موسوڵمانێکی رووت پۆشتە بکاتەوە، خودا لەبەرگی سەوزی بەهەشت پۆشتەی دەکاتەوە، وەهەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی برسی نان بدا، خودا لەمیوەی بەهەشت تێری دەکا، وەهەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی تینوو تێراو بکا، خودای گەورەو سەروەر لەشەرابی پاکی سەربەمۆری مەشهوور بە (الرحيق المختوم) دەرخواردی دەدا. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٢٨٩ چاپی چوارەم}.

٦٥٣- وَعَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: {اَلْيَدُ اَلْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ اَلْيَدِ اَلسُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ اَلصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اَللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اَللَّهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدى بوخارى/٢، لاپەڕە: ١٠٩، ژمارە: ٦٨٥ = ١٤٢٧، ١٤٢٨ بوخارى. پوختەى موسليم ٥٦٠، ٥٦١ = ٢٣٨٢، ٢٣٨٤ شيحا. مسلم ١٠٣٤. أبوداود. زكاة: ١٦٤٨. نسائى. زكاة: ٢٥٣٢. تحفة الأشراف: ٨٣٣٧}:

حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەستی سەرەوە، کە دەستی خێرکەرە، لەدەستی ژێرەوە باشترە، کە دەستی خێر وەرگرە، لەخێزانو خزمو کەسوکاری خۆشتەوە دەست بکە بەخێرکردن، باشترین خێریش ئەو جۆرە خێرەیە، کە لەسەر تێری بێ، وە هەرکەسێکیش شەرمی بەخۆی هەبێو خۆی بپارێزێ لەرووزەردی سواڵو سواڵکردن، خودای گەورە لەهەردوو جیهاندا، رووسوورو سەربەرزی دەکات، وەهەرکەسێکیش چاوتێر بێو خۆی بێ نیاز بگرێو چاوی لەدەستی ئەمو ئەو بێ، خودا دەوڵەمەندو بێ نیازی دەکاو

چاوی لەدەستی ئەمو ئەو نابێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٣، ١٢٦٤ + ریاض/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٤}.

(ڕوونکردنەوە):

حەکیمی کوڕی حیزام، برازای حەزرەتی دایکە خاتوو خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەرە، دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەخاتوو خەدیجەو حەکیمی برازای بێ، حەکیم یەکێ بوو لەبەگزادەکانی قورەیش، ڕیفادە لەدەستی ئەودا بوو، ریفادە ئەوە بوو: هۆزی قورەیش لەناو خۆیاندا، هەرکەسێ بەپێی توانای خۆی، بڕێ بەخششی دەدا، هەتا سامانێکی زۆریان کۆدەکردەوە، جا لەو ماڵە خواردەمەنیو مێوژو خۆشاویان دەکڕی، وە لەڕۆژی حەجدا، دەرخواردی خەڵكو حاجیانیان دەدا.

حەکیم دەیفەرموو: (سیازدە ساڵ لەپێش ساڵی فیل (عامو فیل)دا، لەدایك بووم، لەبیرم دێ، کە عەبدولموتەلیبی باپیرەی پێغەمبەر، دەیویست بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەی عەبدوڵلای کوڕی خۆی، سەربڕێو بیکات بە قوربانی، دوایی فیدییەی داو چەندین وشتری سەربڕی لەباتی عەبدوڵلا.

حەکیم لەناو ژووری کەعبەدا لەدایك بووە، لەجاهیلییەتدا شەست ساڵ ژیاوە، لەسەردەمی ئیسلامیشدا شەست ساڵ ژیاوە، شەست کۆیلەی لەسەردەمی نادانی پێش ئیسلامدا ئازادکردووە، لەسەردەمی ئیسلامدا حەجی کردووە، لەحەجێکا سەد وشتری دیاری بەیتی پێ یوو، کاتێ لەچیای عەرەفە، لەرۆژی عەرەفەدا ڕاوەستا، سەد کۆیلەی هێنا بوو، لەوێ لەگەڵیدا ڕاوەستا بوون، لەگەڵیا حەجیان دەکرد، هەر سەدیان یەکی سەروتەوقی زیوینیان لەگەردندا بوو، بەنەخش لێیان نووسرا بوو: ئەمانە ئازاد کراوی خودان، لەبەر ڕەزای خودا، حەکیمی کوڕی حیزام ئازادی کردوون، هەزار سەر پەزیشی کرد بەدیاری (هەدی)ی بەیت. حیزامی باوکی لەهەراکەی (فجار)دا کوژرا، حەکیم خۆشی ئامادەی ئەو هەرایە بووە. حەکیم لەپێش بیعثەتدا

دۆستی پێغەمبەر بوو، لەدوای بیعثەتیش هەر پێغەمبەری خۆشدەویست بەڵام درەنگ ئیسلام بوو، یەکێ بوو لە (مَسلَمَه)ی فەتح، واتە: لەو موسوڵمانانەیە، کە لەرۆژی ئازاد کردنی مەککەدا، بۆ پاراستنی خوێنی خۆیان، موسوڵمان بوون، وە زۆرینەی ئەمانە لەئەنجامدا، موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، لەرۆژی ئازادکردنی مەککەدا بۆ رێزلێنان لەحەکیم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بڕواتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام، لەسەرو ماڵی خۆی دڵنیا بێ!).

حەکیم پیاوێکی ژیری هۆشمەندی ڕیزدار بوو، زۆر لەخوا ترس بوو، زۆر دەوڵەمەندو بەخشندەو خێرکەر بوو، سەدو بیست ساڵ ژیاوە، شەستی لەنەزانیو شەستی لە موسوڵمانیدا، ساڵی پەنجاو چواری کۆچی، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لەمەدینە بەمەرگی خودا، لەماڵی خۆیدا کۆچی دوایی کردووە. (ڕەزای خودای لێ بێ!).

٦٥٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {قِيلَ يَا رَسُولَ اَللَّهِ: أَيُّ اَلصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "جُهْدُ اَلْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ"} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أبوداود رقم: ١٦٧٧. ابن حبان رقم: ٣٣٤٦. حاكم رقم: ١٥٠٩. احمد رقم: ٨٢٨٧. ابن خزيمة: ٢٤٥١. صحيح الجامع: ١١١٢. الصحيح المسند: ١٣٩١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی پیغەمبەری خودا! کام خێرە زۆر خێرە؟ فەرمووی: (چەندەی لەدەستی مرۆڤی کەم دەست دێ! وە لەخێزانو خزمی خۆشتەوە دەست بکە بەخێرکردن). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ١٢٨١ چاپی چوارەم — د/حا/ص}.

کورد گوتەنی: خێر بۆ خوێش، ئینجا بۆ دەروێش.

٦٥٥- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {" تَصَدَّقُوا " فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، عِنْدِي دِينَارٌ؟ قَالَ: " تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى نَفْسِكَ " قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: " تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى وَلَدِكَ " قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: " تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى خَادِمِكَ " قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: " أَنْتَ أَبْصَرُ بِهِ"} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.

{أبوداود: ١٦٩١. نسائي ٥/٦٢. ابن حبان: ٣٣٣٧. حاكم ١/٥٧٥. حسن، الإرواء: ٨٩٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خێربکەن!) جا پیاوێ گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! دینارێکم هەیە چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (بەخێر بیدە بەخۆتو خەرجی بکە بۆ پێویستی خۆت، ئەویش هەر خێرە). پیاوەکە گوتی: دینارێ تریشم هەیە، ئەی ئەو چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (بەخێر بیدە بەمناڵەکانتو بۆ ئەوان خەرجی بکە، ئەویش هەر خێرە). پیاوەکە گوتی: دینارێ تریشم هەیە، ئەی ئەو چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (بیبەخشە بەنۆکەرو بەردەستەکانتو خەرجی بکە بۆ ئەوان، ئەویش هەر خێرە). پیاوەکە گوتی: دینارێ تریشم هەیە، ئەی ئەو چی لێ بکەم؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ ئەمەیان ئارەزووی خۆتە، چی بەباش دەزانیو کێ بە باش دەزانی بیبەخشە بەو).

(روونکردنەوە):

بۆ روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەو تێگەیشتنی تەواو لێی، ئەم فەرموودەیە، لەپوختەی موسلیمەوە ڕاگوێز دەکەین:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری، ناوی ئەبو مەزکور بوو، لەخێڵی بەنی عوزرە بوو، خولامێکی هەبوو، ناوی بەعقووب بوو، ئازادی کرد، بەمەرجێ کەلە پاش مردنی خۆی

ئازاد ببێ، کە بەمە لەزاراوەی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: مودبەر. واتە: پاشەمەرگ، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری نەبوو، وە داما بۆ ماڵ، جا لەپاشا، کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئەبو مەزکوری فەرموو: (ئایا ماڵی ترت هەیە، بێجگە لەم کۆیلەیە؟)

فەرمووی: (نەء، نیمە). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلەکەی خستە سەر سەواو فەرمووی: (کێ ئەم پیاوەم لێ دەکڕێ؟).

جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلای عەدەوی لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پارەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر لێی وەرگرتو دای بەخاوەنەکەی، کە ناوی ئەبو مەزکور بوو، لەپاشا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو:

(لەپێشا لەخۆتەوە دەست پێ بکە بەخێرکردن، ئەگەر ماڵت هەبوو، لەپێشا خێر بەخۆت بکە، جا ئەگەر لەخۆت مایەوە، با بۆ خاوخێزانت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە با بۆ خزمو خوێشت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە، ئەوا بەهەر چوار لاتا، درێغی لەبەخشینو خێرکردنو سامان بەخشین مەکە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢ + زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٣٧٦ — پوختەی موسلیم ٨٨٣ = ٢٣١٠ مسلم شیحا = تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٧٠ = ٢١٤١ بوخاری}.

٦٥٦– وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا أَنْفَقَتِ اَلْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا اِكْتَسَبَ وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلَا يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر البخاری/٢، ژمارە: ٦٨٤ = ١٤٢٥، ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥ بوخاری. پوختەی موسلیم

٥٥٢ = سيحا ٢٣٣٩ = مسلم ١٠٢٤. أبوداود. زكاة: ١٦٨٥. ترمذي. زكاة: ٦٧٢. ابن ماجة. تجارات: ٢٢٩٤. تحفة الأشراف: ١٧٦٠٨}:

عائيشه (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ژن، بەبێ دەستبڵاویو بەنیازی خێرکردن، لەخۆراکی ماڵەکەی ببەخشێ، ئەوە پاداشی باشی بۆ هەیە، لەسەر ئەو بەخشینە، چونکە ئەو هۆی جێ بەجێ کردنی بووە، هەروەها مێردەکەشی پاداشی باشی بۆ هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردووە، کلیلدارو کلیل بەدەستیش هەروەها، کەسیشیان لەپاداشی کەسیان کەم ناکەنەوە). واتە: نابن بەموزاحیمی یەکتری. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٣٨٦}.

٦٥٧- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {جَاءَتْ زَيْنَبُ اِمْرَأَةُ اِبْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، إِنَّكَ أَمَرْتَ اَلْيَوْمَ بِالصَّدَقَةِ، وَكَانَ عِنْدِي حُلِيٌّ لِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ، فَزَعَمَ اِبْنُ مَسْعُودٍ أَنَّهُ وَوَلَدُهُ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "صَدَقَ اِبْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ"} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٠١ = ١٤٦٢ بوخاری}:

تەواوی ئەم فەرموودەیە لەتجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان، یارەمەزان بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو ڕۆیشت بۆ نوێژگاکە، لەوێ نوێژی جەژنی بەکۆمەڵ بۆ کردین، کەنوێژەکە تەواو بوو، دەستی کرد بەپەندو ئامۆژگاری خەڵکەکە، وەفەرمانی پێکردن بەخێرکردن، فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! خێربکەن!).

ئەوجا ڕۆیشت بۆ ناو ژنەکانو پێی فەرموون: (ئەی ژن گەل! خێرو خێرات بکەنو زۆریش بپاڕێنەوە، داوای لێبووردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا، بینیم کە ئێوەی ژنان، زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بوون!).

ژنەکان عەرزیان کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەوە لەبەر چی وایە؟ فەرمووی: (زۆر رەفو نەفرین دەکەنو سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کە وەك ئێوە هەم کەم هۆشو هەم کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا، پیاو بەو هەموو زیرەکیو زرنگییەوە، دەیخەڵەتێننو بۆڕی دەدەنو دەیبەزێنن!).

لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەماڵەوە زەینەبی ژنی ئیبنو مەسعوود ڕۆیشت بۆ خزمەتی، رێخوازیی کردو داوای ڕێگەپێدانو مۆڵەتی کرد کەبچێ بۆ خزمەتی، عەرزیان کرد: قوربان! زەینەب هاتووە پرسیاری هەیە؟

فەرمووی: (کام زەینەب؟) گوتیان: ژنەکەی ئیبنو مەسعوود. فەرمووی: (دەی رێگەی پێ بدەن با بێ).

ئیتر ڕێگەیان پێدا. زەینەب گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەمڕۆ تۆ فەرمانت کردووە، کەئێمەی ژنان خێر بکەین، منیش بڕێ خشڵم هەیە، دەمەوێ کە بیکەم بەخێر، کەچی بەقسەی ئیبنو مەسعوودی مێردم بێ، ئەو خشڵە خێرە بدەم بە ئیبنو مەسعوودو بەمنداڵەکانی ئەوە خێری زۆرترە، ئایا ئەمە وایە؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیبنو مەسعوود ڕاست دەکا، قسەکەی تەواوە، ممێردەکەتو منالەکانت پێشیاوترین کەسن، کە ئەم خێرەی خۆتیان پێ بدەیت!). {ریاض/١/٢٦٢، ژمارە: ٣٢٦/١٥ + تاج/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١٨ چاپی چوارەم}.

٦٥٨- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَا يَزَالُ اَلرَّجُلُ يَسْأَلُ اَلنَّاسَ حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمـاره: ٧١١ = ١٤٤٧، ١٤٧٥، ٤٧٤٨ بوخـاری. پوختەی موسلیم: ٥٥٨ = شیحا ٢٣٩٣ = مسلم ١٠٤٠}:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (پیـاوی واتـان هەیـە، ئـەی موسوڵمانینە! هـەر خـەریکی دەرووزەو سواڵکردنە، هـەتا لـەرۆژی زینـەوەدا، کـەدێت بـۆ دیـوانی خـودای گـەورە، بـۆ لێپرسـینەوە یـەك پرزۆڵـە گۆشـت بەروویەوە نامێنێ، لەو دەشتی مەحشەرەدا، خودا مـۆری سـواڵکەری دەنـێ بـە روویـەوە، دەموچـاوی یـەك پارچـە، ئێـسقانی رووتـی بـێ گۆشـتە).**

{ریاض/٢/١٠٠، زنجیره: ٥٧، ژماره: ٥٣٠ + تاج/٢، زنجیره: ٢٠، ژماره: ١٢٦٧}.

**٦٥٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰـهِ (صَـلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): {مَنْ سَأَلَ اَلنَّاسَ أَمْـوَالَهُمْ تَكَثُّـرًا، فَإِنَّمَـا يَـسْأَلُ جَمْـرًا، فَلْيَـسْتَقِلَّ أَوْ لِيَسْتَكْثِرْ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.**

{مسلم شیحا: ٢٣٩٦}:

**ئەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بۆ کەڵەکە کردنو زۆرکردنی سامان سواڵ بکا، نەوەك لەبەر ئاتاجیو نەبوونی، ئەوە بەبی گومان کەپـشکۆی ئـاگر کۆدەکاتەوە بۆخۆی، لەدۆزەخدا داخ دەکرێ پێی، جا ئیتر ئـارەزووی خۆیـەتی، زۆر کۆدەکاتەوە یان کەم کۆدەکاتەوە).**

**٦٦٠- وَعَنِ اَلزُّبَيْرِ بْنِ اَلْعَوَّامِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَـلّى الله عَلَيْـهِ وسَلّم) قَالَ: {لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَأْتِي بِحُزْمَةِ اَلْحَطَبِ عَلَى ظَهْـرِهِ، فَيَبِيعَهَـا، فَيَكُفَّ اَللّٰهُ بِهَا وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ اَلنَّاسَ أَعْطَوهُ أَوْ مَنَعُوهُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.**

{تجریدی بوخاری/٢، ژماره: ٧٠٨ = ١٤٧٠، ١٧٨٠، ٢٠٧٤، ٢٣٧٤ + ١٤٧١، ٢٠٧٥، ٢٣٧٣}:

زوبـەيری کـوڕی عـەووام (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سوێندم بەو کەسەی کە گیانی منـی بەدەسـتە، کەسـێ لـەئێوە گوریـسێ هـەڵبگرێو بـچێ بـەکۆڵ کۆڵـەدار بهێنـێو بیفرۆشێو خۆی پێ ڕزگار بکا لەچاوبەرە ژێری ئەمو ئەو، هێشتا ئەوەی گەلێ باشترە لەوە کەبچێ دەست لەمەردووم پان بکاتەوەو سواڵ لەمو لەو بکا، ئـیتر ئـەو خەڵکـە بەشـی بـدەن یـان بەشـی نـەدەن! هـەر ئیـشکردنەکە بەقـەدرترە لەسواڵکردنەکە).

٦٦١- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْمَسْأَلَةُ كَدٌّ يَكُدُّ بِهَا اَلرَّجُلُ وَجْهَهُ، إِلَّا أَنْ يَـسْأَلَ اَلرَّجُـلُ سُلْطَانًا، أَوْ فِي أَمْرٍ لَا بُدَّ مِنْهُ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{ترمذی رقم: ٦٨١ صحيح الجامع: ١٩٤٧. الصحيح المسند: ٤٥٥}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

سـەموورەی کـوڕی جونـدوب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (سـواڵو دەرووزەو گـەدایی، هـەمووی چرنووکەو پیاو ڕووی خـۆی پـێ دەڕنێتـەوە، جـا ئـەوەی دەیـەوێ خـۆی ڕووو سوور بکا، لەهەردوو جیهانا، بـا ڕووی خـۆی بـە پـەنـد نـەکا، وە ئەوەیـشی کـە دەیـەوێ بـەهۆی سـواڵکردنەوە خـۆی ڕووزەرد بـکا، ئـەوە بەدەسـتی خۆیـەتی، مەگەر بۆ پیـاوێ کـە لـە فـەرمانڕەوا داوای بـەش بکـا، یـان بـۆ کـارو فـەرمانێ کەناچار بێ پێی). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٧٢ — د/ت/ن — س/ص}.

(ڕوونکردنەوە):

١- باسی خێرکردن (٦٦١ — ٦٤٩ = ١٢) دوازدە فەرموودەی واتیادا.

٢- موسـوڵمانی بەخـشندەی خێرکـەر، کەخێرەکـەی سـاخ لەبـەر ڕەزای خودا بێ، یەکێکە لەو تاقمانەی کە لەمەڵبەندە سەختو دژوارەکانی قیامـەتا، ئەو لەسێبەری بارەگای خودادا دەحەوێتەوە.

٣- خێرو بەخشین لەقیامەتا دەبێ بەچەترو سابات بۆ خاوەنەکەی‌و لەگەرمای دەشتی مەحشەر دەیپارێزێ.

٤- خێرو بەخشینی مرۆڤی کەم دەست گەورەترین خێرو بەخشینە.

## ٣٠- باسی دابەشکردنی زەکات‌و ئەو تاقمانەی کە زەکاتیان پێ دەشێ
## بابُ: قَسْمِ الصَّدَقَاتِ

٦٦٢– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَحِلُّ اَلصَّدَقَةُ لِغَنِيّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: لِعَامِلٍ عَلَيْهَـا، أَوْ رَجُـلٍ اِشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ غَارِمٍ، أَوْ غَازٍ فِي سَبِيلِ اَللَّهِ، أَوْ مِسْكِينٍ تُصُدِّقَ عَلَيْهِ مِنْهَا، فَأَهْدَى مِنْهَا لِغَنِيّ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَأُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.

{أحمد. رقم: ١١٥٥٥. أبوداود رقم: ١٦٣٦. ابن ماجة رقم: ١٨٤١، ٢٣٧٤. حاكم رقم: ١٤٨٠. بيهقى رقم: ١٢٩٤٦. عبدالرزاق رقم: ٧١٥١. صحيح الجامع: ٧٢٥٠}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (زەکات بەدەوڵەمەند ناشێ، مەگەر ئەو دەوڵەمەندە یەکێ بێ لەم پێنج کەسە:

١- سەرکاری سەر زەکاتەکە بێ‌و بەفەرمانی دەوڵەت، زەکات کۆبکاتەوەو سەرپەرشتی کۆکردنەوەو دابەشکردنی بکا.

٢- یا بەپارەی خۆی زەکاتەکە بکڕێتەوە لەزەکات وەرگرێ، وەك هەژارێ مەڕێ زەکاتی وەرگرتووە، دەوڵەمەندێ بەپارە لێی دەکڕێ، ئەوە لەماڵی هەژارەکە دەردەچێ‌و دەبێ بەماڵی دەوڵەمەندەکەو حەلاڵی خۆیەتی.

٣- یان دەوڵەمەدەکە بووبێ بەژێر قەرزەوەو قەرزار بێ.

٤- یان خەباتکێڕی ڕێگەی خودای گەورە بێ.

٥- یان كەسێ زەكات بدا بە هەژارێ، وەهەژارەكەیش بەدیاری بیدات بەدراوسێیەكی دەوڵەمەندی خۆی. {تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٢٥٣ — د/ئەحمد/حاكم - صحیح}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حاكم بەصەحیحی داناوە، بەڵام هەندێ زانای تر بە زەعیفیان داناوە، هۆی ئەوەیش كە بەزەعیفیان دناوە، ئەوەیە كەمورسەلە.

٦٦٣- وَعَنْ عُبَيْدِ اَللَّهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ اَلْخِيَارِ" {أَنَّ رَجُلَيْنِ حَدَّثَاهُ أَنَّهُمَا أَتَيَا رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَسْأَلَانِهِ مِنَ اَلصَّدَقَةِ، فَقَلَّبَ فِيهِمَا اَلْبَصَرَ، فَرَآهُمَا جَلْدَيْنِ، فَقَالَ: "إِنْ شِئْتُمَا، أَعْطَيْتُكُمَا وَلَا حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ، وَلَا لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ وَقَوَّاهُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.

{أحمد رقم: ١٨٠٠١. أبوداود رقم: ٦٣٣. نسائى فى الكبرى رقم: ٢٣٧٩. بيهقى رقم: ١٢٩٤٢. صحيح الجامع: ١٤٢٩}:

عوبەیدوڵڵای كوڕی عەدی كوڕی خییار، فەرمووی: دووپیاو بۆ خۆمیان گێڕایەوە، گوتیان: چووین بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوامان لێ كرد، كە لەزەكات بەشمان پێ بدات، پێغەمبەریش سەرەنجێكیان دەدا، دەڕوانێ، توانا و بەهێزن و توانا و بەهێزیش زەكاتی پێ ناشێ، لەبەر ئەوە لەم لایەنەوە هۆشیاریییان پێ دەداو خۆیان دەكا بەسەرپشك كەبەشیان بدات یان نا، وەپێیان دەفەرموێ: (زەكات بەم دوو دەستەیە ناشێ، بەدەوڵەمەندو بەمرۆڤی بەهێزی وا، كەبتوانێ بەكەسابەت خۆی بەخێو بكا، جا لەسەر ئەم بنیاتە ئارەزووی خۆتانە، ئەگەر دەتانەوێ ئەوا بەشتان دەدەم، ئەگەر دەشزانن كەپێتان ناشێ ئەوا وەری مەگرن).

(ڕوونكردنەوە):

عوبەیدوڵڵای كوڕی عەدی كوڕی ئەلخییار، لەسەردەمی پێغەمبەردا لەدایك بووە، لەسەردەمی وەلیدی كوڕی عەبدولمەلیكدا مردووە، خانوویەكی

هەبوو لەمەدینە، لەلای خانووەکەی عەلی کوڕی ئەبو طالیبا بوو، گێڕانەوەی لە عومەرو عوسمانەوە ئەنجام داوە.

عوبەیدوڵلا پێغەمبەری دیوە بەمناڵی، خۆیو عەدی باوکی لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، گەرچی هەندێ دەفەرموون: خۆی تابیعیە. عەدی هاوەڵێکی بەرێزی شکۆمەند بوو، یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەچاوی رێزو شکۆمەندی تەماشایان دەکرد.

عوبەیدوڵلا دەفەرموێ: لەسەرەمەرگا، باوکم پێی گوتم: ئەی کوڕی شیرینم! تووخودا، لەپاش مەرگی من کارێ وانەکەی کە روو زەردی ناوگۆڕم بکەی، چونکە کردەوەی مناڵ لەگۆڕا پیشانی باوکی دەدرێ!

عەدی گلەیی لەئیمامی عوسمان کرد، لەسەر ئەوە، کەوەلیدی کوڕی عوقبەی دایک برای عوسمان، ئارەق دەخواتەوەو خەڵکی کووفە دادیانە لەدەستی، عوسمانیش بەڵێنی پێدا، کە قامچی کاری دەکاو شولاقی لێ دەدا.

٦٦٤- وَعَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ اَلْهِلَالِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَلْمَسْأَلَةَ لَا تَحِلُّ إِلَّا لِأَحَدِ ثَلَاثَةٍ: رَجُلٌ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ، وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، اِجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَى مِنْ قَومِهِ: لَقَدْ أَصَابَتْ فُلَانًا فَاقَةٌ" فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ اَلْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ سُحْتٌ يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{پوختەی موسلیم ٥٦٨ = شیحا ٢٤٠١ = مسلم ١٠٤٤ أبوداود زكاة: ١٦٤٠ نسائي. زكاة: ٢٥٧٨. رياض/٢، زنجيره: ٥٧، ژماره: ٥٣٦}:

قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باربوویەکم لەئەستۆی خۆم گرتبوو. واتە: چووبوومە ژێر بڕێ ماڵی بڕیاردراو، کەبیدەم لەپێناوی ناوبژیکردنی دوو دەستەی ناکۆکدا. جا بۆ ئەم

مەبەستە، چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وەداوای پیتاکم لێ کرد بۆ ئەم مەبەستە. فەرمووی: (بمێنەرەوە هەتا زەکاتمان بۆ دێ، لەوە بەشت دەدەم بۆ ئەم کارەی کەتۆ پێی هەڵدەستیت. ئینجا فەرمووی: ئەی قەبیصە! دەرووزەو پیتاك کۆکردنەوە دروست نییە، بۆ ئەم سی کەسە نەبێ.

١- بۆ پیاوێ دروستە، کەچووبێتە ژێر ئەندازەیەك ماڵ، بۆ کوژانەوەی ئاژاوەیەك، بۆ ئەمە دروستە کە ئەوندە پیتاك کۆبکاتەوە تا ئەو ئەندازە دیاری کراوە پەیدا دەکاو، ئیتر دەبی واز بهێنێ.

٢- بۆ پیاوێکیش، کە بەهۆی کارەساتێکەوە هەژار کەوتبێ، بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە پیتاك کۆبکاتەوە هەتا گوزەرانی پێی دەڕوا بەڕێوە. یان فەرمووی: هەتا گوزەرانی پێ دەکا.

٣- بۆ پیاوێکیش، کەسێ پیاوی هۆشیار، لەهۆزی خۆی گەواهیو شایەتی بۆ بدەن کەفیسارەکەس هەژارو نابووت بووە، جا بۆ ئەمەیش دروستە کە ئەوەندە باربوویێ وەربگرێ، هەتا گوزەرانی پێی دەچی بەڕێوە.

یان فەرمووی: هەتا گوزەرانی پێ دەکا، ئەی قەبیصە! ئیتر لەمانە بترازێ، سواڵو دەرووزەو شت کۆکردنەوە، بەناوی یارمەتییەوە، نارەوایەو خاوەنەکەی، بەناڕەوایی دەیخوات. {تاج/٢/٤٦، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٣٤٧ چاپی چوارەم} .

(ڕوونکردنەوە):

قەبیصەی کوڕی موخاریقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شەدادی هیلالی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەبەصرە نیشتەجێ بوو، لەبنەماڵەیەکی خانەدان بوو، لەئەفرادی موسلیمە، لەبوخاریدا فەرموودەی نییە، یەکێ لەبگێڕەوە (راوییە)کانی قەطەنی کوڕی بوو، یەکێ تریان ئەبو عوسمانی نەهدی بوو.

٦٦٥- وَعَنْ عَبْدِ اَلْمُطَّلِبِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ اَلْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَلصَّدَقَةَ لَا تَنْبَغِي لِآلِ مُحَمَّدٍ، إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ اَلنَّاسِ}. وَفِي رِوَايَةٍ: {وَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلَا آلِ مُحَمَّدٍ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٥١٦ = ٢٤٧٨ مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = مسلم ١٠٧٢}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا:

عەبدولموتەلیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریث (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ ڕەبیعەی کوڕی حاریث کوڕی عەبدولموتەلیبو عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، کۆبوونەوەو تەگبیریان کرد: کەمن و فەزڵی کوڕی عەبباس، بنێرن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەقسەی لەگەڵا بکەین، سەبارەت بەوەی کەبیانکات بەکارمەندی سەرزەکات، ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر، ئەرکی خۆیان ببینن و لەهەمان کاتا، وەك ئەوانیش لەم بارەیەوە سوودمەند ببن، فەرمووی: باوکم و عەبباسی مامەم، خەریکی ئەم وتووێژە بوون، لەوکاتەدا عەلی کوڕی ئەبو طالیب هات بەسەریانا، ئەوانیش ئەم پێشنیارەیان بۆی باس کرد، عەلیش فەرمووی: شتی وامەکەن، بەخودا بۆیان ناکات.

باوکم – کەرەبیعەی کوڕی حاریث بوو – لێی ڕاپەڕی و پێی گوت: بەخودا تۆ بۆیە وا دەڵێی چونکە بەخیلی بەئێمە دەبەی، بەڵام تۆ کەبووی بەزاوای پێغەمبەرو فاطیمەی کچی ئەوت بۆخۆت هێنا، ئێمە بەخیلیمان بەتۆ نەبرد، عەلی فەرمووی: کەواتە بیان نێرن، جا ئێمە چووین بۆ خزمەت پێغەمبەرو عەلی ڕاکشاو پاڵکەوت.

جا کەچووین لەخزمەتیدا نوێژی نیوەڕۆمان بەجەماعەت کرد، ئیتر ئێمە پێش خۆی چووین بۆلای ماڵەکەی، لەوێ ڕاوەستاین، هەتا خۆشی هاتەوە، گوێی گرتینو ئەوجا فەرمووی: (ئادەی چیتان لەلایە هەڵیڕێژن!).

ئەوجا ئەو چووە ژوورەوەو ئێمەیش بەشوێنیا چووینە ژوورەوە، ئەو ڕۆژە نۆرە سەرەی زەینەبی کچی جەحش بوو، لەژنەکانی، کە پێغەمبەر لەلای ئەو بێ، فەرمووی: جا لەناو خۆمانا منو فەزڵ، دەستمان کرد بەمقۆ مقۆ، کە کاممان قسە بکەین، تا یەکێکمان دەستی کرد بەقسە کردنو گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! تۆ باشترین کەسیت، بۆ کەسوکاری خۆتو لەهەموو کەسێکی تریش سیلەی ڕەحم بەجێ دەهێنیو، ئێمەیش لەکەسوکاری تۆینو گەیشتووینەتە پلەی پیاوییو کاتی ژن هێنانمان هاتووە، جا هاتووین بۆ خزمەتی تۆ، کەبفەرموویت بمانکەیت بەسەرکاری سەر زەکات کۆکردنەوە، ئێمەیش وەك خەڵکانی تر، ئەرکی سەرشانی خۆمان بەجێ دەهێنینو زەکاتت بۆ کۆدەکەینەوەو، لەهەمان کاتا خۆشمان وەك ئەو خەڵکەی تر، کەسەرکارو کارمەندی تۆن، لەم لایەنەوە شتێکمان دەست دەکەوێ.

فەرمووی: ماوەیەکی زۆر زۆر، پێغەمبەر خامۆش بوو، قسەی نەکرد، تەنانەت ویستمان کەسەرلەنوێ، قسەی بۆ بکەینەوە، فەرمووی: زەینەبی هاوسەری پێغەمبەریش کە لەو دیو پەردەوە بوو ئاماژەی بۆمان کرد: کەقسە نەکەین بۆی، لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی ئێمەی دایەوەو فەرمووی: (ئەمەی ئێوە دەیڵێن نابێ، چونکە زەکات دەست نادات، بۆ کەسوکاری موحەممەد، چونکە زەکات هۆی سڕینەوەی پیسو پۆخڵی مەردومە زەکاتدەرەکەیە، ئەویش شایانی کەسوکاری موحەممەد نییە) ئەوجا فەرمووی: (ئادەی مەحمییەم بۆ بانگ بکەن).

مەحمییە پیاوێ بوو، سەرکاری کۆکردنەوەی خومس بوو، هەروا فەرمووی: (نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولوتەلیبیشم بۆ بانگ بکەن).

فەرمووی: جا هەردووكیان هاتن، حەزرەت بە مەحمییەی فەرموو: (كچەكەت مارە بكە لەم گەنجە). واتە: لەفەزڵی كوڕی عەبباس، ئەویش لێی مارە كرد، وە بەنەوفەڵی كوڕی حاریثیشی فەرموو: (كچەكەت مارە بكە لەم كوڕە). واتە: لەمن. ئەویش كچەكەی، كەئامۆزام بوو، مارە بڕی لەمن. ئەوجا بە مەحمییەی فەرموو: (لەدەستكەوتی پێنج یەك (خومس) مارەیی ئەم دوو بووكە، لەبری مێردەكانیان بدە!).

پێشەوا زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: فەرموودە گێڕەوەی پێش خۆم، كە عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی حاریثی كوڕی نەوفەڵی كوڕی حاریثی كوڕی عەبدولمطلیب بوو، ئەندازەی ئەو مارەییانەی باس نەكرد بۆم.

٦٦٦- وَعَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَشَيْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، أَعْطَيْتَ بَنِي اَلْمُطَّلِبِ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ وَتَرَكْتَنَا، وَنَحْنُ وَهُمْ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "إِنَّمَا بَنُو اَلْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ"} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ١٣٩٤ = ٣٥٠٢، ١٣٤، ٤٢٢٩}:

جوبەیری كوڕی موطعیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منو عوسمانی كوڕی عەففان چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیمانكرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! بۆچی لەپێنج یەكی پێنج یەك، واتە: لە خومسولخومس، بەشی بەرەبابی موطەلیب دەدەی، كەچی بەشی ئێمە نادەی، ئەمەیش لەكاتێكا كەئێمەو ئەوان هەرسێ لامان بۆتۆ، بۆ خزمایەتی وەك یەكینو لەیەك پلەو پایەداین؟

فـەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (ئـاخر بـەرەبابی بـەنی موططەلیبو بەرەبابی بەنی هاشم یەك شتن، لەبەر ئەوەی کە لەسـەردەمی پێش هاتنی ئیسلامو لەدوا هاتنی ئیسلام، پشتی یـەکتریان گرتـووەو هەمیـشە لەخۆشـیو ناخۆشـیدا چـوون یـەك بـوونو لەخۆشـیو ناخۆشـیدا هاوبەشـی یەکتری بوون!). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٥٠١ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

جوبـەیری کـوڕی مـوطعیم (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لـەپیاوماقوڵانی قورەیش بوو، نوێنەری قورەیش بوو، کە هاتە خزمەتی حەزرەت بـۆ بـەردانی دیلەکانی غەزای بەدر، لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا، موسوڵمان بـوو، زانایـەکی ڕەگـەزناس بـوو، لەئەبوبـەکری صـەدیقەوە فێـری زانـستی بنەچەناسـیو ڕەگەزناسـی بـوو بـوو، شەسـت فـەرموودەی هەیـە، نۆیـان وان لەبوخاریـدا، لەمەدینـە لەسـاڵی پـەنجاو چواری کۆچیدا مـردووە، لەسـەردەمی جێنـشینی موعاوییەدا.

٦٦٧- وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعَثَ رَجُلًا عَلَى اَلصَّدَقَةِ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَقَالَ لِأَبِي رَافِعٍ: اِصْحَبْنِي، فَإِنَّكَ تُـصِيبُ مِنْهَا، قَالَ:لا، حَتَّى آتِيَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَسْأَلَهُ. فَأَتَاهُ فَـسَأَلَهُ، فَقَـالَ: " مَوْلَى اَلْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، وَإِنَّا لَا تَحِلُّ لَنَا اَلـصَّدَقَةُ "} رَوَاهُ أَحْمَـدُ، وَالثَّلَاثَـةُ، وَابْـنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٢٢٨١، الصحيح المسند: ١٢٢١}:

ئـەبو رافیـع (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی بەنی مەخزوومی کرد، بەسەرکاری سەر زەکاتو ناردی، پیاوەکە بەمنی گوت: تۆیش ببە بەهاوڕێم، بەشی تۆیشی تێ دەکـەوێ! گوتم: بابچم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بپرسم، جا کەچووم

بۆ خزمەتیو لێیم پرسی، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ) (نۆکەو مەولای گەل لەخۆیانە، کەوابوو تۆ نۆکەری منی لەئێمەی، ئێمەیش دیارو ئاشکرایە کە زەکاتمان پێ ناشێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٩ چاپی چوارەم – د/ت – سند صحیح}.

٦٦٨– وَعَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ" {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُعْطِي عُمَرَ بن الخطاب اَلْعَطَاءَ، فَيَقُولُ: أَعْطِهِ أَفْقَرَ مِنِّي، فَيَقُولُ: "خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ، أَوْ تَصَدَّقْ بِهِ، وَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا اَلْمَالِ، وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{موسليم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا ٥٦٧ = ٢٤٠٣ = ٥٦٧ پوختەی موسلیم + تجریدی بوخاری/١٣٤/٢، ژمارە: ٧١٠ = ١٤٧٣، ٧١٦٣، ٧١٦٤ بوخاری}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەدا بەعومەری کوڕی خەطاب، عومەر دەیفەرموو: (ئەم ماڵە بدە بەکەسێ کە ئەو لەمن زیاتر پێویستی پێی هەبێ).

ئەویش (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەی عومەر! کاتێك لەم ماڵە شتێکت پێ درا، وەری بگرەو بیکە بەماڵ بۆ خۆت، یان بیکە بەخێرو بیبەخشە، بەمەرجێ چاوی تێ نەبڕیو خۆت داوای نەکەیت، ئەگەر وانەبوو خۆتی تێ مەگەیەنەو مەچۆ لەشوێنی!).

سالم – کەکوڕی ئیبنو عومەر بوو – دەیفەرموو: لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو، کە عەبدوڵڵای باوکم داوای شتی لەکەس نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بەشێ، یاماڵێ، یاشتێکی پێ بدرایە، وەری دەگرتو ڕەتی نەدەکردەوە!. {تاج/٢/٥٥، ژمارە: ١٢٦٥، زنجیرە: ٢٠ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، لەپەیڕەوانە، واتە: تابیعیە، لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، دایکی کچی یەزدەجورد بوو، کەپاشای ئێران بوو، ناسراو بوو بە (أَبو عبداللهِ المدني الفقيه) گێڕانەوی زۆری ئەنجام داوە: لە عەبدوڵڵای باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرە، لەکەسانی ترەوە، قورئانخوێنێکی جوان بوو، ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی سالمدا، لەپیاوچاکیو خواناسیو زوهدو بەڕێزیو شکۆمەندیدا وێنەی سالم کەم بوو!).

ئیبنو موبارەك دەفەرموێ: سالم یەکێکە لەحەوت شەرعزانەکانی مەدینە، کە پرسیارێکیان بۆ دەهات، هەر حەوتیان لێی دەکۆڵینەوە، قازی مەدینە ئەگەر پرسیارێکی بۆ حەل نەکرایە، دەینارد بۆ ئەوان، هەتا وەڵامەکەی ئەوانی وەرنەگرتایەتەوە بڕیاری نەدەدا. سالم سەوداو مامەڵەی بازاڕی دەکرد، هەتا مرد، ئیمامی ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە دەفەرموون: (دروستترین ڕشتە واتە: أَصَحُّ الأَسَانيد) زوهری لەسالم، لەباوکیەوە.

ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: سالم بیستنی لەعائیشەوە نیە، وا باوە کەلەمانگی قوربانی ساڵی سەدو شەستی کۆچیدا مردووە، دایکی سالمو دایکی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو دایکی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی، هەرسێکیان خوشك بوونو کچی یەزدەجورد بوون، کەدواهەمین پاشای ئێران بووە. لەساڵی (٦٥١)ی زاینیدا، لە کاتی ئازادکردنی خۆراساندا، لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە کوژراوە، نافیع کەفەقێی ئیبنو عومەر بووە، دەیفەرموو: هەموو جارێ کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، دەگەیشت بەسالمی کوڕی، ماچی دەکردو دەیفەرموو: (پیرێ پیرێ ماچ دەکا!).

جارێ هیشام لەناو بەیتا تووشی سالم بوو، پێی گوت: پێویستیت چییە پێم بڵێ، هەتا جێبەجێی بکەم بۆت. سالم پێی فەرموو: (شەرم لەخودا دەکەم کە لەناو ماڵەکەی ئەودا، داوا لەغەیری ئەو بکەم!) کاتێ کەلەبەیت چوونە دەرەوە، هیشام پێی گوتەوە: دەی ئێستا داوات چییە لێمی داوا بکە، هەتا پێتی بدەم. سالم فەرمووی: (بەخودا داوای دونیام لەخاوەنەکەی نەکردووە کە خودای گەورەیە، لەکەسێکی تر دەی چۆن داوای بکەم کەخاوەنی نییە!).

دەڵێن: ئیتر هیشام دەیکا بەچاواو نەخۆش دەکەوێو دەمرێ (ڕەزای خودا لەخۆیو لە عەبدوڵلای باوکیو لەعومەری باپیری بێو خودا لەخاکوپای ئەواندا حەشرمان بکا).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (٦٦٨ — ٦٦١ = ٧) حەوت فەرموودەی واتیادا.

## ٥- نامەی ڕۆژوو
## كِتَابُ الصِّيَامِ

{بڕوانە: تجریدی بوخاری/٢ لاپەڕە: ٢٦٣، زنجیرە: ٣٦ لە ژمارە: ٨٧١ هەتا ٩٢٦ + تاج/٢، لاپەڕە: ٧٠ هەتا ١٥٩ لە زنجیرە: ٢٥وە هەتا زنجیرە: ٧٧ لە ژمارە: ١٢٩٥وە هەتا ژمارە: ١٤٦٩ + پوختەی موسلیم لە ژمارە: ٥٧١وە هەتا ٦٣٨ لە زنجیرە: ٤٤٩وە هەتا زنجیرە: ٥٠٨ نامەی هەشتەم = ٨ کتاب الصیام + ریاض/٣، ژمارە: ١٢٢٤ هەتا ژمارە: ١٢٦٧ لە زنجیرە: ٢١٧وە هەتا زنجیرە: ٢٣١ لاپەڕە: ١٥٤ هەتا لاپەڕە: ١٨٤}:

٦٦٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا، فَلْيَصُمْهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٥٧٣ = ٢٥١٤ مسلم ترقيم شيحا = مسلم ١٠٨٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڕۆژو دوو ڕۆژ، لەپێش ڕەمەزانا، بەڕۆژوو مەبن، مەگەر بۆ کەسێ ڕۆژووی خۆی بگرێ، وەك ئەوە کەسێ دەستووری وابێ دوو شەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو بێ، یان ڕۆژووی قەزا بێ). {تاج/٢/١٢٨، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ١٤٠٥} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٩، ژمارە: ١٢٢٤}.

٦٧٠- وَعَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {مَنْ صَامَ اَلْيَوْمَ اَلَّذِي يُشَكُّ فِيهِ فَقَدْ عَصَى أَبَا اَلْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} وَذَكَرَهُ اَلْبُخَارِيُّ تَعْلِيقًا، وَوَصَلَهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح، الإرواء: ٩٦١}:

صیلە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەلای عەمماری کوڕی یاسیر بووین، دانیشتبووین، مەڕێکی برژاویان بۆ هێنا، عەممار فەرمووی: فەرموو بخۆن. پیاوێ لەکۆمەڵەکە جیابۆوە، وەگوتی: من بەرۆژووم، عەمماریش گوتی: هەرکەسێ ڕۆژووی ئەم ڕۆژە بگرێ، کەخەڵك گومانی لێ دەکەنو لێیان روون نییە، کە ڕەمەزانە یان ڕەمەزان نییە، ئەوە لەفەرمانی پێغەمبەر دەرچووە (درووودی خودای لەسەر بێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ١٤٠٧ چاپی چوارەم – د/ت/ن – س/ص – بوخاریش بەتەعلیق ریوایەتی کردووە}.

٦٧١- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {فَإِنْ أُغْمِيَ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ثَلَاثِينَ}. وَلِلْبُخَارِيِّ: {فَأَكْمِلُوا اَلْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ}.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمـارە: ٨٧٥ = ١٩٠٠، ١٩٠٦، ١٩٠٧ بوخـارى. پوختەى موسليم ٥٧٤ = ٢٥١٣ شيحا = مسلم ١٩٠٠، ١٠٨٠}:

ئيبنو عومەر (رەزاى خودايان لىٰ بىٰ) فەرمووى: لە پێغەمبەرم بيـست دەيفەرموو: (تا مانگى نوێ نەبينن نەبيكەن بە رەمەزانو نەبيكەن بەجەژن! ئەگەر هەوروهەڵاش بـوو، وە هـەور بـەرى مـانگى گرتبـوو، سيـى رۆژى تـەواو دابنـێن بـۆ مـانگى پێشوو، ئـيتر مـانگى پێشوو كولـەمانگ (شـەعبان) بـێ كـە دەكەوێتـە پـێش رەمەزانـەوە، يـان مـانگى رەمـەزان بـێ كـە دەكەوێتـە پـێش شەشەڵان (شەووال)ەوە.

گێڕانەوەى فەرموودەكەى ترى بوخارى ئاوايە:

عەبدوڵڵاى كوڕى عومەر (رەزاى خودايان لىٰ بىٰ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (مانـگ بيستو نۆ رۆژيـش دەبـێ، خـۆ مەرج نييە هەموو مانگـێ سيى رۆژى رەبـەق بـێ، هـەتا مـانگى يـەك شـەوەى رەمەزان، يان مـانگى يـەك شـەوەى شەشـەڵان نـەبينن، نەبيكـەن بەرەمـەزانو نـەبيكەن بەجەژن!).

ئەگەر وابوو هەوروهەڵاو تەپوتۆزو خۆڵبارينو شتى وابـوو، وە بـەرى مانگ بەهـەورو تـۆزو خۆڵبـارين گيرابـوو، ئـەوا سيـى رۆژى تـەواو دابنـێن بـۆ مـانگى پێشوو، ئەوسـا بيكـەن بەرەمـەزان، يـان بيكـەن بەجـەژن!. {تجريـدى بوخارى/٢، ژمارە: ٨٧٩ = ١٩٠٧ بوخارى} + {تجريد/٨٨٠ = ١٩١٠ بوخارى}.

٦٧٢- وَلَهُ فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ}.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٨٨٠ = ١٩١٠، ٥٢٠٢ بوخارى}:

ئەمەيش دەقەكەيەتى:

ئوم سەلەمەى هاوسەرى پێغەمبەر (دروودى خودا لەسەر پێغەمبـەرو رەزاى خودا لەهاوسەرە پاكيزەكانى) فەرمووى: جارێكيان پێغەمبـەر (دروودى

خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لەژنەکانی کەیەك مانگ نەچێتە لایان‌و دروست نەبێ لەگەڵیان، کەبەم جۆرە سوێندە لەزاراوەی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: (ئیلاء) جا لەپاش بیست‌و نۆ ڕۆژ، سەرلەبەیانی، یاسەرلەئێوارە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆلای خێزانەکانی، کە لەم بارەیەوە پێیان گوت: خۆتۆ سوێندت خواردبوو کەیەك مانگ نەچیت بۆلایان؟ فەرمووی: مانگ بیست‌و نۆ ڕۆژیش دەبێ، خۆ مەرج نییە گشت مانگێ (٣٠) سیی ڕۆژی دەق بێ!. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٢ چاپی چوارەم} + {ژمارە: ١٣١٣، ١٣١٤ تاج/٢}.

٦٧٣- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {تَرَاءَى اَلنَّاسُ اَلْهِلَالَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنِّي رَأَيْتُهُ، فَصَامَ، وَأَمَرَ اَلنَّاسَ بِصِيَامِهِ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح، الأرواء: ٩٠٨. الصحيح المسند ٧٤٥. أبوداود: ٢٣٤٢. إبن حبان ٣٤٤٧. حاكم ١/٥٨٥}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: لەناو خەڵکەکەدا مقۆ مقۆو دەنگۆیێ داکەوت، کە دەڵێن: گوایە مانگیان دیوە. منیش عەرزی پێغەمبەرم کرد: کەمن مانگم دیوە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەم خۆی بەڕۆژوو بوو، وەهەم فەرمانی کرد بەمەردوم کە بەڕۆژوو بن!. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ١٣٢٠}.

٦٧٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَالَ: {إِنِّي رَأَيْتُ اَلْهِلَالَ، فَقَالَ: " أَتَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ؟ " قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: " أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اَللَّهِ؟ " قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: " فَأَذِّنْ فِي اَلنَّاسِ يَا بِلَالُ أَنْ يَصُومُوا غَدًا"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ وَرَجَّحَ النَّسَائِيُّ إِرْسَالَهُ.

{ابن ماجه: ١٢٥٢. ترمذی ٦٩١. أبوداود: ٢٣٤٠. نسائی فی الكبری: ٢٤٣٤. ابن خزيمة: ١٩٢٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هات عەرزی حەزرەتی کرد: کە من بۆخۆم مانگم بینی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا شایەتی دەدەی کە هەر خودا خودایەو بەس؟) گوتی: بەڵێ: فەرمووی: (ئەدی باشە ئەی شایەتی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە؟) گوتی: بەڵێ: فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەی بیلال! بانگەواز بکەو جاڕ هەڵبدە بەناو موسوڵمانانا، با بەیانی بەڕۆژوو بنو بیکەن بەرەمەزان!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ١٣٢٠ چاپی چوارەم}.

ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیببان بە فەرموودەیەکی ساغو دروستی دادەنێن، بەڵام نەسائی ئەوە بە هێزدار دادەنێ کە مورسەل بێ.

٦٧٥- وَعَنْ حَفْصَةَ أُمِّ اَلْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ اَلصِّيَامَ قَبْلَ اَلْفَجْرِ فَلَا صِيَامَ لَـهُ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَمَالَ النَّسَائِيُّ وَاَلتِّرْمِذِيُّ إِلَى تَرْجِيحِ وَقْفِهِ، وَصَحَّحَهُ مَرْفُوعًا اِبْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ.

{أحمد رقم: ٢٦٥٠٠. أبوداود رقم: ٢٤٥٤. ترمذی رقم: ٧٣٠. نسائی الكبری رقم: ٢٦٤٣. إبن خزيمة رقم: ١٩٣٣. إبن ماجة رقم: ١٧٠٠. دارقطنی ١٧٢/٢}:

حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر، دایکی باوەڕداران (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو پەیڕەوانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەپێش شەبەقی بەیاندا، نیاز (نێت)ی ڕۆژووی فەرز نەهێنێ، ڕۆژووەکەی دانامەزرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١٣٢٢ - د/ت/ن - ئیبنو خوزەیمە/ئیبنو ماجە: ص}.

لەدارە قوطنیدا دەفەرموێ: حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ لەشەوەوە، لەرۆژی فەرزدا، نێت نەهێنێ، رۆژووەکەی دروست نییە). (صحیح الجامع: ٧٥١٦).

٦٧٦- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {دَخَلَ عَلَيَّ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) ذَاتَ يَوْمٍ. فَقَالَ: " هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ " قُلْنَا: لَا. قَالَ: " فَإِنِّي إِذًا صَائِمٌ " ثُمَّ أَتَانَا يَوْمًا آخَرَ، فَقُلْنَا: أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَقَالَ: " أَرِينِيهِ، فَلَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِمًا " فَأَكَلَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٦٣٠ = ٢٧٠٧، ٢٧٠٨ مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا = مسلم ١١٥٤}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ لامان، فەرمووی: (ئایا شتێ هەیە کە لەلاتان بیخۆم؟ عەرزیمانکرد: هیچ نییە. فەرمووی: (کەوایە رۆژووەکەم ناشکێنم) لەپاشا رۆژێ تر تەشریفی هات بۆلامان، عەرزیمانکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! کەشك بەخورماو رۆنمان هەیە، بەدیاری بۆمان هاتووە، ئایا ئەفەرمووی کەلێی بخۆیت؟ فەرمووی: (ئادەی پیشانمی بدە، خۆ من ئەمرۆ بەرۆژووشم، کەبۆیمان هێنا نۆشی کرد). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١٣٢٢}.

(رِوونکردنەوە):

ئەوەوی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەلگەیە بۆ ئەوە هەرکەسێ رۆژووی سوننەت بگرێ، خۆی ئاغای خۆیەتی‌و بۆی هەیە کەبیشکێنێ.

٦٧٧- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَزَالُ اَلنَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا اَلْفِطْرَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = مختصر صحیح البخاری = تجریدی بوخاری/٩٠٣ = ١٩٥٧ بوخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم: ٥٩٣ = ٢٥٤٩ شیحا = مسلم ١٠٩٨. ترمذی. صوم: ٦٩٩}:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل – ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (موسوڵمانان هەتا پەلە لەبەربانگ بکەن‌و بەربانگ بەقنگا نەخەن‌و، لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا ڕۆژوو بشکێنن، نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە کەهێشتا هەرباشن‌و پابەندن بە بەرنامەی شەریعەتەوەو لەڕێگەی ڕاست لایان نەداوە!). {تاج/٢/٩٣، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١٣٣٠ + ریاض/٣/١٦٧، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١٢٣٣}.

٦٧٨- وَلِلتِّرْمِذِيِّ: مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {قَالَ اَللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ أَحَبُّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا}.

{ترمذی: ٧٠٠. ضعيف الجامع: ٤٠٤١}:

تەرمەزی لە ئەبو هورەیرەوە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا (لە حەدیثیکی قودسیدا) دەفەرموێ: خۆشەویسترین بەندەکانم لەلام لەپاش بانگی شێوان ئەوانەیانە کەزووتر بەربانگ بکەنەوە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ١٣٣١}.

٦٧٩- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي اَلسَّحُورِ بَرَكَةً } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٨٧ = ١٩٢٣ بوخاری. پوختەی موسلیم. ٥٨٠ = ٢٥٤٤ شیحا = ١٠٩٥ مسلم}:

ئەنەسی کوڕی مالیک (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی موسوڵمانینە! کەویستتان بەرۆژوو بن، پارشێو بکەن، چونکە پیرۆزی‌و پیت‌و فەڕ وا لەپارشێودا).

{تـاج/٢/٩١، زنجـیرە: ٣٢، ژمـارە: ١٣٢٤ + ریـاض/٣/١٦٥، زنجـیرە: ٢٢١، ژمـارە: ١٢٢٩} . لــە (غایــة المــأمول)ی شــەرحی (تــاج الأصــول)دا، دەفــەرموێ: لەگێڕانەوەیەکدا دەفەرموێ: (ئەگەر چی بەقومێ ئاویش بووە، هەر پارشێو بکەن!).

٦٨٠- وَعَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ اَلضَّبِّيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ، فَإِنَّهُ طَهُورٌ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ وَابْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.

{أبـوداود ٢/٣٠٥ رقـم: ٢٣٥٥. ترمـذی ٣/٧٨ رقـم: ٦٩٥. نـسائی فـی الکبری/٢/٢٥٤ رقـم: ٣٣١٩. ابـن ماجـة ١/٥٤٢ رقـم: ١٦٩٩. حـاکم ١/٥٩٧ رقم: ١٥٧٥. ابن خزیمة ٣/٢٧٨ رقم: ٢٠٦٧. ابـن حبـان ٨/٢٨٢ رقـم: ٣٥١٥. بیهقی شعب الأیمان: ٣٨٩٨}:

سـەلمانی کـوڕی عـامیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەخورما بەربانگ بکەنەوە، چونکە شتێکی پاکو پیرۆزو موفەڕکە، خۆ ئەگەر خورما نەبوو، بەئاو ڕۆژووەکـەتان بشکێنن، چونکە ئاو هەم پاکـەو هـەم پاکەرەوەیـە، خـوا حـەزکا ڕۆژووەکـەتان دەبی بەپاکەوەکەری دەروونو دەرەوەتـان). {تـاج/٢، زنجـیرە: ٣٢، ژمـارە: ١٣٣٣ چاپی چوارەم} .

(ڕوونکردنەوە):

سـەلمانی کـوڕی عـامیر، هـاوڕێی پێغەمبـەرە، لەبەصـرە دائەنیـشت، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرەوە هەیە، لەسەردەمی پێغەمبەردا سـەلمان پـیر بـوو، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاویە مابوو.

٦٨١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنِ اَلْوِصَالِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ اَلْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اَللَّـهِ تُوَاصِـلُ؟ قَالَ: " وَأَيُّكُمْ مِثْلِي؟ إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي ". فَلَمَّـا أَبَـوْا أَنْ يَنْتَهُـوا عَـنِ

اَلْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا، ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا اَلْهِلَالَ، فَقَالَ: " لَوْ تَأَخَّرَ اَلْهِلَالُ لَزِدْتُكُمْ " كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريـدى بوخـارى/٢/٢٨٨، ژمـاره: ٩٠٧ = ١٩٦٥، ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩ بوخارى}:

ئەبو هـورەيرە (رەزاى خـوداى لىَ بـىَ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسـەر بـىَ) ڕێگـەى نـەدەدا، كـە يـەكىَ، لەرەمـەزانا، يـان لەمانگـەكانى تردا، كەدوو ڕۆژ لەسەريەك، يان زياتر، شەوو ڕۆژ بەڕۆژوو بـىَو لەوماوەيـەدا بـەهيچ جـۆرىَ ڕۆژووەكـەى نەشـكێنىَ. يـاران گوتيـان: تـۆ خـۆت وادەكـەى؟ فەرمووى: (جـا ئێـوە وەك مـن وان، مـن جيـاوازم لـەئێوە، مـن خـودا فرسـەتم دەداو بەشەو نانو ئاوم دەداتىَ).

جا هاوەڵان كەهەر وازيان نەهێنا، پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بىَ) دوو ڕۆژ لەسەريەك نەيـشكاند پێيـان، تامانگيـان دىَو بووبـە جـەژن، جـا فـەرمووى: (ئەگـەر مـانگ نەبينرايـە پـترم پـى دەگـرتن، وەك كەسـى بيـەوىَ چاوترسێنيان بكا، تا جارێكى تـر شـتى وا نەكـەن!). {تـاج/٢/١٠٧، زنجيرە: ٤١، ژمارە: ١٣٥٩ چاپى چوارەم = ج/٤}.

٦٨٢- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ لَـمْ يَـدَعْ قَوْلَ اَلزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ، وَالْجَهْلَ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَـرَابَهُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ.

{تجريـدى بوخـارى/٢/٢٦٦، ژمـارە: ٨٧٦ = ١٩٠٣، ٦٠٥٧ بوخـارى. أبوداود: ٢٣٦٢. تحفة الأشراف: ١٤٣٢١}:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لىَ بىَ) فەرمووى: (هەر ڕۆژووەوانىَ، كـە لەقسەى ناڕەواو كـارى نـاڕەوا وازنـەهێنىَ، خـودا كـارى بـەوە نييـە كـە ڕۆژ تـا ئێوارىَ، دەمى خـۆى ببەسـتىَو نـانو ئـاو نـەخوات، گوايـە بـەڕۆژووە، شـتى وا

لەمانگرتن لەخواردنو خواردنەوە دەچێ، هەتا لەرۆژوو گرتن!). {تاج/٢/٩٧، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ١٣٣٩ + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٢٣، ژمارە: ١/١٢٤٠}:

٦٨٣- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لِإِرْبِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: {فِي رَمَضَانَ}.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٩٠ = ١٩٢٧، ١٩٢٨ بوخاری. پوختەی موسلیم: ٥٩١ = ٢٥٧١. أبوداود. صوم: ٢٣٨٢. ترمذی. صوم: ٧٢٩. تحفة الأشراف: ١١٥٩٥}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرو هاوەڵانو پەیرەوانی بێ) فەرمووی: وا دەبوو: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرۆژوو بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا، ماچو مۆچو یاریو دەستبازی لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆیدا دەکرد. {واتە: بەم جۆرە شتانە رۆژوو ناشکێ} بەڵام کێتان وەك پێغەمبەری پێ دەکرێ، ئەو لەهەمووتان باشتر ئارەزووی خۆی پێ زەوت دەکرا، لەم لایەنەوەسنووری نەدەبەزاند، تا خوانەخواستە تووشی بێ شەرعی ببێ!. {تاج/٢/١٠٩، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ١٣٦١}.

لەگێڕانەوەی موسلیم/شیحادا، ژمارە: ٢٥٧٩ ئاوایە:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاروبار وادەبوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەرەمەزانا بەرۆژوو بوو، ژنی خۆی ماچ دەکرد.

٦٨٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِحْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢/٢٨٠، ژمارە: ٨٩٣ = ١٩٣٨ بوخاری}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرامدا، بە بەرگی ئیحرامەوە، کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت، وە لەکاتی بەرۆژوو بوونیشدا هەروا کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت. {تاج/٢/١٠٤، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ١٣٦٧ + تاج/٣، زنجیرە: ٦١، ژمارە: ٢٩٧٩}.

گێڕانەوەی ژمارە (٢٩٧٩)ی تاجول ئوصول ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئیحرامدا بوو، کاتێ کەڵەشاخی لەسەری خۆی گرت، چونکە ژانەسەرێکی لەگەڵدا بوو، گەلێ جار لایێ لەسەری دەئێشا، پێی دەگوترێ شەقیقە.

٦٨٥- وَعَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَتَى عَلَى رَجُلٍ بِالْبَقِيعِ وَهُوَ يَحْتَجِمُ فِي رَمَضَانَ. فَقَالَ: " أَفْطَرَ اَلْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ، وَصَحَّحَهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/٤/١٢٢ رقم: ١٧١٥٣. أبوداود رقم: ٢٣٦٩. نسائی فی الكبری رقم: ٣١٣٨. إبن خزيمة ١٩٦٢، صحيح الإرواء: ٩٣١}:

شەددادی کوڕی ئەوس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی رەمەزاندا، لە بەقیع پیاوێکی بینی، کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رۆژووی کەڵەشاخگرو کەڵەشاخ لێگیراو دەشکێ). ئەحمەدو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیببان بەدروستیان داناوە.

(روونکردنەوە):

شەددادی کوڕی ئەوسی کوڕی ثابیتی خەزرەجی، برازای حەسسانی کوڕی ثابیتە، خۆیو ئەوسی باوکی موسوڵمان بوون، (رەزای خودایان لێ بێ)

باوکی ئامادەی بەدر بوو، لە ئوحوددا شەهید بوو، پیاوێکی زاناو دانا بوو، ئامادەی عەقەبەی دووەم بوو، تابلێی قسەزان‌و ڕەوانبێژ بوو، بەحەوسەڵە بوو، لەکاتی توڕەبووندا ڕقی خۆی قووت ئەدایەوە.

شەدادی کوڕی، لەزانایانی هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، شامیەکان فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) موژدەی پێ دەدا کەخۆی‌و منداڵەکانی دەبن بەپێشەوایانی خەڵکی شام.

لەسەردەمی موعاویەدا، لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا، لە فەلەستین دەمرێ، لەساڵی پەنجاو هەشتی کۆچیدا، لەبەیتولمەقدیس نێژراوە.

٦٨٦- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أَوَّلُ مَا كُرِهَتِ اَلْحِجَامَةُ لِلصَّائِمِ" أَنَّ جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ اِحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَمَرَّ بِهِ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: " أَفْطَرَ هَذَانِ "، ثُمَّ رَخَّصَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعْدُ فِي اَلْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ، وَكَانَ أَنَسٌ يَحْتَجِمُ وَهُوَ صَائِمٌ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَقَوَّاهُ.

{صحيح الإرْواء: ٤/٧٢ – ٧٣. دارقطني: ٢/١٨٢. بيهقي: ٤/٢٦٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هۆی ئەوەی کە یەکەمجار، کەڵەشاخگرتن بۆ ڕۆژووەوان بەخراپ‌و ناباش دائەنرا ئەوەبوو: کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب بەڕۆژوو بوو، کەڵەشاخی لەخۆی گرت، پێغەمبەر لەلایەوە ڕەت بوو، فەرمووی: (ئەم دووانە: کەڵەشاخگرو کەڵەشاخ لێگیراو، ڕۆژووەکەیان شکاوە!).

بەڵام لەدوا جاردا، لەوەپاش، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی دا بەڕۆژووەوان، کە کەڵەشاخ لەخۆی بگرێ، ئەنەس خۆی وادەبوو کە بەڕۆژوو بوو، کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت‌و بەردەوامیش دەبوو لەسەر ڕۆژووەکەی خۆی). دارە قوطنی گێڕاویەتەوەو بە بەهێزی داناوە.

٦٨٧- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِكْتَحَلَ فِي رَمَضَانَ، وَهُوَ صَائِمٌ } رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ. وقَالَ اَلتِّرْمِذِيُّ: لَا يَصِحُّ فِي هذا البَابِ شَيْءٌ.

{صحيح، سنن ابن ماجة: ١٦٧٨}:

عائیشه (رهزای خودای لیّ بیّ) فهرمووی: پیّغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بیّ) لهرهمهزانا بهرۆژوویش بوو، چاوی خۆی رشت). {تاج/٢/١١١، زنجیره: ٤٤، ژماره: ١٣٦٩ چاپی چوارهم}.

ئیمامی تهرمهزی (رهحمهتی خودای لیّ بیّ) دهفهرمویّ: سهبارهت بهبابهتی چاورشتن‌و رۆژوو، فهرموودهیێ دروست دهست ناکهویّ. کهواته: ئهصلّ ئیباحهیه.

٦٨٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اَللَّهُ وَسَقَاهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژماره: ٨٩١ = ١٩٣٣، ٦٦٦٩ بوخاری. پوختهی موسلیم/٥٨٧ = شیحا/٢٧٠٩ = مسلم/١١٥٥. أبو داود. صوم: ٢٣٩٨. ترمذی. صوم: ٧٢٢. ابن ماجة/٦١٧٣}:

ئهبو هورهیره (رهزای خودای لیّ بیّ) فهرمووی: پیّغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بیّ) فهرمووی: (ئهگهر کهسیّ لهبیری نهبوو که بهرۆژووه، وهشتی خوارد، یاشتی خواردهوه، ئهوه با رۆژوووهکهی نهشکیّنیّو، رۆژووهکهی تهواوبکا، چونکه بهوه رۆژووهکهی پووچ نابیّتهوه، بهلّکوو ئهو نان‌و ئاوهیش کهخواردوویهتی، رزق‌و رۆزییهکی پاك بووه، خودا بۆی رهخساندووه!).

٦٨٩- وَلِلْحَاكِمِ: {مَنْ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ نَاسِيًا فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ وَلَا كَفَّارَةَ} وَهُوَ صَحِيحٌ.

{حسن، صحيح الجَامِعِ: ٦٠٧٠. حاكم رقم/١٥٦٩}:

حاكم (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەهەر شێوەیێ، لەرەمەزانا، ئەگەر لەبیری نەبوو، ڕۆژووەکەی بشکێنێ، ڕۆژووەکەی لەرووی شەرعەوە ناشکێ، لەبەرئەوە نەقەزای لەسەرەو نە کەفارەتی هەیە). دانەر دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەی حاکم دروستو صەحیحە.

٦٩٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ ذَرَعَهُ اَلْقَيْءُ فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَمَنْ اسْتَقَاءَ فَعَلَيْهِ اَلْقَضَاءُ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ. وَأَعَلَّهُ أَحْمَدُ. وَقَوَّاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ.

{أبو داود. رقم: ٢٣٨٠. ترمذی. رقم: ٧٢٠. ابن ماجة رقم: ١٦٧٦. حاكم رقم: ١٥٥٧. بيهقی رقم: ٧٨١٧. أحمد رقم: ١٠٤٦٨. دارقطنی رقم: ٢٢. طحاوی: ٩٧/٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ بەڕۆژوو بوو، ڕشانەوە زۆری بۆ هێناو، بەبێ خواستی خۆی ڕشایەوە، ئەوە گێڕانەوەو قەزاکردنەوەی لەسەر نییە، چونکە بەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ، بەڵام ئەگەر خۆی بەئەنقەست خۆی ڕشاندەوە، ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە، لەبەر ئەوە با ڕۆژووەکەی بگێڕێتەوە).

{تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، لاپەڕە: ١٠٧، ژمارە: ١٣٥٨ چ/٤ - چاپی چوارەم}.

دانەر مامۆستا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودەیەی بە مەعلوولو لاواز داناوە، بەڵام بەپێچەوانەوە، ئیمامی دارە قوطنی بە فەرموودەیەکی بەهێزی داناوە).

٦٩١- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) خَرَجَ عَامَ اَلْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ، فَصَامَ اَلنَّاسُ، ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ فَرَفَعَهُ، حَتَّى نَظَرَ اَلنَّاسُ إِلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ،

فَقِيلَ لَـهُ بَعْـدَ ذَلِـكَ: إِنَّ بَعْـضَ اَلنَّـاسِ قَـدْ صَـامَ. قَـالَ: "أُولَئِـكَ اَلْعُـصَاةُ، أُولَئِـكَ اَلْعُصَاةُ"}.

{پوختەی موسلیم/٥٩٧ = شیحاه/٢٦٠ = مسلم/١١١٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ئازادکردنی مەککە، لەرەمەزانا، بەرەو مەککە، خۆی و سوپاکەی، لەمەدینەوە دەرچوون، ساڵی هەشتی کۆچی بوو، دووی مانگی رەمەزان بوو، دوازدە رۆژ بەرێوە بوون، سەرلەبەیانی رۆژی سیازدەی مانگ گەیشتنە ناوشاری مەککە، لەرێگە بەرۆژوو بوون، هەتا گەیشتنە پێ دەشتێ پێی دەگوترێ: (کورا عولفەمیم). لەوێ عەرزی پێغەمبەریان کرد: قوربان! خەڵکەکە، سوپاکە، رۆژووەکە سەخڵەتی کردوون، چاوەڕوانی فەرمانی تۆیانە؟

ئەویش لەپاش نوێژی عەصر داوای جامێ ئاوی کردو، لەبەرچاوی عەشاماتەکە، بەرزی کردەوە بۆ دەمی، هەتا ببینن، خەڵکەکە تەماشایان کرد ئەوجا پێغەمبەر لەبەرچاوی ئەوان ئاوەکەی خواردەوە، خەڵکەکەیش چاویان لەو کردو رۆژووەکەیان شکاند، بەڵام عەرزی پێغەمبەر کرا: هێشتا بازێ کەس هەر بەرۆژوون، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوانە یاخین، ئەوانە یاخین!).

٦٩٢- وَفِي لَفْظٍ: {فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ اَلنَّاسَ قَدْ شَقَّ عَلَيْهِمُ اَلصِّيَامُ، وَإِنَّمَا يَنْظُـرُونَ فِيمَا فَعَلْتَ، فَدَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ بَعْدَ اَلْعَصْرِ، فَشَرِبَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ:

ئەمە ژمارە (٢٦٠٦ - شیحایە) مەبەستەکەی لە ژمارە (٦٩١)دا رابورد.

٦٩٣- وَعَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ رِضَى اَللَّهُ عَنْهُ" أَنَّهُ قَالَ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي أَجِدُ بِي قُوَّةً عَلَى اَلصِّيَامِ فِي اَلسَّفَرِ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ فَقَـالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اَللَّهِ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ، وَمَنْ أَحَـبَّ أَنْ

يَصُومَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَأَصْلُهُ فِي " اَلْمُتَّفَقِ " مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ" {أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو سَأَلَ}.

{پوختەی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٩٥ = ١٩٤٣ بوخاری. پوختەی موسلیم/ ٦٠٢ = ٢٦٢٤ شیحا}:

حەمزەی کوڕی عەمری ئەل‌ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من توانای بەرۆژوو بوونم هەیە لەسەفەردا، جا ئایا ئەگەر لەسەفەردا بەرۆژوو ببم گوناهم دەگات؟. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (رۆژوو شکاندن لەسەفەردا، مۆڵەتو روخصەتو ڕێگەپێدانێکە لەخوداوە، هەرکەسێ کار بەو مۆڵەتی خودا بکا، ئەوە کارێ باش دەکاو شتی جوانی کردووەو بەخششو خەڵاتی خودای رەت نەکردۆتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێ بەرۆژووش بێ، هیچ گوناهی لەسەر نییە).

(روونکردنەوە):

حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی، هاوەڵی پێغەمبەرە، بەخەڵکی حیجاز دائەنرێ، ساڵ دوازدە مانگە بەرۆژوو بوو، خەڵکی مەدینە فەرموودەکانی ئەویان دەگێڕایەوە، لەتەمەنی حەفتاو یەك، یان لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، لەساڵی شەستو یەکی کۆچیدا، مردووە.

جارێ لەسەفەرێکا، حوشترەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسەمییەوەو بەلەسە بوو، هەندێ لەشتەکان کە بەسەر پشتی حوشترەکەوە بوو، کەوتنە خوارەوە، وە ئەم رووداوەیش لەشەودا بوو، وەپیلانێ بوو، لەکۆمەڵێ ناپاکانەوە، وەلەکاتی گەڕانەوەدا بوو، لەغەزای تەبووك. حەمزە فەرمووی: شەوێکی زۆر تاریك بوو، من لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، لەخوداوە پەنجەکانم بۆم بوون بەچراو لایت، لەبەر رۆشنایی پەنجەکانم ئەو شتانەی کە لەوشترەکە کەوتبوونە خوارەوە، هەمووم دۆزینەوە، وەك قەمچیو پەتو گوریسو شتی تری وا.

هەر ئەم حەمزەیە بوو، کە موژدەی دا بەکەعبی کوڕی مالیك کە خودا تەوبەی لێ قەبووڵ کردووە. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٩٤١ = مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا ٦٩٦٨ + پوختەی موسلیم ژمارە: ١٥٣٠ = شیحا ٥٩٠٦ + پوختەی موسلیم زنجیرە: ١٤٦٢ ژمارە: ١٩١٨ = مسلم/شیحا ٦٩٤٧}.

٦٩٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {رُخِّصَ لِلشَّيْخِ اَلْكَبِيرِ أَنْ يُفْطِرَ، وَيُطْعِمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَالْحَاكِمُ، وَصَحَّحَاهُ.

{دارقطني: ٢/٢٠٥. حاكم: ١/٦٠٦ (١٦٠٧)}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: مۆڵەت دراوە بەپیری ئیختیار، کە لەمانگی ڕەمەزانا، بەرۆژوو نەبێ، لەجیاتی ئەوە، بۆ هەر رۆژەی کە بەرۆژوو نابێ، بەئەندازەی خواردەمەنی گەدایەك، کەفارەت بدات، گێڕانەوەو قەزای لەسەر نییە. ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ – ٢ – ١٤٨/البقرة}. واتە: پێویستەو فەرزە لەسەر ئەو موسوڵمانانە کەساغن و لەشوێنی خۆیانن، بەڵام لەبەر پیری و ناتەوانایی بەخەرجکردنی هەموو تەوانایی نەبێ، ناتوانن رۆژوو بگرن، تۆڵەو فیدیەی ئەو رۆژوویان بدەن، بۆ هەر رۆژەی بەئەندازەی خواردەمەنی گەدایەك) ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئەم ئایەتە روخسەت و مۆڵەتێکە بۆ ئەو پیرەمێردو پیرە ژنە ئیختیارانە، کە بەزۆر بەگران و بەزەحمەت، رۆژوویان بۆ دەگیرێ، جا ئەوانەی بەرۆژوو نابن، لەبەر پیری و مەهانەی ڕەوا، با لەباتی رۆژووی هەموو رۆژێ نانی هەژارێ بەتۆڵە (بەکەفارەت - بەفیدیە) دەدەن، ژنی سك پڕو ئافرەتی مناڵ بەبەریش، ئەگەر ترسیان هەبوو، لەتەندروستی خۆیان، یان لەسك و ساواکەیان، ئەوە ئەوانیش هەروەها (تاج/٢/١١٦، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ١٣٨٠ — د/ب). گفتەی بوخاری ئاوایە: ئیبنو

عــەباس (ڕەزای خودایــان لێ بــێ) دەڵــێ: ئــەم ئایەتــە، حــوکمو بڕیارەکــەی هەڵنەوەشاوەتەوەو نەسخ نەبۆتەوە، بەڵام ئەمە مۆڵەتو ڕێپێدانە بۆ ئەو پیرە مێردو پیرەژنە بەساڵاچوانەی، کەناتوانن بـەڕۆژوو بـن، جا لـەجیاتی ڕۆژووی هەموو ڕۆژێ، نانی هەژارێ دەدەن.

٦٩٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنـهُ) قَـالَ: {جَـاءَ رَجُـلٌ إِلَـى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ. قَالَ: " وَمَا أَهْلَكَـكَ ؟ " قَـالَ: وَقَعْتُ عَلَى اِمْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: " هَلْ تَجِدُ مَا تَعْتِقُ رَقَبَةً؟ " قَالَ: لَـا. قَـالَ: " فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ " قَالَ: لَا. قَالَ: " فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟ " قَالَ: لَا، ثُمَّ جَلَسَ، فَأُتِي اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم) بِعَـرَقٍ فِيـهِ تَمْـرٌ. فَقَالَ: " تَصَدَّقْ بِهَذَا "، فَقَالَ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا؟ فَمَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْـوَجُ إِلَيْـهِ مِنَّا، فَضَحِكَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم) حَتَّـى بَـدَتْ أَنْيَابُـهُ، ثُـمَّ قَـالَ: "اذْهَـبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ "} رَوَاهُ اَلسَّبْعَةُ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجريــدی بوخــاری/٢/٢٧٩، ژمــارە: ٨٩٢ = ١٩٣٦، ١٩٧٣، ٢٦٠٠، ٥٣٦٨، ٦٠٨٧، ٦١٦٤، ٦٧٠٩، ٦٧١٠، ٦٧١١، ٦٨٢١ بوخــاری. پوختــەی موسليم/ ٥٨٩ = ٢٥٩٠ شيحا. أبو داود. صوم: ٢٣٩٠. ترمذی. صـوم: ٧٢٤، ابـن ماجة. صيام: ١٦٧١. تحفة الأشـراف/١٢٢٧٥. نـسائی في الكـبری/٩/١٢٢٧٥. ابـن خزيمة/١٩٤٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێ هاتـە خزمـەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوی سەلەمە، یان سەلمانی کوڕی صەخر بـوو، عـەرزیکرد: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! فـەوتاوم فریـام کـەوە، فـەرمووی: (بۆچی فەوتاوی؟) گوتی: لەرەمـەزانا بـەڕۆژوو بـووم، لەگەڵ ژنەکەم دروسـت بووم، فەرمووی: (ئایا هەتـە کـە کۆیلـەیێ ئازادبکـەی؟) گـوتی: نـەء، فـەرمووی: (ئەی دەتوانی کەدوو مانگ لەسەر یەك، بەڕۆژوو بـی؟) گـوتی: نـەء، فـەرمووی: (ئەی دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی؟) گوتی: نەء، ئەبو هـورەیرە فـەرمووی:

جا پیاوەکە لەلای پێغەمبەر دانیشت، هەتا زەمیلەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە بکە بەخێر).

پیاوەکەیش گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! کێ لەئێمە هەژارترە، تا ئەم خورمایەی پێ بدەم، دەسا بەو خودایە، لەم پەڕی شاری مەدینەوە هەتا ئەوپەڕی شاری مەدینە، خێزانێکی وای تیا نییە، کە وەك ئێمە پێویستی بەم خورمایە هەبێ!.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەها پێکەنی، تەنانەت ددانە پێشینەکانی وەدەر کەوتن. ئەنجا فەرمووی: (دە بڕۆ دەرخواردی خێزانەکەی خۆتی بدە!). {تاج/٢/١٠٥، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ١٣٥٤ چاپی چوارەم}.

٦٩٦- وَعَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. زَادَ مُسْلِمٌ فِي حَدِيثِ أُمِّ سَلَمَةَ: وَلَا يَقْضِي.

{تەجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٢، لاپەڕە: ٢٧٨، ژمارە: ٨٨٩ = ١٩٢٥، ١٩٢٦، ١٩٣٠، ١٩٣١، ١٩٣٢. مسلم شیحا/٢٥٨٥، ٢٥٨٦، ٢٥٨٧، ٢٥٨٨ = ٥٨٦ پوختەی موسلیم = ١١٠٩}:

عائیشەو ئوم سەلەمە (کە هەردووکیان هاوسەری پێغەمبەر بوون، دەفەرموون: شەوی وا دەبوو، لەڕەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆیدا، دروست دەبوو، هەتا بەیانی لێ دەدا، بەو لەشگرانییەوە دەمایەوە، ئەوسا خۆی دەشۆردو لەکاتی ئاسایی نوێژی بەیانیدا، نوێژی بەیانی دەکرد، لەهەمان کاتا، ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو، مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم کارە بەیانی جەواز بوو. {تاج/٢/١٠٤، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ١٣٦٣، ١٣٦٤} + {ریاض/٣/٩٢٠، زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١٢٤٥}.

گێڕانەوەی ئوم سەلەمە ئاوایە: (جاری وا دەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلەشی پیسەوە، بەیانی لێ دەدا، لەشپیسی جووتبوونیش، نەوەك لەشپیسی شەیتانی بوون، لەگەڵ ئەوەشا نەرۆژووەکەی دەشکاندو نەقەزای دەکردەوە).

لەپوختەی موسلیمدا، ژمارە: (٥٨٦ = ٢٥٨٨ شیحا) ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ هات، بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کرد: من لەپشتی دەرگاکەوە گوێم لێیان بوو، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! وا دەبێ کەنوێژم لێ دەبێ، لەشم پیسەو لەشپیسیم لەسەرە، ئایا دروستە بەلەشی گرانەوە بەرۆژوو بم؟ فەرمووی: (شتی وا ئاساییە، منیش وا دەبێ کەنوێژم لێ دەبێ، لەشپیسیم لەسەرە، لەگەڵ ئەوەشا ئەو ڕۆژە بەرۆژوو دەبم).

پیاوەکە گوتی: قوربان! تۆ وەکوو ئێمە نیت، تۆ خودا لەگوناهی بەرودوات خۆش بووە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە وایە، بەڵام بەخودا، من ئومێد دەکەم کە لەهەمووتان زیاتر لەخودا بترسەمو لەهەمووتان زیاتر بزانم کەخۆم لەبێ فەرمانی خودا بپارێزم!).

٦٩٧- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩٠٠ = ١٩٥٢ بوخاری. پوختەی موسلیم/٦٠٥ = شیحا/٢٦٨٧}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز، دەفەرموێ: (کەسێ بمرێو ڕۆژووی لەسەر بێ، کەسوکاری دەتوانن لەباتی ئەو بەرۆژوو بنو بۆی بگێڕنەوە). {تاج/٢/١١٩، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ١٣٨٦}.

(روونكردنەوە):

(پوختەی ئەم باسە)

١- ئەم باسە (٦٩٧ — ٦٦٨ = ٢٩) بیستو نۆ فەرموودەی واتیادا.

٢- گرتنی رۆژووی گومانە رۆژ (يوم الشك) ناباشەو باش نییە.

٣- بە بینینی مانگی نوێ، هەم یەکەم رۆژی مانگی رەمەزان دەچەسپێ، هەم یەکەم رۆژی جەژن.

٤- ئەگەر هەورو هەلا بوو، یان بەری رۆژ بەدووکەڵو تەپو تۆز گیرا بوو، مانگی پێشوو دائەنرێ بە (٣٠) سیی رۆژی تەواو.

٥- رێ دەکەوێ کەمانگ (٢٩) بیستو نۆ رۆژ بێ، زۆرینەی کات، ساڵی مانگی شەش مانگی (٢٩) بیستو نۆ رۆژەو شەش مانگی (٣٠) سیی رۆژە، کە کۆیان دەکاتە: {٢٩×٦ = ١٧٤ + ٣٠×٦ = ١٨٠ + ١٧٤ = ٣٥٤ سێ سەدو پەنجاو چوار رۆژ، سەرجەمی ساڵی مانگی} .

٦- بەیەك شایەتی عادڵ رەمەزان ئیسپات دەبێ.

٧- نێت هێنان بەشەو، لەرۆژووی فەرزا پێویستە.

٨- رۆژووی سوننەت، رۆژووەوان خۆی سەرپشکە بۆی هەیە کەبیشکێنێ.

٩- کاتێ کەچەسپا بانگی ئێوارە بووەو نوێژی شێوان بووە، ئیتر سوننەتە بۆ رۆژووەوان، کە زووبەزوو، بەخورما یان بەئاو، یان بەخواردنو خواردنەوەی حەلاڵ رۆژووەکەی بشکێنێ، دواخستنی بەربانگ بەبێ مەهانەی رەوا کاری ناپەسەندە.

١٠- پارشێو سوننەتێ گەورەیە، ئەگەر بەقومێ ئاویش بووە پارشێو بکرێ سوننەتە.

١١- دوو رۆژ لەسەر یەك، یان زیاتر، کەسێ بەرۆژوو بێ زۆر ناباشە، کاری وا نابەجایە.

١٢- رۆژوو بەكەڵەشاخگرتنو بەچاوڕشتنو بەبۆنی خۆش لەخۆدان ناشكێ، بەڵام نەكرێن باشترە.

١٣- كەسێ لەبیری نەبوو، لە رەمەزانا، شتی خوارد، یا شتی خواردەوە، یان هەر كارێكی تری ئەنجام دا، كەرۆژووی پێ دەشكێ، مادەم لەبیری نەبووە قەیدی نییە، رۆژووەكەی بەوە ناشكێو رۆژووەكەی تەواوە، نەپێویستی بەگێڕانەوەیە، نە بەكەفارەت.

١٤- رشانەوە ئەگەر زۆری بۆ مرۆڤ هێناو رشایەوەو دەسەڵاتی خۆی تیا نەبوو، ئەوە زیانی بۆ رۆژووەكەی نیەو بەوە رۆژووەكەی ناشكێ، بەمەرجێ بەئارەزوو لەرشانەوەكەی خۆی قوت نەداتەوە.

١٥- خۆ رشانەوە، بەقەستی رۆژووی پێ دەشكێ، دەبێ لەوە دوا رۆژووەكەی بگێڕێتەوە.

١٦- رۆژووەوان لەسەفەردا، خۆی ئەمیندارو ئاغای خۆیەتی، دەتوانێ بەرۆژوو نەبێو دەتوانێ بەرۆژوو بێ. بەڵام ئەگەر لەسەفەردا رۆژووی شكاند دەبی لەوە دوا قەزای بكاتەوە.

١٧- پیرو ئیختیار بۆیان هەیە رۆژوو نەگرنو تۆڵە (فیدیە) بدەن، هەر رۆژەی تێرە خۆركەری هەژارێ.

١٨- كەسێ بەرۆژ، لەمانگی رەمەزانا، بەدروست بوون لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەری خۆیدا، رۆژووەكەی بەئارەزوو بشكێنێ دەبێ:

١- دوو مانگی قەمەری لەسەر یەك بەرۆژوو بێ.

٢- ئەگەر نەیتوانی دوومانگ بەرۆژوو بێ، دەبێ كۆیلەیێ ئازادبكا.

٣- ئەگەر ئەوەیشی بۆ نەكرا، ئەوا دەبێ نانی ژەمێكی شەست گەدا بدات.

١٩- رۆژوو بۆ لەشپیس دروستە، واتە: لەشگرانیو جەنابەتو لەشپیسی كاریگەری لەسەر رۆژوو نییە، ئەگەر كەسێ مانگی رەمەزان سەراسەری لەشی

پیس بێ، وه بەرۆژوو بێ، رۆژووەکەی دروستە. بەڵام بەبێ گومان کەمرۆڤ بەلەشی پاکەوه بەرۆژوو بێ زۆر زۆر باشترە.

٢٠- کەسوکاری مردوو، دەتوانن رۆژووی بۆ بگرنەوە، هەروا دەتوانن نوێژو حەجیشی بۆ بگێرنەوە، وەهەموو جۆره خێرێکی تری بۆ بکەن، وەك قوربانیو خەتمەی قورئان. {بڕوانه: پوختەی موسلیم ژماره: ٦٠٦}.

## ٣١- باسی رۆژووی سوننەتو ئەوشتانەی کە لەرۆژوودا، جڵەوگیرییان لێکراوه

## بَابُ: صَوْمِ التَّطَوُّعِ وَمَا نُهِيَ عَنْ صَوْمِهِ

٦٩٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ. وَقَالَ: " يُكَفِّرُ اَلسَّنَةَ اَلْمَاضِيَةَ وَالْبَاقِيَةَ "، وَسُئِلَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ. قَالَ: " يُكَفِّرُ اَلسَّنَةَ اَلْمَاضِيَةَ" وَسُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ اَلِاثْنَيْنِ، قَالَ: "ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَبُعِثْتُ فِيهِ، أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ "} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسليم/٦٢٠ = ٢٧٣٨ شيحا = ١١٦٢ مسلم + پوختەی موسليم/٦٢٤ = ٢٧٤٢ شيحا = موسليم/١١٦٢}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی خێری گرتنی رۆژووی رۆژی نۆی مانگی قوربانەوە، لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار کرا، کە لەو رۆژەدا حاجیان وان لەکێوی عەرەفە، سەرگەرمی ئەرك‌و کردارەکانی حەجن، وه لەبەر ئەوه پێی دەگوترێ رۆژی عەرەفە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵامدا فەرمووی: (گرتنی رۆژی ئەم رۆژە، برێتی گوناهی ساڵی پێش خۆی‌و ساڵی پاش خۆی دەکەوێ).

هەروا پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی گرتنی رۆژووی رۆژی عاشوراوه، کەعاشوراء، رۆژی دەیەمی مانگی موحەررەمە، ئایا سوننته یان نا؟ وەخێری چییەو چی نییە؟.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا فەرمووی: (برێتی گوناهی ساڵی پێش خۆی دەکەوێ!).

هەروا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارکرا، لەبارەی گرتنی رۆژووی رۆژی دووشەممانەوە، کەشتی وا سوننەتە یانا؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (من لەرۆژی دوشەممەدا لەدیك بوومو، هەر لەم رۆژەیشدا خودا کردمی بە پێغەمبەرو رەوانەی کردم بۆ ڕاگەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامو هەر لەم رۆژەیشا، یەکەمجار قورئانم بۆ هات، کەواتە: ئەم رۆژە رۆژێکی پیرۆزەو شایانی ئەوەیە کەمرۆڤ تیایدا بەرۆژوو بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ١٤٣٦، ١٤٣٧، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ١٤٣٩ + زنجیرە: ٦٩ تاج/٢، ژمارە: ١٤٤٦، ١٤٤٧ لاپەڕە: ١٤٧ چ /٤ = چاپی چوارەم } + {ژمارە: ٧١٤ لەدواوە}.

٦٩٩- وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ اَلدَّهْرِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٦١٨ = ٢٧٥٠ شیحا = مسلم ١١٤٦} {أبوداود. صوم: ٢٤٣٣. ترمذی. صوم: ٧٥٩. تحفة الأشراف: ٣٤٨٢}:

ئەبو ئەیوبی ئەنصاری فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر موسوڵمانێ کاتێ مانگی ڕەمەزان هات، رۆژووەکەی بگرێو، لەپاشان، لەپاش یەکەم رۆژی جەژن، شەش رۆژیش لەمانگی شەشەڵان بگرێ، ئەوە وەکوو ئەوە وایە، کە بەدرێژایی ساڵ، ساڵ دوازدە مانگە، بەرۆژوو بێ وایە). {تاج/٢/١٤١، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ١٤٣٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەوەی کە لەژمارە (٦٩٨)دا، دەفەرموێ: گرتنی رۆژووی رۆژی عەرەفە، برێتی گوناهی ساڵی پێش خۆیو ساڵی پاش خۆی دەکەوێ، مەبەست لەساڵی

پێش خۆی لەنۆی مانگی قوربانی ئەو ساڵەوەیە، کەرۆژووەکەی دەگرێ، هەتا نۆی مانگی قوربانی ساڵی پێشی، وەهەروەها ساڵی پاشیشی، لەنۆی مانگی قوربانەوەیە، هەتا نۆی مانگی قوربانی داهاتوو.

٢- شەش رۆژەی شەشەڵان، بەدوو شێوە دەگیرێ:

یەکەم: لەپاش رۆژی جەژن، کە یەکەم رۆژی مانگی شەشەڵانە، شەش رۆژ لەسەر یەك بەبێ پەچڕان، لەدووەم رۆژی مانگەوە، هەتا حەوتەم رۆژی بەرۆژوو بێ، وە سوننەتە هەموو رۆژێ پارشێو بکاو نێت بهێنێو زووبەزوو بەربانگ بکاتەوە. کورتو پوخت:

آ- ئەوەی رۆژووی رەمەزانی پێ دەشکێ، رۆژووی سوننەتیشی پێ دەشکێ.

ب- هەرچی لەرۆژووی رەمەزاندا سوننەتە، لەرۆژووی سوننەتیشدا سوننەتە، وەك پارشێو بەربانگ بەخورما.

ج- ئەوەی کە لەرۆژووی فەرزدا مەکرووهە یان حەرامە لەرۆژووی سوننەتیشدا، یان ناباشو ناپەسەندو مەکرووهە، یان حەرامو نادروستە.

دووەم: مرۆڤ دەتوانێ لەپاش یەکەم رۆژی جەژن شەش رۆژ، لەدووەم رۆژی شەشەڵانەوە هەتا ئاخر رۆژی هەڵبژێرێو بەنیازی سوننەتی رۆژووی شەشەڵان بە رۆژوو بێ، ئیتر گرنگ ئەوەیە کە شەش رۆژ لەم مانگە بەرۆژوو بێ، لەهەرکوێیەکەوە بێ دەبێ بەسەریەکەوە بێ دەبێ، پچڕ پچڕ بێ دەبێ.

سێیەم: آ- مەرج نییە کە شەش رۆژی تەواو بەرۆژوو بێ، دروستە رۆژێ، یادوو رۆژ، یان زیاتر بەناوی سوننەتی رۆژووی مانگی شەوالەوە بەرۆژوو بێ.

ب- دروستەو سوننەتە کەسەرجەم مانگی شەوال بەرۆژوو بێ، وەهەروەها رۆژنا رۆژێ بەرۆژوو بێ.

ج- ئەوەی لەمانگەکانی تردا سوننەتە، لەمانگی شەشەڵانیشدا سوننەتە، وەك رۆژووی سیازدەو چواردەو پازدە، یان دووشەممانو پێنج شەممان.

٧٠٠- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اَللَّهِ إِلَّا بَاعَدَ اَللَّهُ بِذَلِكَ اَلْيَوْمِ عَنْ وَجْهِهِ اَلنَّارَ سَبْعِينَ خَرِيفًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجريدی بوخاری/٣ لاپەڕە: ٣٠١، ژمارە: ١١٧٠ = بوخاری: ٢٨٤٠. پوختەی موسلیم ٦٠٩ = شیحا ٢٧٠٤ = مسلم ١١٥٣}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ، لەبەر ڕەزای خودا، بەهۆی ئەو ڕۆژە ڕۆژووەوە، خودای گەورە، حەفتا ساڵە ڕێ، ڕووی لەئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە!). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٣٠، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ١٤١٠ چاپی چوارەم}.

٧٠١- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ، وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ قَطُّ إِلَّا رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ مِنْهُ صِيَامًا فِي شَعْبَانَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژمارە: ٩٠٩ = ١٩٧٠، ١٩٦٩، ٦٤٦٥ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦١٦ = شیحا ٢٧١٤ = مسلم ١١٥٦}:

ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی چۆنێتیو چەندێتی ڕۆژووی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارم لەخاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر کرد، فەرمووی: دەستووری ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوابوو: جاری وادەبوو کە دەستی دەکرد بەگرتنی ڕۆژوو، هەر بەردەوام بوو لەسەری، تەنانەت دەمانگوت: ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێو نایشکێنێ، جاری وایش دەبوو کە بەڕۆژوو نەدەبوو، دەمانگوت: بەردەوام دەبێ لەسەر ڕۆژوو شکاندن، نەیشم دیوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مانگێکی تەواو بەڕۆژوو بێ، بێجگە لەمانگی

رەمەزان، هەرگیز نەیشم دیوە کە لەهیچ مانگێك بەقەی مانگی کوڵەمانگ (مانگی شەعبان) بەرۆژوو بێ، بەڵکوو کوڵەمانگی هەمووی دەگرت کەمێکی نەبێ. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ١٤٢٧ لاپەڕە: ١٣٨ چاپی چوارەم}.

٧٠٢- وَعَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أَمَرَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ نَصُومَ مِنْ اَلشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ } رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{حسن، سنن النسائي: ٢٤٢٢. ترمذي: ٧١١. ابن حبان: ٣٦٥٦}:

ئەبو زەڕی غیفاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کردووە، کە لەهەموو مانگێ، سێ رۆژ بەرۆژوو بین، کەبرێتین لەسیازدەو چواردەو پازدەی مانگ. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ١٤٤٣، ١٤٤٤، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ١٤٤٥}.

٧٠٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَزَادَ أَبُو دَاوُدَ: {غَيْرَ رَمَضَانَ}.

{صحيح الجامع: ٧٣٥٢، تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ١٧٧٤ = ٥١٩٥، ٥١٩٢، ٥٣٦٠، ٢٠٦٦ بوخاری. پوختەی موسلیم ٥٥٤ = مسلم ترقيم شيخ خليل مەئموون شيحا ٢٣٦٧ = مسلم ١٠٢٦}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە: دەیکەین بەتەواوکەری ئێرە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ ژنی مێردار، کەرۆژووی سوننەت بگرێ، ئەگەر مێردەکە لەگەڵیا بێ، مەگەر بەرەزامەندی مێردەکەی، هەروەها نابێ کەژن ڕێگەی کەس بدات، کەهاموشۆی بکاو بچێ بۆماڵی مەگەر بەرەزامەندی مێردەکەی‌و مێردەکەی ڕەزای لەسەر بێ، هەرکاتێکیش کە ژن، بەبێ وەرگرتنی فەرمانی روون‌و ئاشکرا لەمێردەکەی، لەماڵی مێردەکەی،

خێرێ بکا، یان شتێ ببەخشێ، یان شتێ خەرج بکا، بۆ کاری خێر، ئەوە خێری ئەو بەخشینە نیوەیی نە، لەنێوانی خۆیو مێردەکەیدا). {تاج/٢/٥٢١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٢١١٥ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٢٨٦ + ریاض الصالحین/١، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٢}.

(ڕوونکردنەوە):

١- کەسوکاری خۆیو مەحرەم، بەشێوەیەکی گشتیو بەپێی عورفو دەستوورو باوی جوانی ناو کۆمەڵگا، دروستە هاموشۆی ماڵی یەکتری بکەنو، مۆڵەتو ڕێگەپێدانی گشتی مێرد، لەم لایەنەوە بەسە، وەنابێ هەندی ڕووداوی ناشایستەی شاز، بکرێ بەڕێساو یاساو، بکرێ بەمەهانە بۆ پێشگیری لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا.

٢- ڕۆژووی سوننەتی ژن، ئەگەر مێردەکەیشی ڕەزای لەسەر نەبێ، حەرام نییە، بەڵام ناباشیو کەراهەتی هەیە، بەمەرجێ مێردەکەی لەسەر هەق بێت، دەنا ئەگەر لەسەر هەق نەبوو، ئەوە ناباشیو کەراهەتیشی نییە.

٣- ژنو نۆکەرو مناڵی فامیدەو کلیل بەدەستو ئەمیندار، ئەگەر خاوەن شت ڕێگەی پێیاندا، یان بەزەینی خۆیان وایان دەزانی کە ڕەزای لەسەرە، یان بەپێی باوی دامەزراوی ناو کۆمەڵایەتی، شتێکیان بەخشی بەهەژارێ، وە لەو بڕوایەدا بوون کەخاوەن شتەکە، ئەو جۆرە بەخشینەی پێ ناخۆش نییە، ئەوە لەهەموو ئەم حاڵەتو شێوە کارانەدا، ئەوانیش دەبن بەخاوەن بەش لەو خێرەدا. بۆ بەهرە وەرگرتنی زیاتر لەم بابەتە بڕوانە: تجریدی بوخاری بەرگی پێنجەم، بەکوردی لاپەڕە: ٤٣، ژمارە: ١٧٧٤ — ڕاڤەو شیکردنەوە.

٧٠٤- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ اَلْفِطْرِ وَيَوْمِ اَلنَّحْرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٥، لاپەڕە: ١٣٦، ژمارە: ١٨٣٩ = ٥٥٧١، ١٩٩٠، ١٩٩١ بوخارى. پوختەى موسليم ٦٢٢ = شيحا ٢٦٦٦ - ٢٦٤٦. أبوداود. صوم: ٢٤١٦. ترمذى. صوم: ٧٧١. تحفة الأشراف: ١٠٦٦٣، ١٠٣٣٠}:

**لەپوختەى موسليمو لەپوختەى بوخاريدا ئاوايە:**

**زوهرى (رەزاو رەحمەتى خوداى لىٚ بىٚ) فەرمووى: ئەبو عوبەيدى ئازادكراوى ئيبنو ئەزهەر، بۆى گێڕامەوە، فەرمووى: لەكاتى جێنشينى پێشەوا عومەرى كوڕى خەطابدا، لەخزمەتيدا، ئامادەى كردنى نوێژى جەژنى قوربان بووم، لەپێش وتار خوێندنەوەدا نوێژى جەژنى بۆمان كرد، ئەوجا وتارى داو فەرمووى:**

**ئەى موسوڵمانينە! پێغەمبەرى خودا، (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) جڵەوگيرى كردووە لەگرتنى رۆژووى رۆژى جەژنى رەمەزانو رۆژووى رۆژى جەژنى قوربان، چونكە يەكەميان رۆژى جەژنى رۆژوو شكاندنە، ئەوى تريشيان رۆژى خواردنى قوربانييەكانە. {بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ١٢٧، زنجيرە: ٥٣، ژمارە: ١٤٠٢}.**

**لێرەدا ئاوايە:**

**ئەبو سەعيدى خودرى (رەزاى خوداى لىٚ بىٚ) دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) نەيى كردووە لەگرتنى رۆژووى ئەم دوو رۆژە: رۆژى جەژنى رەمەزانو رۆژى جەژنى قوربان. {تاج/٢/١٢٧، زنجيرە: ٥٣، ژمارە: ١٤٠٢ چاپى چوارەم}.**

**ئيمامى زوهرى (رەحمەتى خوداى لىٚ بىٚ) ناوى: (پێشەوا ئەبوبەكرى موحەممەدى كوڕى موسليم)ە، نازناوى زوهرييە، ناسراوە بە (ئيبنو شەهاب) لەپەيڕەوانە، لەتابيعييە بچكۆلەكانە، لە پەنجا هەتا پەنجاو شەشى كۆچى لەدايك بووە، لەپياوانى شەش پەيڕەوەكەيە، واتە: لەريجالى كوتوبى سيتتەيە، كەبوخارىو موسليمو ئەبوداودو تەرمەزىو نەسائىو ئيبنو ماجەن،**

فەرموودەی لەئیبنو عومەرو ئیمامی ئەنەس و هاوەڵانی ترەوە وەرگرتووە، فەقێو مەلاو شەرعزانێكی گەورە بوو، یەكێ لەفەقێكانی زوهری پێشەوا عومەری كوڕی عەبدولعزیز بوو.

زوهری دە كەسی لەهاوەڵان بینیوە، هەموو زانستی هەر حەوت شەرعزانەكانی لەبەر بوو، كەناسراون بە (الفقهاء السبعة).

پێشەوا عومەری كوڕی عەبدولعزیز، نامەی نووسی بەهەر چوار لادا، زانای گەورەی وەك ئیبنو شەهابتان دەست ناكەوێ. زوهری كە دادەنیشت كتێبەكانی بەدەوری خۆیدا ریز دەكردو ناوبەناو موراجەعەی دەكردن، ژنەكەی رۆژێ پێی گوت: بەخودا ئەم كتێبانەی تۆ، لەسێ هەوێ زیاتر ئازارم دەدەن!.

باوكی كەناوی موسلیم بوو، لەگەڵ موصعەبی كوڕی زوبەیردا ئیسلام بوو، زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) نزیكەی دوو هەزار فەرموودەی هەیە، نیوەیان موسنەدن، لەیث دەفەرموێ: زوهری فەرمووی: (هەرچیم لەبەر كردبێ لەبیرم نەچۆتەوە).

پیاوێكی زۆر بەخشندە بوو، دەڵێن: ساڵی پەنجای كۆچی لەدایك بووە، وە لەرەمەزانی ساڵی سەدو بیستو پێنجی كۆچیدا مردووە، زوهری لەشام نیشتەجی بوو، برازایەكی زوهری دەیگوت: زوهری مامم، بەهەشتا شەو هەموو قورئانی لەبەر كردو لەسنگیا كۆی كردەوە!

سوفیان دەڵێ: زوهری ساڵێ هات بۆ ناومان، قژەسەریو ریشی مەیلەو سوور بوو، وەك گیرابێتە خەنەو وسمە وابوو، چاوەكانی كەمێ پرووشاوی بوون، لەساڵی سەدو بیستو سێدا هات بۆ لامان، لەلامان مایەوە هەتا سەرەتای مانگی موحەررەمی ساڵی (١٢٤) سەدو بیستو چوار. سوفیان دەفەرموێ: ئەوكاتە من شازدە ساڵ بووم. موعەممەر دەفەرموێ: زوهری دەیفەرموو:

هەشت ساڵی ڕێك ئەژنۆم دەیدا لەئەژنۆی سەعیدی کوڕی موسەییەب‌و لەخزمەتیدا دائەنیشتم.

ئیمامی مالیك فەرمووی: جارێ زوهری سەد فەرموودەی گێڕایەوە بۆمان، ئەوجا ئاوڕی لەمن دایەوەو ڕووی تێکردم‌و فەرمووی: ئەی مالیك! چەند فەرموودەت لەم فەرموودانە لەبەر کرد؟ گوتم: چل فەرموودە. فەرمووی: {إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ} چۆن زەین کوێر بووە؟!

لەیث دەیفەرموو: زوهری فەرموودەی بەم نزا هەمەگیرە کۆتایی دەهێنا. {اللهم أَسْأَلُكَ مِنْ كُلِّ خَيْرٍ أَحَاطَ بِهِ عِلْمُكَ فِي الدُّنيا والآخِرَةِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ كُلِّ شَرِّ أَحَاطَ بِهِ عِلْمُكَ فِي الدُّنْيَا والآخِرَةِ}.

٧٠٥- وَعَنْ نُبَيْشَةَ اَلْهُذَلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَيَّامُ اَلتَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، وَذِكْرٍ لِلَّهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.
{پوختەی موسلیم ٦٢٣ = ٢٦٧٢ شیحا = مسلم ١١٤١}:

نوبەیشەی هوزەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سێ ڕۆژەی پاش ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانیش، کە ناوداران بە (أيَّامُ التَشرِيق = ڕۆژی تەشریق) واتە: ڕۆژانی قوربانی سەربڕین‌و کردنی گۆشتەکەیان بە لەتکە گۆشت (قەدید) بەهەڵخستنی لەبەر خۆر، ئەم سێ ڕۆژەیش وەك یەکەم ڕۆژی جەژن، ڕۆژانی خواردن‌و خواردنەوەو یادکردنی خودای گەورەن). {تاج/٢/١٢٧، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ١٤٠٣}.

(ڕوونکردنەوە):

نوبەیشەی کوڕی عەمری هوزەلی، لەئەفرادی موسلیمە، لەبوخاریدا فەرموودەی نییە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە لەخاوەنانی شەش پەڕاوەکە (أصحاب الكُتُبِ السِتَةِ) بەس ئیمامی موسلیم دەری هێناوە، نوبەیشە چەند

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، دەڵێن: جارێ دەچی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆمەڵێ دیلی لەلا دەبێ، نوبەیشە پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! یان بەسەرانە ئازادیان بکە، یان بیکە بەشاباش‌و پیاوەتی‌و بەرەڵایان بکە بەخۆڕایی؟.

پێغەمبەریش پێی دەفەرموێ: (پێشنیارێکی خاست کرد، کەواتە: تۆ نوبەیشە باشەی!). ئیتر بەو ناوەوە ناو دەردەکا، کە پێغەمبەر لێی دەنێ‌و خەڵکەکە پێی دەڵێن: (نوبەیشە تولخەیر: نوبەیشە باشە!).

نوبەیشە لەبەصرە دائەنیشت، جارێ برایەکی هەبوو، ناوی شوبرومە بوو، کەنێتی حەجی هێنا گوتی: (لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ). پێغەمبەر پێی فەرموو: (لەپێشا حەج بۆ خۆت بکە ئەوسا حەج بۆ شوبرمەی برات بکە). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٦} . بڕوانە: ژمارە: ٧٣٦ لەم کتێبە کە لەدواوە دێت.

٧٠٦- وَعَنْ عَائِشَةَ وَابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ قَالَا: {لَمْ يُرَخَّصْ فِي أَيَّامِ اَلتَّشْرِيقِ أَنْ يُصَمْنَ إِلَّا لِمَنْ لَمْ يَجِدِ اَلْهَدْيَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری = پوختەی بوخاری = تجريدی بوخاری بەکوردی/٢/٢٩٩، ژمارە: ٩١٨ = ١٩٩٧، ١٩٩٨}:

عائیشە‌و ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: (مۆڵەت نەدراوە بەکەس کە (٣)سێ ڕۆژەی پاش یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بەڕۆژوو بێ، کەناوداران بە (أيام التشريق) مەگەر بۆ کەسێ کە لەحەجدا تەمەتتوعی کردبێ‌و، توانای سەربڕینی هەدیی (دیاری بەیتی) نەبێ، ئەوە بۆ ئەو کەسە دروستە کە لەباتی کەفارەت، ئەو سێ ڕۆژە بەڕۆژوو بێ).

٧٠٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ اَلْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اَللَّيَالِي، وَلَا تَخْتَصُّوا يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اَلْأَيَّامِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ فِي صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٦٢٥، ٦٢٦ = ٢٦٥٨ شیحا = ١١٤٤ مسلم}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بــێ) فـەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەتایبەتی بەتەنیا شەوی هـەینی هەڵمەسـن بـۆ شــەونوێژ، لــەناو شــەوانی تــری هەفتــەدا، هــەروا بەتایبــەتی ڕۆرژووی ڕۆژی هەینی، لەناو ڕۆژانی هەفتەدا، بەتەنیا مەگرن، مەگـەر وا ڕێ بکـەوێ کـە ڕۆژی هەینی سەرەی ڕۆژووگرتنی خۆی بێ، وەك ئەوە ڕۆژنا ڕۆژێ بـەڕۆژوو بــێ، یـان نەزرێکی کردبێ ئەوە قەیناکا).

٧٠٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ اَلْجُمُعَةِ، إِلَّـا أَنْ يَـصُومَ يَوْمًـا قَبْلَـهُ، أَوْ يَوْمًـا بَعْدَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢/٢٩٧، ژمارە: ٩١٥ = ١٩٨٤، ١٩٨٦ بوخاری. پوختەی موسلیم: ٦٢٥ = ٢٦٧٨ مسلم/شیحا = ١١٤٤ موسلیم}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بــێ) دەفـەرموێ: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەس بەتایبەتی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتــەنیا نــەگرێ، مەگـەر لەپێـشیەوە یـان لەپاشـیەوە، ڕۆژێکـی تـری لەگەڵـدا بگـرێ). {تاج/٢/١٢٩، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ١٤٠٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- گرتنـی ڕۆژووی ڕۆژی هـەینی بەتـەنیا، ناباشـە، مەگـەر لـە یـەکێ لـەم کاتانەدا:

آ- قەزای ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، ئەوە قەیدی نییە.

ب- گوتبێتی: هەر ڕۆژێ لەحەج گەڕامەوەو گەیشتمە شوێنی خـۆم، ڕۆژی دوایی نەزر بێ لەسەرم کە بەڕۆژوو بم، لەکاتی وادا قەیدی نییە.

ج- یا لەپێـشیەوە ڕۆژی پێـنج شـەم بگـرێ، یـان لەپاشیەوە ڕۆژی شـەممە بگرێ.

د- یان ڕۆژنا ڕۆژێ بەڕۆژوو بێو ڕێکەوتی ڕۆژی هەینی بکا.

٧٠٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا اِنْتَصَفَ شَعْبَانَ فَلَا تَصُومُوا} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَاسْتَنْكَرَهُ أَحْمَدُ.

{أحمد رقم: ٩٧٠٥. أبوداود رقم: ٢٣٣٧. ترمذي رقم: ٧٣٨. نسائي الكبرى رقم: ٢٩١١. إبن ماجة رقم: ١٦٥١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کە مانگی کوڵە مانگ دوو کوت بوو، نیوەی یەکەمی ڕۆیشت، ئیتر هەتا ڕەمەزان دێ، ڕۆژووی سەننەت مەگرن!). {تاج/٢/١٢٨، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ١٤٠٦}.

٧١٠- وَعَنِ اَلصَّمَّاءِ بِنْتِ بُسْرٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تَصُومُوا يَوْمَ اَلسَّبْتِ، إِلَّا فِيمَا اِفْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، فَـإِنْ لَـمْ يَجِـدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا لِحَاءَ عِنَبٍ، أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهَا} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَرِجَالُـهُ ثِقَـاتٌ، إِلَّا أَنَّهُ مُضْطَرِبٌ. وَقَدْ أَنْكَرَهُ مَالِكٌ. وَقَالَ أَبُو دَاوُدَ: هُوَ مَنْسُوخٌ.

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر فەرمووی: صەممای کچی بوسری خوشکم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەتەنیا ڕۆژی شەممە خۆی بەڕۆژوو مەبن، مەگەر بۆ ڕۆژووی فەرز، وەك نەزرو قەزای ڕەمەزانو ڕۆژووی کەفارەت، ئەگەر لەڕۆژی شەممەدا، هەرهیچتان دەست نەکەوت کەبیخۆن، جگە لەتڵپی دەنکە ترێیەك، یان جگە لە پەلکەدارێك، ئەوا ئەوە بجوونو بیخۆنو ڕۆژووی سوننەت بەتەنیا لەڕۆژی شەممەدا مەگرن، تا لاسایی جوولەکە نەکەنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ١٤٠٩}.

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە جێگەی متمانەن، بەڵام شڵۆقی (ئیضطیراب)ی واتیادا. مالیك ئەم فەرموودەیەی بەمونکەر داناوە، ئەبوداوود دەفەرموێ: نەیی

لەگرتنی رۆژووی رۆژی شەممە مەنسووخە، بە بەڵگەی فەرموودەی ژمارە: (٧١١) کە یەکسەر وا لەدوای ئەم ژمارەیەوە.

(روونکردنەوە):

صەمماء ناوی نەهێی کچی بوسرە، خوشکی عەبدوڵڵای کوڕی بوسرەی موزەنییە، بوسرو صەممای کچیو عەبدوڵڵای کوڕی بوسرو عەطییەی کوڕی بوسر، ئەم خانەوادەیە، هەرچواریان لەهاوەڵانی پێغەمبەرن، هەندێ دەفەرموون: صەمماء ناوی بهیە بووە.

عەبدوڵڵای کوڕی بوسرو عەطییەی برایو صەممائی خوشکیو بهییەی دایکیو بوسرای باوکی، هەر پێنجیان صەحابەی پێغەمبەرن، عەبدوڵڵا دواهەمین هاوەڵی پێغەمبەر بوو، کە لەشام لە ساڵی (٨٨) هەشتاو هەشتی کۆچیدا، لەتەمەنی سەد ساڵیدا مردووە.

٧١١- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ أَكْثَرَ مَا يَصُومُ مِنَ اَلْأَيَّامِ يَوْمُ اَلسَّبْتِ، وَيَوْمُ اَلْأَحَدِ، وَكَانَ يَقُولُ: " إِنَّهُمَا يَوْمَا عِيدٍ لِلْمُشْرِكِينَ، وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَهُمْ "} أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَهَذَا لَفْظُهُ.

{السلسلة الضعيفة: ١٠٩٩. نسائی/فی الكبری: ٢٧٧٦. ابن خزيمة: ٢١٦٧}:

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: زۆرترینی کات، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە رۆژووی سوننەتی دەگرت، رۆژی شەممەو یەك شەممە بەرۆژوو دەبوو، وە دەیفەرموو: چونکە ئەم دوو رۆژە جەژنی هاوەڵکارانن (هاوەڵکار، واتە: هاوبەشپەیداکار = موشریك). پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: چونکە ئەم دوو رۆژە جەژنی ئەوانو ئەوان لەم دوو رۆژەدا بەرۆژوو نابن، من دەمەوێ بەپێچەوانەی ئەوانەوە لەم دوو رۆژەدا بەرۆژوو بم.

٧١٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {نَهَى عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ غَيْرَ اَلتِّرْمِذِيِّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَالْحَاكِمُ، وَاسْتَنْكَرَهُ الْعُقَيْلِيُّ.

{أحمد: ٨٠١٨. أبوداود: ٢٤٤٠. إبن ماجة: ١٧٣٢. نسائي الكبرى تحفة الأشراف/١٠/١٤٢٥٣. ضعيف الجامع: ٦٠٦٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەگرتنی ڕۆژووی نۆی مانگی قوربان، کە لەو ڕۆژەدا، حاجیان وان لەکێوی عەرەفە، بۆ کەسێ، کە لەو ڕۆژەدا، لەچیای عەرەفە بێ.

(ڕوونکردنەوە):

دانەر ئەفەرموێ: ئیبنو خوزەیمە بەتەندروستی دائەنێ، بەڵام عوقەیلی بە فەرموودەیەکی مونکەری دائەنێ. بەڵام ئیبنو باز دەفەرموێ: ڕشتەیەکی پەسەندە، ئیستنکاری عوقەیلی، نابەجایەو جێگەی خۆی نییە.

٧١٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا صَامَ مَنْ صَامَ اَلْأَبَدَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = مختصر صحيح البخاري بالكوردى/٢/٢٩٤ ط/١، ژمارە: ٩١٢ = ١٩٧٧ بوخارى. پوختەى موسليم ٦٢٨ = ٢٧٢٦ شيحا = ١١٥٩ مسلم + تجريدى بوخارى/١/٥٤٢، ژمارە: ٥٦٤. ترمذى. صوم: ٧٦٨. نسائي. صيام: ٢٣٩٦. تحفة: ٦٦٣٥}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما زۆر درێژە، ئەمە دەقەکەیەتی:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کردبوو، کە من بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبمو، بەشەویش هەر شەونوێژ دەکەم، جا یان ناردی بەشوێنما، یان بەخزمەتی گەیشتم، فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا! ئایا وایە، گوایە تۆ دەڵێیت: من بەردەوام

هەموو رۆژێ هەر بەرۆژوو دەبم‌و رۆژێکی لێ نـاخۆم‌و بەشـەویش ناخـەوم هـەر شـەونوێژ دەکـەم؟ گـوتم: بـەڵێ، گوتوومـە، فـەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بێ).

(شـتی وا مەکـە، چـونکە چاوەکانت مافیـان هەیـە لەسـەر تـۆ، کـە بەشـی خۆیان بخەون، تا کزو کوێر نەبن، بەهۆی شەونخوونی زۆرەوە، دەروونـت مـافی حەوانەوەی هەیە لەسـەر تـۆ، وەخێزانەکـەت هـەقی هەیـە لەسـەر تـۆ، وەخـۆت مـاف‌و هـەقت هەیـە لەسـەر خـۆت، جـا دەبـێ موراعـاتی حـاڵی ئەمانـە بکـەی، کەواتە: ناوبەناو بەرۆژووبەو ناوبەناویش بەرۆژوو مەبە، ناوبەناویش بەشەو، شـەونوێژ بکـەو ناوبـەناویش بەشـی خـۆت بخـەوە، لـە (١٠) دە رۆژ، یـەك رۆژ بەرۆژوو بە خێری گرتنی (٩) نۆ رۆژەکەی تریشت بـۆ حـسێب دەکـرێ، چـونکە چاکەیەك بە دەیە!).

عەبدوڵڵا فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! توانای زیاترم هەیـە، کەواتـە بـۆم زیـاتر بکـە؟ فـەرمووی: دەی تـۆیش وەك داوود پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرۆژوو بە!.

عەبدوڵڵا عەرزی دەکا: ئەی پیغەمبەری خودا! داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چۆن چـۆنی رۆژووی سـوننەتی دەگـرت؟ فـەرمووی: (داوود ئـاوا بـەرۆژوو دەبـوو: رۆژنـا رۆژێ بـەرۆژوو دەبـوو، کـاتێکیش لـەکاتی شـەڕو جەنگـدا، بـەرەنگاری لەشـکری دوژمنـی دیـن دەبـوو، لەبـەری هەڵنـەدەهات‌و شێرانە دەجەنگی لەگەڵیانا).

عەبدوڵڵا فەرمووی: قوربان! جا شتی وا نایاب دەست کێ دەکەوێ!.

عەطا کە ئەم فەرموودەیە لـە ئەبولعەبباسـەوە دەگێڕێتـەوە، ئـەویش لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمرەوە، دەیگێڕێتـەوە، عـەتاء دەفـەرموێ: نـازانم کـە ئەبولعەبباس، باسی رۆژووی ساڵ دوازدە مانگەی چۆن گێڕایەوە، لـەم بارەیـەوە تەنیا ئەمەم لەبەرماوە، کە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) سـێ جـار

لەسەر یەك، دەفەرموێ: (ڕۆژووی ئەو كەسەیە گیرا نەبێ، كەساڵ دوازدە مانگ بەڕۆژوو دەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ١٤٥٢ + زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ١٤٥٠، ١٤٥١}.

٧١٤- وَلِمُسْلِمٍ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بِلَفْظِ: {لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ}.

{پوختەی موسلیم: ٦٢٠ = ٢٧٣٨ موسلیم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا. أبوداود. صوم: ٢٤٣٩. ترمذی. صوم: ٧٥٦. تحفة الأشراف: ١٥٩٤٩}:

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی پرسی: تۆ چۆن چۆنی بەڕۆژوو دەبیت؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم قسەیەی تووڕە بوو، چونكە دوورنیە كەپرسیاری وا سەربكێشێ بۆ هەندێ كێشە، كاتێ عومەر تووڕە بوونەكەی پێغەمبەری بینی، بۆ عوزرخوایی لەخزمەت پێغەمبەردا، نەوەكوو نزای خراپ بكات، فەرمووی: خودامان بە پەروەردگاری خۆمان قەبووڵەو، ئیسلاممان بەئایین قەبووڵەو، موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە، ئیتر عومەر هەر ئەم گوتەیەی دووبارە دەكردەوە، هەتا تووڕەبوونەكەی پێغەمبەر دامردەوە، ئەوجا عومەر خۆی ئەم پرسیارەی دواوەی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ كەسێ ساڵ دوازدە مانگ بەڕۆژوو بێ، پلەو پایەی چۆن بێ؟ باشە یان خراپە؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە وەك كەسێ وایە، دەمی خۆی بە بەلاش ببەستێ، نەڕۆژووەكەی تەواوەو نە ڕۆژوو شكاندنەكەی، نە بەڕۆژوو بووەو نە بەڕۆژووش نەبووە).

عومــەر فــەرمووی: ئــەی ئەگــەر کەســێ دوو ڕۆژ بــەرۆژوو بــێو ڕۆژێ بیـشکێنێ چۆنە؟ فـەرمووی: (جـا هەیـە توانـای ئـەوەی هـەبێ؟ ئەگـەر بتوانـێ قەیدی نییە).

عومــەر فــەرمووی: ئــەی ئەگــەر کەســی ڕۆژنــا ڕۆژێ بــەرۆژوو بــێ ئــەوە چۆنە؟ فەرمووی: (ئەوە زۆر باشو ڕێکوپێکە).

ئەوجا فەرمووی: (ڕەزای خودای لەسەر بێ) پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) ئاوا بەرۆژوو دەبوو).

عومــەر فــەرمووی: ئــەی ئەگــەر کەســێ دوو ڕۆژ بــەرۆژوو نــەبێو ڕۆژێ بەرۆژوو بێ، ئەوە چۆنە؟ هەمیشە لەسێ ڕۆژ، ڕۆژێ بـەرۆژوو بـێ؟ فـەرمووی: خۆزگەم گەلی موسوڵمانی من بەشـێوەی گـشتی توانـای شـتی وا چـاكو نایابیـان دەبوو!!.

لەپاشان پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ڕۆژووی (٣) ڕۆژ لەهـەموو مانگـێ، لەگـەڵ ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان، لەهـەموو سـاڵێ، ئـەوە بـەرۆژوو بـوونی سـاڵ دوازدە مانگەیـە، ئومێـد دەكـەم كـە ڕۆژووی ڕۆژی نـۆی مانگی قوربانیش، كە لەو ڕۆژەدا حاجیان وان لەچیای عەرەفە، لەبەر ئەوە پێی دەگوترێ: ڕۆژی عەرەفە، برێتی گونـاهی سـاڵی پـێش خـۆیو سـاڵی پـاش خـۆی بكەوێ، هەروا ئومێد دەكەم كە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورایش برێتی گونـاهی سـاڵی پێش خۆی بكەوێ!. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٥، ژمـارە: ١٤٣٦، ١٤٣٧، زنجـیرە: ٦٦، ژمـارە: ١٤٣٨، زنجـیرە: ٦٧، ژمـارە: ١٤٤١، ١٤٤٢. بڕوانـە: ژمـارە: ٦٩٨ پوختـەی موسـلیم كـە لەپێشەوە رابورد}.

## پوختەی بڕیارەکانی نامەی رۆژوو

١- رۆژوو روکنی چوارەمە لەپێنج روکنەی ئیسلامو فەرزێکە لەفەرزە گرنگە ئایینیەکانو رێزو پیرۆزیو پاداشێکی گەورەی هەیە، هەرکەسێ رۆژووی مانگی رەمەزان بەفەرزو پێویست نەزانێ پێی کافرو ناموسوڵمان دەبێ. بڕوانە: (روونکردنەوە) دوا ژمارە: ٦٩٧.

٢- رێزو گەورەیی مانگی رەمەزان.

٣- پارشێو سوننەتە، چی بۆ رۆژووی فەرز بێ، چی بۆ رۆژووی سوننەت، هەتا پارشێو دوابخرێ خێرترە، بەمەرجێ شەوی بمێنێ، کە پارشێو دەکرێ.

٤- نیازهێنانی رۆژووی فەرز، لەپێش شەبەقدا فەرزە.

٥- لەگەڵ شەبەقی بەیانا، رۆژوو دەست پێ دەکا، هەتا بانگی شێوان.

٦- رۆژووی شەو حەرامە.

٧- رۆژوو برێتییە لەخۆپاراستن لەخواردنو خواردنەوەو جیماعو هەرشتێ کە رۆژووی پێ بشکێ، بەنیازی خواپەرستی.

٨- رۆژوو دانە دەم رۆژوو (وصال الصِيَامِ) باش نییە. واتە: ویصال ناباشەو مەکرووهە.

٩- لەسەفەردا، مرۆڤ دەتوانێ بەرۆژوو بێو دەتوانێ بەرۆژوو نەبێ، واباشە مرۆڤ بەپێی حاڵی خۆی لەم لایەنەوە بڕیاربدا.

١٠- رۆژووی مانگی رەمەزان، لەسەر توانای بێ عوزر فەرزە.

١١- رۆژووی فەوتاوی رەمەزان، دەبێ قەزا بکرێتەوە بەمەرجی خۆی، ئەوەی لەرۆژووی ئەدادا، پێویستە، وەك نیەتو وازهێنان لەرۆژوو شكێن، لەرۆژووی قەزایشدا پێویستە، هەروا ئەوەی لەرۆژووی ئەدادا سوننەتە لەرۆژووی قەزایشدا سوننەتە.

١٢- کەسێ بمرێو رۆژووی لەسەر بێ، کەسوکاری دەتوانن بۆی بگێڕنەوە، دەتوانن حەجیشی بۆ بکەن، عەمرەی بۆ بکەن، قوربانی بۆ بکەن، قەرزی بۆ

بدەنەوە، صەدەقەی جاری بۆ وەقف بکەن، وەك بیرو پردو مزگەوت. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٠٥، ٦٠٦}.

١٣- ڕۆژووی سوننەت باشترین خواپەرستیو پاداشی گەورەو زۆری هەیە، جۆرو بۆنەی زۆری هەیە.

١٤- ڕۆژوو نەزرکردن، بەبۆنەی هاتنەدی مرازەوە، یا بەهۆی ڕزگاربوون لەدەردوبەلا، پەرستشێکی گەورەیە.

١٥- ڕۆژووی نۆی مانگی قوربان، بۆ کەسێ خەریکی کردنی حەجو عەمرە نەبێ، سوننەتەو خێرێکی گەورەی هەیە.

١٦- ڕۆژووی عاشوراء سوننەتە، کە دەیەمی مانگی موحەرڕەمە.

١٧- ڕۆژووی شەش ڕۆژ لەمانگی شەشەلان (شەعبان) سوننەتە.

١٨- ڕۆژووی ڕۆژەکانی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قوربان نادروستەو دانامەزرێو حەرامە.

١٩- ڕۆژووی دوو شەممەو پێنج شەممە سوننەتە، ئەگەر کەسێ هەموو حەفتەیێ، یان ناوبەناو، پێنج شەممان بەڕۆژوو نەبێو دوو شەممە بەڕۆژوو بێ هەردەبێو سوننەتە، یا بەپێچەوانەوە پێنج شەممان بەڕۆژوو بێو دوو شەممان بەڕۆژوو نەبێ هەر سوننەتە، بەلام بەردەوام بوون لەسەر گرتنی ئەو دوو ڕۆژە لە حەفتەدا، سوننەتێکی گەورەیەو دروشمی خوناسانە.

٢٠- بەتەنها بەبێ هۆی ڕەوا، گرتنی ڕۆژووی هەینی، بەنیازی ڕۆژووی سوننەت ناباشە. {بڕوانە: ژمارە: ٧٠٨ لەپێشەوە}.

٢١- کەسێ ڕۆژووی سوننەت بگرێ دەتوانێ بیشکێنێ، تەنانەت بۆی هەیە بەدروستبوون لەگەڵ حەلاڵو هاوسەریدا بیشکێنێ.

٢٢- ڕۆژوشکاندن، لەڕەمەزانو لەغەیری ڕەمەزانا، لەپاش بانگی شێوان، لەکاتی ڕۆژوو شکاندن، بەجیماع لەگەڵ حەلاڵو هاوسەردا دروستەو ناباشی نییە.

٢٣- ڕۆژووی سوننەت بۆ ڕەگەزی مێ، ئەگەر مێردی هەبێو مێردەکەی لەگەڵیدا بێو لەکاروانو دەشتو دەر نەبێ، بەبێ ڕەزابوونی مێردەکەی ناباشە، بەڵام دادەمەزرێ. {بڕوانە: ژمارە: ٧٠٣} .

٢٤- بۆ ژنی مێردار، ڕۆژووی فەرزو ڕۆژووی نەزرو ڕۆژووی قەزا، پێویستی بەڕەزا لەسەربوونی مێرد نییە.

٢٥- لەهەموو مانگێ گرتنی سێ ڕۆژ سوننەتە، واباشە کەسیازدەو چواردەو پازدە بن.

٢٦- لەشپیسی ڕۆژووی پێ ناشکێ. بڕوانە: ژمارە: ٦٩٧ بڕگەی ژمارە: ١٩ لەڕوونکردنەوەکە.

٢٧- خواردنو خواردنەوەو چوونە لای ژن، بەپێش یان بەپاش، هەروا خۆ ڕەحەتکردن بەهەر شێوەیێ بێو چوونە لای ئاژەڵو مرۆڤ، چی بەپێش چی بەپاش ڕۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە، بکەرو بدەر ئەگەر بەڕۆژوو بن، ڕۆژووی هەردوولایان بەتاڵو پووچ دەبێتەوە، ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزان بێو ئەدا بێو بەڕۆژ بێ، بەس مێرد کەفارەتی دەکەوێتە سەر، کەفارەت لەسەر ژنەکە نییە. گەرچی هەندێ دەفەرموون: ژنەکەیش کەفارەتێکی تری لەسەرە. لەم جۆرە شتانەدا لەبیر چوون کاریگەری هەیە.

٢٨- ئەم باسە (٧١٤ — ٦٩٦ = ١٨) هەژدە فەرموودەی لەخۆی گرتووە.

## ٣٢- باسی خەڵوەکێشانو تەراویحی ڕەمەزان.
## باب: الإعْتكاف وَقِيام رَمَضَان

{بڕوانە: تاجول ئوصول. بەرگی/٢، زنجیرە: ٧٤ هەتا/٧٧، لە ژمارە: ١٤٥٩ — ١٤٦٩ + تجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری/٢، زنجیرە: ٣٨ نامەی خەڵوەکێشان لە ژمارە: ٩٢٧ هەتا ژمارە: ٩٣٢ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٣٨٤، زنجیرە: ١٥٧ + ریاض الصالحین بەکوردی/٣، لاپەڕە: ١٨٥، زنجیرە:

٢٣٣، ژمـاره: ١٢٦٨، ١٢٦٩، ١٢٧٠ + پوختـەی موسـلیم/٤ – نامـەی خەڵوەکێـشان. زنجیره: ٥٠٠، ژماره: ٦٣١ هـەتا ژمـاره: ٦٣٣ + ٦٣٤ هـەتا/٦٣٨ + پوختـەی موسـلیم: ٣٩٨}.

٧١٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِـيَ اللّٰـهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اَللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: { مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَـا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذَنْبِـهِ} مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی موسلیم: ٣٩٨ = ١٧٧٧ شیحا = مسلم: ٧٥٩. تجریدی بوخاری/١، ژماره: ٣٦ = ٣٨}:

لەپوختـەی موسلیمدا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

ئـەبو هـورەیره (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خوداى لەسەر بێ) هانی موسوڵمانانی دەدا، لەسەر کردنی شـەونوێژی رەمـەزان، بـەڵام لـەم لایەنـەوە جـەختی لێ نـەدەکردن، دەیفـەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ):

(هەرکەسی شەنوێژی رەمەزان بکا، بەئیمانو باوەڕەوە ساخ لەبـەر رەزای خـودا خـودا لەگوناهـەکانی لەوەپێـشی خـۆش دەبـێ). ئـیتر هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسەر ئـەم بارودۆخـە بوو، هەرکەسی بۆخۆی بەتەنیا بەئارەزووی خۆی، چەندێ ئارەزووی لێ بووایە، ئەوەنـدە نوێـژی تـەراویحی دەکـرد، لەپاشیـشا لـەکاتی جێنـشینی (خەلافـەت)ی ئەبو بەکرو لەسەرەتای جێنشینی عومەریشەوە ئەم کارە هـەر وابـوو. {تـاج/٢، لاپەڕە: ١٠٠، زنجیره: ٣٧، ژماره: ١٣٤٧}.

٧١٦– وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهَا قَالَـتْ: {كَـانَ رَسُـولُ اَللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا دَخَلَ اَلْعَشْرُ –أَيْ: اَلْعَشْرُ اَلْأَخِيرُ مِنْ رَمَضَانَ– شَـدَّ مِئْـزَرَهُ، وَأَحْيَـا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٩٢٦ = ٢٠٢٤ بوخارى. پوختەى موسـليم ٦٣٤ = ٢٧٧٩ شيحا = ١١٧٤ صحيح مسلم. أبوداود. صلاة: ١٣٧٦. نسائى. قيام الليـل: ١٦٣٨}:

**عائيشەى هاوسـەرى پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بێ) فـەرمووى: دەســتوورى پێغەمبــەر (دروودى خــوداى لەســەر بــێ) وا بــوو، كــە دەى دواى رەمەزان دەهات، خۆى گورج دەكـردەوە بـۆ خوداپـەرسـتىو، بـەدەورى قورئـانو بەشـەونوێژو بـەيادى خـودا، زۆربـەى شـەوى خـۆى ئـاوەدان دەكـردەوە، وە بـۆ هەمان مەبەستى خوداپەرستىو شـەو ئاوەدانكردنـەوە بەخوداپەرسـتى جـوان، كەسوكارى خۆيشى خەبەر دەكردەوە. {تاج/٢، زنجيرە: ٥١، ژمارە: ١٣٩٣ + ريـاض الصالحين/١، زنجيرە: ١١، ژمارە: ٩٩ + تجريدى بوخـارى/١، لاپـەڕە: ٢٠، ژمـارە: ٦ = ١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧ بوخارى} + {صحيح مسلم تـرقيم الـشيخ خليـل مـأمون شيحا ٥٩٦٤}.**

٧١٧- وَعَنْهَا: { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) كَـانَ يَعْتَكِـفُ اَلْعَـشْرَ اَلْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، حَتَّى تَوَفَّاهُ اَللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢/٣٠٧، ژمارە: ٩٢٧ = ٢٠٢٦ بوخارى. پوختەى موسليم: ٦٣٣ = شيحا ٢٧٧٦ = صحيح مسلم ١١٧٢}:

**عائيـشە (رەزاى خـوداى لێ بـێ) فـەرمووى: جـاران پێغەمبــەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەژيانيدا، كردبـووى بەدەسـتوور، لـە دەى دوايـى رەمەزانـدا، لەناو مزگەوتا خەڵوەى دەكێشا (واتە: ئيعتيكافى دەكرد) هەتا ئەوكاتەى كۆچى دوايى كرد، وازى لەمە نەهێناو لەدەى دوايـى رەمـەزانا، سـەرگەرمى پـەرسـتـشى جوان بوو، بۆيە لەپاش مەرگى خۆشى ژنەكانيـشى لەمزگـەوتا خەڵوەدەكێـشنو ئيعتيكـاف دەكـەن. {تـاج/٢/١٥٤، زنجـيرە: ٧٤، ژمـارە: ١٤٥٩ چـاپى چـوارەم + رياض/٣/٩٣١، زنجيرە: ٢٣٢، ژمارە: ٢/١٢٦٩ — ٣٢٤ = واتـە: ژمـارە: (٢) لـە زنجـيرە:**

٢٣٢ لەبەرگی سێیەم، ژمارە: ١٢٦٩ لە سەراسەی کتێبەکە لەسەرەتای ریاضەوە هەتا ئێرە، ژمارە: ٣٢٤ لەم بەرگی سێیە}.

٧١٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى اَلْفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/ ٩٣٠ = ٢٠٣٤، ٢٠٣٣ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦٣١ = ٢٧٧٧ شیحا = صحیح مسلم: ١١٧٣. أبوداود. صوم: ٢٤٦٤. ترمذی. صوم: ٧٩١. نسائی. مساجد: ٧٠٨}:

لەپوختەی موسلیمدا ئەم فەرموودەیە ئاوایە دەقەکەی دەنووسین، بۆ سوودو بەهرەی زیاتر:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە دەیویست خەڵوەبکێشێ (ئیعتیکاف بکا) لەمزگەوتا، کەنوێژی بەیانی دەکرد، ئەوسا دەچووە ناو خەڵوەخانەکەیەوە، جارێ لەدەی دوایی رەمەزاندا، ویستی خەڵوەبکێشێ، جا فەرمانی کرد، چاتۆڵەکەیان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا، زەینەبی خێزانیشی گاڵیدا چاتۆڵەکەی خۆیان بۆ هەڵدا، هەتا خەڵوەی تیا بکێشێ، ژنەکانی تریشی هەروا، هەرکەسەیان لەناو مزگەوتا چاتۆڵەکەی خۆی هەڵدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنوێژی بەیانی کرد، چاتۆڵەکانی بینی، ناو مزگەوتەکەیان داگیر کردبوو، جا بەژنەکانی خۆیی فەرموو: (ئالەم کارەتان مەبەستتان کردنی کردەوەی چاکەیە، یان بۆ چاولێکەرییەو هیچی تر؟).

ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد: چاتۆڵەکەی ئەویان خستو لایان برد، وە لەو رەمەزانەدا خەڵوەی نەکێشا، وە لە دەی یەکەمی مانگی شەشەڵانا خەڵوەی کیشا. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ١٤٦١}.

٧١٩- وَعَنْهَا قَالَتْ: { إِنْ كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ -وَهُوَ فِي اَلْمَسْجِدِ- فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لَا يَدْخُلُ اَلْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدی بوخاری/٢/٣٠٧، ژماره: ٩٢٨ = ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥ بوخاری. پوختەی موسلیم: ١٧٤ = ٦٨٣ شیحا = مسلم ٢٩٧}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو پەیڕەوانو هاوسەرەپاکیزەکانی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، لەدەرگای هۆدەکەی خۆمەوە، کە لەسەر ماڵی مزگەوت بوو، سەری دەهێنا، سەریم شانە دەکرد، ئەو لەناو مزگەوتا بوو، من لەناو هۆدەکەی خۆمدا بووم، لەسەر ئەو حاڵە قژەسەریم شانە دەکرد، وەبۆ سەراویش نەبوایە نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە.**
**{تاج/٢/١٤٦، زنجیره: ٧٥، ژماره: ١٤٦٣ چاپی چوارەم}.**

**ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما، لەسەرەتاوە ئەمەی پترە:**

**عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاری وادەبوو خۆم لەناو مزگەوتا خەڵوەم دەکێشا، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: (إعتكاف). جا بۆ کاروباری تایبەت دەچوومەوە بۆ ماڵەوەم، بەڵام زۆر بەپەلە، کارەکەمم ئەنجام دەداو دەگەڕامەوە بۆ مزگەوت. تەنانەت ڕێ دەکەوت کە نەخۆشی لێ بوو، هەواڵ پرسی دوورو درێژم لەگەڵ نەدەکرد، بەڵکوو هەر بەدەم ڕێگەوە، بەسەرپێوە هەواڵم دەپرسیو بەس، ئیتر یەکسەر دەگەڕامەوە بۆ خەڵوەگاکەم لەمزگەوت... تاکۆتایی فەرموودەکە.**

٧٢٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: {اَلسُّنَّةُ عَلَى اَلْمُعْتَكِفِ أَنْ لَا يَعُودَ مَرِيضًا، وَلَا يَشْهَدَ جِنَازَةً، وَلَا يَمَسَّ امْرَأَةً، وَلَا يُبَاشِرَهَا، وَلَا يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ، إِلَّا لِمَا لَا بُدَّ لَهُ مِنْهُ، وَلَا اعْتِكَافَ إِلَّا بِصَوْمٍ وَلَا اعْتِكَافَ إِلَّا فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَلَا بَأْسَ بِرِجَالِهِ، إِلَّا أَنَّ اَلرَّاجِحَ وَقْفُ آخِرِهِ.

{حسن صحيحُ، سُنَنُ أَبی داود: ٢٤٧٣}:

**دیسان عائیشه (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ:**

**یاساو دەستووری خەڵوەکێشان بەم شێوەیە: کە نەبچیٚ بۆ سەردانی نەخۆش‌و نەبچیٚ بۆ سەر تەرمی مردوو نەدەست بەریٚ بۆ ژن‌و نە لەگەڵیا دروست بیٚ، وە بۆ پێویستییەکی ناچاری خۆشی نەبیٚ، نابیٚ لەمزگەوت دەربچیٚ، وەخەڵوەکێشانیش بەبیٚ ڕۆژووو نابیٚ، وە دەبیٚ خەڵوەکێشان هەر لەمزگەوتێکا بیٚ کەنوێژی جومعەی تیا بکریٚ.**

**دانەر (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) دەڵیٚ: دوا ڕستەی ئەم فەرموودەیە، لەوێوە دەست پیٚ دەکا: (وَلاَ اْعتِكافَ إِلاَّ بِصَوْمٍ...) مەوقووفە لەسەر عائیشەو قسەی عائیشەیە.**

**هەروا دانەر دەفەرمویٚ: پیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لەرووی متمانە پیٚ کردنەوە خراپ نین.** {تاج/٢، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ١٤٦٦}.

٧٢١- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَيْسَ عَلَى اَلْمُعْتَكِفِ صِيَامٌ إِلَّا أَنْ يَجْعَلَهُ عَلَى نَفْسِهِ } رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَالْحَاكِمُ، وَالرَّاجِحُ وَقْفُهُ أَيْضًا.

{ضعيف الجامع: ٤٨٩٦. حاكم رقم: ١٦٠٣. بيهقي رقم: ٨٣٧٠. دارقطنی/٢/١٩٩}:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: (خەڵوەکێش مەرج نییە، لەکاتی خەڵوەکێشانا بەرۆژ بەرۆژوو بیٚ، مەگەر خۆی لەو کاتەدا نەزری بکا لەسەر خۆی، ئەوە مەرجە کە بەرۆژوو بیٚ).**

**دانەر شێخی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: فەرمایشتی سەنگین ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مەوقووف بیٚ لەسەر ئیبنو عەبباس خۆی.**

٧٢٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: { أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أُرُوا لَيْلَةَ اَلْقَدْرِ فِي اَلْمَنَامِ، فِي اَلسَّبْعِ اَلْأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي اَلسَّبْعِ اَلْأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي اَلسَّبْعِ اَلْأَوَاخِرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، لاپەڕە: ٣٠٤، ژمارە: ٩٢٢ = ٢٠١٥ بوخارى. موسليم/شيحا: ٢٧٥٣ مسلم ١١٦٥}:

ئيبنو عومەر (ڕەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: چەند پياوێ لەهاوەڵانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەخەونا پێيان گوترابوو: كەشەوى لەيلەتولقەدر، كە دەكەوێتە حەوت شەوەكانى دوايى ڕەمەزانەوە. جا پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) كاتێ هەواڵى ئەو خەونەى ئەو هاوەڵانەى پێ گەيشتەوە، فەرمووى پێيان: (وا دەزانم كەخەونەكەتان پێكاويەتىو ڕێك دەكەوێ لەگەڵ ڕاستيدا، جاكەوابێ ئەوكەسەى كە دەيەوێ مشوورى ئەم شەوى لەيلەتولقەدرە بخوات، با هەموو كاتێ لەحەوت شەوەكانى دوايى ڕەمەزاندا مشوورى بۆ بخوات). {تاج/٢/١٢٣، زنجيرە: ٥١، ژمارە: ١٣٩٥. رياض/٣، لاپەڕە: ١٤٠، زنجيرە: ٢١٤، ژمارە: ١١٩٠. صحيح مسلم: ١١٦٥}.

٧٢٣- وَعَنْ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ: {لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالرَّاجِحُ وَقْفُهُ. وَقَدْ اِخْتُلِفَ فِي تَعْيِينِهَا عَلَى أَرْبَعِينَ قَوْلًا أَوْرَدْتُهَا فِي " فَتْحِ اَلْبَارِي".

{أبوداود: ١٣٨٦. صحيح الجامع: ٥٤٧٤}:

ئەم فەرموودەيەى پوختەى موسليم، كەزيادەى بەسوودى زۆرترى واتيادا دەنووسين، لەباتى ئەم فەرموودەيە:

زیڕی کوڕی حەبەیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە ئوبەییەی کوڕی کەعب، گوتم: ئیبنو مەسعوودی برادەرت دەڵێ: هەرکەسێ سەرانسەری ساڵ شەونوێژ بکا، ئەوسا تووشی لەیلەتولقەدر دەبێ و شەوی لەیلەتولقەدری بەنسیب دەبێ. ئەویش گوتی: (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەوە مەبەستی ئەوەیە، کە موسوڵمانان پشتیان سارد نەبێتەوە لەخواپەرستیو، تەنیا بەکردنی شەنوێژی دەی دوایی رەمەزان پشت نەبەستن، ئەگینا ئەو باش باش دەزانێ کە ئەو شەوە دەکەوێتە مانگی رەمەزانەوە، وە لە دەی دوایشیدایە، وە شەوی بیستو حەوتیشە، لەپاشا، ئوبەیی بەبێ پەروا سوێندی خوارد، بەبێ ئەوە کە سێو دووی لێ بکا، لەسەر ئەوە کە ئەو شەوە شەوی بیستو حەوتی رەمەزانە.

منیش پێیم گوت: ئەی ئەبولونزیر! لەسەر چی بنەمایێ وا دەڵێیتو بەچیا وا دەڵێیتو بەڵگەت چییە لەسەر ئەم گوتەیەی خۆت؟ گوتی: بەو نیشانەیەدا، یان بەو بەڵگەیەدا وا دەڵێم، کە پێغەمبەر (درووردی خودای لەسەر بێ) پێی گوتووین: ئەو رۆژە کە خۆر هەڵدێ تیشکی نییە. {پوختەی موسلیم: ٦٣٨ = ٢٧٦٩ شیحا + تاج/١٢٦/٢، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١٤٠٠ چاپی چوارەم = چ/٤}.

دانەر مامۆستای گەورەو سەروەر عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەکۆتایدا دەفەرموێ: سەبارەت بەدیاری کردنی شەوی لەیلەتولقەدر، چل گوتەی زانایان هەیە، لەپەڕاوی فەتحولباری شەرحی صەحیحی بوخاریدا، هەموویانم ڕاگوێز کردووە. هەروا دەڵێ: ئەم فەرموودەیەی ئێرە کە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (درووردی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەشەوی لەیلەتولقەدر دەفەرموێ: (شەوی لەیلەتولقەدر شەوی بیستو حەوتی رەمەزانە). دانەر دەڵێ: گوتەی سەنگین ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مەوقووفە لەسەر موعاوییە. {تاج/٢، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١٤٠١}.

له (سبل السلام)دا دەفەرموێ: بەڵام حوكمی مەرفووعی هەیە.

٧٢٤- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {قُلْتُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ : أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ اَلْقَدْرِ، مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: " قُولِي: اَللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ اَلْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي "} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، غَيْرَ أَبِي دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ.

{أحمد: ١٧١. ابن ماجة: ٣٨٥٠. ترمذی: ٣٥١٣. نسائی: عمل اليوم والليلة: ٨٧٢ وفی الكبری: ٧٧١٢. حاكم ٧١٢/١ وقال: علی شرط الشيخين}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خـودا لەهـەموو هاوسـەرو هـاوەڵو پـەیڕەوانی بـێ) فـەرمووی: گـوتم: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! پـێم بفـەرموو: ئەگـەر زانـیم چـی شـەوێ، شـەوی لەیلەتولقەدرە، چی نزایەکی تیادا بخوێنم؟ فـەرمووی: {بڵێ: اَللَّهُـمَّ إِنَّـكَ عَفُـوٌّ تُحِبُّ اْلعَفْوَ فَـاعْفُ عَنِّـي}. واتـە: ئـەی خودایـە! تـۆ لێبوردەیتو لێبوردنـت پـێ خۆشە، کەواتە لێم ببوورەو لێم خۆشبە.

٧٢٥- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِىَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّی اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) : {لَا تُشَدُّ اَلرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: اَلْمَـسْجِدِ اَلْحَـرَامِ، وَمَسْجِدِي هَذَا، وَالْمَسْجِدِ اَلْأَقْصَى} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٢، لاپـەڕە: ٣، ژمـارە: ٥٨٦ = ١١٨٩ بوخـاری. پوختـەی موسلیم ٧٨٩ = ٣٣٧٠ شيحا = مسلم ١٣٩٧}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بۆ ئـەم سـێ مزگەوتـە نـەبێ، سـەفەر نـاکرێ: بـۆ مەسـجیدولحەرام لـە مەککـەوە، بـۆ ئـەم مزگەوتـەی مـن کـەوا لەمەدینەو، بۆ مسجیدول ئەقصا کەوا لەقودس!). {تـاج/١، زنجیرە: ١١٥، ژمـارە: ٦٩٢}.

(ڕوونکردنەوە):

١- باسی خەڵوەکێشان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بریتیە لە (٧٢٥ – ٧١٤ = ١١) یازدە فەرموودە.

٢- خەڵوەکێشان (واتە: ئیعتیکاف) سوننەتێکی گەورەیە، پێغەمبەرو خێزان و هاوسەرەکانی و هاوەڵە بەڕێزەکانی و زۆرینەی زانایان و خواناسان، ماوەیەکی باش لەمزگەوتا، بەنیازی پەرستشی راست و دروست، خەڵوەیان کێشاوە.

٣- پێناسەیەکی کورت و پوختی خەڵوەکێشان بەکوردی پەتی ئەوەیە: (مانەوە بەلەشی پاکەوە، لەناو مزگەوتا، بەنیازی خواپەرستی).

٤- خەڵوەکێشان ساڵ دوازدە مانگ سوننەتە، لەمانگی رەمەزانا خێرترە، لەدەی دوایی رەمەزاندا سوننەتترە.

٥- خەڵوەکێشان بەوەندە دێتە دی: کە کەسێ دەچێ بۆ مزگەوت، نێت بهێنێ، بڵێ: هەتا ئەم نوێژی عەصرە، یا ئەم نوێژی شێوانە، یان ئەم نوێژی خەوتنانە تەواو دەکەم، نێتمە لەم مزگەوتەدا خەڵوەدەکێشم، یا ئیعتیکاف دەکەم، یا بڵێ: هەتا تەراویحی ئەم شەو تەواو دەکەم، لەم مزگەوتەدا خەڵوەدەکێشم.

٦- لە ڕەمەزاندا گەڕان بەشوێن شەوی لەیلەتولقەدردا زۆر سوننەتە، واباشە ئەو شەوانەی کە موسوڵمان بەشوێنی شەوی قەدردا دەگەڕێ، لەمزگەوتا خەڵوەبکێشێ هەتا بەیانی.

٧- إحیاء زیندوو کردنەوەی شەوی لەیلەتولقەدرو شەوی هەینی و شەوەکانی دەی دوایی مانگی رەمەزان و دەی یەکەمی مانگی قوربان، یان هەرشەوێکی تری ساڵ، مەرج نییە کە هەر بەخەڵوەکێشان بێ، یان هەر لەمزگەوتا بێ، لەماڵیشەوە دەبێ، لەدەشت و دەرو سەر ئیش وکارو پیشەو شتی تری وایش دەبێ، وەك شوان لەلای ڕان بێ، یا کەسێ لەسەفەرا بێ، لەئوتێلا بێ،

لەشەمەندەفەردا بێ، لەفڕۆکەدا بێ، لەکەشتیدا بێ دەبێ، لەم کاتانەداو لەم شوێنانەدا، سەرگەرمی یادی خودا بێ، قورئان بخوێنێ، گوێ لە قورئان بگرێ، شەونوێژ بکا، نزا بخوێنێ، لەخودا بپاڕێتەوە. بەڵام لەم کاتانەدا، چونکە لەمزگەوت نییە، نابێ نێتی خەڵوەکێشان و ئیعتیکاف بهێنێ، بەڵکوو ئەم جۆرە کارانە ئەنجام بدا، بەنیازی زیندوو کردنەوەی ئەو بۆنەیەی کەوا تیادا.

## ٦- نامەی حەج
## كِتَابُ الحَجّ

{بڕوانە: پوختەی موسلیم زنجیرە: ٥٠٩ هەتا زنجیرە: ٦٢١ لە ژمارە: ٦٣٩ هەتا ژمارە: ٧٩٣ + تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٧٨ هەتا زنجیرە: ١٤٤ لە ژمارە: ١٤٧٠ هەتا ژمارە: ١٧٥٥ + تجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٢ هەتا زنجیرە: ٣٥ لە ژمارە: ٧٢٨ هەتا ژمارە: ٨٧٠ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لە زنجیرە: ١٥٨ هەتا زنجیرە: ١٨٦ لەلاپەڕە: ٣٨٩ هەتا ٤٧٠}.

### ٣٣- باسی گەورەیی حەج و باسی ئەو کەسەی کە حەج پێویست و ئەرك و فەرزە لەسەری
### بَابُ: فَضْلِهِ وَبَيَانِ مَنْ فُرِضَ عَلَيْهِ

٧٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْعُمْرَةُ إِلَى اَلْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ اَلْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا اَلْجَنَّةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری = پوختەی بوخاری: ٢، لاپەڕە: ٢٢٨، ژمارە: ٨١٩ = ١٧٧٣ بوخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٤٠ = ٣٢٧٦ شیحا = ١٣٤٩ مسلم}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم عەمرە هەتا ئـەو عـەمرە، بڕێتـی گونـاهی نێـوانی هـەردووکیان دەکـەێ، حـەجی قـەبوولیش هـەر بەهەشـتە پاداشـێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ١٤٧١} .

٧٢٧- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اَللَّـهِ! عَلَـى اَلنِّسَاءِ جِهَادٌ ؟ قَالَ: " نَعَمْ، عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ لَـا قِتَـالَ فِيـهِ: اَلْحَـجُّ، وَالْعُمْـرَةُ "} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَهْ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَإِسْنَادُهُ صَحِيحٌ. وَأَصْلُهُ فِي اَلصَّحِيحِ.

{تجریـدی بوخـاری/٢، ژمـارە: ٧٣١ = ١٥٢٠، ١٨٦١، ٢٧٨٤، ٢٨٧٥، ٢٧٧٦ بوخاری} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربـان! ئـەی پیغەمبـەری خـودا! ئایـا خـەباتگێڕان و غـەزاکردن لەسـەر ژنـان هەیـە؟ فـەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (بـەڵێ، لەسـەریانە، بـەڵام ئـەم خەباتگێڕان و غەزاکردنەی کە لەسەر ژنانە، شەڕوشۆڕ و کوشتاری تیـادا نییـە: کەبریتییە لەحەج و عەمرە).

دانـەر دەفـەرموێ: ئەحمـەدو ئیبنـو ماجـە گێڕاویانەتـەوە، ئەمـە لـەفظ (گفت = بێژە)ی ئیبنو ماجەیـە، ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـە تەندروسـتە، هـەروا دەفـەرموێ: ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـە لـە صـەحیح (بوخـاری)دا هەیـە. لەبوخاریدا ئاوایە:

دایکـی موسـوڵمانان عائیـشەی کـچی ئـەبو بـەکری صـەدیق (ڕەزای خـودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئێمە خـەبات و غـەزاکرد، بەباشترین کردەوزە دەزانـین، چـونکە ئەوەنـدە بـەزۆری لـەقورئان و سوننەتدا، باسی خێر و گەورەی غەزا دەکرێ، جا ئایا ئێمەی ژنـانیش وەك پیـاوان نـەچین بۆ غەزاو خەباتگێڕان؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (نەء، چونکە بۆ ئێوەی ژنان حەجی دروست باشترین غەزاو خەباتە لەڕێگەی خودادا). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ١٤٧٢ + ریاض:٣، زنجیرە: ٢٣٣، ژمارە: ١٢٧٦} .

٧٢٨- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {أَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَعْرَابِيٌّ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَخْبِرْنِي عَنْ اَلْعُمْرَةِ، أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ فَقَالَ: " لَا. وَأَنْ تَعْتَمِرَ خَيْرٌ لَكَ "} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَالرَّاجِحُ وَقْفُهُ. وَأَخْرَجَهُ اِبْنُ عَدِيٍّ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ ضَعِيفٍ. وَعَنْ جَابِرٍ مَرْفُوعًا: {اَلْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ فَرِيضَتَانِ} .

{أحمد ٣/٣١٦ (١٤٤٥٠) ترمذی: ٩٣١. حاكم رقم: ١٧٣٠. دارقطني ٢/٢٨٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! پێم بفەرموو: ئایا عەمرە فەرزە یان نا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵامدا فەرمووی: (نەء، عەمرە فەرز نییە، بەڵام عەمرە کردن خێرێکی گەلێ گەورەیە، چی بۆ تۆ، چی بۆ هەموو موسوڵمانێ).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوتەی سەنگین ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مەوقووفە لەسەر جابیر، بەڵام بەمەرفووعی لەجابیرەوە ئاوایش هاتووە: (السلسلة الضعيفة: ٣٥٢٠).

جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەج و عەمرە هەردووکیان فەرزێکن لە فەرزەکانی خودا، بەهەرکامیان دەست پێ بکەی زیانی نییە بۆ تۆ).

٧٢٩- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { قِيلَ يَا رَسُولَ اَللَّهِ، مَا اَلسَّبِيلُ؟ قَالَ: " اَلزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ "} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَالرَّاجِحُ إِرْسَالُهُ.

{ترمذی: ٢٩٩٨. دارقطنی ٢/٢١٥. بیهقی رقم: ٨٤٢٣}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوترا: ئەی پیغەمبەری خودا! مەبەست لە وشەی (سَبیلا) چییە؟ لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {وَلِلَّـهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً – سورة آل عمران/٩٧}:

واتە: (حەج فەرزێکە لەفەرزەکانی خودا، فەرزی کردووە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، کەتوانای سامانیو جەستەیی ڕێگەی چوونو هاتنەوەی سەفەری حەجی ماڵی خودای هەبێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: مەبەست لە (سبیل) لەم ئایەتە پیرۆزەدا، ئەوەیە: ئەو موسوڵمانەی دەیەوێ بچێ بۆ حەج، کاتێ حەجی لەسەرە، کەتوێشوو خەرجی ڕێگەو وڵاخی سواری، یان هۆکاری سواری هەبێ.

دانەر دەڵێ: دارە قوطنی گێڕاویەتەوەو حاکم بەتەندروستی داناوە، بەڵام گوتەی سەنگین (قەولی ڕاجیح) ئەوەیە: کەمورسەلی تابیعیە.

٧٣٠- {وَأَخرجَهُ الترمذی من حديث ابن عمر أيضاً وفي إسنادِهِ ضعفٌ}:

تەرمەزی فەرموودەی ژمارە (٧٢٩) دەرهێناوە، بەڵام لەئیبنو عومەرەوە، لەرشتەی ئەمیشا دیسان لاوازی هەیە.

٧٣١– وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَقِيَ رَكْبًا بِالرَّوْحَاءِ فَقَالَ: " مَنِ اَلْقَوْمُ؟ " قَالُوا: اَلْمُسْلِمُونَ. فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: " رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ اِمْرَأَةٌ صَبِيًّا. فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: " نَعَمْ: وَلَكِ أَجْرٌ "} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٤٨ = شیحا: ٣٢٤٠ = مسلم ١٣٣٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: لە ڕەوحا، کەشوێنێکە نزیکەی چل میل لەمەدینەوە دوورە، پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) گەیشت بەکۆمەڵێ سوار نەیناسین لێی پرسین: ئێوە کێن؟ گوتیان: موسوڵمانانین، ئەی تۆ کێی؟ فەرمووی: (موحەممەدی پێغەمبەری خودام).

جا ئافرەتێ، منالێکی خۆی هەڵبڕی و نیشانی پێغەمبەری داو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا حەج بۆ ئەم منالە دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ بۆی دەبێ، وە بۆتۆیش پاداشی باش هەیە لەسەر ئەوە کەهێناوتە حەجی پێ دەکەی، چونکە مامۆستای خێرکەر وەك خێرکەر وایە). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ١٤٩١}.

(ڕوونکردنەوە):

حەجی منال دروستەو دادەمەزرێ، بەڵام دەبێ هەموو کردارەکانی حەج ئەنجام بدا، بەڵام ئەگەر فامیدە نەبوو، هەقداره (وەلی)یەکەی حەجی بۆ دادەبەستێ و ئیحرامی بۆ دەبەستێ.

٧٣٢- وَعَنْهُ قَالَ: {كَانَ اَلْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) . فَجَاءَتِ اِمْرَأَةٌ مَنْ خَثْعَمَ، فَجعَلَ اَلْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَصْرِفُ وَجْهَ اَلْفَضْلِ إِلَى اَلشِّقِّ اَلْآخَرِ. فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اَللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي اَلْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَثْبُتُ عَلَى اَلرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: " نَعَمْ " وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ اَلْوَدَاعِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدى بوخارى/١٥٧/٢، ژمارە: ٧١٨ = ١٥١٣، ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨ بوخارى. أبوداود: مناسك/١٨٠٩. نسائى. حج/٢٦٣٣. تحفة الأشراف: ٥٦٧٠ پوختەى موسليم: ٦٤٩ = شيحا ٣٢٣٨ = مسلم ١٣٣٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵئاوایدا، فەضلی برام لەپاشکۆی پێغەمبەردا سوار بوو بوو، لەوکاتەدا، ژنێ لەهۆزی خەثعەم هات، پرسیاری هەبوو، فەزڵ دەستی کرد بەتەماشاکردنی ژنەکە، ژنەکەیش دەستی کرد بەتەماشاکردنی فەضل، جا پێغەمبەر (درودی

خودای لەسەر بێ) دەستی نابەڕووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، هەتا ڕێگەی تەماشاکردنی بگرێ، ژنەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج کەفەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی خۆی، کەوتۆتە سەر باوکم، لەحاڵێکا کەپیرە مێردێکی ئیختیاری وایە، خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا مرۆڤی پەککەوتووی وەها، حەجی لەسەر دەمێنێ؟ وەئاشکرایە، ئەگەر حەجی لەسەر دەمێنێ، کەخۆی ناتوانێ حەج بکا، جا ئایا دەبێ کەمن لەباتی خۆی حەجی بۆ بکەم؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ، حەجی لەسەر دەمێنێ، وە دروستە کەتۆ حەجی بۆ بکەی، یان کەسێ تر حەجی بۆ بکا). ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەکاتی حەجی ماڵاوایدا بوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥} .

**(ڕوونکردنەوە):**

١- حەج فەرزە.

٢- کاتێ لەسەر کەسێ پێویست بوو، ئەگەر لەبەر هەر هۆیەکی ڕەوا خۆی نەیدەتوانی حەج بکا، دەبێ وەکیل حەجێ بگرێ، حەجی بۆ بکا، وەکیل حەج دروستە پیاو بێ یان ژن بێ، ئەگەر خۆی نەی کرد هەتا مرد، ئەوا کەسوکاری دروستە بەوە هەڵسن، خۆیان حەجی بۆ بکەن، یان وەکیل حەجی بۆ بگرن.

٣- فەزڵی کوڕی عەبباس، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەبباسە، لەیەك باوكو لەیەك دایکن، کوڕی گەورەی ئیمامی عەبباسە، کە مامەی پێغەمبەرە، لەغەزای مەککەو لەغەزای حونەینا، لەخزمەت پێغەمبەر دا بوو، لەحەجی ماڵڵاوایدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕێز لێنان لەپاشکۆی خۆیەوە سواری کردبوو، لەکاتی شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەردا، عەلیو فەضلو ئوسامەی کوڕی زەید شۆردیان، هەر ئەوانیش تەرمەکەیان داهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، عەلی تەرمەکەی دەشۆردو فەضل ئاوەکەی دەکرد بەدەستیدا، فەضل پیاوێکی جوانی، قژجوانی، سپیلکەی قۆز

بوو، زۆرکەس فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك عەبدوڵڵای برایو ئەبو هورەیرەو تەنانەت عەباسی باوکیشی، یەك فەرموودەی لە فەزڵەوە گێڕاوەتەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ژنی بۆهێناو خۆی مارەیی پێدا. {بڕوانە: ژمارە: ٦٦٥ کە لەپێشەوە رابورد}.

یەك کچی لەدوا بەجێماوە، ناوی ئوم کولثوم بوو، شووی کرد بەحەسەنی کوڕی عەلی، لەپاش ئەو شووی کرد بە ئەبو موسای ئەشعەری، ڕاجیایەکی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وا دەردەکەوێ کەئیبنو عەبباسی برای، ئەم فەرموودەیەی لە فەزڵی برایەوە وەرگرتووە. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

٧٣٣- وَعَنْهُ: {أَنَّ اِمْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: " نَعَمْ "، حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ اِقْضُوا اَللَّهَ، فَاَللَّهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢/٢٤٤، ژمارە: ٨٤٨ = ١٨٥٢، ٦٦٩٩، ٧٣١٥ بوخاری}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: ژنێ لەهۆزی جوهەینە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! دایکم لەژیانیدا ئاهو نەزری کرد بوو، کە حەج بکا، بەڵام هەتا مرد حەجی نەکردو نەزرەکەی جێبەجێ نەکرد، جا ئایا دروستە من لەباتی ئەو حەجی بۆ بکەم؟

فەرمووی: (بەڵێ، دروستە ئایا نابینیت ئەگەر گریمان دایکت قەرزێکی کەسێکی لەسەر بێ، تۆ ئەو قەرزەی بۆ دەبژێریتەوەو قەرزەکە جێگەی خۆی دەگرێ، کەواتە قەرزی خودای گەورەیش بدەنەوە، بگرە لەم بارەتەدا خودای

گەورە شایانترە كە قەرزو مافی خۆی پێ بدرێتەوە). {تاج/١٦٨/٢، ژمارە: ١٤٩٠، زنجیرە: ٨٠ چاپی چوارەم}.

٧٣٤- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَيُّمَا صَبِيّ حَجَّ، ثُمَّ بَلَغَ اَلْحِنْثَ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حَجَّةً أُخْرَى، وَأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ، ثُمَّ أُعْتِقَ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حَجَّةً أُخْرَى} رَوَاهُ اِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَالْبَيْهَقِيُّ وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، إِلَّا أَنَّهُ اِخْتُلِفَ فِي رَفْعِهِ، وَالْمَحْفُوظُ أَنَّهُ مَوْقُوفٌ.

{صحيح الجامع: ٢٧٢٩. بيهقي رقم: ٩٦٣٠}:

دیسان ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوكی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر منالێ بەمنالی حەج بكا، لەپاشا ڕەسیدە بوو، گەیشتە بالقی، دیسان پێویستە لەسەری كە حەجێكی تر بكا، ئەگەر توانای حەجی تری هەبوو، هەروا هەر كۆیلەیێ، لەكاتی كۆیلەییدا حەج بكا، وە لەپاشا ئازاد بوو، وە لەكۆیلەیی ڕزگاری بوو، ئەوە ئەگەر توانای سامانیو جەستەیی شەرعی هەبوو، دەبێ حەجێكی تر بكا، چونكە ئەو حەجەی كە بەمنالی، یان بەكۆیلەیی كردوویانە، برێتی حەججەتول ئیسلام ناكەوێ).

(ڕوونكردنەوە):

١- حەجی منالی نابالقو كۆیلە دادەمەزرێو دروستەو خێری زۆری بۆ خۆیانو بۆ كەسی یارمەتی دابن لەكردنی ئەو حەجەیاندا هەیە، وە شتی وا سوننەتەو بەشداریو یارمەتیو كارئاسانی لەم لایەنەوە، بۆ ئەم جۆرە دوو كەسە، لەكاتی كردنی حەجدا سوننەتە.

٢- ئەم پرسە درێژەیێ زۆر هەڵدەگرێ، لەپەڕاوی شەرحە گەورەكانا، ئەم باسە بەتێروتەسەلی تۆمار كراوە. بەڵام لێرەدا ئاماژە بۆ ئەمە دەكەین:

آ- زۆرینە دەفەرموون: حەجی منالو كۆیلە دادەمەزرێو سوننەتەو خێری هەیە بۆیان، بەڵام برێتی حەججەتول ئیسلام ناكەوێ، لەبەر ئەوە

هەرکاتێ مناڵەکە گەورە بوو، یان کۆیلەکە ئازاد بـوو، وە توانـای شـەرعی حـەج کردنیان هەبوو، دەبی حەجێ تر بکەنەوە.

ب- کەمینـەش دەڵـێن: حـەجی منـاڵو حـەجی کۆیلـە، لـەکاتی منـاڵیو کۆیلـەییدا، هـەروەك سـوننەتەو دادەمـەزرێ، برێتـی حەججەتول ئیـسلامیش دەکەوێ، کاتێ منالەکە گەورە بوو، یان کۆیلەکە ئازاد بوو، حەجی تریان لەسەر نییە!

ج- ئەبو حەنیفەو کەسانی تـریش دەڵێن: حـەجو عیبـادەتو پەرسـتشی منـاڵ هیـچی دانامـەزرێ، وەمناڵکـە لـەکاتی ئـەنجام دانـی ئـەو حەجـەو ئـەو عیبادەتـەدا، مـولزەم نییـە بـەهیچ، وە لـەکاتی حەجـدا، لەمـەحظوراتی حـەج، هیچی لێ قەدەغە نییە، وە ئەم فەرمانانەی کە بەمناڵ دەکرێ، لەحەوت ساڵیدا، نوێژ بکا، یان رۆژوو بگرێ، یان حەج بکا، هەمووی بۆ خـوو پێـوەگرتنو مەشـق کردنەو بەس!

٣- دانــەر مامۆسـتای عەسـقەلانی دەفـەرموێ: (پیـاوانی ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیــە متمانــەدارن، بــەڵام ڕاجیــایی لــەوەدا هەیــە، کــە حــەدیثــەکــە مەرفووعەو بەرزەوەکراوە بۆ پێغەمبەرو فەرمایشتی ئـەوە یانـا؟. عەسـقەلانی دەڵێ: ئەوەی کە لەناو فەرموودەزانەکانا لەبەر کراوەو ناسراوە ئەوەیە کـە ئـەم فەرموودەیە مەوقووفە لەسەر ئیبنو عەبباسو فەرمایشتی ئەوە.

٧٣٥- وَعَنْهُ: قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَخْطُبُ يَقُولُ: {" لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِاِمْرَأَةٍ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ، وَلَا تُسَافِرُ اَلْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ " فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ، إِنَّ اِمْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً، وَإِنِّي اِكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: " اِنْطَلِقْ، فَحُجَّ مَعَ اِمْرَأَتِكَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بڕوانــە: تجریـدی بوخـاری/٢/٢٤٦، ژمـارە: ٨٥١ = ١٨٦٤ بوخـاری + بوخـاری: ١٨٦٢، ٣٠٠٦، ٣٠٦١، ٥٢٣٣، پوختــەی موسـلیم: ٦٤٧ = شــیحا

٣٢٥٩ = صحيح مسلم بشرح الإمام النووي، تخريج وترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا = صحيح مسلم ١٣٤١ + تجريدى بوخارى/٣/٣٥٥، ژمارە: ١٢٣١ = ٣٠٠٦، ١٩٦٢، ٣٠٦١، ٥٢٣٣ بوخارى. تحفة الأشراف: ٦٥١٤}. {بڕوانە: پوختەى موسليم: ٦٤٥}.

ئيبنو عەبباس (ڕەزاى خودا لەخۆى و لەباوكى) فەرمووى: لە پێغەمبەرم بيست وتارى دەدا، دەيفەرموو: (نابێ پياوو ژنى بيانى بەتەنها، دوو بەدوو، لەشوێنێكا كۆببنەوە، مەگەر ژنەكە خۆى (مەحرەم)ى لەگەڵدا بێ، ئافرەتيش نابێ بچێ بۆ سەفەرێ دوور مەگەر خۆيى (مەحرەم)ى لەگەڵدا بێ).

پياوێ هەستا گوتى: ئەى پێغەمبەرى خودا! من خۆم بۆ ئەو غەزايە ناونووس كراوم و ژنەكەشم چووە بۆ حەج؟!

فەرمووى: (دەى خۆشت بڕۆ لەگەڵ ژنەكەتا بۆ حەج!). {تاج/٢، زنجيرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٧ + پوختەى موسليم ٦٤٥ = ٣٢٥٧ شيحا + ژمارە: ٦٤٦}. {بڕوانە: تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٨٥١}.

(ڕوونكردنەوە):

بەهۆى خۆيى و مەحرەمييەوە، لەنێوانى دوو كەسدا، ئەم بڕيارە شەرعيانە دەچەسپێ، ئەگەر يەكێكيان نێرو ئەويتريان مێ بوو:

١- هاوسەرى لەنێوانيانا قەدەغەيەو نادروستەو حەرامە.

٢- دەسنوێژيان لەيەكترى ناشكێ.

٣- پێكەوە ژيان و دانيشتن و هاموشۆو سەفەريان بەيەكەوە دروستەو بێ شەرعى نييە، وەك: دايك و كوڕ، يان خوشك و برا، هۆى دروستبوونى خۆيى و مەحرەمى لەنێوانى دوو كەسدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ هۆيە:

آ- خزمايەتى.

ب- ژن و ژنخوازيى (موصاهەرە).

ج- شيرخواردن.

**یەکەم: بوون بەخۆیی‌و حەرام بوون لەیەکتری: بەهۆی خزمایەتییەوە:**

پیاوی موسولّمان، بەهۆی خزمایەتییەوە، ئەم چوار جۆرە ژنەی لێ قەدەغە دەبێ‌و ئەو ژن‌و پیاوە دەبن بەخۆیی‌و مەحرەمی یەکتری‌و دەسنوێژیان لەیەکتری ناشکێ‌و مارەو نیکاحیان لەیەکتری دروست نییەو دانیشتن‌و گوزەران‌و سەفەریان بەدوو بەدوو دروستە:

١- هەر ژنێ کەبنەچێ بێ بۆ مرۆڤ (بنەچە واتە: ئەصڵ) با بەرەو ژووریش بڕوا، وەك:

آ- دایك.

ب- دایکی دایك بابەرەو ژووریش بڕوا.

ج- دایکی باوك بابەرەو ژووریش بڕوات.

د- دایکی باپیرە بابەرەو ژووریش بڕوات، بۆ ئەم مەبەستە باپیرەی باوکی‌و باپیرەی دایکی جیاوازی نییە.

کورت‌و پوخت: دایك‌و نەنك خۆیین بۆ منالّ‌و منالّی منالّیان، نەنك دوور بێ یان نزیك، نەنکی باوکی بێ، یان نەنکی دایکی بێ، جیاوازی نییە، هەروا باپیرەی باوکی بێ، یادایکی جیاوازی نییە.

٢- هەر ژنێ کە وەچە بێ بۆ پیاو: با بەرەو خواریش بڕوات، دەبێ بەمەحرەم‌و خۆیی بۆ ئەو پیاوە. (وەچە واتە: فەرع) وەك:

آ- کچ‌و منالّی کچ بابەرەو خواریش بڕوات، وەك کچی کچ‌و کچی کوڕی کچ‌و... تاد.

ب- کچی کوڕ‌و کچی منالّی کوڕ، با بەرەو خواریش بڕوات.

(كورت و پوخت)

(بنەچەو وەچە واتە: ئەصلْ و فەرع) نزیك بن وەك دایكو باوكو كچو كوڕی خۆت، یا دووربن، وەك: نەنكو باپیرەی خۆتو نەنكو باپیرەی بنەچەتو منالّی منالّتو منالّی وەچەت، كورتو پوخت بنەچەو وەچەی مرۆڤ مەحرەمە، بنەچەی نزیك باوكە یان دایكە، بنەچەی دوور، لەدایكەوە بێ یان لەباوكەوە بێ، باپیرە یان نەنكە، وەچەی نزیك كوڕو كچە، وەچەی دوور كوڕەزایە، یان كچەزایە. تەنانەت لەلای جەماوەری زانایان (وەچەیێ كە لەئاوی داوێپیسی پەیدا بووبێ، واتە: زۆڵ بێ، هەم ئەو وەچەیە خۆیو هەم وەچەی ئەو وەچەیە، دادەنرێن بەخۆیی و بەمەحرەم، بۆ باوكو دایكیانو بۆ باپیرەو نەنكیان!).

٣- هەر مێینەیەك كە وەچە بێ بۆ دایكت، یان وەچە بێ بۆ باوكت، یان وەچە بێ بۆ باوكو دایكت، مەحرەمەو خۆییە بەتۆ.

وەچەی دایكت، خوشكی دایكیتە، یاخوشكەزای دایكیتە، با بەرەو خواریش بڕوات، وەچەی باوكت خوشكی باوكیتە یان خوشكەزای باوكیتە، بابەرەو خواریش بڕوات، وەچەی باوكو دایكت خوشكی هەفتە، لەباوكو دایكتەوە، یان خوشكەزای هەفتە لەباوكو دایكەوە، بابەرەو خواریش بڕوات.

لەسەر ڕای جەماوەری زانایان خوشكی زۆڵو برازای زۆڵ كە كچ بێو خوشكەزای زۆڵو برازای زۆڵ كە كچ بێ مەحرەمەو خۆییە.

وەك ئەوە: باوكی زەید، یان برای زەید، یان خوشكی زەید، یان كوڕی زەید، كچێكی زۆڵی هەبێ، ئەوە لەشێوەی یەكەما خوشكی زەیدە، لەشێوەی دووەما برازای زەیدەو زەید مامیەتی، لەشێوەی سێیەما خوشكەزای زەیدو زەید خاڵیەتی، لەشێوەی چوارەما كوڕەزای زەیدەو زەید باپیرەیەتی.

٤- وەچەی باپیرو وەچەی نەنك، كە لەیەك پلەدا بن:

کەبریتین لەپووری باوکی‌و لە پووری دایکی مرۆڤ، ئیتر چی خوشکی هەقی باوکت، یان خوشکی هەقی دایکت بێ، یان خوشکی باوکی باوکت، یان خوشکی باوکی دایکت بێ، وە چی خوشکی دایکی باوکت، یان خوشکی دایکیی دایکت بێ. هەروەها پووری بنەچەت، چی لەتەرەفی باوکەوە بێ، وەچی لەتەرەفی دایکەوە بێ وەك:

آ- پووری باوکت، یان پووری باپیرت، بابەرەو ژووریش بڕوات، پووری تۆیشەو مەحرەمی شەرعییە.

ب- پووری دایکت، یان پووری نەنکت، بابەرەو ژووریش بڕوات، نەنکەکە لەلای باوکەوە بێ، یان لەلای دایکەوە بێ، پووری تۆیشەو خۆییەو مەحرەمە بەتۆ.

دووەم: مەحرەمی شەرعی بەهۆی ژن‌و ژنخوازییەوە، کە دەستنوێژیان لەیەکتری ناشکێ‌و مارەیان لەیەکتری نایەت‌و گوزەران‌و پێکەوە ژیان‌و سەفەرو دانیشتنیان پێکەوە دروستە، ئەم چوار جۆرە کەسەن:

١- ژنی باوك، یاژنی باپیرە، با بەرەو زووریش بڕوات، چی باپیرە لەلایەنی باوکەوە بێ، وەچی لەلایەنی دایکەوە بێ جیاوازی نییە. باوەژنی خۆت، یان باوەژنی باوکت، یان باووەژنی باپیرەت، بۆ تۆ مەحرەمەو لەشوێنی دایکتە لەمەحرەمییەتدا.

٢- بنەچەی ژن، کەبریتییە لەدایکی ژنەکەت‌و لەدایکی دایکی ژنەکەت‌و لەدایکی باوکی‌و لەدایکی باپیرەی.

دایکی ژنەکەت و هەموو نەنکێکی ژنەکەت، باوکی بێ، یان دایکی، نزیك بێ، یان دوور، خەسووتە و دەسنوێژت لێی ناشکێ و مەحرەمە بەتۆ.

٣- وەچەی ژنی تۆ، مەحرەمە بەتۆ، کەبریتین لەکچی ژن و لەکچی کچی ژن و لەکچی کوڕی ژن، بابەرەو خواریش بڕوات، تۆ دەبیت بە باوە پیارەو زڕباب بۆ ئەوان و ئەوانیش دەبن بەزڕکچ و هەنەزا بۆ تۆ، هەتا هەتایە دەبن بەمەحرەمی یەکتری.

٤- ژنی وەچەی تۆ، کەبریتین لەژنی کوڕو لەژنی کوڕی کوڕو لەژنی کوڕی کچی تۆ، با دووریش بکەونەوە، ئەمانە هەموویان دادەنرێن بەبووکی تۆ و تۆیش دادەنرێیت بە خەزووری ئەوان، لەمەحرەمییەتدا، لەجێگەی باوکیانیت و ئەوان لەحوکمی کچی تۆدان.

سێیەم: خۆیی و مەحرەمییەت، بەهۆی شیر و شیرخواردنەوە:

لەتەجریدی بوخاریەوە، لەبەرگی پێنجەمەوە، لەکۆتایی ژمارە (١٧٥٧)وە، ئەم زانیاری و بڕیارە شەرعیانە ڕاگوێز دەکەین:

یەکەم: پوختەیێ لەبڕیارەکانی شیر و مەمکخواردن:

١- هەردوو کەسێ شیرخواردنی شەرعی چەسپا لەنێوانیاندا، هەتاهەتایە، لەیەکتری حەرام دەبن، مارەیان لەیەکتری نایەت، نەزەر و تەماشایان بۆ یەکتری حەرام نییە، خەڵوەت و دانیشتن و پێکەوەژیانیان دوو بەدوو لەگەڵ یەکتردا حەرام نییە، سەفەرییان پێکەوە دوو بەدوو دروستە، دروستە لەگەڵ یەکتری بچن بۆ حەج، دەسنوێژیان لەیەکتری ناشکێ، بەشێوەیەکی گشتی، لەبابەتی خواستن و شووپێکردن و تەماشاکردن و دوو بەدوو پێکەوەبوون و سەفەرکردن و دەسنوێژ و تەوقەکردن و ماچکردن و تەوابیعی نیکاحەوە، دادەنرێن بەدوو خزمی خۆیی و مەحرەم، بەبێ زیادوکەم، لەجێگەی خوشك و بران و یان لەشوێنی دایك و منالن، وەچی بۆ ئەوان دروست نییە، بۆ ئەمانیش دروست

نییە، وەچی بۆ ئەوان لەناو خۆیانا دروستە، کە کەسی نەسەبی یەکتر ین، بۆ ئەمانیش دروستە کە کەسی شیری یەکترین، لەرووی مەحرەمییەتەوە.

٢- تەنیا لەم چەند بڕیارەدا، جیاوازی هەیە لەنێوانی کەسی خوێنی (نەسەبی)و کەسی شیریدا:

آ- کەلەپوورو میرات لەیەکتری وەرناگرن.

ب- ژێوارو نەفەقەیان لەسەر یەکتری نییە.

ج- ئەگەر کەسی شیریی، خوشکی شیری خۆی، یان دایکی شیری خۆی، یان باوکی شیری خۆی، یان هەرکەسێکی تری شیری خۆی، بووبە کۆیلەو سامانی، بەوە ئازاد نابێ، بەپێچەوانەوە باوكو دایكو براو خوشكو کەسی نەسەبی، کە لەکاتی وادا یەکسەر ئازاد دەبن.

د- یان شایەتی برای شیری بۆ برای شیری، یان بۆ دایکی شیری قەیدی نییەو وەردەگیرێ.

هـ- یان ئەگەر باوکی شیری، یان باپیرەی شیری، یان دایکی شیری، کەسێکی شیری خۆی کوشت، دەکوژرێتەوە لەباتی ئەو کوژراوە، بەپێچەوانەی منداڵو باوكو دایکی خوێنی، واتە: نەسەبی، چونکە ئەوان لەجیاتی منالی خۆیان ناکوژرێنەوە.

و- یان ئەگەر باوکی شیری کەسێ، یان باپیرەی شیری کەسێ، یان دایکی شیری کەسێ، کەسێکی تری کوشت ئەم کەسە شیرییەی بەعاقلە دانانرێ.

واتە: بەشێ لەخوێنی کوژراوەکە ناکەوێتە ئەستۆی ئەو.

ز- هەروەها براو باوكو مامی شیریو ئەمانە، لەکاتی مارەبڕینو لەکاتی حەددو تۆڵە سەندنو قەصاصو بوختانو قەزفو تەعزیرو ئەمانەدا، دانانرێن بەهەقدارو وەلی ژنە شیرخۆرەکەیان، یان براو باوكو دایكو خوشكو کچە شیرییەکەیان.

٣- بەشـێوەیەکی گـشتی سـیلەی ڕەحمیـان سـوننەتە، بەسـەرکردنەوەو سـەرلێدانو دیـاری بـردن بۆیـانو چـاکەکردن لەگـەڵیاناو باشـبوون بۆیـان سوننەتە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) زۆر زۆر ڕێـزی ئـوم ئەیمـەنی دەگرت، کەدایکی شیری پێغەمبەر بوو.

٤- شیرخواردن خۆیی‌و مەحرەمییەت لەنێوان شیرەخۆرو ئـەم کەسانەی تردا، لەسەر ئەم شێوەیە دادەمەزرێنێ.

١- ژنە شیردەرەکە مەحرەمییەتی، چونکە دایکی شیرییەتی.

٢- مێردەکەی، چونکە خاوەنی شیرەکەیەو ئەو ژنەکەی متوربە کردووەو باوکی شیرییەتی.

٣- ئاغای ژنەکە، ئەگەر ژنەکە کەنیزەك‌و جاریە بوو، مێردی نەبوو، ئـوم وەلەد بوو بۆ خاوەنەکەی چونکە باوکی شیرییەتی.

٤- دایکـی ژنــە شـیردەرەکە، چـونکە نـەنکی شـیرییەتی، بابـەرەو ژووریـش بڕوات، وەك دایکی نەنکی ژنەشیردەرەکە.

٥- خوشکی ژنە شیردەرەکە، چونکە پووریەتی.

٦- کچی شیردەرەکە، چونکە خوشکی شیرییەتی.

٧- کـچی کـچی شـیردەرەکە، چـونکە خوشـکەزایەتی، بابـەرەو خـوواریش بڕوات.

٨- کچی پیـاوی خـاوەن شـیرەکە، بالـەژنێکی تـریش بـێ، چـونکە خوشـکی شیرییەتی.

٩- کــچی کــچی خــاوەن شــیرەکە، کــەمێردی ژنـــە شــیردەرەکەیە، یــان خاوەنییـەتی، ئەگـەر شـیردەرەکە کۆیلـەو کـەنیزەك بـوو، چـونکە خوشـکەزای شیرییەتی، بابەرەو خواریش بڕوات.

١٠- دایکی خاوەن شیرەکە، کەیا مێردیـەتی یـان خـاوەنی، چـونکە نـەنکی شیرییەتی، بابەرەو ژووریش بڕوات.

١١- خوشكی خاوەن شیرەكە، چونكە پووری شیرییەتی، لەباوكی شیرییەوە.

١٢- برای خاوەن شیرەكە، چونكە مامی شیرییەتی.

١٣- كوڕی خاوەن شیرەكە، چونكە برای شیرییەتی.

١٤- باوكو باپیرەی خاوەن شیرەكە، چونكە باپیرەی شیرییەتی، بابەرەو ژووریش بڕوات.

١٥- كوڕی شیردەرەكە، چونكە برای شیرییەتی.

١٦- برای ژنە شیردەرەكە، چونكە خاڵی شیرییەتی.

١٧- كوڕو كچی كوڕی شیردەرەكە، چونكە كوڕەزا، یان خوشكەزایەتی لەشیرەوە. (نەقڵ لە تجریدی بوخارییەوە تەواو).

١٨- جەماوەری زانایان دەفەرموون: (هەركەسێ بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە ببێ بەمەحرەم بۆ كەسێ، دەبێ بەمەحرەم بۆ ئەو كەسەیش، كە بەهۆی شیرخواردنەوە بووە بەمەحرەم بۆ ئەو كەسی دووەمە). لەژناندا ئەمانەن:

١- دایكی شیری ژنی تۆ، هەروا دایكی دایكی شیری ژنی تۆ، بابەرەو ژووریش بڕوات، دەبن بەخەسوو بۆ تۆو دەبن بەمەحرەمەت.

٢- كچی شیری ژنی تۆو كچی كچی شیری ژنی تۆ، بابەرەو خواریش بڕوات، دەبن بەمەحرەم بۆتۆ، چونكە لەجێگەی كچتە لەمەحرەمیدا.

٣- ژنی باوكی شیریو ژنی باپیرەی شیری، بابەرەو ژووریش بڕوات، مەحرەمە بۆتۆو لەجێگەی دایكو نەنكتە.

٤- ژنی كوڕی شیریو ژنی كوڕی كوڕی شیری تۆ، بابەرەو خواریش بڕوات، دەبن بەبووك بۆتۆو لەمەحرەمیدا، لەجێگەی كچی نەسەبی تۆیە. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ٨٦٩ = ٣٧٣١ شیحا}.

١٩- مایەوە سەر ئەوە كەروونی بكەینەوە، كەژنو مێرد نابێ مەحرەم بن، دەنا مارەیان لەیەكتری نایەت. بەڵام سەفەرو خەڵوەو ژیانو گوزەرانیان بەیەكەوە دروستەو كارێكی رەوای شەرعییە.

٧٣٦- وَعَنْهُ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ، قَالَ: " مَنْ شُبْرُمَةُ؟ " قَالَ: أَخٌ لِي أَوْ قَرِيبٌ لِي، قَالَ: " حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ؟ " قَالَ: لَا. قَالَ: "حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ، ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ "} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالرَّاجِحُ عِنْدَ أَحْمَدَ وَقْفُهُ.

{أبوداود: ١٨١١. ابن ماجة: ٢٩٠٣. ابن خزيمة: ٣٠٣٩. ابن حبان: ٣٩٨٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاوایی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو پیاوێ دەیگوت: خودایە ئیحرامی حەج دائەبەستم بۆ تۆ، لەجیاتی شوبرومە!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (شوبرومە کێیە؟). گوتی: برامە، یاگوتی: خزممە، فەرمووی: (ئایا لەمەو پێش حەجت بۆ خۆت کردووە؟) گوتی: نەخەیر! فەرمووی: (دە لەپێشدا، حەج بۆ خۆت بکە، ئینجا لەوەپاش حەج بۆ شوبرومە بکە). {تاج/٢/١٦٧، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٦}.

ئیبنو حیببان بە صەحیحی داناوە، بەڵام گوتەی سەنگین لەلای پێشەوا ئەحمەد، مەوقووفە.

٧٣٧- وَعَنْهُ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: {" إِنَّ اَللَّهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ اَلْحَجَّ " فَقَامَ اَلْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ فَقَالَ: أَفِي كُلِّ عَامٍ يَا رَسُولَ اَللَّهِ؟ قَالَ: " لَوْ قُلْتُهَا لَوَجَبَتْ، اَلْحَجُّ مَرَّةٌ، فَمَا زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ "} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، غَيْرَ اَلتِّرْمِذِيِّ.

{أحمد: ٢٣٠٤. أبوداود: ١٧٢١. نسائى/٥/١١١ وفى الكبرى: ٣٥٨٦}:

دیسانەوە پێشەوا ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی بۆمان دا، لەو

وتارەدا فەرمووی: (خودای گەورە حەجی فەرز کردووە، لەسەر ئێوە کە نەتەوەی ئیسلامن).

ئەقرەعی کوڕی حابیس هەڵسا، فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا حەج هەموو ساڵێ فەرزە لەسەر موسوڵمانان، یان یەك جار فەرزە لەتەواوی تەمەندا؟ فەرمووی: (ئەگەر بڵێم هەموو ساڵێ حەج فەرزە لەسەر هەموو کەسێ، ئەوا فەرز دەبوو لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە هەموو ساڵێ حەج بکا، بەڵام هەموو ساڵێ فەرز نییە لەسەر هەموو کەسێ، بەڵکوو لەتەواوی تەمەندا یەکجار فەرزە، ئیتر هەرکەسێ حەجی زیاتر بکا، ئەوە زیادە خێرەو سوننەتەو بەس).

٧٣٨- وَأَصْلُهُ فِي مُسْلِمٍ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

{پوختەی موسلیم: ٦٣٩ = شیحا ٣٢٤٤. نسائی. مناسك الحج: ٢٦٤٤. تحفة الأشراف: ٢٦٤٥}:

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درוودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی بۆمان دا، فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! خودای گەورە حەجی داناوە لەسەرتان، دەی حەج بکەن!). پیاوێ گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا هەموو ساڵێ؟ پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) دەنگی نەکرد، هەتا پیاوەکە سێ جار ئەم پرسیارەی لێ کردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بڵێم بەڵێ، ئەوا هەموو ساڵێ حەج فەرز دەبێ لەسەرتان و ئەوەیشتان بۆناکرێ).

ئەنجا فەرمووی: (کاتێ من وازم لەئێوە هێنا، ئێوەیش واز لەمن بهێننو کەمن لەشتێکم نەکۆڵیەوە، ئێوەیش لێی مەکۆڵنەوە، مەبادا سەربکێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست. چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە، لەبەر ئەوە لەناو چوون، چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردو زۆر لەدژیان دەوەستان،

ئەوەی کە گوتم بیکەن، چەندەی لەتواناتانا هەیە بیکەن، بەڵام ئەوەی کە گوتم مەیکەن توخنی مەکەون!). {ریاض/٣/١٨٧٣، ژمارە: ١٢٧٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٧٩، چاپی چوارەم لاپەڕە: ١٦٣} .

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە بریتییە لە (٧٣٨ – ٧٢٥ = ١٣) سیازدە فەرموودە، لە ژمارە: (٧٢٦)وە هەتا ژمارە: (٧٢٥).

٢- باسی گەورەیی‌و خێری حەج‌و عەمرە.

٣- حەج لەسەر ژن وەك پیاو فەرزە، هەروا عەمرەیش لەسەر ژن وەك لەسەر پیاو فەرزە.

٤- حەج‌و عەمرە کاتێ پێویست دەبن لەسەر کەسێ، کە لەهەموو ڕوویەکەوە توانای چوون‌و هاتنەوەی شەرعیان هەبێ.

٥- حەجی مناڵ‌و کۆیلە دروستە، هەروا عەمرەیان، خێری خۆشیان‌و ئەو کەسەش دەگات کە حەجیان پێ دەکا.

٦- حەج‌و عەمرەی منـاڵ‌و کۆیلە، برێتی حەججەتول ئیسلام ناکەوێ، منالّەکە ئەگەر گەورە بوو، وەتوانای شەرعی هەبوو، دەبی حەج‌و عەمرە بکاتەوە، هەروا کۆیلەکە هەرکاتێ ئازاد بوو، دەبێ حەج‌و عەمرە بکاتەوە، ئەگەر توانای شەرعی هەبوو.

٧- حەج‌و عەمرە لەتەمەندا یەکجار فەرزە، وەسوننەتێکی گەورەن ئەگەر چەندبارە بکرێنەوە.

٨- حەج‌و عەمرە بۆ مردوو دەکرێ، هەروا کەسێ کە لەبەر پیری، یان لەبەر نەخۆشی، یان لەبەر مەهانەیەکی ڕەوا، نەتوانێ حەج‌و عەمرە بکا، کەسێ تر حەجی بۆ دەکا، یان عەمرەی بۆ دەکا، مەرجە ئەو کەسە لەپێشا خۆی حەجی بۆخۆی کردبێ، یا عەمرەی بۆ خۆی کردبێ.

## ٣٤- باسی نیشانەی کاتو وادەو شوێنی دابەستنی ئیحرامی حەجو عەمرە

## باب: المواقيت

{بڕوانە: پوختەی موسلیم زنجیرە: ٥١٨، ژمارە: ٦٥١و ٦٥٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٥ هەتا ١٤٩٩}.

٧٣٩- عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَقَّتَ لِأَهْلِ اَلْمَدِينَةِ: ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ اَلشَّامِ: اَلْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ: قَرْنَ اَلْمَنَازِلِ، وَلِأَهْلِ اَلْيَمَنِ: يَلَمْلَمَ، هُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَ اَلْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٣٣ = ١٥٢٤، ١٥٢٦، ١٥٢٩، ١٥٣٠، ١٨٤٥ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦٥١ = شیحا ٢٧٩٥ = مسلم ١١٨١. أبوداود. حج: ١٧٣٨. نسائی. حج: ٢٦٥٧. تحفة الأشراف: ٥٧٣٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زولحولەیفە، کەئێستا ناوداره بە بیری عەلی، ئەو شوێنەی دیاری کردووە بۆ جێگەی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، وە بۆ خەڵکی شامیش جوحفە، وە بۆ خەڵکی نەجدیش قەرنولمەنازیل، وە بۆ خەڵکی یەمەنیش یەلەملەم.

وە فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) (ئەم شوێنانە جێگای ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کەدێن بۆ حەجو عەمرە، لەخەڵکی ئەم وڵاتانەو لەخەڵکی ئەو وڵاتانەی تریش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەجو عەمرە، وەهەر کەسی لەم شوێنانەی کەناومان هێنان، نزیکتر بوو، ئەوە جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە، کە لێیەوە دەکەوێتە ڕێ! ئیتر هەروا بەم پێو دانە، هەتا نزیکتر بێ جێگەی ئیحرام دابەستنەکەشی نزیکترە، تەنانەت خەڵکی

مەککە، لەناو مەککەوە ئیحرام دادەبەستن). {تاج/٢/١٧٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٦}.

٧٤٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا: {أَنَّ أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَقَّتَ لِأَهْلِ اَلْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ.
{صحيح، الإرواء: ٩٩٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاتوعیرقی دیاری کردووە بۆ جێگەی ئیحرام دابەستنی خەڵکی عێراق. {تاج/٢/١٧٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٨ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٥٢ = مسلم ترقیم شیحا ٢٨٠٢}.

٧٤١- {وَأَصْلُهُ عِنْدَ مُسْلِمٍ مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ إِلَّا أَنَّ رَاوِيَهُ شَكٌّ فِي رَفْعِهِ}:

ئەمەیش دەقی بنەمای ئەم فەرموودەیەیە، لەپوختەی موسلیمدا {ژمارە: ٦٥٢ = ٢٨٠٢ شیحا} کە دانەر دەفەرموێ: بنەمای ئەم فەرموودەیە لەموسلیمدا، لەجابیرەوە ئاوایە:

ئەبو زوبەیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) گوتی: بیستم لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) پرسیاری لێ کرا، لەبارەی جێگەی ئیحرام دابەستنەوە، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە زولحولەیفەیە، لەرێگەی تری مەدینەشەوە شوێنی دابەستنی خەڵکی مەدینە جوحفەیە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی عێراقیش ذاتوعیرقە، کە چلو دوو میل لەمەککەوە دوورە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی یەمەن یەلەملەیە.

ئەبو زوبەیر گومانی بۆ پەیدا بوو بوو، کەجابیر ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەر بیستووە؟ یانا؟ واتە: فەرموودەکە مەرفووعە، یان قسەی جابیر خۆیەتی. لەگەڵ ئەوەیشا ئەبو زوبەیر فەرمووی: وەها دەزانم کەجابیر فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست، تاکۆتایی فەرموودەکە.

٧٤٢- وَفِي صحيح اَلْبُخَارِيِّ: {أَنَّ عُمَرَ هُوَ اَلَّذِي وَقَّتَ ذَاتَ عِرْقٍ}.

{بوخاری: ١٥٣١}:

**لەتاجول ئوصولدا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:**

**ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کووفەو بەصرە ئازادکران، هاتنە خزمەتی عومەری باوکم، عەرزیان کرد: قوربان! ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! خۆت دەزانی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەرنولمەنازیلی دیاری کردووە بۆ جێگەی ئیحرام بەستنی خەڵکی نەجد، ئەوێش کلایە لەڕێگەی ئێمەوەو، ئەگەر گریمان بچین لەوێوە بڕۆین بۆ حەج دوور دەکەوینەوەو تووشی رەنجو زەحمەت دەبین؟**

**عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەرەنج بدەن لەڕێکی ئەوێ، لەڕێگەی خۆتانەوە کوێیە، جا عومەر زات عیرقی دیاری کرد بۆیان. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٩}.**

٧٤٣- وَعِنْدَ أَحْمَدَ، وَأَبِي دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيِّ: عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَقَّتَ لِأَهْلِ اَلْمَشْرِقِ: اَلْعَقِيقَ}.

{أحمد/١/٣٤٤ (٣٢٠٥). أبوداود: ١٧٤٠. ترمذی: ٨٣٢}:

**ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەقیقی دیاری کردووە بۆ جێگەی ئیحرام بەستنی خەڵکی ڕۆژهەڵات (عێراق). {تاج/٢/١٧٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٧ — ئەبوداوود/ترمذی — سند حسن}.**

## ٣٥- ئیحرام بۆچیو چی دەبەستریو چۆنێتی ئیحرام دابەستن
## بَابُ: وُجُوهِ الإِحْرَامِ وصِفَتِه

٧٤٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {خَرَجْنَا مَعَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَامَ حَجَّةِ اَلْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ

أَهَلَّ بِحَجّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَحَلَّ، وَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجّ، أَوْ جَمَعَ اَلْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمَ اَلنَّحْرِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = پوختەى بوخارى = مختصر صحيح البخارى بالكوردى/٢، ژمارە: ٧٥١ = بوخارى: ١٥٦٢. پوختەى موسليم ٧٦٤ = شيحا ٢٩٠٩ = مسلم ١٢١١. أبوداود. حج: ١٧٧٩. نسائى. حج: ٢٧١٥. ابن ماجة. حج: ٢٩٦٥. تحفة الأشراف: ١٦٣٨٩}:

عائيشە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: لەساڵى حەجى ماڵاوايدا، لەمەدینەوە لەخزمەتى پێغەمبەردا، لەمانگەكانى حەجا، بەرەو مەككە، بەنیازى حەجو عەمرە كەوتینە ڕێ، لەسەر ئەم سێ شێوەیە ئیحراممان بەست:

هەمان بوو، لەمیقات، بەس ئیحرامى عەمرەى بەستبوو، هەمان بوو ئیحرامى حەجو عەمرەى بەسەریەكەوە بەستبوو، هەمان بوو بەس ئیحرامى حەجى بەستبوو، پێغەمبەر خۆى (دروودى خوداى لەسەر بێ) بەس ئیحرامى حەجى دابەستبوو. جا ئەوانەى كەتەنیا ئیحرامى عەمرەیان بەستبوو، وەدیاریى بەیتیان پێ نەبوو، واتە: هەدیى حەرەمیان پێ نەبوو، كاتێ گەیشتنە مەككە، عەمرەكەیان تەواو كردو ئیحرامیان شكاند، بەڵام ئەوانەى كەتەنیا ئیحرامى حەجیان دابەستبوو، لەگەڵ ئەوانەدا كە ئیحرامى حەجو عەمرەیان بەسەریەكەوە دابەستبوو، ئیحرامیان نەشكاند، هەتا یەكەم رۆژى جەژن، لەپاش رەجمى شەیتانو تەوافى بەیتو سەربڕینى هەدى ئیحرامیان شكاند. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ١٥٢٨ + ژمارە: ١٥٢٧}.

## ٣٦- ئیحرام دابەستنو نیتی حەج، یان عەمرە هێنان لەگەڵ ئەو شتانەدا پەیوەندیان بەئیحرام دابەستنو نیت هێنانەوە هەیە
## باب: الإحْرامِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهِ

٧٤٥- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {مَا أَهَلَّ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِلَّا مِنْ عِنْدِ اَلْمَسْجِدِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٧٤١ = بوخارى: ١٥٤١. پوختەى موسليم ٦٥٨ = شيحا ٢٨٠٩، ٢٨٠٨ = مسلم ١١٨٦. نسائى. حج: ٢٥٥٨. أبوداود. حج: ١٧٧١. ترمذى. حج: ٨١٨}:

سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودا لەسالمو لەباوکیو لەباپیری بێ) فەرمووی: بیستم لە عەبدوڵلای باوکم، کەناسراوە بە ئیبنو عومەر، دەیفەرموو: ئەم بەیدایەی کە ئێوە بەدرۆ دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ئیحرامی دابەستو نێتی حەجی هێنا، شتی وا نییە، چونکە بەبێ گومان، دڵنیام لەوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ئیحرامی دانەبەست، بەڵکوو لەپێش ئەوە، لەلای درەختەکەدا، کە لەلای مزگەوتەکەی ژولحولەیفەدا بوو، لەوێ ئیحرامی حەجو عەمرەی دابەستو بەرگی ئیحرامی پۆشی!.

٧٤٦- وَعَنْ خَلَّادِ بْنِ اَلسَّائِبِ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالْإِهْلَالِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{مالك/ الموطا: ٩٣٨. أبوداود: ١٨١٤. ابن ماجة: ٢٩٢٢. ترمذى: ٨٢٩. نسائى: ٣٧١٩}:

خـەللادی کـوڕی سـائیب (ڕەزاو ڕەحمـەتی خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جوبرائیـل (سلاوی خودای لەسەر بێ) هـات بۆلام، فـەرمانی پـێم کـرد کـە فـەرمان بکـەم، بەهاوەڵانی خۆم کـە لـەکاتی تەلبییـە کردنـدا بـەدەنگی بـەرز تەلبییـە بکـەن). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ١٥٢٠م}.

(ڕوونکردنەوە):

خەللادی کوڕی سائیبی کوڕی خـەللاد، هەنـدێ دەڵێن: خـەللادو سـائیب هەردووکیان هـاوەڵی پێغەمبـەر بـوون، لـە إسـتیعابا دەڵێ: بـەپێی زانیـاری مـن بەس خـەللادی کـوڕی، گێڕانـەوەی لەسـائیبی کـوڕی خـەللادەوە هەیـە، سـائیب ئەنصارییە، خەزرەجییە، کەسناو (کونیە)ەکـەی ئـەبو سـهلەیە، دەڵێن: سـائیب بەدرییە، کارمەندی موعاوییە بوو لەسەر یەمەن، ساڵی (٧١ك) مردووە.

٧٤٧- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ وَاغْتَسَلَ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ.

{حسن، الإرواء: ١٤٩}:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەرم بینـی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـۆ ئیحـرام بەسـتن، خـۆی ڕووت کـردەوەو خـۆی شۆرد. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٤، ت/سند حسن}.

٧٤٨- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: {أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) سُئِلَ: مَا يَلْبَسُ اَلْمُحْرِمُ مِنْ اَلثِّيَابِ؟ فَقَالَ: " لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا اَلْعَمَـائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا اَلْبَرَانِسَ، وَلَا اَلْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَا يَجِدُ اَلنَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ اَلْخُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ اَلْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَـسُوا شَـيْئًا مِـنْ اَلثِّيَـابِ مَـسَّهُ اَلزَّعْفَـرَانُ وَلَـا اَلْوَرْسُ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بخاری. حـج: ١٥٤٢، ٥٧٨٣. پوختـەی موسـلیم ٦٧٨ = شـیحا ٢٧٨٣ = مسلم ١١٧٧. تجریدی بوخـاری/١/١٣٣، ژمـارە: ١٠٨ = ٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٤٢،

٥٧٩٤، ٥٨٠٣، ٥٨٤٧، ٥٨٥٢ بوخاری. أبوداود. حج: ١٨٤٢. نسائی. حج: ٢٦٧٣. ابن ماجة. حج: ٢٩٢٩. تحفة الأشراف: ٨٣٢٥}:

**ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: ئەی پیغەمبەری خودا! بەرگی ئیحرام چییە بۆ کەسێ کە لەئیحرامدا بێ؟ فەرمووی: مێزەرو کراسو دەرپێو کڵاوو خوف لەبەر نەکا، ئەگەر کەسێ جووتی سۆڵی دەست نەکەوت ئەوا جووتێ خوف، لەخوار قاپە ڕەقەڵەوە ببڕێتەوە، ئەوجا لەپێیان بکا، وە هەر بەرگێ زەعفەرانو وەرسی پێوە بێ لەبەری مەکەن. {تاج/٢/١٧٣، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ١٥٠٠}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**وەرس لەسەرکێشی فەلس، ڕووەکێکە لەیەمەن دەڕوێ، ڕەنگی زەردە، ژنان دەرمانێکی لێ دروست دەکەن، دەموچاویانی پێ جوان دەکەن.**

**زەعفەران ڕووەکێکە، ڕەنگێکی زەردی بۆنخۆشی لێ دروست دەکرێ، مەیلەو زەردە، وەك ڕەنگی شێر، جلوبەرگی پێ ززەردو بۆنخۆش دەکرێ، بنکەکەی پیازە، ووەك پیازی ئاسایی.**

٧٤٩- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٢/١٦٤، ژمارە: ٧٣٩ = ١٥٣٩، ١٧٥٤، ٥٩٢٢، ٥٩٢٨، ٥٩٣٠ بوخاری. پوختەی موسلیم: ٦٥٣ = ٢٨١٨ شیحا = مسلم ١١٨٩. أبوداود. مناسك: ١٧٤٥. نسائی. حج: ٢٦٨٤. تحفة الأشراف: ١٧٥١٨}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی). فەرمووی: بۆخۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام بەستندا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کەئیحرام ببەستێو بەرگی ئیحرام لەبەر بکا، وە هەروەها بۆ ئیحرام**

شکاندنیش، لەپاش رەجمی شەیتانو سەرتاشین، لەپێش ئەوەدا کەتەوافی بەیت بکا، بۆنی خۆشم لە پێغەمبەر دەدا. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٥} .

٧٥٠- وَعَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَنْكِحُ اَلْمُحْرِمُ، وَلَا يُنْكِحُ، وَلَا يَخْطُبُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٨١٤ = شیحا ٣٤٣٢ = مسلم ١٤٠٩}:

لەپوختەی موسلیمدا ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە:

نوبەیهی کوڕی وەهب (رەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی عەبدوللا، لەئیحرامی حەجدا بوو، ویستی کچێکی شەیبەی کوڕی جوبەیری کوڕی عوثمانی حەجەبی، کە کچەکە ناوی (ئومولحەمید - دایکی حەمید) بوو، مارە ببڕێ لە طەلحەی کوڕی خۆی، ئەوسالە ئەببانی کوڕی عوثمانی کوڕی عەففان مێر حەج بوو، جا عومەری کوڕی عەبدوللا منی نارد بەشوێن ئەبباندا، کە ئامادەی ئەم بۆنەی مارە بڕینە بێت. کەچووم پێیم گوت: ئەببان فەرمووی: چۆن شتی وا دەبێ؟ من بۆخۆم لەباوکم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوکەسەی کەوا لەئیحرامدا، نابێ نەژن مارە بکاو نە ژن بەشوو بداتو نەخوازبێنی ژن بکا).

{تاج/١٧٨/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥٠٩ + ژمارە: ١٥١٠} .

٧٥١- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {فِي قِصَّةِ صَيْدِهِ اَلْحِمَارَ اَلْوَحْشِيَّ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِأَصْحَابِهِ، وَكَانُوا مُحْرِمِينَ: " هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَوْ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ ؟ " قَالُوا: لَا. قَالَ: " فَكُلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهِ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢٣٨/٢، ژمارە: ٨٣٨ = ١٨٢٢، ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٦١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦٨٢ = شیحا ٢٨٤٧ = ١١٩٦ مسلم} .

لەپوختەی موسلیمدا، دەقی ئەم چیرۆکەی ئەبو قەتادە ئاوایە:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەوەو لەدەوروبەری مەدینەوە، بەرەو مەککە، لەکاتی غەزای حودەیبییەدا، دەرچووین بۆ مەبەستی عەمرە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆمەڵێکی لەهاوەڵانی خۆی جیاکردەوە، کەئەبو قەتادە یەکێ بوو لەو کۆمەڵەیە، فەرمووی پێیان: (ئێوە بەری دەریا بگرن، هەتا دەگەنەوە بەخۆم، ئیتر ئێمەیش بەرەو ڕێگەی دەریا، ڕووەو مەککە ڕۆیشتین‌و ئەو ئەرکەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی سپاردین ئەنجاممان داو، کاتێ بەرەو پێغەمبەرو یارانی گەڕاینەوە، هاوڕێکانم هەموویان ئیحرامی عەمرەیان دابەست‌و بەرگی عەمرەیان پۆشی، تەنیا من نەبێ، من ئیحرامم دانەبەست، جا لەڕێگە بڕکەیێ کەرەکێویمان تووش بوو، من بەئەسپەکەم هەڵمەتم بردە سەریان‌و دێڵەکەرێکم لێ کوشتن، جا هەموو دابەزین‌و دەستمان کرد بەخواردن لەگۆشتەکەی، دوایی بوو بەمقۆ مقۆیان‌و گوتیان: چۆن شتی وا دەبێ، ئیمە لای خۆی لەئیحرامدا بووین، چۆن دەبێ گۆشتی نەچیری ڕاوکراو بخۆین؟)

ئەبو قەتادە فەرمووی: جا ئەوەی مابوو، لەگۆشتی دێڵە کەرەکێویەکە، هەڵیان گرت‌و کاتێ چووینە خزمەتی پێغەمبەر عەرزیان کرد: قوربان! ئێمە لەئیحراما بووین، بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی دانەبەستبوو، بڕکەیێ کەرە کێویمان بینی. ئەبو قەتادە نیشتە سەریان، دێڵەکەرێکی لێ کوشتن. ئێمەیش دابەزین‌و لەگۆشتەکەیمان خواردو گوتمان: شتی وا چۆن دەبێ، ئێمە ئیحرامدارین، چۆن دەبێ گۆشتی نەچیری ڕاوکراو بخۆین؟ ئەوەتا ئەوەی مابوو لەگۆشتەکەی لەگەڵ خۆمان هێناومانە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا کەسێ لەئێوە پێی گوت کەبنیشێتە سەری، یا سەبارەت بەو نێچیرانە ئاماژەیەکی بۆ ئەبو قەتادە کرد؟)

گوتيان: نهء، فهرمووی: (دهی ئهوهیشی که ماوه لهگۆشتهکهی بیخۆن). {تاج/٢، زنجیره: ٨٤، ژماره: ١٥٠٥}.

٧٥٢– وَعَنْ اَلصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اَللَّيْثِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالْأَبْوَاءِ، أَوْ بِوَدَّانَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: " إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلَّا أَنَّا حُرُمٌ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢/٢٤٠، ژماره: ٨٣٩ = ١٨٢٥، ٢٥٧٣، ٢٥٩٦ بوخارى. پوختەى موسليم ٦٨٠ = شيحا ٢٨٣٧ = مسلم ١١٩٣. ترمذى. حج: ٨٤٩. نسائى. حج: ٢٨١٨. تحفة الأشراف: ٤٩٤٠}:

دهقی ئهم فهرموودهیه لهپوختهی موسلیمدا ئاوایه:

عهبدوڵڵای کوڕی عهبباس (رهزای خودایان لێ بێ) فهرمووی: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) لهئیحرامدا بوو، صهعبی کوڕی جهثثامه (رهزای خودای لێ بێ) کهرهکێوییهکی سهربڕاوی بۆ هێنا، پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) دایهوه بهسهریداو وهری نهگرت لێی، ئهوکاته پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) له ئهبواء بوو، کهناوی کێوێکه، یان له وهددان بوو کهناوی شوێنێکه وا لهنزیکی جهحهفهوه، ئهبواء له وهددان لهجهحفهوه نزیکتره. جا پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) کهسهیری کرد، صهعب ئهم وهرنهگرتنهی پێ ناخۆش بوو، وه بهم بۆنهیهوه رووی گرژ بوو، پێغهمبهر دڵی دایهوهو پۆزشی هێنایهوه بۆیو عوزرخوایی بۆ کردو پێی فهرموو: (لهبهر ئهوهی کهواین لهئیحرامدا، بۆیه ئهم نێچیرهت لێ وهرناگرین، دهنا لێمان وهردهگرتیت!). (تاج/٢، زنجیره: ٨٤، ژماره: ١٥٠٥).

(روونکردنهوه):

صهعبی کوڕی جهثثامه (رهزای خودای لێ بێ) لهوهددان نیشتهجێ بوو، کهوا لهوڵاتی حیجاز، که لهم فهرموودهیهدا ناوبراوه، دایکی ناوی فاخیتهی

خوشکی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە، لە (فتح الملهم)دا، دەفەرموێ: دایکی نـاوی زەینـەبی کـچی حـەربی کـوڕی ئومەییەیـە، لـەکاتی موئاخاتـا، کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پـەیمانی برایـەتی بەسـت لـەنێوانی موسـوڵمانانـدا، دوو دوو کردنی بـەبرای یـەکتری، پـەیمانی برایـەتی بەسـت لـەنێوانی صـەعبو لەنێوانی عـەوفی کـوڕی مالیکـدا، ئامـادەی ئـازادکردنی وڵاتـی ئیستەخـر بـووە، دەڵێن: لەپاش ئازادکردنی ئیستەخر، جارچی جاڕ دەدا: کەوا جەجاڵ هەڵساوە! کە دەگەن بەصەعب (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: (شتی وا نییـە، چـونکە بـەگوێی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەرم بیـستووە دەیفـەرموو: (جـەجاڵ هەڵناسێ هەتا خەڵك باسی پشت گوێ دەخەن!).

صـەعب چـەند فەرموودەیـەکی تەندروسـت (صـحیح)ی گێڕاوەتـەوە، لەبوخاریـدا سـێ فـەرموودەی هەیـە، ڕاسـتتر ئەوەیـە کـە لـەئاخرو ئـۆخری جێنـشینی ئیمـامی عومـەردا مـردووە. (رەزای خـودا لەهـەموو هاوەڵـە بـەڕێزو نازدارەکانی پێغەمبەر بێ).

٧٥٣- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {خَمْسٌ مِنَ اَلدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ، يُقْـتَلْنَ فِـي اَلْحِـلِّ وَاَلْحَـرَمِ: اَلْغُـرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ اَلْعَقُورُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٢، ژمـارە: ٨٤٠ = ١٨٢٩، ١٨٢٨، ٣٣١٤ بوخـاری. پوختەی موسلیم ٦٨٤ = شیحا ٢٨٦٠ = مسلم ١١٩٨}:

عائیـشە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (پێـنج جـۆرە جانـەوەر هـەن، هەرکەسـێ بیـانکوژێ گوناهی ناکات، چی لەناو سنووری بەستی مەککەدا بیانکوژێ، وەچی لەدەرەوەی سنووری بەستی مەککەدا بیانکوژێ، وەیا چی بێ ئیحرام بێو بیانکوژێ، دیـسان گوناهی ناکات، ئەو پێنج جانەوەریش ئەمانەن: قەلەڕەشەو کۆلارەو دووپشكو مشكو سەگی هار). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ١٥٠٨ چاپی چوارەم}.

٧٥٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اِحْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢/٢٤٢، ژماره: ٨٤٤ = ١٨٣٦، ١٨٣٥، ٥٦٩٨ بوخارى. پوختەى موسليم ٦٨٥ = ٢٨٧٨، ٢٨٧٧ مسلم/شيحا = ١٢٠٢ مسلم}:

**له تجريدى بوخارىو پوختەى موسليمدا دەفەرموێ: ئيبنو بوحەينە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (درووودى خوداى لەسەر بێ) لەئيحرامدا بوو، لە لەحى جەمەل بوو، كەجێگەيەكە وا لەنێوانى مەدينەو مەككەدا، بەلام لەمەدينەوە نزيكترە، لەوێ كەڵەشاخى لەناوەڕاستى سەرى خۆى گرت، لەبەر ئازارێ كە لەسەريدا بوو، كە بەعەرەبى پێى دەگوترێ (شەقيقە) وە ئەمە لەكاتى ئەنجامدانى حەجى ماڵئاوايدا بوو.**

٧٥٥- وَعَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {حُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: " مَا كُنْتُ أَرَى اَلْوَجَعَ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى، تَجِدُ شَاةً ؟ قُلْتُ: لَا. قَالَ: " فَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى = مختصر صحيح البخارى بالكوردى/٢، ژماره: ٨٣٧ = ١٨١٥، ١٨١٤، ١٨١٦، ١٨١٧، ٦٨٠٨، ١٨١٨، ٤١٥٩، ٤١٦٠، ٤١٩١، ٤٥١٧، ٥٦٦٥، ٥٧٠٣ بوخارى. پوختەى موسليم ٦٨٨ = ٢٨٧٥ شيحا = مسلم ١٢٠١. ترمذى. تفسير: ٢٩٧٣}:

**ئەمە دەقى ئەم فەرموودەيە، لەپوختەى صەحيحى موسليمدا، لێرەدا دەينووسين، بەئومێدى ڕاڤەكردنو ڕۆشن كردنەوەى مەبەستى ئەم فەرموودە پيرۆزە:**

**عەبدوڵلاى كوڕى مەعقيل (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: كەعبى كوڕى عوجرە (ڕەزاى خوداى لێ بێ) لەمزگەوتەكەى كووفە بوو، سەبارەت بەم**

ئایەتە، پرسیارم لێی کرد، کە دەفەرمویٚ: {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ – البقرة/٢/١٩٦}.

کەعب فەرمووی: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە من بووم، لەحودەیبییە، ناموسوڵمانانەکانی مەککە، ڕێگەیان نەداین کە عەمرەکەمان تەواو بکەین، بردمیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) ئەسپیٚ لەسەرم هەڵدەوەری لەبەر زۆری، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بیٚ) (لەڕاستیدا نەمزانی کە ئەمە حاڵتەو بەدەستی ئەم جڕوجانەوەرەی سەرتەوە پەرێشانی، ئایا مەڕیٚ، یان بزنێکت هەیە کەسەری ببڕیت؟) گوتم: نەء، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ}. واتە: دەی ئەگەر کەسیٚ لەئێوە، لەئیحرامی عەمرە، یان حەجا بوو، نەخۆش کەوت، یان ئازاریٚ لەسەریدا بوو، وە بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە، یان بەهۆی ئەو ئازارەوە، سەری خۆی تاشی بەناچاری، ئەوە لەسەریەتی تۆڵەییٚ (واتە: فیدیەیەکی شەرعی) بدات لەباتی ئەو سەرتاشینەی، کە ئەو تۆڵەیە برێتییە لەرۆژووی (٣) سیٚ رۆژ، یان خواردەمەنی ژەمێکی تێرەخۆر، بۆ شەش هەژار، یان ئاژەڵیٚ سەربېڕیٚو دابەشی بکا بەسەر هەژارانا.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) بۆ روونکردنەوەی جیٚبەجیٚ کردنی ئایەتەکە، بەمنی فەرموو: (یا سیٚ رۆژ بەرۆژوو بە، یا خواردەمەنی شەش هەژار بدە، هەر هەژارەی نیومەن خۆراکی پیٚ بدە). چونکە نەم بوو کەئاژەڵیٚ سەربېڕم.

کەعب فەرمووی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا...} بەهۆی منەوە هاتە خوارەوەو ئەم بارودۆخەی من بوو بەهۆی هاتنی، بەڵام بڕیارو حوکمەکەی بەتێکڕایی بۆ هەمووتانە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ١٦٤٩}.

٧٥٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَمَّا فَتَحَ اَللّٰهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَكَّةَ، قَامَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلنَّاسِ، فَحَمِدَ اَللّٰهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: " إِنَّ اَللّٰهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ اَلْفِيلَ، وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ كَانَ قَبْلِي، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ بَعْدِي، فَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلَا تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلَّا لِمُنْشِدٍ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ اَلنَّظَرَيْنِ " فَقَالَ اَلْعَبَّاسُ: إِلَّا اَلْإِذْخِرَ، يَا رَسُولَ اَللّٰهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي قُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا، فَقَالَ: " إِلَّا اَلْإِذْخِرَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١/١١٥، ژمارە: ٩٢ = ١١٢، ٢٤٣٤، ٦٨٨٠ بوخارى. پوختەى موسليم ٧٦٦ = شيحا ٣٢٩٢}:

ئەبو هورەيرە (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: كاتێ خوداى گەورەو سەروەر، مەككەى ئازادكرد لەسەر دەستى پێغەمبەردا (دروودى خوداى لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەناو خەڵكەكەدا هەڵسايەوە وتارێكى فەرموو، سوپاس و ستايشى جوانى خوداى گەورەى كرد، ئەوجا فەرمووى: خوداى گەورەو سەروەر مەككەى پاراست لەدەستدرێژيى خاوەن فيلەكان، كە ئەبرەهەو لەشكرەكەى بوون، كەهاتبوون بۆ روخاندنى كەعبە. وەك لەقورئانا، لەسوورەتى فيلدا باسكراوە، وە بەپشتيوانى خودا، پێغەمبەرى خوداو موسوڵمانان لەرۆژى ئازادكردنى مەككەدا، زاڵبوون بەسەر گرتنى ئەم شارەدا، بەڵام باش باش بزانن كە ئەم شارە نە لەپێش مندا، وە نەلەپاش من بۆ كەسى تر رەوا نەبينراوەو ڕەوا نابينرێ، كەڕێزى بشكێنێو شەڕو شۆڕى تيا بكا، ئاگادار بن تەنانەت بۆ منيش بۆ ماوەيەكى كەم لەو رۆژەدا كوشتارى تيا ڕەوا بوو، باش ئاگادار بن، تا ئێستا ئالەم دەمەدا، شارێكى بەڕێزو قەدەغەيە، كەوابوو نە نەچيرى دەرەوێنرێتەوە، وە نەدڕكو داڵو گياو گوژەى پاكۆ دەدرێ، وەنەشتى داكەوتووى هەڵدەگيرێتەوە، مەگەر بۆ كەسێ كەناونيشانى هەڵبدا، هەتا خاوەنكەى پەيدا ببێو بيباتەوە، وە هەركەسێ كەسێكى كوژرا، ئەوا خۆى

سەرپشکە لەیەکێ لەم دوو بڕیارە: یان خوێن وەربگرێ، یان تۆڵەی بۆ دەسەندرێو لەجیاتی کوژراوەکەی، بکوژەکەی دەکوژێتەوە.

عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرێ ڕەزای خودا لە عەبباس بێ) فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! تەنیا گیایی سوڕناتك (إِذْخَر)ی لێ دەرچێ، چونکە ئەم گیایە بۆ ئەم جۆرە پێویستیانە بەکار دەهێنرێ:

١- بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕیچەی گۆڕو بۆ پڕکردنەوەی کونو بۆشایی نێوانی خشتو تەختە بەردەکانی سەر ئەلحەدی گۆڕەکان.

٢- بۆ سووتەمەنی ناو ماڵو ئاگرکردنەوە.

٣- بۆ پەردووی سەر دارەڕاو شتی تری وا بەکاری دەهێنین، کەواتە: باسوڕناتك بەر ئەم قەدەغە کردنە نەکەوێ؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە، تەنیا گیایی سوڕناتکی لێ دەرچێ).

جا پیاوێکی یەمەنی کەپێیان دەگوت: ئەبو شاە، هەڵسا گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! فەرمان بفەرموو بە هاوەڵانی خۆت کە ئەمەم بۆ بنووسنەوە؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بینووسن بۆ ئەبوشاە). وەلیدی کوڕی موسلیم، کە کەسی سێیەمە لەپیاوانی ڕشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە، دەفەرموێ: عەرزی مامۆستاکەی خۆمم کرد، بۆ ئەم فەرموودەیە، کە ئیمامی ئەوزاعییە: ئەبوشاە مەبەستی چییە کە دەفەرموێ: ئەی پیغەمبەری خودا! بۆم بنووسنەوە؟

فەرمووی: مەبەستی ئەبوشاە ئەوە بوو، کە ئەم وتارەی کە لە پێغەمبەری بیستووە بۆی بنووسنەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ١٧٠٣ چاپی چوارەم}.

٧٥٧- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لِأَهْلِهَا، وَإِنِّي حَرَّمْتُ اَلْمَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَإِنِّي دَعَوْتُ فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا بِمِثْلَيْ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ لِأَهْلِ مَكَّةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژماره: ٩٦٥ = ٢١٢٩ بخارى. پوختەى موسليم ٧٧٣ = مسلم شيحا ٣٣٠٠ = مسلم ١٣٦٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیم (سلاّوی خودای لێ بێ) بەفەرمانی خودا مەککەی کردووە بەحەرەمو بەستێکی ئەمین‌و هێمن‌و، قەدەغەی کردووە کەکاری ناشایستەی تیادا بەرپابکرێ، وە دوعاو نزای باشی کردووە بۆ دانیشتوانی، وە منیش بەفەرمانی خودا، مەدینەم حەرام کردووەو کردوومە بە بەست‌و حەرەم، هەروەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کردووەو کردوویەتی بە بەست‌و حەرەم، وەمن دوعاو نزای پیت‌و فەڕم کردووە بۆ مەن (صاع)و مشت (مودد)ی مەدینە، بۆ عەیارەو ئەندازەی کێشاتن‌و پێوانەی، دوو قاتی ئەو دوعاو نزایەی کە ئیبراهیم کردوویەتی بۆ مەککە). {تاج/٢، زنجیره: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٢ چاپی چوارەم}.

٧٥٨- وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{تجريدى بوخارى/٤، ژماره: ١٣٩٥ = ٣٥٠٨، ٦٠٤٥ + تجريدى بوخارى/٢، ژماره: ٨٥٦ = ١٨٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٧٣٠٠ بوخارى. پوختەى موسليم ٧٧٧ = مسلم/شيحا: ٣٣١٤ = ١٣٧٠}:

لەپوختەی بوخاری‌و پوختەی موسلیمدا، ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

ئیبراهیمی تەمیمی فەرمووی: باوکم فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، وتارێکی دا بۆمان، فەرمووی: هەرکەسێ گومانی وا بێ، کەئێمە، کە کەسوکاری

پێغەمبەرین، نامەو نووسراوێکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کە بەس خۆمان دەیخوێنینو لەلای خەڵکی تر نییە، وەك: رافیضەو شیعە برەو بەم جۆرە درۆشاخدارانە دەدەن. هەرکەسێ لافی شتی وا لێ بدات درۆ دەکا، چونکە ئێمەیش کە کەسوکارو ئالوبەیتی پێغەمبەرین، وەك سەرجەمی موسوڵمانانی تر بەگشتی، بەس قورئانی پیرۆزمان لەلایە، کەنامەی خودایە، بەڵام لەسوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەندێ فەرموودەمان لەلایە، لەکەسی ناشارینەوە، چونکە بەهرەو بڕیارەکەی بۆ هەمووانە، بۆ سەرجەمی گەلی ئیسلامە، نەوەك هەر بۆخۆمان بێ، کەخزمانی پێغەمبەرین، وەك ئەم چەند فەرموودەیە، کە لەم تۆمارەدا نووسیومنەتەوە (فەرمووی: تۆمارێکی پێچراوە بوو، لەناو هەبگەی شمشێرەکەیدا دایدانابوو بۆ پاراستنی، نەبادا بفەوتێ).

ئەوجا عەلی فەرمووی: ئەمانە لەم تۆمارەدا نووسراون: تەمەنی ئەو وشترانەی دەدرێن بەخوێن، کاتێ کەسێ دەکوژرێو چەند شتی تر، سەبارەت بەخوێنی زامو زامکاری.

عەلی فەرمووی: وە لەم تۆمارەدا ئەمەیشی وا تیادا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

(مەدینە لەنێوانی چیای عەیرەوە هەتا چیای ئەور، کە دوو چیایی ناسراون لەمەدینە بەستە (واتە: حەرەمە، بەفەرمانی شەرعی خودا، کۆمەڵێ کاری ئاسایی تیادا نادروستە، کە لەشوێنانی تر، بەپێی مەرجی دیاری کراو ئەو شتانە دروستن).

جا هەرکەسێ کارێکی ناڕەوای تیادا بەرپا بکا، یان پیاوخراپێکی تیادا پەنا بدا، یان کارێکی ناشایستەی تازە قەڵای تیادا بکا بە باو، لەعنەتو نەفرینی خوداو، نەفرەتو نەفرینی فریشتەکانی خوداو، نەفرەتو نەفرینی

هەموو مرۆڤەكانی لێ بێ، لەرۆژی قیامەتا. خودا نە فەرزو نەسوونەتی لێ قەبووڵ ناكا.

وە لەم تۆمارەدا ئەوەیشی واتیا كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (لە ئەستۆگرتنی پەیمان بۆ موسوڵمانان وەك یەكە، هەموو موسوڵمانێ مافی ئەوەی هەیە كە پەیمانی ئەمان بەكافران و نا موسوڵمانان بدا، بەپێی یاسانامەی خودا، هەرە خوارینەكەیان مافی ئەمان پێدانی بۆ هەیە، بەهەر نا موسوڵمانێ بیەوێ كە ئامانی پێ بدا، وە هەركەسێ حاشا لەباوكی خۆی بكاو خۆی بكا بە نەتەوەی پیاوێكی تر، یان حاشا بكا لە ئازادكاران (مەوالی)ی خۆی و كەسانی تر بكا بەئاغای ئازادكاری خۆی، نەفرینی خوداو فریشتەكان و هەموو مرۆڤەكان لەو جۆرە كەسانە بێ، لەقیامەتدا نە تەوەبەیان لێ قەبووڵ دەكرێ، نە تۆڵەو برێتیو كەفارەتیان لێ وەردەگیرێ). {تاج/١/١٦، ژمارە: ١١٧ + تاج/٢/١٣٩، ژمارە: ١٧٣٣} .

(روونكردنەوە):

١- باسی ژمارە (٣٤)و (٣٥)و (٣٦) برێتین لە {٧٥٨ — ٧٣٨ = ٢٠} بیست فەرمووده.

## ٣٧- باسی چۆنێتی حەج و رۆیشتنە ناو شاری مەككە
## بابُ: صِفَةِ الحَجِّ وَدُخُولِ مَكَّةَ

٧٥٩- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حَجَّ، فَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى إِذا أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، فَقَالَ: " اِغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، وَأَحْرِمِي" وَصَلَّى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ اَلْقَصْوَاءَ حَتَّى إِذَا اِسْتَوَتْ بِهِ عَلَى اَلْبَيْدَاءِ أَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ: " لَبَّيْكَ اَللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ اَلْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ ". حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا اَلْبَيْتَ اِسْتَلَمَ اَلرُّكْنَ، فَرَمَلَ ثَلَاثًا وَمَشَى

أَرْبَعًا، ثُمَّ أَتَى مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ فَصَلَّى، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى اَلرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ. ثُمَّ خَرَجَ مِنَ اَلْبَابِ إِلَى اَلصَّفَا، فَلَمَّا دَنَا مِنَ اَلصَّفَا قَرَأَ: " إِنَّ اَلصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اَللَّهِ " البقرة/١٥٨ " أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اَللَّهُ بِهِ " فَرَقِيَ اَلصَّفَا، حَتَّى رَأَى اَلْبَيْتَ، فَاسْتَقْبَلَ اَلْقِبْلَةَ فَوَحَّدَ اَللَّهَ وَكَبَّرَهُ وَقَالَ: " لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ اَلْأَحْزَابَ وَحْدَهُ ". ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ إِلَى اَلْمَرْوَةِ، حَتَّى اِنْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ اَلْوَادِي سَعَى حَتَّى إِذَا صَعَدَتَا مَشَى إِلَى اَلْمَرْوَةِ فَفَعَلَ عَلَى اَلْمَرْوَةِ، كَمَا فَعَلَ عَلَى اَلصَّفَا ... - فَذَكَرَ اَلْحَدِيثَ. وَفِيهِ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمَ اَلتَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنَى، وَرَكِبَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَصَلَّى بِهَا اَلظُّهْرَ، وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ، وَالْفَجْرَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتْ اَلشَّمْسُ، فَأَجَازَ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ اَلْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ فَنَزَلَ بِهَا. حَتَّى إِذَا زَاغَتْ اَلشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ اَلْوَادِي، فَخَطَبَ اَلنَّاسَ. ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى اَلظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى اَلْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا. ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى أَتَى اَلْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ اَلْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ اَلْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ اَلْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى غَرَبَتِ اَلشَّمْسُ، وَذَهَبَتْ اَلصُّفْرَةُ قَلِيلاً، حَتَّى غَابَ اَلْقُرْصُ، وَدَفَعَ، وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ اَلزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَيَقُولُ بِيَدِهِ اَلْيُمْنَى: " أَيُّهَا اَلنَّاسُ، اَلسَّكِينَةَ، اَلسَّكِينَةَ "، كُلَّمَا أَتَى حَبْلاً أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً حَتَّى تَصْعَدَ. حَتَّى أَتَى اَلْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا اَلْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ اِضْطَجَعَ حَتَّى طَلَعَ اَلْفَجْرُ، فَصَلَّى اَلْفَجْرَ، حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ اَلصُّبْحُ بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى أَتَى اَلْمَشْعَرَ اَلْحَرَامَ، فَاسْتَقْبَلَ اَلْقِبْلَةَ، فَدَعَاهُ، وَكَبَّرَهُ، وَهَلَّلَهُ فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا. فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ، حَتَّى أَتَى بَطْنَ مُحَسِّرَ فَحَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ اَلطَّرِيقَ اَلْوُسْطَى اَلَّتِي تَخْرُجُ عَلَى اَلْجَمْرَةِ اَلْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى اَلْجَمْرَةَ اَلَّتِي عِنْدَ اَلشَّجَرَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ

مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، مِثْلَ حَصَى اَلْخَذْفِ، رَمَى مِنْ بَطْنِ اَلْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى اَلْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَفَاضَ إِلَى اَلْبَيْتِ، فَصَلَّى بِمَكَّةَ اَلظُّهْرَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ مُطَوَّلاً.

{پوختەی موسلیم ٧٠٧ = ٢٩٤١ موسلیم ژمارە دانانی شێخ خەلیل مەئمون شیحا = مسلم ١٢١٨. أبوداود. حج: ١٩٠٥. ابن ماجة. حج: ٣٠٧٤. تحفة الشراف: ٢٥٩٣}:

**لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لەباوکیەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چووین بۆلای جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) کوێر بوو بوو، یەکە یەکە دەیپرسی لێمان: ئەمە کێیەو ئەوە کێیە؟ تا سەرە هاتە سەر من، گوتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلیم (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) کەوام گوت: دەستی هێنا بەسەر سەرماو دەستی هێنایە خوارەوە بۆ سەر سینگ و بەرۆکمو دوگمەی سەرەوەو دوگمەی خوارەوەی ترازاندمو لەپی هێنا بەسەر سینگما بۆ مووفەڕکیو پیرۆزی، لەبەر ئەوەی کەمن لە نەوەی پێغەمبەرمو فەرمووی پێم: خۆش هاتی ئەی برازای خۆشەویستم! پرسیارت چییە بیکە؟ منیش ئەوکاتە کوڕێکی لاو بووم. ئەنجا کاتی نوێژ بوو، هەڵسا بەرنوێژی کرد بۆمان، تەیلەسانێکی لەبەردا بوو، پێچابووی لەخۆیەوە، لەبەر بچووکی کە دەیدا بەسەر شانیدا چمکەکانی هەڵدەشانەوە بۆلای خۆی، پەشتەماڵ (ریداء)ەکەیشی لەتەنیشتیەوە، بەسەر سێپایەکەوە بوو، جا کە بەرنوێژییەکەی کرد بۆمان، لەپاشا لێیم پرسی، گوتم: باسی حەجەکەی پێغەمبەرم بۆ بکە (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) جا نۆ پەنجەی خۆی ژماردو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش کۆچ، نۆ ساڵ مایەوە لەمەدینە، لەو ماوەیەدا حەجی نەکرد، جا لەساڵی دەهەمدا، جاڕیدا بەناو خەڵکەکەدا کە: ئەمساڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ حەج، ئیتر عەشاماتێکی گەلێ زۆر هاتن بۆ مەدینە، وە**

هـەموويان دەيانويـست کەپـەيڕەوی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بکەن و چاو لەو بکەن و ئەو هەرچی کرد لەحەجەکەیدا، ئەوانیش بیکەن.

ئەنجا لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) مەردومەکە کەوتنەڕێ و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ذولحولەیفە، لەوێ ئەسمای کچی عومـەیس، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیقی بوو، وە هەواڵی نارد بۆلای پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەحاڵم وایـە، زەیـستانم چی بکـەم و چۆن بکـەم؟ فەرمووی: (خۆت بشۆرەو ناواخنـێ بۆخـۆت بکـەو تۆپەوانـەیێ بـۆ وانێکەکـەت بکەو خوێنی زەیستانییەکەتی پێ بەربەست بکەو ئیحرام دابەستە).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ لەمزگەوتەکـەدا، نوێـژی عەصری کرد بۆمـان، ئـەنجا سـواری وشـترەکەی بـوو، کـە وشـترە مێنگـەیێ بـوو، ناوی قەصواء بوو، چونکە سەری گوێی قرتا بوو، ئەوجا ڕۆیشت هـەتا بەسـواری سەرکەوتە سەرکێوی بەیداء، لەوێ بەهـەر چوار لادا، تەماشـام کـرد، هـەتا چـاو بڕیکا هەر سوارە بوو، وەهەر پیـادە بـوو، لـەدەوری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ). وەخـۆی لـەناومانا بـوو، پـەیتا پـەیتا، خـۆش حـۆش قورئـانی بـۆ دەهاتە خوارێ، وەخـۆی بـەجوانی واتـاو راڤـەو تەفـسیری قورئانەکـەی دەزانـی، ئیتر ئەو خۆی هەرچی دەکـرد، ئێمـەیش پـەیڕەوی ئـەومان دەکـردو لەشـوێنی ئەوەوە ئەوەمان دەکرد، ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەم وشـە پیرۆزەیە، کە دروشمی یەکتاپەرسـتییەو نیـشانەی یـەکتایی خودایـە، بـەم وشـە پیرۆزە ئاوا ئیحرامی حەجی دابەست و نێتی هێنا.

(لَبَّيْكَ اللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ ، لَبَّيْكَ لاَ شَـرِيكَ لَـكَ لَبَّيْـكَ ، إِنَّ الْحَمْـدَ وَالنِّعْمَـةَ لَـكَ وَالْمُلْكَ ، لاَ شَرِيكَ لَكَ).

واتـە: پـەروەردگارا! ئـەی تاقـە خـودا! هەمیـشە کەمـەری بەنـدەییم بەسـتووە، بـۆ جێبـەجێکردن و ئەنجامـدانی فـەرمانی تـۆ، تـۆ بـێ چوون و بـێ هاوەڵی، سوپاس و سـتایش هـەر بـۆ تۆیـە، وەبەخـشش و نازوبـەهرەو نیعمـەت و

دارایـی‌و پادشـایی‌و خـاوەنێتی، هـەر لـەخۆت دێ‌و هـەر لـەخۆت جوانـە، بـێ چوونی‌و بێ هاوەڵیی تۆی پەروەردگار، ئاشکراو نمایانە!.

خەڵکەکـەی تـریش ئـا بەمـەی کـەخۆیان ئیحرامـی پـێ دادەبەسـتن، ئیحرامیان دابەست، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی نەگرتن‌و رەخنەی لێیان نەبوو لەم لاینەوە، بەڵام خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر لەسەر تەلبییە کردنەکەی خۆی بەردەوام بوو.

جـابیر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەپێـشا تـەنها هـەر نیـازی حـەجمان هـەبوو، خـەیاڵی عـەمرەمان نـەبوو، چـونکە لـەوەوپێش لـەرۆژانی حەجـدا عـەمرەمان نـەدەکرد، هـەتا ئـەو حەلـە کـە لەخزمـەتی پێغەمبـەردا چووینە بەیت‌و لـەوێ پێغەمبـەری خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەستی هێنا بەگۆشەی حەجەرولئەسوەدداو ماچی کردو سێ جار بەهەڕاکردن، چـوار جـار بەڕۆیـشتنی ئاسـایی هەڵـسووڕا بـەدەوری خانـەی خـودادا، کـە بـەم کردارە، لەزاراوەی شەرعی پیرۆزدا دەگووترێ: (تـەوافی بـەیت). ئـەنجا رۆیـشت بۆ مەقامی ئیبراهیم (دروودو سڵاوی خودای گەورەو سەروەی لەسـەر بـێ) ئـەم ئایەتە پیرۆزەی خوێند: {وَاتَّخِذُواْ مِـن مَّقَـامِ إِبْـرَاهِيمَ مُـصَلًّى – البقـرة/١٢٥} . واتە: وەپێمـان گـوتن: مـەقامی ئیـبراهیم بکـەن بەجێگـە نوێـژ بۆخۆتـان‌و ئـەو شوێنە پیرۆزەیە بکەن بەنوێژگاو نوێژی سوننەتی تیادا بکەن.

ئەنجا مەقامی خستە بەینی خۆی‌و بەینی بەیتـەوەو دوو رکـات نوێـژی سوننەتی تەوافی کردو لەرکاتی یەکەمداو لەپاش خوێندنی سـوورەتی فاتیحـە، سـوورەتی {قُـلْ يَـا أَيُّهَـا الْكَـافِرُونَ}ەی خوێنـد، وە لـەرکاتی دووەمـدا لـەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، سوورەتی {قُلْ هُـوَ اللَّـهُ أَحَـدٌ}ی خوێنـد (مـەقامی ئیبراهیم = جێ پێی وەستانی حەزرەتی ئیبراهیم، ئـەو بەردەیـە، کـە حـەزرەتی ئیبراهیم لەسەری دەوەستا، لەکاتی دروست کردنی بەیتدا – وەرگێڕ).

ئـەنجا حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گەڕایـەوە بـۆ سـەر حەجەرولئەسوەدو دیسانەوە دەستی پیادا هێنایەوە، ئـەنجا لـەدەرگای نزیک صەفاوە، کەپێی دەگوترێ: (بابُ الصَّفا = دەرگای سـەفا) دەرچوو، وەڕۆیشت بـۆ سەعی صەفاو مەڕوە، کە لەصەفا نزیک بوویەوە ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە {إِنَّ الـصَّفَا وَالْمَـرْوَةَ مِـن شَـعَآئِرِ اللّـهِ – البقـرة/١٥٨} . واتـە: تەپۆڵکـەی صـەفاو تەپۆڵکـەی مـەڕوە، هاموشـۆ لـەنێوانیانا، لـەکاتی حـەج و عـەمرەدا، نیـشانەی دروشمی بەندەیی خودان.

وە فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): (تـەوافی سـەفاو مـەڕوە، بەومیان دەست پێ بکەن کە خودا لە ئایەتەکەدا پێشی خستووە). ئەنجا دەستی کرد بەتەوافی صەفاو سەرکەوتە سـەر تەپۆڵکـەی صـەفا، تـا خـانووی کەعبـەی لێوە دەرکـەوت. جـا رووی کـردە رووگـەو شـایەتومانی هێنـاو ئەڵلاهوئەکبـەری کردو فەرمووی:

{" لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ اَلْمُلْكُ، وَلَهُ اَلْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَـهَ إِلَّـا اَللَّـهُ وَحْـدَهُ أَنْجَـزَ وَعْـدَهُ، وَنَـصَرَ عَبْـدَهُ، وَهَـزَمَ اَلْـأَحْزَابَ وَحْدَهُ"} .

واتـە: هـەر خـودا خودایـەو تـاك و تەنیایـە، بـێ هـاوەڵ و بـێ چـوونە، خـاوەنی موڵـك و پادشـایی و دەسـتەڵات و سـەڵتەنەتە، سـوپاس و سـتایش هـەر لـەخۆی جوانـەو هـەر قابیـل بەخۆیـەتی، هیـچی لەدەسـت دەرناچـێ و توانـای هـەموو شـتێکی هەیـە، هـەر خـودا خودایـە، بەڵێنەکـەی خـۆی هێنایـە دی، وەبەندەی خۆی، کە موحەممـەدە بەسـەر دوشمنـی ئایینەکەیدا سەرخست، وە ئەو کۆمەڵانەی کە لەرۆژانی غەزای خەندەقا گەلەکۆمەیان لە ئیسلام کرد بوو، خۆی بەتەنها شکاندنی و ژێری خستن و موحەممەدو دەستەی موحەممەدی زاڵ کرد بەسەریاندا.

وه (٣) سێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم یادو ژیکرەی خوێند، وە لەبەینی ئەم سێ جارەیشدا دەپاڕایەوەو دوعاو نزای تری دەکرد.

ئەنجا داپەڕی بۆ مەڕوە، کەپێی نایە ناو شیوەکەوە، پێی هەڵگرتو خێرا ڕۆیی، هەتا گەیشتە هەورازەکە، ئەنجا بەئاسایی ڕۆیشت تاچووە، سەر تەپۆڵکەی مەڕوە، وە لەسەر تەپۆڵکەی صەفا چی کرد، لەسەر مەڕوەیش هەمان شتی دووبارە کردەوە، هەتا دوا تەوافی لەسەر مەڕوە تەواو بوو، فەرمووی: (تازە لەدەستم چوو، دەنا دیاریی بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وە دەمکرد بەعەمرە، جا هەرکەسەتان کەدیاریی پێ نییە، با ئیحرام بشکێنێو بیکا بەعەمرە، سوراقەی کوڕی مالیکیش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ ئەم ساڵ وایە، یان هەتا هەتایە هەروا دەمێنێ؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەکانی هەردووو دەستی خۆی تێك پەڕاندو دووجار فەرمووی: (ئاوا وەك ئەم پەنجانە عەمرە تێکەڵی حەج بوو هەتا هەتایە!).

عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش (ڕەزای خودای لێ بێ) لەیەمەنەوە دیاریی وشتری بەیتی هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

عەلی هات ڕوانی وا فاتیمەی هاوسەری (ڕەزای خودای لێ بێ) ئیحرامی شکاندووەو جلی ڕەنگینی پۆشیوەو چاوی ڕشتووە، جا گوتی: ئەمە چییە؟ فاتیمەیش فەرمووی: باوکم فەرموویەتی وا بکەم. گوتی: کاتێ عەلی لەعێراق بوو دەیفەرموو: جا چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا گاڵی بدەم لەفاتیمە، کە بۆ وای کردووە، وە بۆ ئەم قسەیەیش کە گوتی باوکم فەرمووی کەوا بکەم هەر لێیم پرسی، وە عەرزیشیم کرد کە من ئەو کارەی فاتیمەم پێ خۆش نییە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (فاتیمە ڕاست دەکا، من خۆم پێم گوتووە، تۆ ئەی عەلی! کەئیحرامی حەجت

دابەست چیت گوت، چۆن نێتت هێنا؟ عەلی فەرمووی: گوتم ئەی خودایە! ئەوا نێتی حەجم هێنا، لەسەر ئەو نێتەی کە پێغەمبەری تۆ دەیهێنێ. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (دەی تۆ ئیحرام مەشکێنە، چونکە من دیاریی بەیتم پێیە).

فەرمووی: ئەو دیارییە کەعەلی لەیەمەنەوە هێنا بووی، لەگەڵ ئەو دیارییەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خۆی هێنا بووی، سەرجەم سەد وشتر بوو.

گوتی: ئیتر خەڵکەکە هەموو ئیحرامیان شکاندو مووی سەریان کورت کردەوە، پێغەمبەرو ئەو کەسانە نەبێ کەدیاریی بەیتیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو، جا لەرۆژی تەروییەدا کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی نۆمینە، بەرەو مینا جمانو ئیحرامی حەجیان دابەست، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوار بوو، وە نوێژی نیوەڕۆو عەصرو شێوانو خەوتنانو بەیانی لەوێ کرد، ئینجا لەوێ کەمێ مایەوە تا خۆرهەڵهات، وە فەرمانی دا کە لە نەمیرە دەوارێکی بۆ هەڵدەن، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتەڕێ، قورەیش وایان دەزانی کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك سەردەمی نەزانی خۆیان لە مەشعەرولحەرام دەوەستێ، بەڵام پێغەمبەر لەوێ ڕەت بوو، وە نەوەستاو ڕۆیشت هەتا چووە نزیکی عەرەفە، سەیری کرد لەنەمیرە دەوارەکەیان بۆ هەڵداوە، جا لەوێ دابەزی، وەلەوێ مایەوە تا خۆر لایدا.

ئەوجا فەرمانی کرد، قەصوایان بۆ کۆپان کردو چوو بۆ ناو شیوەکەو لەوێ وتارێکی داو فەرمووی: (خوێنو سەروماڵو نامووستان لەیەکتریی زۆر زۆر حەرامەو ناڕەوایە، هەر وەك چۆن شکاندنی ڕێزی ئەم رۆژە پیرۆزەتان، لەم مانگە پیرۆزەتانا، لەم شنارە پیرۆزەتانا زۆر زۆر حەرامو ناڕەوایە ئاوا.

ئاگاداربن! کەوا هەرچی کاروباری سەردەمی نەزانییە، پووچەو بەتاڵەو بێ بایەخە، خوێنی سەردەمی نەزانی بەتاڵەو پووچە، وە یەکەم خوێن لەخوێنی کەسوکاری خۆم، کە بەتاڵو بێ بایەخی دادەنێم، خوێنی کوڕەکەی ڕەبیعەی کوڕی حاریسە، کە لەناو هۆزی بەنی سەعددا، درابوو بەدایەن، وە هۆزی هوزەیل دەیکوژن. وە سوود (ڕیبا)ی سەردەمی نەزانی هەمووی پووچو بەتاڵە، وە یەکەم سوودیش، لەسوودی کەسوکاری خۆم، کە بەتاڵی دەکەمەوە سوودی عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیبە، ئەو سوودە هەمووی پووچو بەتاڵە، وە دەربارەی ئافرەتانیش لەخودا بترسنو نا دادیو ناهەقییان لێ مەکەنو ڕەفتارتان جوان بێ لەگەڵیاندا، چونکە ئەوان ئەمانەتو سپاردەی خودای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، دەی پیاو گریمان ئەگەر خیانەتو ناپاکیش بکا، نابێ خیانەتو ناپاکی لە سپاردەو ئەمانەتی خودای خۆی بکا! وە ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی قسەی شەریعەتی خوداو بەرنامەو یاسا نامەی ئیسلام، کە ئەوانی ژنان، بەپێی یاسانامەی خودا، بۆ ئێوەی پیاوان حەڵاڵو ڕەوا بوونو دێنە باخەڵتانو دەچنە لایان. وە مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە: کە ئەوکەسەی کە ئێوە حەزی لێ ناکەنو حەز ناکەن هاموشۆتان بکەن، نەیهێننە سەر بەڕەتانو نەهێڵن بێتە ماڵتان، جا ئەگەر شتی وایان کرد کە بەدڵی ئێوە نەبوو ئەوا هەتا دەتوانن چاو پۆشییان لێ بکەنو بە نەرمو نیانی لەگەڵیاندا ڕەفتار بکەن، وە بەبێ هۆیەکی ڕەوا تەڵاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەیش چاریان نەکرا، ئەوا شەریعەت ڕێگەتان پێ دەدا، کە بە ئاسپایی بۆ تەمێو پەند وەرگرتن لێیان بدەن، نەوەك بۆ ڕق پێ ڕشتنو خۆ بەزلزانین.

وەمافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بەباشیو بەپێی باوی جوانی ناو وڵاتی خۆتان، ڕۆژیو خۆراكو بەرگو پۆشاکیان پێ بدەن، وەکی هاوسەری هاوشانی خۆتان، تا هەست بەهاوسەر کەمی نەکەن!

وەمن یاسایەکی ڕەسای ڕێکوپێکی وەهام لەپاش مەرگی خۆم بۆ بەجێ هێشتوون، ئەگەر بێتوو پەیڕەوی بکەن‌و ڕەفتارو کاری پێ بکەن لەناو خۆتانا، هەتا هەتایە، جارێکی تر سەرتان لێ ناشێوێ‌و سەرگەردان نابن، ئەویش ئەم قورئانەیە کە پەڕاوو نامەی پیرۆزی خودایە.

وە ئێوە لەدوا ڕۆژدا، لەقیامەتدا، لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، ئایا من بە ئەرکی سەرشانی خۆم هەڵساوم‌و یاسانامەی خودام بەئێوە ڕاگەیاندووە یانا، جا ئێوە سەبارەت بەم پرسیارە وەڵامتان چی دەبێ؟).

گوتیان: شایەتی دەدەیمن کەتۆ، سەبارەت بەم بابەتە، کۆتایی‌و درێغیت نەکردووە، تەبلیغی خۆتت کردووەو ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خێری ئێمەت کردووە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ‌جار پەنجەی شایەتمانی خۆی هەڵبڕی بۆ ئاسمان‌و داینەواندەوە بۆ ناو خەڵکەکەو هەموو جارێکیش لەگەڵ ئەم ئاماژەیەدا دەیفەرموو: (خودایە! تۆ بەشایەت بە!).

ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیدا بانگ دراو، قامەت کراو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین‌و فەرمانی کردەوە قامەت کرایەوەو نوێژی عەصریشی بەجەمع بۆ کردین، و لە بەینیاندا هیچ نوێژی تری نەکرد. ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وشترەکەی بوو، ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئێستگاکەی خۆی لە عەرەفات، جا ڕووی وشترەکەی، کەناوی قەصواء بوو، کردە تاوێرە بەردەکانی داوێنی کێوی جەبەلوڕەحمە، کە ئەم چیای ڕەحمەتە خۆی وا لەناوەڕاستی خاکی عەرەفاتدا، وە کۆمەڵی حاجییە پیادەکانی خستە بەردەمی خۆیەوە، وە ڕووی کردە ڕووگە، (واتە: قیبلە).

ئیتر لەوێدا ڕاوەستا تا خۆرئاوا بوو، جا ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوەو داپەڕی بۆ موزدەلیفە، هەوسارەکەی قەصواشی وا گورج کردبۆوە، تەنانەت سەری قەصوا دەیدا لەقەڵپووزی کۆپانەکەی، وە پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) بەدەستی ڕاستیشی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: (خەڵکینە! لەسەر خۆبن، خەڵکینە! هێواش، ئارامی بپارێزن). بەڵام کە دەگەیشتە تەپکەو ماسۆڵکە لێ، کەمێ جڵەوەکەی بۆ قەصواء شل دەکرد، تا سەردەکەوتە سەری، جا ڕۆیشت تا تەشریفی گەیشتە موزدەلیفە، جا لەوێ نوێژی شێوان‌و خەوتنانی، بەجەمعە تەئخیر کرد، بەیەك بانگ‌و بە دوو قامەت، وەهیچ نوێژی سوننەتی لە بەیانیاندا نەکرد، ئینجا تەشریفی خەوت هەتا شەبەقی دا.

جا کەبەیانی تەواوی دا، فەرمانی دا، بانگ دراو قامەت کراو نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئەنجا سواری قەصوا بۆوەو ڕۆیشت تا گەیشتە مەشعەرولحەرام، جا رووی کردە رووگەو لەخودا پاڕایەوەو ئەڵڵاهوئەکبەرو تەلیلەی کردو ناوی خودای تاك‌و تەنیایی هێنا. وە لەوێ ڕاوەستا تا تەواو دونیا رووناك بووەوە، جا لەپێش خۆرکەوتندا، کەوتە ڕێ بۆ مینا، وە فەزڵی کوڕی عەبباسی مامی خستە پاشکۆی خۆی، فەزڵیش پیاوێکی قژجوانی سپیلکەی شۆخ‌و قۆز بوو، جا لەو کاتەدا، کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتەڕێ، تاقمێ ژن لەناو کەژاوەدا دایان بەلایدا، فەزڵیش دەستی کرد بەتەماشا کردنیان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی نا بە رووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، فەزڵیش رووی وەرچەرخان بەولاداو لەولاوە تەماشای دەکردن!.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەولاوە گواستەوە بۆ لایەکەی ترو نایەوە بەرووی فەزڵەوە، تابەرچاوی بگرێتەوەو تەماشا نەکا، ئیتر حەزرەت ڕۆیشت تاگەیشتە ناو شیوی موحەسسیر، لەوێ تۆزێ خێرا لێی خوڕی‌و ڕێگەی ناوەڕاستی گرت، کەدەچێ بە سەر کۆگای گەورەدا، جا ڕۆیشت تاگەیشتە لای کۆگا بەردەکە، کەوا لەلای درەختەکەدا وە حەوت بەردی بۆ فڕێدا، بەردەکان وەك بەردێ وابوون کە بە پەلەپیتکە دەهاوێژرێ، گشت جارێ کە بەردێکی تێ دەگرت ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد، لەناو شیوەکەوە بەردەکانی تێ

دەگرت. ئینجا ڕۆیشت بۆ کوشتنگا (مەنحەر: کوشتارگە)کەو لەوێ بەدەستی خۆی شەستو سێ وشتری سەربڕی، ئەنجا چەقۆکەی دا بەعەلیو عەلیش باقی مەندەی وشترە دیارییەکانی حەزرەتی سەربڕی، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی کرد بەهاوبەشی خۆی لەم وشترە دیارییانەدا، ئینجا فەرمانیدا، لەگۆشتی هەر وشترێ پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە، کوڵانیانو خۆیو عەلی لەگۆشتەکەیان خواردو لەئاوی مەرگەکەیان خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواربوو، ڕۆیشت بۆ بەیتو تەوافی ئیفازەی کرد، وە نوێژی نیوەڕۆی لەمەککە کرد. جا چوو بۆلای بەنی عەبدولموتتەلیب، کە لەسەر بیری زەمزەم ئاویان دەدا بەحاجیان، فەرمووی: (ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب! ئاو هەلگۆزنو بیدەن بەحاجییانو بەمەردوم، نەبادا خەڵك وا تێ بگەن کە ئاو هەلگۆزینیش بەشێکە لە کردارەکانی حەج، وە لەم حاڵەتەدا زۆرتان بۆ بهێننو ڕێگەتان نەدەن کە بەئاساییو ئاسانی ئاو بدەن بەحاجیان، نەبادا ئەمە ڕووبدا ئەگینا ئەم ئیشەی ئێوە ئەوەندە کارێکی جوانو پەسەندە منیش ئاوم هەڵدەگۆست لەگەڵتانا، جا ئەوانیش سەتڵێ ئاویان بۆیبرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی خواردەوە). {پوختەی موسلیم ژمارە: ٧٠٧ + تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی دوو، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ١٦٢٥ + فیقهی ئاسان بەکوردی، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ١٧٩ لاپەڕە: ٤٣٣ — حەجەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

(ڕوونکردنەوە):

جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) ناسراوە بە (جەعفەری صادیق). دایکی ناوی فەروەی کچی قاسمی کوڕی موحەممەدە، دایکی فەروەیش ئەسمائی کچی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیقە. لەبەر ئەوە

كەجەعفەری صادیق لەدوو سەرەوە دەگاتەوە بە ئەبوبەکری صەدیق دەیفەرموو: من دووجار لە ئەبوبەکری صەدیق بووم، جەعفەر ساڵی هەشتای کۆچی لەدایك بووە، سەهلی کوڕی سەعدو چەندین هاوەڵی تری پێغەمبەری دیوە، لەبەر ئەوە بەتابیعی دائەنرێ، ئەبو خەنیفە گێڕانەوەی لێوە ئەنجام داوە، جەعفەر هەتا بڵێی جێگەی متمانەو باوەڕی فەرموودەزانەکان بوو، ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: (کەسم نەدیوە وەك جەعفەری کوڕی موحەممەد، ئاوا شەرعزانێکی شارەزاو زانا بێ).

پێشەوا جەعفەر دەیفەرموو: (بەرلەوە بمرمو دەستتان پێم نەگات، پرسیارم لێ بکەن، چونکە لەپاش من کەسی تر، وەك خۆم، ئەم فەرموودانەتان بۆ تانی ناگێڕێتەوە کەمن بۆتانی دەگێڕمەوە).

عەلی کوڕی جەعد، لەزوهەیری کوڕی موحەممەدەوە، لەباوکیەوە دەفەرموێ: گوتم بەجەعفەری کوڕی موحەممەد: دراوسێیەکم هەیە گوایە دەڵێ: تۆ تەبەررا لە ئەبوبەکرو عومەر دەکەی؟ فەرمووی: خودا حاشاو تەبەررا لەو دراوسێیەی تۆ بکا، من ئومێد دەکەم بەهۆی ئەو خزمایەتییەی کە هەمە لەگەڵ ئەبوبەکری صەدیقا، کە لە دوو سەرەوە باپیرمە، خودا بەهۆی ئەوەوە سوودم پێ بگەیەنێ. شیعە درۆزنەکان بەبارو بەئەغار درۆیان هەڵبەستووە بەدەم جەعفەری صادیقەوە، ئەم فەرموودەزانە گەورانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەوتەوە: پێشەوا موسلیمو ئەبوداوودو تەرمەزیو نەسائیو ئیبنو ماجە.

ساڵی (١٤٨) سەدو چلو هەشتی کۆچی مردووە لەبەقیع نێژراوە. لەبەر ڕاستگۆیی ناونرا (جەعفەری صادیق = جەعفەری ڕاستگۆ). دەڵێن: جارێ مێش مەنصور جاڕس دەکا، هەردەری دەکاو هەردێتەوە بۆی، تا بێزاری دەکا، لەوکاتەدا جەعفەری صادیق دەچێ بۆ سەردانی، مەنصور پێی دەڵێ: ئەی باوکی عەبدوڵڵا! خودا مێشی بۆ چییە، بۆ درستی کردووە؟ پێشەوا جەعفەر

لـەوەڵامیا دەفـەرموێ: (هـەتا ملـهوڕەكانی پـێ دەسەوسـان‌و كەسـاس بكـا). دەفەرموێ: (نیـشانەی ڕاسـتگۆیی كەسـێ ئەوەیـە كەئاشـكراو نهێنـی وەك یـەك وابێ!).

موحەممەدی كوڕی عەلی كوڕی حوسەین كوڕی عەلی كوڕی ئـەبو تالیـب (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) ناسـراوە بـە (أبـو جعفـر الهـاشمی المـدنی القرشـی) فـەرموودەی لـەجابیری كـوڕی عەبـدوڵلا و لـەباوكی خـۆی‌و لەكەسـانی تـر گێڕاوەتـەوە، لەبـەر ئـەوە دائـەنرێ بـەتابیعی. لەتەمـەنی (٥٨) پـەنجاو هەشـت ساڵیدا مـردووە. هەنـدێ دەڵـێن: سـاڵی (١١٤) سـەدو چـوارده كۆچـی مـردووە. ئەوەنـدەی كوڕنـووش بـرد بـوو، نیـشانەی لـەناو چـاوانی دروسـت كردبـوو، كراسێكی هەبوو نوێژی پێوە دەكـرد، ڕایـسپارد كەلـەپاش مـەرگی لـەو كراسـەدا كفن بكرێ.

٧٦٠- وَعَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ تَلْبِيَتِهِ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ سَأَلَ اَللَّهَ رِضْوَانَهُ وَالْجَنَّةَ وَاسْتَعَاذَ بِرَحْمَتِهِ مِنَ اَلنَّارِ} رَوَاهُ اَلشَّافِعِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

ضعيف الجامع: ٤٤٣٥ + شافعي في المسند ١/١٢٣. دارقطني/٢/٢٣٨. بهقي ٤٦/٥}:

خوزەیمـەی كـوڕی ثابیـت (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: جـاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەكاتی كردنی حەج، یان لەكاتی كردنـی عەمرەدا، هەموو جارێ، كە تەلبییەی دەكرد، كە لە تەلبییەكە دەبۆوە، داوای لێ ڕازیبوونی خوداو بەهەشتی لەخودا دەكرد، وە پەنای دەگرت بەرەحمەتی خودا لەئاگری دۆزەخ. دانەر دەڵێ: شافیعی بەڕشتەیەكی لاواز گێڕاویەتەوە.

(ڕوونكردنەوە):

خوزەیمـەی كـوڕی ثـابیتی ئەنـصاری، یەكێكـە لـە موسـوڵمانە هـەرە پێشینەكان، ئامادەی بەدرو شەڕگاكانی تری دوای بەدر بـووە، بەدەسـتی خـۆی

بتەكانی بەنی (خطمە)ی دەشكاند، لەرۆژی رزگار كردنی مەككەدا ئالآی هۆزی (خطمـە) لای ئـەو بـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) شـایەتی خوزەیمەی دادەنا بەشایەتی دوو پیاو. {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٩٤، لاپـەڕە: ٦٤، ژمارە: ٣٦٨٥ چاپی چوارەم} . لەگەڵ عەلیدا بوو، كاتێ عەمماری كوڕی یاسیر لـە (صفّین) شەهید بوو، شمشێرەكەی عەمماری بەرووتی هەڵگرتو جەنگی كرد هەتا شەهید بوو، ساڵی (٣٧) سیی‌و حەوتی كۆچی بوو.

٧٦١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {نَحَرْتُ هَاهُنَا، وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ، وَوَقَفْتُ هَاهُنَا وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَوَقَفْتُ هَاهُنَا وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم. حج: ٢٩٤٣}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی ماڵڵاوایدا، فەرمووی: (هەرچەندە من خۆم لێرەدا قوربانیم سەربڕی، بەڵام خاكی مینا هەمووی جێگای قوربانی سەربڕینە، وە لە هەر كوێدا دەستی دا بۆتان لەوێدا قوربانی خۆتان سەربڕن، هەرچەندە من خۆم لێرانەدا ڕاوەستاوم بەڵام خاكی عەرەفات هەمووی ئێستگایەو جێگەی ڕاوەستانە، وەهەرچەند من خۆم لێرانەدا ڕاوەستام لە موزدەلیفە، بەڵام خاكی موزدەلیفە هەمووی ئێستگایەو جێگای ڕاوەستانە).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ١٥٦٩} .

٧٦٢- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَمَّا جَاءَ إِلَى مَكَّةَ دَخَلَهَا مِنْ أَعْلَاهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٥٨ = ١٥٧٦، ١٥٧٧ بوخاری. لەپوختەی موسلیم = مسلم. حج: ٣٠٣١ شیحا = مسلم ١٢٥٨. أبوداود. مناسك: ١٨٦٩. ترمذی. حج: ٨٥٣. تحفة الأشراف: ١٦٩٢٣}:

مەبەست لەم فەرموودەیەی عائیشە، ئەمەیە کە لەم فەرموودەیەی ئیبنو عومەردا، لە تجریدی بوخاریو پوختەی موسلیمدا دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕێگەی ئەل – شەجەرەوە لەمەدینە دەردەچوو، لەڕێگەی ئەل – موعەررەسەوە دەگەڕایەوە بۆی، کە دەچوو بۆ مەککەیش لە کەدائەوە دەڕۆیشتە ناو شاری مەککەوە، واتە: لەدانەی ژوورووەوە کەپێی دەگوترێ: ئەنییەتولعولیا، کەوا لەناو بەطحادا، وەلە کوداءە لەشاری مەککە دەردەچوو، واتە: لەدانەی خوارووەوە، کەپێی دەگوترێ: ئەنییەتول سوفلا. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ١٥٤٠ – س/د/ت/ن}.

(ڕوونکردنەوە):

(گَدَاء = کەداء) ناوی شوێنێکە لەسەرووی مەککەوە، لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو ملیەوە ڕۆیشتە ناوشاری مەککەوە، وە لەپاش تەواوبوونی سەفەری حەج، کە لەمەککە دەرچوو، وە گەڕایەوە بۆ مەدینە لەشوێنێکەوە دەرچوو، کەپێی دەگوترێ: (کودا) هەروەك پێی دەگوترێ (الثنیةُ السُّفْلی = دانەی خواروو = ملەی خواروو) (کودا) بە ضەمەی کافەوە مەقصورە، بەڵام (کەداء) بە فەتحەی کافەوە مەمدوودە، خەڵکی مەککە دەڵێن: (إِفْتَحْ وَادْخَلْ واضْمُمْ واخْرُجْ!).

کوداء ملەیەکی پلانو سەخت بوو، بەچەند قۆناغێ ئەو پلانە کرا بەڕێگەیەکی خۆشی ئاسانی ئاسایی.

١- لەسەردەمی موعاوییەدا.

٢- لەپاشا لەسەردەمی عبدول مەلیکدا.

٣- لەپاشا لەسەردەمی ئەلمەهدید.

٤- لەپاشـا بەتـەواوی هـەمووی لەسـەردەمی ئەلمۆئەییەدی پادشـای میصردا، لەسنووری ساڵی (٨٢٠) هەشت سەدو بیستدا خۆشکراو تەخت کراو بوو بەڕێگەیەکی خۆشی ئاسانی ئاسایی.

٧٦٣- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: {أَنَّهُ كَانَ لَا يَقْدُمُ مَكَّةَ إِلَّا بَاتَ بِذِي طُوًى حَتَّى يُصْبِحَ وَيَغْتَسِلَ، وَيَذْكُرُ ذَلِكَ عِنْدَ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٤٦ = ١٥٥٣، ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤. پوختەی موسلیم: ٦٩٠ = ٣٠٣٤ شیحا = مسلم ١٢٥٩. أبوداود. حج: ١٨٦٥}:

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کاتێ ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە زولحولەیفە، نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوسا فەرمانی دەدا: وشترەکەیان کۆپان دەکرد بۆی، ئەوجا سوار دەبوو، جا کە بەباشی لەسەر پشتی وشترەکەی ژێری خۆی دەگرت‌و ڕێك دادەمەزرا لەسەرپشتی، بەسەر وشترەکەوە قیت دادەنیشت‌و ڕووی دەکردە ڕووگەی پیرۆز، ئیتر دەستی دەکرد بە لەبەیکە کردن‌و بەینە بەینە بەبێ پسان تەلبییەی دەکرد، هەتا دەگەیشتە خاکی حەرەم‌و ئەوجا بە ئەرکەکانی تری حەجەوە خەریك دەبوو، کەمتر دەی پەرژایە سەر تەلبییە، ئەوجا دەچوو بۆ ذیتەوا، کەئێستا پێی دەگوترێ: (بئر الزّهر = بیری زاهیر) لەوێ شەوێ دەمایەوە هەتا بەیانی، جا کاتێ لەوێ نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوسا خۆی دەشۆرد، ئەوجا لەڕۆژدا دەڕۆیشتە ناو مەککە، بەقسەی ئیبنو عومەر، پێغەمبەر خۆشی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ شتەی ئاوا بەرودوا دەکرد.

٧٦٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: { أَنَّهُ كَانَ يُقَبِّلُ اَلْحَجَرَ اَلْأَسْوَدَ وَيَسْجُدُ عَلَيْهِ } رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ مَرْفُوعًا، وَالْبَيْهَقِيُّ مَوْقُوفًا.

{ضعيف، الإرواء: ١١١٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) گەلێ جار بەردە ڕەشەکەی ماچ دەکردو سوژدەی لەسەر دەبرد).

حاکم بە مەرفووعی گێڕاویەتەوەو بەیهەقی بە مەوقووفی، مەرفووع وەك: ئەبو داوودی تەیالیسی دەگێڕێتەوە: جەعفەری کوڕی عوثمانی مەخزوومی دەڵێ: دینیم کە موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەر حەجەرولئەسوەدی ماچ کردو کوڕنووشی لەسەر بردو فەرمووی: خاڵم ئیبنو عەبباسم بینی، حەجەرولئەسوەدی ماچ کردو کوڕنووشی لەسەربردو، فەرمووی: عومەری کوڕی خەطابم بینی حەجەرول ئەسوەدی ماچ کردو کوڕنووشی لەسەری بردو فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوەهای کرد: حەجەرول ئەسوەدی ماچ کردو کوڕنووشی لەسەری برد).

٧٦٥- وَعَنْهُ قَالَ: أَمَرَهُمْ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَنْ يَرْمُلُوا ثَلَاثَةَ أَشْوَاطٍ وَيَمْشُوا أَرْبَعًا، مَا بَيْنَ اَلرُّكْنَيْنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٧٠ = ١٦٠٢، ٤٢٥٦ بوخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٩٥ = ٣٠٤٤ + ٣٠٤٨ شیحا. مسلم/١٢٦٤}:

لێرەدا بۆ بەهرەو سوودی پتر دەقی ئەم گێڕانەوەی پوختەی موسلیم ڕاگوێز دەکەم:

ئەبو طوفەیل فەرمووی: گوتم بە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ): ئەرێ پێم نافەرمووی ئەم سێجار هەڕاکردنو چوار جار ڕۆیشتن بەڕۆیشتنی ئاسایی، بەدەوری بەیتا، لەکاتی تەوافی حەجو عەمرەدا، ئایا ئەمە سوننەتە یانا؟ بەقسەی خزمانی تۆبێ ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەو پێغەمبەر وایکردووە، فەرمووی: قسەکەیان نیوەی ڕاستەو نیوەی درۆیە. گوتم: چۆن چۆنی نیوەی ڕاستەو نیوەی درۆیە؟ فەرمووی: ئەوەی کە دەڵێن: پێغەمبەر وایکردووە، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: ئەمە سوننەتێکی دامەزراوە

لەکاتی کردنی هەموو تەوافێکا، ئەوە درۆیە! بەپێی ئەم روونکردنەوەیە: ساڵی عەمرەتولقەضاء، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ عەمرە، کاتێ گەیشتنە مەککە، هاوبەشپەیداکەرەکان لە حەسوودیدا، گوتیان: موحەممەدو هاوەڵەکانی، لەرزو تای مەدینە، لەڕو لاوازی کردوون، ناتوانن تەوافی بەیت ئەنجام بدەن، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ساڵە فەرمانی کرد، بەهاوڕێکانی خۆی، کە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا، بەلۆقەو نەرمە غار بڕۆنو چالاکیو هێزی خۆیان، پیشانی دوژمن بدەن، هەتا چاو ترسێنیان بکەنو چوار سەرەکەی تری تەوافیش بەڕۆیشتنی ئاسایی تەواوبکەن، دەی کە ئێستا ئەو مەبەستە نەماوە، پێویست بەهەڕاکردن ناکات لەسێ سەرەی یەکەما، چونکە هۆکەی نەماوە، کە پێشاندانی هێزە بۆ چاو ترساندنی دوژمنی ئایین، ئەنجا عەرزیم کرد: خزمانی تۆ دەفەرموون، کە تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە بەسواری سوننەتە، تۆ بۆ ئەمە دەفەرمووی چی؟ ئایا شتی وەها سوننەتە یانا؟ فەرمووی: ئەم قسەشیان هەندێکی راستەو هەندێکی درۆیە، عەرزیمکرد: چۆن چۆنی؟ فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەعی نێوانی سەفاو مەڕوەدا، خەڵکێکی زۆر کەڵەکەیان لێی کرد، دەیانگوت: ئەمە موحەممەدە، ئەمە موحەممەدە، تەنانەت گەورە کچەکانیش لەماڵ دەرچوو بوونو هاتبوون، پێغەمبەریش (دروودی خودای گەورەی لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست، گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) عادەتو یاسای وەها نەبوو، کە وەك میرو ئاغاو پاشا، بە لێدانو بەپاڵ، درِ بەخەڵك بدرێ لەبەردەمیەوەو ڕێگەی بۆ چۆڵ بکرێ، جا لەناچاریدا کە خەڵکەکە ئاوا ئابلۆقەیان لە پێغەمبەر دابوو، کەڵەکەیان لێ کرد. سواری وڵاخەکەی بوو، هەتا خەڵکەکە چاویان لەکردارەکانی بێو کردارەکانی ئەو لەکاتی ئەنجامدانی حەجەکەیدا، بکەن بەسەر مەشقو پەیڕەوی لێ بکەن.

كەواتە: ئەو قسەیان راستە، كە دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواریی وڵاخ، سەعی نێوانی سەفاو مەروەی كردووە، بەڵام ئەوەی كەدەڵێن: ئەمە سوننەتە، ئەوە وانییە، چونكە پێغەمبەر، كە لەسەعی نێوانی سەفاو مەروەدا سواری وڵاخ بوو، بۆئەوە نەبوو كە ئەوە سوننەتە، بەڵكوو لەبەر ناچاری بوو، وەلەبەر ئەو هۆكارو عوزرە بوو كە بەیانكرا، كەواتە: رۆیشتن بەپێو هەراكردن بەپێ لەنێوانی سەفاو مەروەدا سوننەتە، نەوەك سواربوونی وڵاخ، وەك ئەو خەڵكە بەهەڵە وادەڵێن).

(روونكردنەوە):

١- نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەمەی كە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ رەمل (هەراكردنو لۆقە كردن) لەسێ سەری پێشەوەی تەوافا سوننەت نییە، ئەمە مەزهەبی ئیبنو عەبباس خۆیەتی، بەڵام هەموو زاناكان، لە سەحابەو تابیعینو دوای ئەوان، رایان وایە كە رەمل، لەم سێ تەوافەدا سوننەتە، بەڵام ئەوەی كە دەفەرموێ تەواف بەپێ سوننەتە، نەوەك بەسواری، ئەمە بەكۆی دەنگ وایەو قسەكەی ئیبنو عەبباس لەم مەسەلەیەدا تەواوە، چونكە زاناكان دەفەرموون: تەواف بەسواری دروستە، بەڵام تەواف بەپێ ئەنجام بدرێ باشترە، مەگەر لەبەر ناچاری.

٢- ئەبو طوفەیل، ناوی عامیری كوڕی واثیلەی لەیثییە، ساڵی شەڕی ئوحود لەدایك بووە، زیاتر لەسەد ساڵ ژیاوە، دواترین كەس بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر كەمردووە، هەواداری ئیمامی عەلی بوو، فریای هەشت ساڵ لەژیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەوتووە، واتە: كە پێغەمبەر مردووە ئەو هەشت ساڵان بووە، لەهەموو نەبەردو شەڕگاكانا لەگەڵ پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تالیبدا بووە، لە كووفە دادەنیشت، كە ئیمامی عەلی شەهید بوو لەمەككە نیشتەجێ بوو، لەوێش مرد، گەڵێ جار دەیفەرموو: لەوانەی كە پێغەمبەریان دیوە، بەس من ماوم لەسەر رووی زەوی).

پیاوێکی هۆشمەندو شاعیرێکی بەهرەمەند بوو، چوار فەرموودەی هەیە، باوەڕی وابوو: (گەرچی دیانی دەنا بەسەروەریی ئەبوبەکرو عومەردا، بەڵام باوەڕی وابوو کەعەلی لەوان سەروەرترە).

٧٦٦- {وَعَن ابن عُمَرَ (رضي الله عنه) أنه كَانَ إذا طَاف بالبَيْتِ الطَّوَاف الأول خَبَّ ثَلاَثاً قبلَ الفجرِ، ثم مَضَتْ فَأَفَاضَتْ} . رَوَاهُ أبو داود وإسْنَادُهُ عَلَى شرط مسلم} :

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٧٧١ = ١٦٠٤، ١٦١٦، ١٦١٧، ١٦٤٤ بوخارى + تەجريد/٢، ژمارە: ٧٧٧ = ١٦١٦ بوخارى + تەجريد/٢، ژمارە: ٧٨٥ = ١٦٤٤ بوخارى. پوختەى موسليم ژمارە: ٦٩٣ = شيحا/٣٠٣٨، ٣٠٣٩ = مسلم/١٢٦١، ١٢٦٩ + تەجريدى بوخارى/٢/٧٧٠ = ١٦٠٢، ٤٢٥٦ بوخارى. أبو داود. حج/١٨٩٣. نسائى. حج/٢٩٤١. تحفة الأشراف/٨٤٥٣} :

لە تەجریدو پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، کاتێ دەچوو بۆ حەج، یا بۆ عەمرە، کاتێ دەگەیشتە ناو مەککە، لەپێشا تەوافی قودومی لەسەر ئەم شێوەیە ئەنجام دەدا: سێ جار بەهەڕاکردنو بەنەرمە لۆقە هەڵدەسوڕا بەدەوری بەیتدا، چوارجاریش بەڕۆیشتنی ئاسایی، هەڵدەسوڕا بەدەوریدا، ئەنجا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەوافی دەکرد: ئینجا تەوافی نێوانی سەفاو مەڕوەشی ئەنجام دەدا. {تاج/٢، لاپەڕە: ١٩٧، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ١٥٤٢ چاپی چوارەم} + {پوختەی موسلیم: ٦٩٥ کە لە ژمارە (٧٦٥)ی ئەم پەڕاوەدا لەپێش کەمێ ڕابورد} .

٧٦٧- وَعَنْهُ قَالَ: {لَمْ أَرَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْتَلِمُ مِنْ اَلْبَيْتِ غَيْرَ اَلرُّكْنَيْنِ اَلْيَمَانِيَيْنِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەى موسليم، ژمارە: ٦٩٨ = شيحا ٣٠٥٥ + پوختەى موسليم ژمارە: ٦٩٧ = شيحا ٣٠٥٣ = مسلم ١٢٦٩} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەدوو گۆشە یەمانییەکانی بەیت، هیچ گۆشەیەکی تری ماچ بکا.

له ژمارە: (٦٩٧)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەوکاتەوە کە بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینیوە، لەکاتی تەوافو هەڵسووڕانی ئایینی بەگردی خانەی خودادا، دەستی هێناوە بەم دوو گۆشە یەمانییەی بەیتداو بەردە ڕەشەکەداو، ماچی کردوون، لەوکاتەوە ئەوەم دیوە منیش لەکاتی تەوافی بەیتا، وازم لەدەست پیاهێنانو ماچکردنی ئەم دوو گۆشە یەمانیەو حەجەرولئەسوەد نەهێناوە، بەڵکوو دەستم پیادا هێناونو ماچم کردوون، چی لەکاتی دەور چووڵی داو، چی لەکاتی دەور قەرەباڵغیدا. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٩٥}.

٧٦٨- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّهُ قَبَّلَ اَلْحَجَرَ اَلْأَسْوَدَ فَقَالَ: إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَضُرُّ وَلَا تَنْفَعُ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٦٧ = ١٥٩٧، ١٦٠٥، ١٦١٠ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦٩٦ = ٣٠٥٦ شیحا = مسلم ١٢٧٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس فەرمووی: پێشەوا عومەری کوڕی خەطابم بینی، حەجەرەولئەسوەدی ماچ دەکردو، دەیفەرموو: بەخودا من کە ماچت دەکەم، لەهەمان کاتدا دەزانم کەتۆ بەردێکیت، نەزیان دەبەخشیتو نەبەهرەو سوود دەگەیەنی بەکەسێ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە من خۆم بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینیوە کەتۆی ماچ کردووە، لەبەر ئەوە منیش ماچت دەکەم، دەنا ماچم نەدەکردیت. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ١٥٤٧ + تجریدی/٢، ژمارە: ٧٧٥}.

٧٦٩- وَعَنْ أَبِي اَلطُّفَيْلِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {رَأَيْتُ رَسُولَ اَللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَيَسْتَلِمُ اَلرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ مَعَهُ، وَيُقَبِّلُ اَلْمِحْجَنَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٦٩٩ = ٣٠٦٣ شیحا = مسلم ١٢٧٥}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی ماڵاوایدا، بەسواری وشترەکەی خۆی، تەوافی بەیتی کرد، وە بەگۆچانەکەی دەستی هێنا بەگۆشەی حەجەرولئەسوەددا، بۆ ئەوەی کە حاجییەکان ببینن و بیکەن بەسەرمەشق بۆ خۆیان و چاویان لێ بێ، هەتا پرسیاری لێ بکەن، چونکە خەڵکەکە گەمارۆیان دابوو!. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ١٥٤٨}:

لێرەدا ئاوایە:

ئەبو طوفەیل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی تەوافی بەیتی دەکرد، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو، دەیهێنا بەگۆشەی بەردەڕشەکەدا، ئەوجا گۆچانەکەی ماچ دەکرد.

(ڕوونکردنەوە):

نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەم چەند شتە:

١- دەست هێنان بەحەجەرولئەسوەددا سوننەتە، هەروا ماچ کردنی، ئەگەر بەبێ کێشەو بەرە، ئەم دوو کارە ئەنجام دەدران.

٢- بەهۆی عوزرەوە، وەك قەرەباڵغی و نەخۆشی، گۆچانێ، یا هەرشتێ کە لەبار بێ، بیهێنێ بە حەجەرولئەسوەدداو، لەپاشا گۆچانەکە، یا دارەدەستەکە ماچ بکات.

٧٧٠- وَعَنْ يَعْلَى بْنَ أُمَيَّةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَـالَ: {طَـافَ اَلنَّبِيُّ (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مُضْطَبِعًا بِبُرْدٍ أَخْضَرَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{حسن، صحيح أبي داود: ١٦٤٥. الصحيح المسند: ١٢٠٤. أبوداود: ١٨٨٣. ترمذي: ٨٥٩. ابن ماجة: ٢٩٥٤. أحمد ٤/٢٢٣}:

يەعلای کوڕی ئومییە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی تەوافی بەیتدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بوردێکی سەوز، کرداری ئیضطباعی ئەنجام دا.

(ڕوونکردنەوە):

١- بورد جۆرە شاڵێکە، زۆرتر لە یەمەن دروست دەکرێ.

٢- إضطباع ئەوەیە، کەحاجی، یا عەمرەکار، بەم شێوەیە بەرماڵەکەی لای سەرەوەی لەشی، کەپێی دەگوترێ (ریداء) ببەستێ، چمکێکی لەژێر باڵی راستیەوە، لەسەر پشتیەوە ببا بۆ سەرشانی چەپی و چمکەکەی بەرامبەری ئەو چمکەیش لەسەر سینگیەوە ببا بۆ سەرشانی چەپی و بەوشێوەیە بی پێچێ بەخۆیەوە، کە لەم کاتەدا سەرشانی ڕاستی و باڵی ڕاستی ڕووت دەبێ.

٣- یەعلای کوڕی مونیە، کە ناوی دایکی مونیە بوو، وەناوی باوکی ئومییە بوو، کە ناودارو ناسراوە بە یەعلای کوڕی ئومەیەی تەمیمی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەرۆژی رزگارکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، پیاوێکی دەوڵەمەندی زۆر سەخی بوو، ئامادەی غەزای تائیف و حونەین و تەبووك بووە، لەخزمەتی پێغەمبەر خۆیدا ئامادەی ئەم غەزایانە بووە، نۆزدە فەرموودەی هەیە، لە موقەدیمەی فەتحولباریدا دەفەرموێ: سێ فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، یەعلا پیاوێکی ناوداری لێهاتوو بوو، لەبەر ئەوە لەکاتی حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی هەرچوار جێنشینەکانی پێغەمبەردا، رۆڵی گەورەی بینیوە، ئەبوبەکر کردی بەکاربەدەستی سەر حولوان، لەکاتی جەنگی ریدەدا، کەناسراوە بە (حوروبی ریددە).

لەسەردەمی عومەردا بوو بەکارمەند لەسەر هەندێ لەوڵاتی یەمەن، لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانیشدا، یەعلا بوو بەکاربەدەستی عوسمان لەسەر سەنعاء، ئەو ساڵەی کە عوسمان شەهیدکرا هات بۆ حەج، زۆر لەدژی بکوژانی عوسمان خەباتی گێڕا، لەگەڵ عائیشەدا ئامادەی جەنگی ئەل-جەمەل بوو، ئەو حوشترەی کە لەو جەنگەدا لەژێر حەزرەتی عائیشەدا بوو، کە شەڕەکە بەناوی ئەو وشترەوە، ناوی دەرکرد، حوشترەکە ناوی (عەسکەر) بوو، یەعلا بەدوو سەد لیرەی زێڕ کڕیی‌و بەخشی بەعائیشە، لەو رووداوە دڵتەزینەدا عائیشە سواری ئەو وشترە بوو، لەپاشا لەگەڵ ئیمامی عەلیدا، ئامادەی شەڕی صەفین بوو، لەم شەڕەدا لەساڵی (٣٨)ی کۆچیدا شەهیدکرا (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٧٧١- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كَانَ يُهِلُّ مِنَّا اَلْمُهِلُّ فَلَا يُنْكِرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ مِنَّا اَلْمُكَبِّرُ فَلَا يُنْكِرُ عَلَيْهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری = پوختەی بوخاری/١، ژمارە: ٥٠٦ = ٩٧٠، ١٦٥٩ بوخاری. پوختەی موسلیم/٧٠٩ = ٣٠٨٥ شیحا = مسلم/١٢٨٥}:

لە پوختەی موسلیم‌و تاجول ئوصولا ئاوایە:

موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەل-ثەقەفی (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجێکا لەخزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکا بووین، لەڕۆژی عەرەفەدا، سەر لەبەیانی، لەوکاتەدا کە لەخزمەتیدا، خەریك بووین دەردەچووین لەميناوە بۆ عەرەفات، عەرزیمکرد: لەم رۆژانی مینایەدا، کاتێ ئێوە لەخزمەتی پێغەمبەردا دەبوون چیتان دەکرد؟

فەرمووی: هەمان بوو تەلیلەی دەکردو دەیگوت: (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّه) وە هەمان بوو (اللّـهُ أكـبر)ی دەکرد، وەهەمان بوو تەسبیحات‌و سوبحانەڵڵای دەکرد، وەهەمان بوو تەلبییەی دەکردو (لَبَّيْكَ اللهمَّ لَبَّيْكَة)ی دەکرد، وە کەسیش

رەخنەی لەکەس نەدەگرت، نەیان دەگوت ئەمـەیان بکـەن‌و ئـەوەیان مەکـەن!).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ١٥٦٨م}.

٧٧٢- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {بَعَثَنِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي اَلثَّقَلِ، أَوْ قَالَ فِي اَلضَّعَفَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ} متفق عليه.

{بوخاری. حج/١٦٧٧، ١٦٧٨، ١٨٥٦، ١٣٥٧. پوختەی موسـلیم/٧١٩ = ٣١١٣ شیحا = مسلم/١٢٩٣. أبو داود. حج: ١٩٣٩. نسائی. حج: ٣٠٣٢}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەگـەڵ بارگەکـەدا، یـا فـەرمووی: لەگـەڵ زەبوونـەکانی کەسـوکاری خۆیـدا، کەشـەوی موزدەلیفـە لەپێـشەوە نـاردنی بـۆ مینـا، منیـشی لەگەڵ ئەواندا بەشەو نارد).

لـەتاجا ئەمـەی پـترە: تیرمـزی‌و نەسـائی ئەمـەیان لـەم فەرموودەیـە پـتر کردووە: وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەرد فڕێ مەدەن بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە تاخۆر هەڵدێ!. {تـاج/٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمـارە: ١٥٨٤، لاپەڕە: ٢٢٥ چاپی چوارەم}.

٧٧٣- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {اِسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَيْلَةَ اَلْمُزْدَلِفَةِ: أَنْ تَدْفَعَ قَبْلَهُ، وَكَانَتْ ثَبِطَةً -تَعْنِي: ثَقِيلَـةً- فَأَذِنَ لَهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٢، ژمـارە: ٧٩٤ = ١٦٨٠، ١٦٨١ بوخـاری. پوختـەی موسـليم، ژمـارە: ٧١٧ = مـسلم/شـيحا ٣١٠٦ = مـسلم/١٢٩٠. تحفـة الأشراف/١٧٤٧٣}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەگـشت هاوسـەرە پاکیزەکـانی بـێ) فـەرمووی: سـەودەی دایکـی موسوڵمانان، ئافرەتێکی قەبـەی گرانـەڕۆ بـوو، لەبـەر ئـەوە شـەوی موزدەلیفـە،

داوای لە پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڕێگەی پێ بدا کە بەشەو لەموزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا، لەگەڵ لازەبوونو بێ هێزەکانا، بەرلەوە کە خەڵکەکە بیکەن بە قەرەباڵغیو جەنجاڵی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی پێدا، جا سەودە لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ عەشاماتەکەدا دەربچن، ئەو دەرچوو بۆ مینا، بەڵام ئێمە لەموزدەلیفە ماینەوە هەتا ڕۆژمان لێ بۆوە، ئەوجا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕێکەوت، ئێمەیش لەگەڵ ئەودا بەڕێکەوتین، خۆزگەم منیش کاتی خۆی، وەك سەودە، بۆ ئەمە مۆڵەتم لە پێغەمبەر وەردەگرتو ئێستا لەکاتی حەج کردندا، لە شەوی موزدەلیفەدا ئەوەم جێبەجێ دەکرد، لەسەر ئەو ڕێگەپێدانەی ئەو، بەڕاستی شت نییە کە وەك ئەو مۆڵەتە پێم خۆش بێ، بەڵام تازە لەکیسم چووا.

قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری صەدیق، کەبرازای دایکە عائیشە بوو، فەرمووی: وشەی (ثَبِطَةُ) کە لەدەقی عەرەبییەکەی فەرموودەکەدا هاتووە، بەواتای (ثَقِيلَةُ)نە، واتە: قورسو گرانەڕۆ. {تاج/٢، لاپەڕە: ٢٢٤، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ١٥٨٣، ١٥٨٤} .

٧٧٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَرْمُوا اَلْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَفِيهِ اِنْقِطَاعٌ.

{صحيح الجامع/٤٩. أحمد ١/٢٣٥ - ٢٠٩٩. أبو داود/١٩٤٠. ترمذى/٨٩٣. ابن ماجة/٣٠٢٥} :

لەکۆتایی ژمارە (٧٧٢) کە لەپێشەوە ڕۆیشت، واتای ئەم فەرموودەیە کراوە. لێرەدا:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێمان: (بەڵام ڕەجمی شەیتان مەکەنو بەرد فڕێ

مـەدەن بـۆ كۆگابەردەكـەی عەقەبـە هـەتا خـۆر دەكـەوێ). دانـەر (رەحمـەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا پچڕانێك هەیە. پـچڕان واتە: إنقِطاع.

٧٧٥- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {أَرْسَلَ اَلنَّبِيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) بِأُمِّ سَلَمَةَ لَيْلَةَ اَلنَّحْرِ، فَرَمَتِ اَلْجَمْرَةَ قَبْلَ اَلْفَجْرِ، ثُمَّ مَضَتْ فَأَفَاضَـتْ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَإِسْنَادُهُ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ.

{أبو داود/١٩٤٢}:

عائیـــشه (ڕەزای خـــودای لێ بـــێ) فـــەرمووی: لەحـــەجی ماڵاواییـــدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) لەشـەوی موزدەلیفـەدا، كـە بـۆ بـەیانی یەكەم ڕۆژی جەژنی قوربانەو قوربانی كردن دەست پی دەكات، ئـوم سـەلەمەی هاوسەری لەموزدەلیفەوە نارد بۆ مینا، جا ئـوم سـەلەمە لـەمینا لـەپێش بـەیانا ڕەجمی شەیتانی ئەنجام داو بەردی فڕێدا بۆ كۆگـا بەردەكـەی عەقەبـە، ئـەوجا ڕۆیشت بۆ بەیتو تەوافول ئیفازەی ئەنجامدا.

دانەر مامۆستا عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بـێ) دەڵـێ: ڕشـتەكەی بەپێی مەرجی موسلیمە.

٧٧٦- وَعَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَنْ شَهِدَ صَلَاتَنَا هَـذِهِ -يَعْنِـي: بِالْمُزْدَلِفَـةِ- فَوَقَـفَ مَعَنَـا حَتَّى نَدْفَعَ، وَقَدْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ تَـمَّ حَجُّـهُ وَقَـضَى تَفَثَـهُ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ.

{صحيح الجامع: ٦٣٢١. أبو داود/١٩٥٠. ترمذى/٨٩١. ابن ماجة/٣٠٢٥. أحمد/١/٢٣٤. ابن خزيمة في صحيحه/١٧٩/٤}:

لەتاجا ئاوایە:

عوروەی كوڕی موضەرریسی طائی (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: لـە موزدەلیفە چووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گـوتم:

ئـەی پیغەمبـەری خـودا! لـەلای دوو کێوەکـەی تەییئـەوە هـاتووم، وڵاخەکـەمم ڕەتانـدووەو خۆشم شەکەتو ماندوو کردووە لەڕێگە، ئەوەندە پەلەم کردووە تـا فریـای حـەج بکـەوم، بـەخودا تووشـی چـەند باسـکەو قوتکـەیێ بـووم، لەسـەر هەموویان ڕاوەستاوم، جا ئایا فریای حەج کەوتووم یان نا؟ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەوەڵاما فـەرمووی: (هەرکەسـێ ئامـادەی ئـەم نوێـژی بەیانییەمان لەموزدەلیفە ببـێ، وە لەگـەڵمانا ڕاوەسـتێ هـەتا دەکەوینـە ڕێ بـۆ مینا بۆ ڕەجمی شەیتان، وە لەپێش ئەو ، بەشـەو، یـا بـەڕۆژ، وەسـتانی چیایی عەرەفەی ئەنجام دابێ، ئیتر ئەوە بەحەجا گەیشتووەو حەجەکەی تەواوەو لەم لایەنەوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنـاوە). {تـاج/٢، لاپـەڕە: ٢٢١، زنجـیرە: ١٠٣، ژمارە: ١٥٧٦ چاپی چوارەم}.

٧٧٧- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {إِنَّ اَلْمُشْرِكِينَ كَانُوا لَا يُفِيـضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ اَلـشَّمْسُ، وَيَقُولُـونَ: أَشْـرِقْ ثَـبِيرُ وَأَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٩٦ = ١٦٨٤، ٣٨٣٨ بوخاری}:

عەمری کوڕی مەیموون (ڕەحمەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـۆ خـۆم لەگـەڵ عومـەری کـوڕی خەتابـدا بـووم، لـەکاتی جێنـشینی خۆیـدا، لـەکاتی ئەنجامدانی حەجدا، کاتێ نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە کـرد، فـەرمووی: جـاران هاوبـەش پەیـداکارەکان (کـە لـەزاراوەدا پێیـان دەگـوترێ: موشـریکین) تـا خـۆر نەکەوتایە، لەموزدەلیفەوە ڕەویان نەدەکرد بۆ مینـا، لـەم بارەیـەوە دەیـانگوت: (باخۆر لەچیایی ئەبیر گزنگ بدا، ئەوسا دەڕۆین بۆ مینا).

بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پێـچەوانەی ئـەوانی دەکردو لەپێش خۆرکەوتندا دەڕۆیشت بۆ مینا. {تـاج/٢، لاپـەڕە: ٢٢٤، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٨٢ چاپی چوارەم = چ/٤}.

٧٧٨- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ قَالَا: { لَمْ يَزَلِ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ اَلْعَقَبَةِ } رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژماره: ٧٤٢ = ١٥٤٣، ١٦٨٦، ١٥٤٤، ١٦٧٠، ١٦٨٥، ١٦٨٧ بوخارى}:

**له تهجريدى بوخاريدا ئاوايه:**

**ئيبنو عهبباس (رهزاى خودايان لىٚ بىٚ) فهرمووى: لهحهجى مالآواييدا، ئوسامهى كوڕى زهيد، لهپاشكۆى پێغهمبهرهوه، سوار بوو بوو، لهكێوى عهرهفهوه ههتا موزدهليفه، پاشان پێغهمبهر (دروودى خوداى لهسهر بىٚ) لهموزدهليفهوه ههتا مينا، فهزڵى كوڕى عهبباسى خسته پاشكۆى خۆى. ئيبنو عهبباس فهرمووى: ههردووكيان ههم ئوسامهو ههم فهزڵ دهيان فهرموو: پێغهمبهر (دروودى خوداى لهسهر بىٚ) لهو ماوهيهدا ههر سهرگهرمى (لَبَّيْكَ) كردن بوو، ههتا ڕهجمى شهيتانى تهواو كرد، لهكۆگا بهردهكهى جهمرهتولعهقهبه.**

٧٧٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّهُ جَعَلَ اَلْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ، وَرَمَى اَلْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ وَقَالَ: هَذَا مَقَامُ اَلَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ اَلْبَقَرَةِ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژماره: ٨١٢ = ١٧٤٧، ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠. پوختهى موسليم، ژماره: ٧٢٢ = ٣١١٩ = مسلم/١٢٩٦. أبو داود.حج/١٩٧٤. ترمذى. حج: ٩٠١. نسائى. حج: ٣٠٧٠. ابن ماجة. مناسك: ٣٠٣٠. تحفة الأشراف: ٩٣٨٢}:

**دهقى ئهم فهرموودهيه لهپوختهى موسليمدا ئاوايه، دهيكهين بهروونكردنهوه بۆ ئهمهى ئێره:**

**ئهعمهش (رهحمهتى خوداى لىٚ بىٚ) فهرمووى: رۆژىٚ، حهججاجى كوڕى يوسفى ئهلثهقهفى، وتارى دهدا، گوێم لىٚ بوو، لهكاتى وتارهكهدا، لهسهر دوانگه**

دەیگوت: ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ یەکتریدا، لەپاڵ یەکتریدا دابنێین، لەسەر شێوەی ڕیزکردنی حەزرەتی جوبرائیل، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا فێری ئەوەی کردووین و ئیمامی عوثمان لە موصحەفی عوسمانیدا چەسپاندوویەتی، بەلاّم مەڵێن: سوورەتی بەقەرە، واتە سوورەتی چێل، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کە باسی مانگای تیادا کراوە، هەروا مەڵێن: سوورەتی نیساء، واتە: سوورەتی ژنان، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کەباسی ژنانی واتیادا، هەروا سوورەتی ئالی عیمران.

ئەعمەش (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جاکاتێ بەخزمەتی ئیبراهیمی نەخەعی گەیشتم، قسەکەی حەجاجم بۆ گێڕایەوە، ئەویش جمێنی بەحەجاج دا، چونکە زۆردارو ستەمکار بوو، ئەوجا فەرمووی: عەبدولڕەحمانی کوڕی یەزید، قسەی بۆ کردووم، فەرمووی: لە خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودا چووم بۆ حەج، کاتێ چووین بۆ ڕەجمی کۆگا بەردەکەی عەقەبە، لەناو شیوەکەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، لەتەنیشتی کۆگا بەردەکەوە، بەردی فڕێ دەدا بۆی، حەوت بەردی بەرودوای تی گرت، لەگەڵ هەموو بەردێکا ئەڵڵاهوئەکبەری دەکرد.

عەبدولڕەحمان فەرمووی: عەرزی ئیبنو مەسعوودم کرد: ئەی باوکی عەبدولڕەحمان! هەندێ کەس لەلای سەروی شیوەکەوە بەردی بۆ فڕێ دەدەن؟

ئیبنو مەسعوودیش فەرمووی: بەخودای تاك و تەنیا، ئا ئەم جێگەیە، کە من ڕەجمی شەیتانم لێیەوە کرد، ئەو جێگەیەیە کە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەجمی شەیتانی لێیەوە کردووە، لەکاتی حەجەکەیدا، کەسوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە، کە ئەو سوورەتەیە زۆربەی یاساو دەستوورەکانی حەج و عەمرەی واتیادا. کەواتە: دروستە بگوترێ: سوورەتی بەقەرە، یان سوورەتی نیساء...تاد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ١٥٩١}.

**(ڕوونکردنەوە):**

ئیمامی ئەعمەش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی سولەیمانی کوڕی میهرانە، کەسناوی (واتە: کونیەی) ئەبو موحەممەدە، لەبنەڕەتدا خەڵکی (طبرستان)ە، لەگوندێکی ئەوێ لەدایك بووە، کە ئەو گوندە ناوی (دوباوەندە).

چوار هەزار فەرموودەی هەیە، کتێبی نەبوو، هەمووی لەبەر بوو، زۆر فەصیحو زمانپاراوو ڕەوانبێژ بوو، هەرگیز لەحنی نەدەکرد، لەحن ئەوەیە کەقسە بەعەرەبی نافەصیح بکەی، یا هەڵەی زمانەوانی لە گوفتوگۆدا بکەی، کاتێ بەعەرەبی قسە دەکەی!

پێشەوا ئەعمەش ئیمامی ئەنەسی دیوە، لەمەککەو لەواسیط لەو کاتەدا ئەنەس نوێژی کردووە، لەشەستی کۆچیدا لەدایك بووە.

بەڵام ڕاجیایی هەیە لەوەدا، کە فەرموودەی لەوەوە گێڕابێتەوە یان نا.

کەواتە: پێشەوا ئەعمەش تابیعییەو لەپەیڕەوانە، تابیعی بەو موسوڵمانە دەگوترێ کە لەچینی دووەمی موسوڵمانان بێ، پێغەمبەری نەدیبێ، بەڵام هاوەڵی پێغەمبەری دیبێ. بەکوردی بەتابیعین دەگوترێ: شوێکەوتوان، یان پەیڕەوان.

ئەعمەش ئەم زاتانە مامۆستای بوون، واتە: شێخی بوون، شێخی ڕاوی، یان شێخی موحەددیث، ئەو کەسەیە کە فەقێکە، یان راویەکە، یان موحەددیثەکە، فەرموودەی لێ وەردەگرێو کەسێ تر لەنێوانی ئەوو شاگردەکەدا نییە، وەك ئەم نموونەیە:

١- بوخاری.

٢- ئەبو وەلید.

٣- شوعبە.

٤- ئەعمەش.

٥- ئیبراهیم.

٦- عەلقەمە.

٧- ئیبنو مەسعوود، لەم ڕشتە حەوتینەدا: بوخاری شاگردو فەقێی ئەبو وەلیدە، ئەبو وەلید شێخو مامۆستای بوخارییە، شوعبە مامۆستای مامۆستاکەی بوخارییە، واتە: شێخی شێخەکەیەتی، وە هەروەها پیاوانی تری ڕشتەکە، هەتا سەر ئیبنو مەسعوود. ئەعمەش فەرموودەی لەم زاتانە وەرگرتووە: ئەبو وائیلو مەعروورو موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعیو تەیمیو شەعبی، ئەم زاتانەو خەڵکێکی زۆری تریش شێخی ئەعمەش بوونو مامۆستای ڕاستەوخۆی بوون. کۆمەڵێ مامۆستاو فەرموودەزانی گەورە گەورەیش فەقێو شاگردی ئیمامی ئەعمەش بوون، ڕاستەوخۆ فەرموودەیان لەدەمی ئەعمەش وەرگرتووە، وەك: سوبەیعیو ئیبراهیمی تەیمیو ثەوریو شوعبەو یەحیای کوڕی قەطانو سوفیانی کوڕی عویەینە. ئەبو حەنیفە ریوایەتی لە ئەعمەشەوە هەیە.

یەحیای کوڕی قەططان دەفەرموێ: (ئەعمەش سۆفیلکەیەکی وەها بوو، بەردەوام لەریزی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا ئامادە بوو، زانایەکی پایە بەرزی ئیسلام بوو).

وەکیع دەفەرموێ: (ئەعمەش نزیکەی حەفتا ساڵ ئەڵڵاهوئەکبەری یەکەمی جەماعەتی نەفەوتاوە!).

شوعبە پێی دەگوت: (موصحەف!) واتە: وەك موصحەف ڕاستو بێ گەردە، ناسراو بوو بە: (سَيِّدُ المحَدِثِين) واتە: گەورەی فەرموودەزانەکان، بۆنی شیعەیی لێ دەهات، جاروبار تەدلیسی دەکرد، ئەعمەش موفتی سەردەمی خۆی بوو، پیاوێکی هەژاری کەم دەستی سابیری زاهیدی واریعی بێ هەوابوو، گوێی بەدونیا نەدەدا، زۆر بەقنیات بوو، قەت دەرماڵی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار نەدەچوو، بۆ ئیشی دونیای پیاوێکی خاوەن وەرعو تەقوا، زانا بەقورئانو سوننەت، دوورەپارێز لەدەسەڵاتو دەسەڵاتداران بوو، زانایەکی فەرائیززان بوو.

ئیبنولمەدینی دەفەرموێ: (ئەم شەش كەسە عیلم‌و زانستیان بۆ ئومەتی موحەممەد لەفەوتان پاراست).

١- عەمری كوڕی دینار، لەمەككە.

٢- ئیمامی زوهری لەمەدینە.

٣ - ٤ ئەبو ئیسحاقی سوبەیعی‌و ئەعمەش لەكووفە.

٥ -٦ قەتادەو یەحیای كوڕی ئەبو كەثیر لەبەصرە.

ئیمامی ئەعمەش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەساڵی شەستی كۆچیدا لەدایك بووە، لەسەدو چل‌و هەشتدا مردووە، هەشتاو هەشت ساڵ ژیاوە، ڕاجیایی هەیە لەساڵی لەدایكبوونی‌و مردنیدا، مامۆستا فەرموودەزانە گەورەكان، كەناسراون بە (الجماعە) فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، لەپەڕاوی (تهذیب التهذیب)دا، دانراوی ئیبنولحەجەری عەسقەلانی، هێمای (ع - سلیمان)ی بۆ دانراوە، واتە: سولەیمانی كوڕی مەهران، كەناسراوە بە ئەعمەش، لەپیاوانی ئەم شەش پەڕاوەیە، كە ناسراون بە:

١- صحیح البخاری.

٢- صحیح مسلم.

٣- سنن أبی داود.

٤- جامع الترمذی.

٥- المجتبی للنسائی.

٦- ئیبنو ماجە.

ئیمامی ئەعمەش لەگەڵ ئەو هەموو شكۆمەندی‌و زانستەدا كە هەیبوو جاروبار سوعبەتی دەكرد، جارێ جۆلاییی لێی پرسی: نوێژ لەپشتی جۆلانەوە چۆن دەبینی؟ گوتی: قەیدی نییە، ئەگەر بەبێ دەسنوێژ بێ!

٧٨٠- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {رَمَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) اَلْجَمْرَةَ يَوْمَ اَلنَّحْرِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ فَإِذَا زَالَتِ اَلشَّمْسُ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٧٢٦ = ٣١٢٨ شیحا = مسلم/١٢٩٩. بوخاری/٣٠٦٥. أبو داود. حج: ١٩٧١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانـدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ شەیتانی جەمرەتولعەقەبەی بەردەباران کرد، کات چێشتەنگاو بوو، بەڵام ڕۆژەکانی تر، لەپاش نیوەڕۆ شەیتانی بەردەباران دەکرد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٣ن ژمارە: ١٥٩٣}.

٧٨١- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا {أَنَّهُ كَانَ يَرْمِي اَلْجَمْرَةَ اَلدُّنْيَا، بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عَلَى أَثَرِ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ، ثُمَّ يُسْهِلُ، فَيَقُومُ فَيَسْتَقْبِلُ اَلْقِبْلَةَ، فَيَقُومُ طَوِيلاً، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَرْمِي اَلْوُسْطَى، ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ اَلشِّمَالِ فَيُسْهِلُ، وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ اَلْقِبْلَةِ، ثُمَّ يَدْعُو فَيَرْفَعُ يَدَيْهِ وَيَقُومُ طَوِيلاً، ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ اَلْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ اَلْوَادِي وَلَا يَقِفُ عِنْدَهَا، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُولُ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَفْعَلُهُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨١٣ = ١٧٥١، ١٧٥٢، ١٧٥٣ بوخاری}:

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڕەجمی شەیتانی دەکرد، لەڕۆژی دووەمی جەژندا، لەسەر ئەم شێوەیە دەیکرد: یەکەمجار حەوت بەردی فڕێ دەدا بۆ کۆگابەردەکەی ئەولای مزگەوتەکەی میناوە، کەوا ڕێکەوتووە، لەهەموو کۆگابەردەکانی تر لەمیناوە نزیکترو لەمەککەوە دوورترە، لەپاش هەڵدانی گشت بەردێ، ئەڵڵاهوئەکبەری دەکردو دەیفەرموو:

(الله اكبر، الله اكبر، لا إله إلا الله، والله اكبر، الله اكبر ولله الحمدُ).

ئەنجا دەچووە پێشەوە هەتا دەگەیشتە دەشتایی، لەوێ بەرەو رووگە رادەوەستاو، هەردوو دەستی لەکاتی پاڕانەوەو نزاکردندا، بەرزەوە دەکرد، وە بەپێوە لەوێدا زۆر دەپاڕایەوە، ئینجا دەڕۆیشت بۆ کۆگابەردی دووەم، واتە: بۆ کۆگابەردی ناوەڕاست، (واتە: الجَمْرَةُ الوُسطى). وە حەوت بەردی تری فڕێ دەدا بۆ ئەومیلەیش، وە لەپاش تێگرتنی هەموو بەردێ ئەللّاهوئەکبەری، لەسەر شێوەی پێشوو دەکرد، ئینجا بەلای چەپا لەلای شیوەکەوە دادەپەڕی، هەتا دەگەیشتە ناو دەشتایی و لەوێ ماوەیەکی دوورو درێژ بەپێوە رادەوەستاو هەردوو دەستی بەرزەوە دەکردو زۆر نزای دەکردو دەپاڕایەوە، ئەنجا دەڕۆیشت بۆ کۆگابەردەکەی لای عەقەبە، لەناو شیوەکەوە، لەخوارەوە بۆ سەرەوە، حەوت بەردی فڕێ دەدا بۆ ئەم میلەیش، لەپاش تێگرتنی هەر بەردێ، لەسەر شێوەی پێشوو ئەللّاهوئەکبەری دەکرد، ئیتر دەگەڕایەوەو لەوێ نەدەوەستا، سالم دەیفەرموو: باوکم خۆشی ئاوای دەکرد، وە دەیفەرموو: پێغەمبەر ئاوای دەکرد. {تاج/٢، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ١٦١٤ چاپی چوارەم}.

٧٨٢- وَعَنْـهُ: {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: " اَللَّهُـمَّ ارْحَمِ اَلْمُحَلِّقِينَ " قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اَللَّهِ. قَالَ فِي اَلثَّالِثَـةِ: " وَالْمُقَـصِّرِينَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٠٨ = ١٧٢٧ بوخاری + ذمارة: ٨٠٩ = ١٧٢٨ بوخاری. پوختەی موسلیم/٧٢٩ = ٣١٣٥ صحيح مسلم بشرح النووی بترقیم الشيخ خليل مأمون شيحا = ١٣٠١. تحفة الأشراف/١٤٩٠٤}:

له پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوەی کە موسوڵمانان حاڵی بکا، کە لەپاش حەج و عەمرە، سەرتاشین خێر ترە، لە سەرکورتکردنەوە فەرمووی: (خودایە! لەو

کەسانە خۆش بە، کە لەپاش تەواو کردنی حەجو عەمرە، سەری خۆیان دەتاشن) .

یارانیش (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەجو عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان فەرموویەوە: (خودایە! لەو کەسانە خۆش بە، کە لەپاش حەجو عەمرە سەری خۆیان دەتاشن!).

دیسانەوە یارانی پێغەمبەر عەرزیان کردەوە: ئەی پیغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەجو عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ بارە فەرموویەوە: (خودایە! لەو کەسانە خۆش بە، کە لەپاش حەجو عەمرە، سەری خۆیان دەتاشن!).

هەمدیسانەوە عەرزی پێغەمبەریان کردەوە: ئەی پیغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەجو عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ ئەوجا پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دوعاو نزای لێخۆشبوونی بۆ ئەوانیش کردو فەرمووی: (خودایە! لەو کەسانەیش خۆش بە کە لەپاش حەجو عەمرە مووی سەریان کورت دەکەنەوە بۆ ئیحرام شکاندن!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٥} .

٧٨٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِوِ بْنِ اَلْعَاصِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَقَفَ فِي حَجَّةِ اَلْوَدَاعِ، فَجَعَلُوا يَسْأَلُونَهُ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَمْ أَشْعُرْ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ. قَالَ: " اِذْبَحْ وَلَا حَرَجَ " فَجَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: " اِرْمِ وَلَا حَرَجَ " فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلَا أُخِّرَ إِلَّا قَالَ: " اِفْعَلْ وَلَا حَرَجَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٧٣ = ٨٣، ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥ بوخاری. پوختەی موسلیم/٧٣١ = شیحا/٣١٤٤ = مسلم/١٣٠٦. أبو داود. حج: ٢٠١٤. ترمذی. حج: ٩١٦. تحفة الأشراف/٨٩٠٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی ماڵاوایدا، لە مینا، بەسواری وشترەکەی ژێری ڕاوەستا، هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن، لەبارەی ڕێو ڕەسمی حەجەوە، پرسیارکەرێ گوتی: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! من نەمزانی کە ڕەجمی شەیتان لەپێش ئاژەڵ سەربڕیندایە، لەبەر ئەوە ئاژەڵەکەم سەربڕی لەپێش ڕەجمی شەیتانا؟ فەرمووی: (بڕۆ ڕەجمی شەیتان بکە، قەیناکا).

فەرمووی: یەکێ تر هات گوتی: من نەمزانی کە سەربڕینی ئاژەڵی دیاری، وا لەپێش سەرتاشینەوە، لەبەر ئەوە سەرمم تاشی لەپێش سەربڕینی ئاژەڵەکەدا؟

فەرمووی: (ئاژەڵەکەت سەرببڕە قەیناکا).

عەبدوڵڵا فەرمووی: ئیتر ئەو ڕۆژە، هەرچیان لێ دەپرسی، سەبارەت بەو شتانە کەمرۆڤ لەبیری چوو بوو، یان نەیزانی بوو، ئایا پێش و پاشی خستبوو، یان شتی وا، دەمبیست لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵامیانا هەر دەیفەرموو: بیکەن، قەیناکا!. {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٦م}.

ئەمەیش گێڕانەوەکەی ئێرەیە، کە دەقی گێڕانەوەی تجریدی بوخارییە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا، لەحەجی ماڵاوایدا، لەمینا ڕاوەستا هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن، پیاوێ هات گوتی: قوربان! نەمزانی لەپێش

قوربـانی کردنـدا سـەرم تاشـی؟ فـەرمووی: قوربانییەکـەت سـەربڕە قـەیناکا. پیـاوێکی تـر هـات گـوتی: نـەمزانی لـەپێش ڕەجـم کردنـی شـەیتاندا قوربـانیم سەربڕیوە؟

فەرمووی: (ڕەجمی شەیتان بکە قەیناکا، ئیتر ئـەو ڕۆژە هەرچـیان لێـی دەپرسی، لەبارەی هەر شتێکەوە بوایە، کەپێش خرابوو بێ، یا دواخـرا بـوو بـێ، هەر دەیفەرموو: (بیکەن قەیناکا).

٧٨٤- وَعَنْ اَلْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا): {أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَحَرَ قَبْلَ أَنْ يَحْلِقَ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ بِذَلِكَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٣٦ = ١٨١١}:

میسوەری کوڕی میخرەمە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییە، کاتێ قەدەغـەکرا (واتە: ڕێگەی لێ گیرا) لەتەواو کردنی عەمرەکەی، لەسەر ئەم شێوەیە ئیحرامی شکاند: لەپێشدا وشترە دیارییەکەی خۆی سەربڕی، ئـەوجا سـەری خـۆی تاشـی، وە دەسـتووری بەهاوڕێکانیـشی دا: کـە ئـەوانیش هـەروا بکـەن، لەپێـشدا دیـاری خانەی خودا سەربڕن، ئەوسا سەریان بتاشن و ئیحرامی عەمرەکـەیان بـشکێنن. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ١٦٤٨ چاپی چوارەم}.

١- صەنعانی لە (سـبل الـسلام)دا دەفـەرموێ: جێگـەی ئـەم فەرموودەیـە باسی قەدەغەبوون و ئیحصار بووو کە لەدوواوە دێت.

٢- میسوەری کوڕی مەخرەمە، خۆی و باوکی، لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەرن، خـۆی لەهاوەڵـە بـچکۆلەکانی پێغەمبــەرە، چـونکە بـەدوو سـاڵ لـەدوای کـۆچ (هیجرەت) لەدایك بووە، لەمەککە لەدایك بووە، کە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) مرد، ئەو تەمەنی هەشت ساڵان بـوو، لـەریجالی صـەحیحەینە، واتـە: لەبوخاری و مەسلیمدا فەرموودەی هەیە، مەلایەکی شەرعزانی گەورە بـوو، زۆر بەڕێز و بەدین و دیندار بوو، لەتەمەنی (٦٣) شەست و سێ ساڵیدا، لەئابلۆقەکەی

مەککەدا، لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا، لەشەستو چواری کۆچیدا، لەکاتێکا لە مەسجیدولحەراما، لەناو حیجردا نوێژی دەکرد، بەردێ لە مەنجەنیقی گەمارۆدەرەکان بەری کەوتو شەهیدی کرد، ئیبنو زوبەیر لەحەجوون نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد. {پوختەی موسلیم/٥٧٠}.

مەخرەمەی کوڕی نەوفەل، کەباوکی ئەم میسورەیە، لە مەسلەمەی فەتحە، کە (مَسْلَمَةُ الفَتْحِ) ئەو موسوڵمانانەن کە لەکاتی رزگارکردنی مەککەدا، بۆ پاراستنی سەروسامانیان، موسوڵمان بوون، لەپاشا کە بە باشی لەئیسلام حاڵی دەبن، زۆریان موسوڵمانی باشیان لێ دەردەچێ، مەخرەمە رەگەز ناسێکی باش بوو، موسوڵمانێکی جوانی لێ دەرچوو بوو، یەکێك بوو لەو چوار پیاوەی کە عومەر ناردنی بۆ نوێژەنکردنەوەی کێلەکانی بەست (حەرەم)ی مەککە، کەخاکی حیلل، لەخاکی حەرەم (بەست) جیا دەکەنەوە، مەخرەمە ئامادەی غەزای حونەین بوو لەگەڵ سوپای ئیسلاما.

لەکۆتایی تەمەنیدا کوێر بوو بوو، دەڵێن: سەدو پازدە ساڵ ژیاوە، لەساڵی پەنجاو چواری، یان پەنجاو پێنجی کۆچیدا، لەمەدینە، لەسەردەمی موعاوییەدا مردووە. (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٧٨٥- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) {إِذَا رَمَيْتُمْ وَحَلَقْتُمْ فَقَدَ حَلَّ لَكُمْ اَلطِّيبُ وَكُلُّ شَيْءٍ إِلَّا اَلنِّسَاءَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف، الجامع/٥٢٧. أبو داود/١٩٧٨. أحمد/١٤٣/٦}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکاتێ رەجمی شەیتانی گۆگای گەورەتان تەواوکرد، کە ناوداره بە جەمرەتولعەقەبە، ئیتر ژن نەبێ، هەموو شتێکی ترتان بۆ رەوا دەبێتەوە، کەبەهۆی ئیحرام دابەستنەوە لێتان قەدەغە بووە).

(ڕوونکردنەوە):

هەندێ لەو شتانەی کەبەهۆی ئیحرامی حەج، یا عەمرە بەستنەوە، لەحاجیو عەمرەکار قەدەغە دەبن:

١- بۆنی خۆش بەکارهێنانو قژچەور کردنو موو بۆیە کردن.

٢- جوتبوون، بەهەر شێوەیێ بێ، تەنانەت لەگەڵ ئاژاڵیشدا، لەکاتی ئیحرامدا، وەك جوتبوون لەگەڵ مرۆڤدا وایەو حەرامە، ئیتر بەپێش بێ یان بەپاش جیاوازی نییە.

٣- پۆشینی جلوبەگی ئاسایی.

٤- تاشینی سەرو ریشو مووی تری لەش، یان هەڵکەندنی، یان بڕینو کورتکردنەوەی.

٥- ژنو ژنخوازیو ژن بەشوودانو ژن هێنان.

٦- لەزەت وەرگرتن لەژن، یان لەپیاو، یا لەئاژەڵ، کەمو زۆری بەمەرجێ لەزەتی نێرو مێی بێ، با نەیشگاتە ئەندازەی ڕەحەتبوونو ئاوهاتنەوەیش.

٧- ئەو شتانەی کەبەهۆی ئیحرام بەستنەوە، لەخاوەن ئیحرام حەرام دەبن، ئەوەی کە لەپێش ئیحرام بەستندا حەلاڵ بێ، لەپاش ئیحرام شکاندن حەلاڵ دەبێتەوە، ئەوەی کە لەپێش ئیحرام بەوستندا، ناڕەوا بووە لەپاش ئیحرام شکاندنیش هەر ناڕەوایە، بەلاّم لەکاتی ئیحرامدا ناڕەواترەو زیان لەحەجو عەمرەکەیشی دەدات.

٧٨٦- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَيْسَ عَلَى اَلنِّسَاءِ حَلْقٌ، وَإِنَّمَا يُقَصِّرْنَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{صحيح الجامعِ/٥٤٠٣. الصحيح المسند/٦٨٦. أبو دداود/١٩٨٥}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی ئیحرام شکاندنی حەجو عەمرەدا، ژن

سەرتاشینی لەسەر نییە، بەڵام موو کورتکردنەوەی لەسەرە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٥م چاپی چوارەم} .

٧٨٧- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا: {أَنَّ اَلْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ اَلْمُطَّلِبِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) اِسْتَأْذَنَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٨١ = ١٦٣٤، ١٧٤٣، ١٧٤٤، ١٧٤٥ بوخاری. پوختەی موسلیم/ ٧٥٠ = ٣١٦٤ شیحا = ١٣١٥ صحیح مسلم. أبو داود/١٩٥٩} :

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب (ڕەزای خودای لێ بێ) داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە ڕێگەی پێ بدا، کە شەوەکانی مینا، لەمەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بەحاجیان، ئەویش ڕێگەی ئەوەی پێدا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ١٥٩٠} .

(ڕوونکردنەوە):

١- عەبباسی کوڕی عبدالمطلب مامەی پێغەمبەرە.

٢- شەوەکانی مینا، لەکاتی حەجا پێویستە حاجی لەوێ شەو بمێنێتەوە، بریتیە لەشەوی دووەمو شەوی سێیەمی جەژنو شەوی چووارەمی جەژنیش، بۆ کەسێ دوابکەوێ.

٧٨٨- وَعَنْ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَرْخَصَ لِرُعَاةِ اَلْإِبِلِ فِي اَلْبَيْتُوتَةِ عَنْ مِنًى، يَرْمُونَ يَوْمَ اَلنَّحْرِ، ثُمَّ يَرْمُونَ اَلْغَدِ لِيَوْمَيْنِ، ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ اَلنَّفْرِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{احمد/٥/٤٥٠/٢٤١٨١. ابن ماجة/٣٠٣٧. ترمذی/٩٥٤. نسائی/٥/٢٧٣ وفي الكبرى/٤٠٦٠} :

عاصیمی کوڕی عەدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموویی: بۆمانەوەی شەو لەمینا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی شوانە وشترەکانی دەدا، کەرۆژی جەژن، ڕەجمی شەیتان بکەن، ئینجا لەپاش یەکەم ڕۆژی جەژنیش، ڕەجمی دوو ڕۆژ کۆبکەنەوەو لەیەکێ لە دوو ڕۆژەکەی پاش یەکەم ڕۆژی جەژنا، هەردوو ڕەجمەکە بکەن!.

ئەنجا لەڕۆژی چوارەما، کە لەمیناوە دەڕۆنەوە بۆ مەککە، بۆ دواجار ڕەجمی شەیتان بکەن!. {تاج/٢، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ١٦١٦} .

(ڕوونکردنەوە):

١- کەسانێ کە مەهانەی ڕەوایان هەیە، یەکەم ڕۆژی جەژن بەرد فڕێ دەدەن بۆ کۆگابەردەکەی عەقەبەو ئەوجا دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیانو بۆیان هەیە شەو لەمینا نەمێننەوە، کە شەو مانەوە لەمینا پێویستەو یەکێکە لەکردارە گرنگەکانی حەج.

٢- ڕەجمی ڕۆژی دووەمو سێیەمی جەژن کۆبکەنەوە، یا لەڕۆژی دووەما، هەردوو ڕەجمەکە بکەن، یان لەڕۆژی سێیەما بیکەن.

٣- ئەگەر پەلەشیان لە نەفر نەکرد، با لەڕۆژی چوارەما بۆ دواجار ڕەجمی شەیتان بکەنو ئیتر بەئێجگاری مینا بەجێ بهێڵن.

کورتو پوخت: (حاجی خاوەن مەهانەی ڕەوا بۆ مانەوەی شەو لە مینا، لەو ماوەیەدا، کە حاجیان شەو لە مینا دەمێننەوە، ئەو بۆ ئەوە چاوپۆشی لێ دەکرێو مەرج نییە شەو لەمینا بمێنێتەوە).

٤- دیسان کورتو پوخت: (حاجی مەهانەدار: یەکەم: چاوپۆشی لێ دەکرێ لەمانەوەی شەو لەمینا، لەشەوەکانی مینادا. دووەم: مۆڵەت دراوەکە ڕەجم پێش بخا یان پاش بخا).

٥- عاصیمی کوڕی عەدی ئەنصارییە، بەدرییە، ئوحودییە، گەرچی گوتراوە، لەکاتی غەزای بەدردا، پێغەمبەر کردی بەکارمەند لەسەر خەڵکی

قباو والعاليه. سالّی (٤٥) چلو پێنجی کۆچی لەتەمەنی (١١٥) یا لەتەمەنی (١٢٠) ساڵیدا مردووە، دەڵێن: کورتەباڵا بووە.

٧٨٩- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { خَطَبَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ اَلنَّحْرِ...} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ٦٠ = ٦٧، ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧ بوخـــاری. پوختـــەی موســـلیم/١٠٢١ = شيحا/٤٣٥٩ = مسلم/١٦٧٩. تحفة الأشراف/١١٦٨٢}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمو لە پوختەی بوخاریدا دوورو درێژەو ئاوایە، ئێمە بۆ بەهرەی پترو سوودی گشتی دەقی وەرگێڕاوی گێڕانەوەی پوختەی موسلیم ڕاگوێز دەکەین، دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) مەبەستی کورتەکارییە، بەڵام ئێستا هۆکاری پەخشو تۆمار ئاسان بووە:

ئەبو بەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو حەجەدا، کە لەپاش کۆچ کردنی، کە ناودارە بەحەجی ماڵاوایی لەڕۆژی یەکەمی جەژنی قورباندا، لەوتارێکدا فەرمووی:

(چەرخ چووەتەوە دۆخی جارانی خۆیو، زەمان هەڵسوڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەی خۆی، کە خودای گەورە ئاسمانەکانو زەوی لەسەر دروست کردو شەو ڕۆژو مانگو ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بەدوازدە مانگو هەموو مانگێ لەدوازدە مانگەی خودا کەوتۆتە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیو (نەسیئ) نەما، وە وەك سەردەمی پێغەمبەرەکان (دروودی خودا لە پێغەمبەرو لەگشت پێغەمبەرەکانی تر بێ) ئەوەی ڕەوایە بووەتەوە بەڕەواو ئەوەی ناڕەوایە بووتەوە بەناڕەوا، وە ئەو گۆڕانو دەستکاریی شەریعەتە کە لەسەردەمی نەزانیدا کرا بوون، هەموو ڕاست کرانەوە، وە ئەو مانگانە، چواریان مانگە حەرامنو خاوەن ڕێزو قەدرو نرخنو لەبەر ئەوە شەڕو شۆڕو هەروا جەنگیان زۆر تیا حەرامە، وە ئەم چوار مانگە سیانیان بەرودوانو بەشوێن یەکا دێن، کە

ناو جەژنانو نۆمینەو موحەررەمن، ئەوی تریشیان تەنیایە، کەمانگی رەجەبە، کە مەشهوورە بە رەجەبی هۆزی موضەر، لەبەر ئەوە کە هۆزی موضەر، زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن، کە دەکەوێتە نێوانی مانگی جوممادی دووەمو مانگی کوڵەمانگەوە.

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم مانگە چی مانگێکە؟). گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماوەیێ خامۆش بوو، تەنانەت خامۆشییەکەی وا درێژەی کێشا، زەینمان بۆ ئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕێو ناوێ تری لێ بنێ، بەلاّم فەرمووی: (ئەرێ ئەمە مانگی نۆمیینەی حاجیان نییە، کە حەجی تیادا دەکرێ؟) گوتمان: بەڵێ ئەوە. فەرمووی: (ئەی ئەم شارە کام شارەیە؟). گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: هەمدیسان ماوەیێ تر بێ دەنگ بوو، تەنانەت زەینمان بۆ ئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕێو ناوێکی تری لێ بنێ. فەرمووی: (ئەرێ ئەمە شاری مەککە نییە؟). گوتمان: بەڵێ خۆیەتی. فەرمووی: (ئەی ئەم رۆژە چ رۆژێکە؟). گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: دیسان ماوەیەکی تر خامۆش بوو، دیسان گومانمان بۆ ئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕێو ناوێکی تری لێ بنێ. بەلاّم فەرمووی: (دیارە کە ئەمە رۆژی جەژنی قوربانە، کە قوربانی تیادا دەکرێ) گوتمان: بەڵێ ئەوە، ئەی پێغەمبەری خودا!.

فەرمووی: (دەی باش باش بزانن، کە سەروماڵو ناموستان بەیەکتری حەرامە، وەك چۆن شکاندنی رێزی ئەم رۆژەتان حەرامە ئاوا، بەتایبەتی ئەگەر شککاندنی رێزی ئەم رۆژەتان لەو شارەتانا بێو لەم مانگەشتانا بێ!) فەرمووشی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (وە ئێوە بەزوویی دەچنەوە بەر دیوانی خودای پەروەردگارتان، یەکە یەکە پرسیارتان لێ دەکا، سەبارەت بەکاروکردەوەکانتان، جا نەکەن پاش مەرگی من بگەڕێنەوە بۆ سەر بارودۆخی

پێشینتانو پاشگەز ببنەوەو گومڕاو سەرلێ شێواو ببنـەوەو وەك جـاری جـاران ببنەوە بەهۆزی خۆ خۆرو بەشیرو تیرگەردنی یەکتری ببەڕێنن، هۆشیار بن، بـا ئامـادە بـووانی ئـەم وتـارو ڕێو ڕەسمانـە، خۆیـان لەبـەریان بکـەنو ڕەوانیـان بکەنو ئەوجا ڕایان بگەیەنن بەکەسـانێ کەئێستا لێـرە نـینو نادیـارن، هەیانـە کەهێـشتا لـەدایك نـەبوون، چـونکە ئومێـدە هەنـدێ کـەس لەوانـەی کـە ئـەم فەرموودەو فەرمایشتانەیان پێ ڕادەگەیەنرێو بـەرودوا لـەئێوەو لەچینەکانی پاش ئێوەی دەبیستن، باشتر لێیان تێ بگـەنو وەریـان بگـرن، لـەو کەسـانەی کـە بەگوێی خۆیان لەمن دەیانبیستن).

لەپاشا فەرمووی: (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) (دەی ئـەوا مـن ئـەرکی سەرشانی خۆم ڕاگەیانـد!). {ریاضـی صـالحین بـەکوردی/١، زنجیـرە: ٢٦، ژمـارە: ٢١٣}. {تاج/٢، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ١٦٠٩}.

٧٩٠- وَعَنْ سَرَّاءَ بِنْتِ نَبْهَانَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {خَطَبَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَوْمَ اَلرُّءُوسِ فَقَالَ: " أَلَيْسَ هَذَا أَوْسَطَ أَيَّامِ اَلتَّشْرِيقِ ؟ "} اَلْحَدِيثَ رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{سنن أبي داود/١٩٥٣}:

سەرڕائی کچی نەبهان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی دووەمـی جـەژنی قوربـان، کـەناودارە بـەرۆژی (يَـوْمُ الـرُّؤسِ = ڕۆژی سـەروپێ خـواردن) پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وتـارێکی بۆمـان دا، فـەرمووی: (ئەمـە باشترینی سێ ڕۆژەکەی ئەییامو تەشریقە!). تا کۆتایی فەرموودەکە.

(ڕوونکردنەوە):

سـەرڕائی کـچی نـەبهان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) لەسـەردەمی نەزانیـدا کەیبانۆی ماڵ بووە، دەڵێ: پرسیار لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کرا: چی جۆرە مارێ بکوژین؟ فەرمووی: (هەرچی بەرچنگتان کـەوت بیکـوژن، ئەوە کافرێ دەکوژن، ئەوەی ماریش بیکوژێ شەهیدە!)

٧٩١- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهَا: {طَوَافُكِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ اَلصَّفَا وَاَلْمَرْوَةِ يَكْفِيكَ لِحَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{موسـليم ژمـاره: دانـانی شـێخ مـەئموون شـیحا/٢٩٢٦ = صـحيح مسلم/١٢١١}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەپوختەی صەحیحی موسلیما، وەرگەڕاوە کوردیەکەی:

عائیـشەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵو پەیڕەوانی بێ) فـەرمووی: لەخزمـەتی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەسـاڵی حـەجی ماڵاوایـدا، کـە لەمەدینەوە دەچووین بۆ حەج، کاتێ گەیشتینە سەریف، لەوێ بێنوێژ کەوتمو سووڕی مانگانەی ژنانەم بۆ هات، وە لەچیای عەرەفە، لەبێنوێژی پاك بوومەوە، وە یەکەم ڕۆژی جەژن تەوافی ئیفاضەم ئەنجامـدا، کەپێـشی دەگـوترێ: تـەوافی روکن، هەروەك پێـشی دەگـوترێ تـەوافی زیـارە، وە هـەروەها هاتوچۆی نێـوانی صەفاو مەڕوەیشم ئەنجامدا، جا لەبەر ئەوەی کە من لەو حەجەدا قارین (واتە: جووتکار) بوومو حەجو عـەمرەم تێکـەڵ کردبـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) فـەرمووی پـێم: (ئـەم تـەوافی بـەیتو ئـەم تـەوافی نێـوانی صـەفاو مەڕوەیەت، کە لەم ڕۆژی یەکەمی جەژنەدا ئەنجامت دان، بڕێتـی حەجەکـەتو بڕێتی عەمرەکەت دەکەون!)

(ڕوونکردنەوە):

١- بۆیـە پێـی دەگـوترێ تـەوافی ئیفاضـە، چـونکە لـەپاش ئیفاضـەو خێرکردن لەميناوە بۆ مەککە ئەنجام دەدرێو بە کۆمەڵ دەجمین بـۆ خزمـەتی بەیت.

٢- بۆیه پێی دەگوترێ فەرزو روکن، چونکه بەبێ ئەو حەج یان عـەمرە دانامەزرێ، وەك لە (شرح الوجیز)دا بەدەق دەفـەرموێ: {یُسَمَّی طَوَافَ الرُّکْنِ لأَنَهُ لابُدَّ مِنْهُ فِي حُصُولِ الحَّجِ}.

٣- بۆیه پێی دەگوترێ تەوافی زیارە، چونکه حاجیان لـە میـناوە دەچـن بۆ دینیو سەردانی خانەی خودا.

٤- بۆیـه پێـشی دەگـوترێ: (طـواف الـصَّدْر) چـونکه لـەمیناوە صـدوری بۆئەکەن، واتە: دەجمێن بۆی.

٧٩٢- وَعَنِ اِبْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا" أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {لَمْ يَرْمُـلْ فِـي اَلـسَّبْعِ اَلَّـذِي أَفَـاضَ فِيـهِ} رَوَاهُ اَلْخَمْـسَةُ إِلَّـا اَلتِّرْمِـذِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أبـو داود/٢٠٠١. ابـن ماجـة/٣٠٦٠. نـسائی/فـی الکـبری/٤١٥٦. ابـن خزیمة/٢٩٤٣}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەحـەجی مالاوایـدا، لـەهیچ سـەرێ لەحـەوت سـەرەکەی تەوافی ئیفازەدا، بەلۆقەو نەرمەغار نەڕۆیشت، کەڕۆیشتن بەلۆقـەو نـەرمـەغار لەسێ جـاری پێـشینی حـەوت جارەکـەی تـەوافی قودومـا کـارێ رەوایـە. (حـاکم بەتەندروستی داناوە).

٧٩٣- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) صَلَّى اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، ثُمَّ رَقَدَ رَقْدَةً بِالْمُحَصَّبِ، ثُـمَّ رَكِـبَ إِلَـى اَلْبَيْتِ فَطَافَ بِهِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختەی بوخاری/٢، ژمارە: ٨١٥ = بوخاری/١٧٥٦، ١٧٦٤}:

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەحـەجی مالاواییدا پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە رۆژی سـێیەمی ئـەیامول

تەشریقدا، لەپاش نیوەڕۆ ڕەجمی هەرسێ شەیتانەکەی کرد، کەناودارن بەکۆگا بەردی گەورە (الجَمْرَةُ الكبرى)و بەکۆگا بەردەکەی جەمرەتول ووستاو بەکۆگا بەردی (جَمرَةُ العقبة) ئەوجا نوێژی نیوەڕۆی دواخستو ڕۆیشت هەتا گەیشتە موحەصصەب کە پانایییەکە، وا لەنێوانی میناو مەککەدا، لەوێ لە موحصصەب نوێژی نیوەڕۆو عەصری پێکەوە کرد، لەپاشا شێوانو خەوتنانیشی کردو هەرلەوێش سەرخەوێکی شکاند، ئەوجا سوار بوو ڕۆیشت بۆ بەیت، لەوێ تەوافی مالآوایی کرد. {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦١٨} .

٧٩٤- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا: {أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُ ذَلِكَ -أَيْ: اَلنُّزُولَ بِالْأَبْطَحِ- وَتَقُولُ : إِنَّمَا نَزَلَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِأَنَّهُ كَانَ مَنْزِلاً أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٧٤٨ = شیحا/٣١٥٦ = صحيح مسلم/١٣١١} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دابەزین لەڕۆژی عیلحاڕی (نەفر)دا، لە ئەبطەح سوننەت نییە، وزە عائیشە خۆی ئەوەی نەدەکرد، وە دەیفەرموو: ڕاستە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەجی مالآوایدا، لەرۆژی نەفر (عێلجاڕی)دا، لەوێ لە ئەبطەح دابەزی، بەلآم ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کەخودی دابەزین لە ئەبطەح سوننەت بێ، بەلکوو ئەوە لەبەر ئەوە بوو، کە کۆڵو باری خۆیان سوك بکەنو، بنەوبارگەو شمەکە قورسو گرانەکانیان لەوێ دابنێنو ئەوجا بڕۆن بۆ تەوافی بەیتو تەوافی مالآوایی بکەنو، بگەڕێنەوە بۆلای بنەو بارگەکایانو مەندە (باقی) شەو لەوێ بمێننەوەو دەمەو بەیان لە ئەبتەحەوە، بەکۆمەڵی پێکەوە ئێلجاڕی لێ بکەنو بجمێنو بە ئاسانی دەرچن بۆ مەدینەو بڕۆنەوە بۆ ولآتی خۆیان!.

ئەمە پوختەی ڕوونکردنەوەی شەرحو ڕاڤەنامەکانە، بۆ واتای ئەم فەرموودەیە.

٧٩٥- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {أُمِرَ اَلنَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرَ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خَفَّفَ عَنِ الْحَائِضِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٨١٤ = بوخارى/١٧٥٥، پوختەى موسليم/٧٥٣، ٧٥٤، ٧٥٥ = شيحا/٣٢٠٦، ٣٢٠٧ = صحيح مسلم/١٣٢٨}:

ئيبنو عەبباس (ڕەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: جاران موسوڵمانان كە حەجو عەمرەيان تەواو دەكرد، ئيتر بەهەر چوارلادا بڵاوەيان لێ دەكرد، هەتا پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمانى پێيان كرد، (كەس بڵاوەى لێ نەكا، هەتا تەوافى ماڵاوايى لە بەيت نەكا). بەڵام ئەوەندە هەيە بۆ ژنى بێنوێژ، بۆ بارسووكى چاوپۆشى لەتەوافى ماڵاوايى كراوە، گريمان ئەگەر نەشيكا قەيناكا.

٧٩٦- وَعَنِ اِبْنِ اَلزُّبَيْرِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلَّا اَلْمَسْجِدَ اَلْحَرَامَ ، وَصَلَاةٌ فِي اَلْمَسْجِدِ اَلْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةٍ فِي مَسْجِدِي بِمِائَةِ صَلَاةٍ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٣٨٤١. الصحيح المسند: ٥٧١. أحمد رقم: ١٦١٦٢. ابن حبان رقم: ١٦٢٠} + {تجريدى بوخارى/٢، ژمارە: ٥٨٧ = ١١٩٠ بوخارى. پوختەى موسليم/٧٨٩، ٧٩٠ = شيحا/٣٣٦١، ٣٣٦٢}:

عەبدوڵلاى كوڕى زوبەير (ڕەزاى خودا لەخۆىو لەباوكى بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (تەنيا مەسجيدول حەرامى لێ دەرچێ، يەك نوێژ لەم مزگەوتەى مندا خێرترە، لەهەزار نوێژى شوێنانى تر، وە يەك نوێژيش لە مەسجيدولحەراما خێرترە لەسەد نوێژى ئەم مزگەوتەى من). كەواتە: وەك لە تاجا دەفەرموێ: (يەك نوێژ لە مەسجيدولحەراما خێرترە لە سەد هەزار نوێژى شوێنانى تر!). {تاج/١، زنجيرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٤ چاپى چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

بۆ ژیاننامەی ئیبنو زوبەیر بڕوانە کۆتایی ژمارە: ٧٩٩ کە لەدواوە دێت، کە دوا ژمارەیە لەنامەی حەج.

## ٣٨- باسی کات بەسەرچوونو فریانەکەوتنو ڕێ لێگیران
## بابُ: الفَوَاتِ والإِحْصَارِ

٧٩٧- عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {قَدْ أُحْصِرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَحَلَقَ وَجَامَعَ نِسَاءَهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ، حَتَّى اِعْتَمَرَ عَامًا قَابِلًا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٣٤ = ١٨٠٩ بوخاری}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو موسوڵمانان لەمەدینەوە، بەرەو مەککە، لەمانگی ناو جەژناندا، کەوتنەڕێ بۆ عەمەرە کردن، بێ بڕواکانی قوڕەیش لە حودەیبییە، ڕێگەی بەیتیان لێ گرتنو لەوێ گیریان خوارد، جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەرو یارانی لەوێ ڕێگەیان پێ نەدرا کە عەمرەکەیان تەواو بکەن، لەلایەنی دوژمنەوە، ئیتر وشترە دیارییەکانیان سەربڕیو، پێغەمبەر سەری خۆشی تاشیو ئیحرامی شکاندو دروست بوو لەگەڵ ژنەکانی، وە لەساڵی ئایندەدا عەمرەی کردەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ١٦٤٤، ١٦٤٥}.

٧٩٨- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { دَخَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ اَلزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ اَلْمُطَّلِبِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي أُرِيدُ اَلْحَجَّ، وَأَنَا شَاكِيَةٌ، فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " حُجِّي وَاشْتَرِطِي: أَنَّ مَحَلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٤٩ = ٥٠٨٩ بوخاری. پوختەی موسلیم ٦٧٦ = ٢٨٩٧ شیحا = مسلم ١٢٠٧. نسائي. حج: ٢٧٦٦. ابن ماجة. مناسك: ٢٩٣٨}:

لە پوختەی موسلیما ئاوایە، بەهرەی پترە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەلیب، کە کچی مامەی پێغەمبەر بوو، چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! دەمەوی بچم بۆ حەج، بەلاّم نەخۆشی باری لەشی گران کردووم، دەترسم لەڕێ تەواو نەخۆش بکەوم جا چار چییە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بڕۆ بۆ حەجو مەرج دابنێو بڵێ: ئەی خودایە! خۆت ئاگات لەحالّمە، لەهەر شوێنێ، تۆ نەخۆشت خستم لەوێ ئیحرام دەشکێنم!!).

فەرمووی: ضوباعە چوو بۆ حەجو حەجەکەی تەواو کردو ئیحرامی نەشکاند، ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٩ = ١٥١٨م - ش/د/ت/ن}.

لەتاجو تجریدی بوخاریدا ئاوایە، وەکوو ئێرە:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی چوو بۆ سەردانی ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموطەلیب، کە ئامۆزای پێغەمبەر بوو، ضوباعە گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! دەمەوی بچم بۆ حەج، بەلاّم دەترسم لەڕێ نەخۆش بکەوم؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (بڕۆ بۆ حەجو مەرج دابنێو بڵێ: خودایە! لە هەرکوێ تۆ نەخۆشت خستم لەوێ ئیحرام دەشکێنم). ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسوەد بووو.

٧٩٩- وَعَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اَلْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { مَنْ كُسِرَ، أَوْ عُرِجَ، فَقَدَ حَلَّ وَعَلَيْهِ

اَلْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ قَالَ عِكْرِمَةُ. فَسَأَلْتُ اِبْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَا: صَدَقَ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{أبوداود: ١٨٦٢. ترمذي: ٩٤٠. نسائي/١٩٨/٥. رقم: ٢٨٦١ ابن ماجة: ٣٠٧٧. أحمد ٣/٤٥٠. حاكم ٦٤٢/١ + رقم: ١٧٧٥} + {صحيح الجامع: ٦٥٢١. الصحيح المسند: ٢٩١}:

عیكریمە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: حەججاجی كوڕی عەمری ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەسی پەكی بكەوێ، یان لەنگ ببێ، وە لەئیحرامدا بێ، ئەوە ئیحرامەكەی دەشكێو ئاژەڵی دیاری سەردەبڕێ، وە لەساڵی ئاییندەدا حەجی لەسەرە). عەكرەمە گوتی: بۆ ئەم قسەیە لە ئیبنو عەبباسو ئەبو هورەیرەم پرسی، گوتیان: حەججاج ڕاست دەكا: پێغەمبەر وای فەرمووە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ١٦٤٥ — د/ت/ن — س/ص}.

(ڕوونكردنەوە):

١- عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیری كوڕی عەوام، خوشكەزای حەزرەتی عائیشەیە، دایكی ئەسمائی كچی ئەبو بەكرە، زوبەیری باوكی پورزای پێغەمبەرە، چونكە دایكی زوبەیر كە نەنكی ئەم عەبدوڵڵایە صەفییەی كچی عەبدولموطەلیبە، كەخوشكی عەبدوڵڵای باوكی پێغەمبەرە، زوبەیر یەكێكە لەعەشەرەی موبەشەرە، كەواتە عەبدوڵڵا پورزا زای پێغەمبەرە. {بڕوانە: پوختەی موسلیم ژمارە: ١٦٤٥. ئەسماء كاتێ كۆچی كرد بۆ مەدینە سكی پڕ بوو بە عەبدوڵڵا، ساڵی (٣) سێی كۆچی عەبدوڵڵا لەدایك بووە، یەكەم شت كە چووەتە دیوی دەروونی، تفی پیرۆزی پێغەمبەر بوو، كە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بەتفی خۆی گۆشی كرد، لەگەڵ باوكیداو لەگەڵ عائیشەی پووریدا، ئامادەی جەنگی ئەل — جەمەل بووە. {بڕوانە: ریاضی صالحین/ ١٨٦/١ ژمارە: ٢٠٢}.

عەبدوڵلا زۆر مەردو دلێرو ئازاو بلیمەتو رەوانبێژو قسەزان بوو، کۆستە بوو، ڕیشو دەموچاوی مووی پێوە نەبوو، شەونوێژێکی زۆری دەکرد، زۆر بەرۆژوو دەبوو، لەساڵی شەستو چواری کۆچیدا، لەپاش مردنی موعاوییەی کوڕی یەزیدی کوڕی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، پەیمانی جێنشینی پێ درا، خەڵکانو جەماوەری حیجازو یەمەنو عێراقو خۆراسان، گوێڕایەڵی بوون، هەشت ساڵ خۆی میرحەج بوو، حەجی بە موسوڵمانان دەکرد، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ بوو بەمیوانی، عەبدوڵلا نۆساڵان بوو، لەگەڵ ئەوەیشا فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە لەبەر کردووە، (١٠) فەرموودەی لە صەحیحی بوخاریدا هەیە، یەکێکە لەچوار عەبدوڵلاکان، ئامادەی شەڕگای یەرمووك بووە، لەخزمەت باوکیدا، ئامادەی ئازادکردنی ئەفریقیاش بووە. لەپاش شەڕو شۆڕو بگرەو بەردەو کێشمە کێشمێکی زۆر، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، حەجاجی بەلەشکرێکی گەورەوە نارد بۆ سەر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، عەبدوڵلا پاش شەڕو ئابڵۆقەیەکی قورس، خۆی دایە پاڵ بەیت، بەلام حەجاج گوێی بەشتی وا نەدا، سەرەنجام لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا، لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا، عەبدوڵلا کوژرا، لەمەککە، لە هەورازێ، کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی مەککە – مەدینە، کرا بەقەد دار خورمایەکا، دوایی دایان گرتو لاشەکەیان لەناو گۆڕستانی جوولەکەکاندا تووڕدا!!

{بڕوانە: تاجی کوردی/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ چاپی چوارەم + تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢ هەتا ٣٣١٩ چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٦٠١ – مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ریاضی صالحین/١٨٦/١، ژمارە: ٢٠٢، زنجیرە: ٢٥ چاپی دووەم + تجریدی بوخاری/٣٣٦/٣، ژمارە: ١٢١٣ + پوختەی موسلیم. ژمارە: ٨، بەرگی یەکەم}.

٢- عيكريمه يەكێكه لەپياوانی صەحيحی بوخاریو صەحيحی موسليم، فەقێی ئيبنو عەبباس بووه، كۆيلەشی بووه، بەرەگەز بەربەرە، خەڵكی مەغريبه، فەرموودەی لەزۆر لەهاوڕێيان وەرگرتووه، يەكێكه لەزانا گەورەكانی سەردەمی خۆی، قورئانزانێكی چاك بووه، ئەييوبو خاليدو ئەلحەززاء فەقێی بوون، دەڵێن: گوايه له بيروباوەڕدا هەواخوای خەواريج بووه، نافيعو كەسانی تر تۆمەتی درۆيان لێ دەدا، جێگەی متمانەی بوخارييە، بەڵام موسليم بەمەرجێ فەرموودەی عيكريمە دەگێڕێتەوه، كه طاووسو سەعيدی كوڕی جوبەيری لەگەڵدا بێ، بۆرەگلەيی لەبوخاری دەكرێ لەسەر عيكريمە كە نەدەبوو حەديثی عيكريمه لەبوخاريدا بگێڕێتەوه، واتە: عيكريمە لەپياوانی مەرجی بوخارييە، بەڵام لەپياوانی مەرجی موسليم نييیە، بەڵام بەسە بۆ بەهرەوەریو سەروەريی عيكريمە كەجێگەی متمانەی پێشەوا بوخارييە، عيكريمە گەڕيدە بوو، بە وڵاتانا دەسووڕايەوه، كاتێ ئيبنو عەبباس دەمرێ، عيكريمه هێشتا ئازاد نەبوو بوو، هێشتا هەر كۆيلە بوو، عەلی كوڕی ئيبنو عەبباس دەيفرۆشێ بەخاليدی كوڕی موعاوييە، بەچوار هەزار دينارى زێڕ!. عەكرەمە پێی دەفەرموێ: (هەموو زانستو عيلمەكەی باوكتت فرۆشت بەچوار هەزار دينار!).

عەليش پەشيمان دەبێتەوەو سەوداكه هەڵدەوەشێنێتەوەو ئازادی دەكا، لەمەدينە لەتەمەنی هەشتا ساڵيدا مردووه، رەحمەتو رەزای خودای لێ بێ.

٣- پوختەی فەرموودەكانی نامەی حەج كه روكنی پێنجەمە:

١- حەج لەتەمەنا يەكجار فەرزه، هەروا عەمرەيش لەتەمەنا يەكجار فەرزه، بەڵام حەجی زۆرو عەمرەی زۆر، زۆر سوننەته بۆ هەموو موسوڵمانێ.

٢- حەج يەكێكه لەو پەرستشانەی كه مرۆڤ لەگوناه پاك دەكاتەوه، وەك ئەو رۆژەی كه لەدايك دەبێ، بەمەرجێ حەجێكی گيرا بێ.

٣- حەج كاتی تايبەتی هەيه، بەڵام عەمره كاتی تايبەتی نييه.

٤- ئـەو حەجـەی کـە حـاجی لـەگوناه پـاك دەکاتـەوە، وەك منـاڵی سـاوا، حەجی گیرا بووە، نیشانەی حەجی گیرا بوو ئەوەیە: کە رەفتاری حاجی لـەپاش حەجەکەی بەرەو باشیو خواپەرستی بڕوات، نەوەك بەرەو خراپی.

٥- رۆژی عەرەفـە رۆژی لێبـووردنی گـشتییە، رۆژووەکـەی سـوننەتە. {بڕوانـە: پوختـەی موسـلیم کۆتـایی بابـەتی حـەج کـە لـەپاش ژمـارە: ٧٩٣وە روونکراوەتەوە لە پوختەی موسلیمدا} .

٦- کەسێ لـەجیاتی کەسێکی تـر بـچێ بـۆ حـەج دروسـتە، یـا لـەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ عـەمرە دروسـتە، ئایا بـەخۆڕایی بـچێ پـارەی نـەوێ، وەك ئەوە کەسێ لەجیاتی بـاوکی یـا دایکی، یـا منـاڵی، یـا هاوسـەری خـۆی حـەج، یـا عەمرە بکا، یان کەسی بەپارە بچێ لـەباتی کەسێکی تـر بـچێ بـۆ حـەج یـان بـۆ عەمرە، لەکاتی وادا واباشە ئەم شتانە ڕەچاو بکرێ:

١- وەکیـل حـەج هـەم حـەجو هـەم عـەمرە بـۆ کەسـەکە بکـات، چـونکە عەمرەیش پێویستە وەك حەج، ئەگەر کاتەکە کاتی حەج بوو.

٢- ئەو کەسەی لەجیاتی کەسێکی تر دەچێ بۆ حەج دەبـی خـۆی حـەجی فـەرزی کردبـێ، وەك خـۆی حەججـەتول ئیـسلامی لەسـەر نـەبێ، وە هـەروەها ئەگەر لەجیاتی کەسێکی تر بچێ بۆ عـەمرە دەبـی خـۆی عـەمرەتول ئیـسلامی لەسەر نەبێ، وە هەروەها ئەو کەسەی کە حەجی فەرز، یان عەمرەی فەرزی بـۆ دەکـرێ دەبـێ خـۆی لەبـەر مەهانـەی شـەرعی نـەتوانێ بـچێ بـۆ حـەج یـان بـۆ عەمرە یان مردبێ.

٣- حـەجو عـەمرە بـۆ مـردوو دەکـرێ، بـەبێ قەیـدو مـەرج، ئـیتر حـەجو عەمرەی فەرزبێ یا سوننەت.

٤- دروستە حەج بۆ زیندوو بکرێ، با ئـەو زینـدووە خۆشـی بتوانـێ حـەج بـۆ خـۆی بکـا، وە هـەروەها عـەمرە، بەمـەرجێ ئـەو حەجـە یـا ئـەو عەمرەیـە سوننەت بێو حەججەتول ئیسلا و عەمرەتول ئیسلا نەبێ.

٥- بەشێوەی گشتی حاجیو عەمرەکار دەبێ هێمن بێ، هەمیشە لەو سەفەرە پیرۆزەدا دەم بەیادو زیکری خودا بێ، دووربێ لەقسەی پڕو پووچ.

٦- حەج جۆرە گەشتو گوزارێکە، مرۆڤ تادەتوانی سەردانی شوێنە پیرۆزو جێگە دێرینەکان بکاتو پەندو ئامۆژگاری لەم لایەنەوە وەربگرێ.

٧- گوناه لەناو بەست (حەرەم)ی مەککەو مەدینەدا، سزاکەی چەند قاتە، هەر وەك چاکەیش وەهایەو لەو دوو شوێنەدا پاداشەککەی چەند قاتە.

٨- ئەوەندەی دەکرێ حاجیو عەمرەکار، پێنج فەرزەکە، لەمەککە لە مەسجیدولحەرام بکەنو، لەمەدینە لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر بیکەن، وە بەپێی توانا بەجەماعەتیش بیانکەن.

٩- بەپێی توانا درێغیو کۆتایی لەبەخشینو خێرکردن نەکەن.

١٠- نموونەو سەرمەشقێ جوان بن بۆ خۆیانو بۆ وڵاتی خۆیان.

## ٧- نامەی کڕینو فرۆشتن
## كتاب: البيُوعِ

{بڕوانە: تجریدی بوخاری. بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٥، زنجیرە: ٢٩، لە ژمارە: ٩٣٣وە هەتا ژمارە: ١٠٠٢ + پوختەی موسلیم لە زنجیرە: ١٨وە هەتا زنجیرە: ١٩ لە ژمارە: ٩٠٨وە هەتا ژمارە: ٩٧١ + تاجول ئوصول/٢، زنجیرە: ١٤٥ هەتا زنجیرە: ١٨٥ لە ژمارە: ١٧٥٦وە هەتا ژمارە: ١٩٦٥ + فیقهی ئاسان، لاپەڕە: ٤٧١، زنجیرە: ١٨٧} .

## ٣٩- باسی مەرجەکانی کڕینو فرۆشتنو ئەو سەوداو مامەڵانەی کە ڕێگریان لێ دەکرێ لەرووی شەرعەوە

## بَابُ: شُرُطِهِ وَمَا نُهِيَ عَنْهُ

٨٠٠- عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) سُئِلَ: أَيُّ اَلْكَسْبِ أَطْيَبُ؟ قَالَ: { عَمَلُ اَلرَّجُلِ بِيَدِهِ، وَكُلُّ بَيْعٍ مَبْرُورٍ} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ١٠٣٣}:

ریفاعەی کوڕی رافیع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیار کرا: چی کەسابەتێ پاكو پوختە؟ فەرمووی: (بەری ڕەنجەشانی مرۆڤ باشترین کاسپیەتی، ئەو مامەڵەو سەودایەیش کە دروست بێو فێڵو فڕو فۆڵبڕینی تیادا نەبێ!).

٨٠١- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَقُولُ عَامَ اَلْفَتْحِ، وَهُوَ بِمَكَّةَ: {إِنَّ اَللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ اَلْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! أَرَأَيْتَ شُحُومَ اَلْمَيْتَةِ، فَإِنَّهُ تُطْلَى بِهَا اَلسُّفُنُ، وَتُدْهَنُ بِهَا اَلْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا اَلنَّاسُ؟ فَقَالَ: " لَا. هُوَ حَرَامٌ "، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عِنْدَ ذَلِكَ: " قَاتَلَ اَللَّهُ اَلْيَهُودَ، إِنَّ اَللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٩٦ = ٢٢٣٦، ٤٢٩٦، ٤٦٣٣ صەحیحی بوخاری. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم بالكوردی ژمارە: ٩٣١ = شیحا/٤٠٢٤ = مسلم ١٥٨١. ابوداود. بیوع: ٣٤٨٦. ترمذی بیوع: ١٢٩٧. نسائی. بیوع: ٤٢٦٧. تحفة الأشراف/٢٤٩٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە، لەوکاتەدا کەهێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەککە بوو، کە هێشتا نەگەڕابۆوە بۆ مەدینە، لەوکاتەدا لەخۆیم

بیست دەیفەرموو: (خوداو پێغەمبەری خودا، کڕینو فرۆشتنی مەیو ئارەقو مرداردارو بەرازو بتیان حەرامو ناڕەوا کردووە).

عەرزیکرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو: ئەی ئایا ئەوە چۆنە کە خەڵك بەزو پیوی مردارەوە بوو، کەشتیو کەوڵی پێ چەور دەکەن، تا کەشتییەکە بپارێزێ لەهەوای دەریاو کەوڵەکەیش جیڕ ببێو قایم ببێ، یا چرای پێ دەگرێنن، شتی وا دەبی یا نا؟ فەرمووی: (نابێ ئەوەیش هەر حەرامە) لەهەمان کاتدا، فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بێ) (خودا بچێ بەگژ جوولەکەکاندا، کاتێ خودای گەورەو سەروەر، بەزو پیوی مردارەوە بووی لێیان نادروستو حەرام کرد، دەچوون بەئاگر دەیان تواندەوەو پوختیان دەکردو دەیان پاڵاوتو بەڕۆنی دەیانفرۆشت، ئەوجا پارەکەیان دەخوارد).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٣ چاپی چوارەم}.

٨٠٢- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { إِذَا اِخْتَلَفَ اَلْمُتَبَايِعَانِ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ، فَالْقَوْلُ مَا يَقُولُ رَبُّ اَلسِّلْعَةِ أَوْ يَتَتَارَكَانِ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أبوداود. رقم: ٣٥١١. نسائي. رقم: ٤٦٤٨. حاكم. رقم: ٢٢٩٣. بيهقي. رقم: ١٠٥٨٦. دارقطني. رقم: ٦٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کڕیارو فرۆشیار، قسەیان یەك نەبوو، وە کەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، ئەوە یا قسەی فرۆشیار دەخوا، یا هەردوولا واز لەو سەوددایە دێنن، واتە: سەوداکە هەڵدەوەشێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ١٨٠٢}.

٨٠٣- وَعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ ثَمَنِ اَلْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ اَلْكَاهِنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{لە ژمارە: ٨٠١ دا تەخریج کراوە}:

ئـەبو مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەر بێ) نـەهی کـردوو لەبـەهای سـەگ و لـەکرێی ژنـی لەشـفرۆش و لەسەر قەڵەمانەو کرێی کوڵەنانێ. {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمـارە: ١٧٨٣ — لاپـەڕە: ٣٢٩. چاپی چوارەم} .

٨٠٤- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" { أَنَّهُ كَانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهُ قَدْ أَعْيَا. فَأَرَادَ أَنْ يُسَيِّبَهُ. قَالَ: فَلَحِقَنِي اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَدَعَا لِي، وَضَرَبَهُ، فَسَارَ سَيْراً لَمْ يَسِرْ مِثْلَهُ، قَالَ: " بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ " قُلْتُ: لَا. ثُمَّ قَالَ: " بِعْنِيهِ " فَبِعْتُهُ بِأُوقِيَّةٍ وَاشْتَرَطْتُ حُمْلَانَهُ إِلَى أَهْلِي، فَلَمَّا بَلَغْتُ أَتَيْتُهُ بِالْجَمَلِ، فَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ، ثُمَّ رَجَعْتُ فَأَرْسَلَ فِي أَثَرِي. فَقَالَ: " أَتُرَانِي مَاكَسْتُكَ لِآخُذَ جَمَلَكَ؟ خُذْ جَمَلَكَ وَدَرَاهِمَكَ. فَهُوَ لَكَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَهَذَا اَلسِّيَاقُ لِمُسْلِمٍ.

{بوخاری. استقراض: ٢٢٨٥، ٢٧١٨، ٢٩٦٧، أبوداود. بيوع: ٢٥٠٥. ترمذی. بيوع: ١٢٥٢. نسائی. بيوع: ٤٦٥١ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٧٩٩ = شیحا ٣٦٢١ + ژمارە: ٨٤٧ شیحا ٣٦٢٥ + ژمارە: ٩٦٠ = شیحا ٤٠٧٦. تجریدی بوخاری/٣ ژمارە: ٩٥١ = ٢٠٩٧، ٢٨٦١، ٤٠٥٢، ٢٤٠٦، ٢٣٠٩، ٢٧١٨، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٥، ٥٢٤٩، ٥٢٤٧، ٥٣٦٧ بوخاری + تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٥ = ٥٢٤٦، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧ بوخاری. أبوداود/جهاد/٢٧٧٨}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەت پێغەمبەردا (درودی خودایان لەسەر بێ) چووین بۆ غەزا، وشـترێکی ئاوکێـشم لەژێردا بوو، وەستا بوو، کەڵکی ڕۆیـشتنی نـەمابوو، بـە ئاسـتەم ڕێگـەی دەکـرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسـەر بـێ) لـەدواوە بـوو، پـێم گەیـشت، فـەرمووی پێم: ئەی جابیر! ئەوە وشترەکەت چییەتی؟

عەرزیم كرد: نەخۆشە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو لەدواوە تێی خوڕی نزای بۆی كرد، ئیتر وای لێ هات هەر لەپێش وشترەكانەوە دەڕۆیشت، پاش ماوەیێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەرێ وشترەكەت ئێستا چۆنە؟).

منیش عەرزیم كرد: زۆر باشە، لەپیتو فەڕو پیرۆزی تۆوە زۆر باش بووە، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (پێمی دەفرۆشیت؟). گەرچی وشتری ئاوكێشی ترمان نەبوو، لەبەر ئەوە حەزم لەفرۆشتنی نەبوو، بەڵام شەرمم لە پێغەمبەر كرد، لەبەر ئەوە گوتم: بەڵێ دەیفرۆشم، جا پێیم فرۆشت، بەمەرجێ هەتا دەچمەوە مەدینە خۆم سواری پشتی ببم.

جا عەرزی حەزرەتم كرد: قوربان! من تازە زاوام، لەبەر ئەوە حەز دەكەم زوو بگەمەوە ماڵەوە، ئەگەر مۆڵەتم بدەی، پێش دەكەومو دەڕۆم، ئەویش مۆڵەتی ئەوەی پێمدا، ئیتر پێش خەڵكەكە كەوتم بەرەو مەدینە، هەتا گەیشتمە ناوشار، لەوێ خاڵم پێ گەیشت، پرسیاری وشترەكەمی لێم كرد، منیش چیرۆكەكەیم بۆی گێڕایەوە، ئەویش لەسەر ئەوە سەرزەنشتی كرد. جابیر فەرمووی: لەوكاتەدا كە مۆڵەتم لە پێغەمبەر وەرگرت، كە پێش بكەوم لەبەر ئەوەی كە تازە زاوام، فەرمووی: (چیت هێناوە: كچ یان بێوەژن؟) عەرزیم كرد: بێوەژنم هێناوە. فەرمووی: ئەی بۆ كچێكت نەهێنا، گەمەو یاری لەگەڵدا بكەیتو گەمەو یاریت لەگەڵ بكا؟ عەرزیم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! عەبدوڵڵای باوكم كە مردو لەغەزای ئوحوددا شەهید كرا، حەوت خوشك یان نۆ خوشكی بەسەردا بەجێ هێشتم، كە هەموویان سەرو قنگ بوونو منداڵكار بوون، لەبەر ئەوە بیوەژنێكم هێنا كە كارامە بێت، ماڵو مێردی دی بێتو وەك خۆیان كوڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا بتوانێ بەجوانی پەروەردەیان بكاتو سەرپەرشتیان بكات. جابیر فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە جێو هاتەوە مەدینە وشترەکەم برد بۆی، ئەویش پارەکەی دا پێم، بەڵام لەپاشا وشترەکەشی دایەوە پێم بۆ خۆم.

٨٠٥- وَعَنْهُ قَالَ: {أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنَّا عَبْداً لَهُ عَنْ دُبُرٍ لَمْ يَكُنْ لَـهُ مَـالٌ غَيْـرُهُ. فَدَعَا بِهِ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَبَاعَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريـــد/٣، ژمـــارە: ٩٧٠ = ٢١٤١، ٢٢٣٠، ٢٣٢١، ٢٤٠٣، ٢٤١٥، ٦٧١٦، ٦٩٤٧، ٧١٨٦ بوخاری. پوختەی موسلیم/٨٨٣ = شیحا = ٢٢٨٨}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری، لەخێڵی بەنی عوزرە، کە ناوی ئەبو مەزکوور بوو، خولامێکی هەبوو، ناوی یەعقووب بوو، ئازادی کرد، بەمەرجێ لەپاش مردنی خۆی ئازاد بێ، کە بەمە لە زاراوەی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: مودبەر، واتە: پاشەمەرگ، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری نەبوو، وە داما بۆ ماڵێ، جا لە پاشا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو مەزکووری فەرموو: (ئایا دارایی ترت هەیە، بێجگە لەم کۆیلەیە؟). گوتی: (نەء، نیمە!). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلەکەی خستە سەر سەواو فەرمووی: (کێ ئەم پیاوەم لێ دەکڕێ؟).

جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلای عەدەوی لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پارەکەی هێنا بۆ پێغەمبەر لێی وەرگرتو دای بەخاوەنەکەی، کەناوی ئەبو مەزکوور بوو، لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (لە پێشا لەخۆتەوە دەست پێ بکە، ئەگەر ماڵت هەبوو، لەپێشا خێر بەخۆت بکە، جا ئەگەر لەخۆت مایەوە با بۆ خاوخێزانت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە با بۆ خزمو خوێشت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە ئەوا بەهەرچووار لادا، درێغی لەخێرکردنو سامان بەخشین مەکە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢ + زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٣٧٦}.

٨٠٦- وَعَنْ مَيْمُونَةَ زَوْجِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَرَضِيَ عَنْهَا)" {أَنَّ فَأْرَةً وَقَعَتْ فِي سَمْنٍ، فَمَاتَتْ فِيهِ، فَسُئِلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْهَا. فَقَالَ: " أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا، وَكُلُوهُ "} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/١٦٩ = ٢٣٥، ٢٣٦، ٥٥٣٨، ٥٥٣٩، ٥٥٤٠ بوخارى}:

مەیموونـەی هاوسـەری پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خـودا لەهـەموو هاوسـەرو هـاوەڵانو پـەیڕەوانی بـێ) فـەرمووی: مـشکێ دەکەوێتە ناو ڕۆنی مەییوەوە، لەناو ڕۆنەکەدا دەتۆپـێ، بـۆ ئـەوە لـە پێغەمبـەر پرسـیار دەکـەن، دەفـەرموێ: (درودی خـودای لەسـەر بـێ) (مـشکە تۆپیوەکـەو دەوروبەری فڕێ بدەنو ڕۆنی خۆتان بخۆن!).

لەگێڕانەوەیەکی تاجول ئوصولا: فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بـێ) (ئەگەر مشك كەوتە ناو ڕۆنەوە، ئەوا تەماشا بکەن: ئەگەر ڕۆنەکە مـەییو بـوو، مشکەکەو دەوروبەرەکـەی فـڕێ بـدەن، بـەڵام ئەگـەر ڕۆنەکـە شل بـوو تـوخنی مەکەون). {تاج/١، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٧٦}.

ئـەم گێڕانـەوەی تـاجول ئوصـول، زیادەکـەی ئەحمـەدو نەسـائی روون دەکاتەوەو دەقی فەرموودەی چاپی چوارەم (٨٠٧)ە کەوا لەدوا ئەم ژمارەیەوە.

٨٠٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { إِذَا وَقَعَتْ اَلْفَأْرَةُ فِي اَلسَّمْنِ، فَإِنْ كَانَ جَامِداً فَأَلْقُوهَـا وَمَـا حَوْلَهَـا، وَإِنْ كَانَ مَائِعًا فَلَا تَقْرَبُوهُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَقَدْ حَكَمَ عَلَيْهِ اَلْبُخَارِيُّ وَأَبُو حَاتِمٍ بِالْوَهْمِ.

{أحمد ٢/٢٦٥. أبوداو: ٣٨٤٢. ابن حبان: ١٣٩٣}:

لە ژمارە: (٨٠٦)دا ڕۆیشت.

٨٠٨- وَعَنْ أَبِي اَلزُّبَيْرِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرًا عَنْ ثَمَنِ اَلسِّنَّوْرِ وَالْكَلْبِ؟ فَقَالَ: {زَجَرَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَالنَّسَائِيُّ وَزَادَ: {إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ}.

{پوختەی موسلیم: ٩٣٣ = شیحا: ٣٩٩١ = مسلم ١٥٦٩}:

ئەبو زوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەجابیرم پرسی (ڕەزای خودای لێ بێ) لە بارەی بەهای سەگو بەهای پشیلەوە، حەلاڵە یان حەرامە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرزەنشتو سەرکۆنەی کەسانێ دەکا، کە شتی وا دەکەن! {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٣٠، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨١ — م. چاپی چوارەم} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٧١، ژمارە: ١٩١٨ کە ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی ڕاوو پاسی ئاژەڵو پاسی زەویو زارو مەزراو کشتوکاڵ نەبێ، هەموو ڕۆژێ دوو پارچە لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

موسلیمو بوخاری گێڕاویانەتەوە، گوتەی بوخاری ئاوایە:

(هەرکەسێ سەگێ ڕابگرێ کە سەگی پاسی ڕانو کێڵگەو ڕاو نەبێ، هەموو ڕۆژێ پارچەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

٨٠٩- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: {جَاءَتْنِي بَرِيرَةُ، فَقَالَتْ: كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي. فَقُلْتُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لِي فَعَلْتُ، فَذَهَبَتْ بَرِيرَةُ إِلَى أَهْلِهَا. فَقَالَتْ لَهُمْ" فَأَبَوْا عَلَيْهَا، فَجَاءَتْ مِنْ عِنْدِهِمْ، وَرَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) جَالِسٌ. فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ فَأَبَوْا إِلَّا أَنْ يَكُونَ اَلْوَلَاءُ لَهُمْ، فَسَمِعَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَأَخْبَرَتْ عَائِشَةُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). فَقَالَ: خُذِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ اَلْوَلَاءَ، فَإِنَّمَا اَلْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ فَفَعَلَتْ عَائِشَةُ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ

وسلّم) فِي اَلنَّاسِ خَطِيباً فَحَمِدَ اَللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ. ثُمَّ قَالَ: " أَمَّا بَعْدُ، مَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اَللَّهِ (عَزَّ وَجَلَّ) مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اَللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، قَضَاءُ اَللَّهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اَللَّهِ أَوْثَقُ، وَإِنَّمَا اَلْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ "} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَعِنْدَ مُسْلِمٍ فَقَالَ: {اِشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ اَلْوَلَاءَ}.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠، ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥ بوخاری. پوختەی موسلیم ٨٩٦ = شیحا ٣٧٥٨ = مسلم ١٥٠٤}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەریرە (ڕەزای خودای لێ بێ) هات بۆلام، گوتی: خاوەنەکانم نامەنووسی (موکاتەبە)یان لەگەڵدا کردووم لەسەر (٩) نۆ ئۆقیە، بۆ ماوەی نۆ ساڵ، کە هەر ساڵەی ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆلات کەتۆیش یارمەتییەکم بدەی، هەتا زوو ڕزگارم ببێ لەم کۆیلەییە، وە ئەوکاتە هیچ پشکێکی لەنامە نووسینەکەی جێبەجێ نەکردبوو؟!

عائیشە فەرمووی: منیش پێیم گوت: برۆ بە ئاغاکانت بڵێ: ئەگەر ئەوان ئارەزوو دەکەنو ڕازی دەبن، ئەوا من ئەو پارەیان هەموو بەیەکجار، بەنەختی بۆ دەژمێرمو یەکسەر ئازادت دەکەم، بەلام بەمەرجێ کە سەرداریی (وَلاَء = هەقداری)یەکەت بۆ من بێ، من ببم بەهەقدارت، جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاکانی، بەلام ئاغاکان بەوە ڕازی نابنو دەڵێن: سەرداریی و هەقداری هی خۆمانەو نایدەین بەکەسی تر.

جا دیسانەوە بەریرە هاتەوە بۆلامو ئەم باسوخواسەی بۆم گێڕایەوە، منیش پیاهەڵشاخام، ئەویش گوتی: سوێندم بەخودا هەر ئەوەیە کە عەرزم کردی. عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بیستو لەمنی پرسی، منیش باسەکەم عەرزی کرد، فەرمووی پێم: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکەو مەرجیش دابنێ کە سەرداریی (وەلاء) بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە

بایەخی نییە، چونکە لەڕاستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا.

منیش وام کرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەئێوارەیێ، هەڵسایەوە وتارێکی دا، سوپاس و ستایشێ کە شایانی خودا بێ کردی و ئەوجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە ئەوە بۆچی هەندێ کەس دەچێ مەرجی وا بەمەرج دەگرێ، کە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، دەی هەرکەسێ مەرجی وا بەمەرج بگرێ، لەکاتی سەوداو مامەڵەداو مەرجێ دابنێ کە بەپێی یاسانامەی خودا نەبێ، ئەوە پووچ و بەتاڵە، ئەو جۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی، ئەگەر سەد مەرجیش بێ هەموویان پووچ و بێ بایەخن، نامەی خودا لەپێشترە، مەرجی خودا پتەوترە، ئەوە بۆ هەندی پیاو لەئێوە دەڵێن: ئێمە فیسارەکەسی کۆیلە ئازاد دەکەین، بەمەرجێ کە سەرداریيەکەی بۆ خۆمان بێ، بەبی چەندو چوون سەرداریی (وەلاء) هی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، لاپەڕە: ٣٣٥، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩} . {بڕوانە: ژمارە: ١٤٥٧} .

(ڕوونکردنەوە):

١- ئۆقیەی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل درەمی زیوە.

٢- بەریرە لەپێشا. خزمەتی عائیشەی دەکرد، دوایی عائیشە کڕی و ئازادی کرد، زۆر دڵسۆزی عائیشە بوو هەتا مردن. ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا، ئەم کەرامەتە لە بەریرەوە دەگێڕێتەوە:

(عەبدولخالیقی کوڕی زەیدی کوڕی واقید، فەرمووی: باوکم گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کە ببم بەجێنشین (خەلیفە) لەمەدینە، لەخزمەتی بەیرەدا دادەنیشتم، زۆرجار پێی دەفەرمووم: ئەی عەبدولمەلیک! دەبینم چەند

ڕەوشتێکی باشت وا تیادا، لەبەر ئەوە وا هەست دەکەم کە تۆ دەبی بە جێنشین لەسەر موسوڵمانان، جا ئەگەر بوویت بەخەلیفەو جێنشین، خۆت لەخوێنڕشتنی ناڕەوا بەدوور بگرە، چونکە بۆخۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستی خودام بیست، دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوی وا هەیە دەڕوا بەرەو بەهەشت، تا دەگاتە بەردەرگاکەی‌و بەچاوی خۆی تەماشای دەکا، بەڵام لەوێ بەپاڵ دەری دەکەن‌و تەسی پێ دەکەنە دواوە، لەسەر ڕژاندنی لوێچێ خوێنی ناڕەوا، لەسەر پڕکەڵە شاخێ خوێن، کە لەدونیادا بەناڕەوا ڕژاندوویەتی!).

پێشەوا عەللامەی عەینی دەفەرموێ: بەریرە بەڕەگەز نەبەطی، یا قیبطی بووە، بەریرە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو، بەریرە ئەو بەریرەیەیە، کە لە فەرموودەی هەلاتەکەدا (لەحەدیثول ئیفاکا) ناوی هاتووەو لەسەر ڕاوێژی ئیمامی عەلی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسی پێ دەکاو دەفەرموێ: (ئەی بەریرە! هیچت لەعائیشە دیوە کە جێگەی گومان بێ؟). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٨، لاپەڕە: ٣٩٠ چاپی چوارەم + تجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەکوردی، بەرگی/٣، ژمارە: ١١٢١، لاپەڕە: ٢٠٩ چاپی یەکەم}.

٣- وەلاء: یا سەرداریی، یا هەقداریی، لەزاراوەی شەرع‌و یاسانامەی خودای گەورەدا، باوانییەکە (عوصوبە) کەهۆکەی نەمانی خاوەنیە لەکۆیلەدا، بەهۆی ئازاد بوونەوە، بەنموونە: ئەگەر کەسێ بەهەر هۆیێ، کەسێ ئازاد بکا، کۆمەڵێ مافی یاسایی، لەنێوانی ئازادکارو ئازادکراودا دروست دەبێ، هەندێ لەو مافانە پەیوەندی بەژیانەوە هەیە، هەندێکی تریان پەیوەندی بە مردنەوە هەیە.

گریمان ئازادکراو بمرێ، وە کەلەپوورگری خزمی نەبێ، ئەوە ئازادکەرەکەی هەقداریەتی‌و ئەو مارەی دەبڕێ لەشووەکەی، یان ئەگەر بمرێ

نوێـژی لەسـەر ئـەکا، وەکۆمـەڵێ مـافی تـر، کـە بـەپێی شـەرع بـۆ ئازادکـەرو ئـازادکراو دەچەسـپێ. {تـاج/٢، زنجـیرە: ٨، لاپـەڕە: ٤٣١، ژمـارە: ١٩٨٤ چـاپی چوارەم} + {ژمارە: ١٤٥٧ لەدواوە}.

٨١٠- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {نَهَى عُمَرُ عَـنْ بَيْـعِ أُمَّهَـاتِ اَلْأَوْلَادِ فَقَالَ: لَا تُبَاعُ، وَلَا تُوهَبُ، وَلَا تُورَثُ، لِيَسْتَمْتِعْ بِهَا مَا بَدَا لَهُ، فَإِذَا مَاتَ فَهِيَ حُرَّةٌ} رَوَاهُ مَالِكٌ، وَالْبَيْهَقِيُّ، وَقَالَ: رَفَعَهُ بَعْضُ اَلرُّوَاةِ، فَوَهِمَ.

{مالـك ٢/٧٧٦. بيهقـي رقـم: ٢١٥٥٨} + {صـحيح موقوفـاً: الإرواء: ١٧٧٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێشەوا عومـەر (ڕەزای خودای لێ بێ) پێشگیری دەکـرد لەفرۆشـتنی ئـوم وەلـەد، وە دەیفـەرموو: (ئـوم وەلـەد نەدەفرۆشـرێ، نەدەبەخـشرێ، نـە کەلـەپوور دەکـرێ، خاوەنەکـەی هـەتا ماوە وەك ژنی خۆی خۆشی لێ وەردەگـرێو دەچێتەلای، کاتـێ دەمـرێ یەکسەر ئەو ئوم وەلەدە ئازاد دەبێ!).

دانەر دەفـەرموێ: ئیمـامی مالیـكو ئیمـامی بەیهـەقی ئـەم فـەرموودەیان لەعومەرەوە گێڕاوەتەوە، ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: هەندێ لـەڕاوییانی ئـەم فەرموودەیە بەرزیان کردۆتـەوە بـۆ پێغەمبـەرو گوتوویانـە کـە پێغەمبـەر وای فەرمووە، بەڵام ئەمە هەڵەیەو بەسەرچوونە.

(ڕوونکردنەوە):

ئوم وەلەد واتە: کەنیزەکی دایکی مناڵ. لە یاسانامەی خودادا، ژنی کۆیلە، کەپێی دەگوترێ (ئەمەتە: کەنیزەك: کەنیز) خاوەنەکەی وەك مێردی وایە، جا لەبەر ئەوە: خاوەنەکەی وەك هاوسەری خۆی لەگەڵی جووت دەبێ، بەمـەرجێ ڕێگرێ نەبێ، ڕێگر وەك ئەوە:

١- خوشكی شیری خاوەنەكەی بێ، یا دایكی شیری خاوەنكەی بێ، یا هەر نەهێڵێكی شیریی تر هەبێ، لەكاتی وادا كە نەهێڵێ یاسایی (واتە: مانعی شەرعی) هەبوو، دروست نییە بچێتە لای.

٢- موڵكی تەواوی نەبێ، هاوبەشی تری هەبێ.

٣- وەك ئەوە كەنیزەكەكە كچی ژنی ئاغاكەی بێ.

٤- وەك ئەوە وەچەی خاوەنەكەی لەگەڵی جووت بووبێ.

٥- یا مَوطوئەی باوكو باپیری خاوەنەكەی بێ.

٦- یا مێردی هەبێ، یا خوشكی ژنی خاوەنەكەی بێ.

٧- وەك ئەوە كەنیزەكەكە لەعیددەی شەرعیدا بێ.

٨- ئەگەر دوو كەنیزەكی خوشكی یەكتری، پیاوێ خاوەنی هەردووكیان بوو، ئەگەر چووە لای یەكێكیان، ئەوی تریانی لێ حەرام دەبێ، هەتا خاوەنی لاقەكراوەكە بێ.

٩- هەر ژنێ بۆ پیاو دروست نەبێ بچێتە لای، دروست نییە كە لەززەتی پێشینەو سەرەتای جووتبوونی لێ وەربگرێ، وەك ماچ كردنو دەستبازیو مەمك گوشینو شتی تری وا.

١٠- خاوەنی كۆیلەی ژن دەتوانێ، بەپێی ئەم ڕێنماییانە لەزەت لەژنی كۆیلەی خۆی وەربگرێو بەس، ئەگەر كۆیلەكە نێرینە بوو ئەوە حەرامەو گەورەترین تاوانەو نێربازییە.

١١- خاوەن ئەگەر ژن بوو، كۆیلەی خۆی ژن بێ یا پیاو بێ حەرامە لێی، ئەگەر پیاو بوو جووتبوون لەگەڵی داوێنپیسییە، ئەگەر ژن بوو پانی بەپانییەی حەرامە.

٨١١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {كُنَّا نَبِيعُ سَرَارِيَنَا، أُمَّهَاتِ اَلْأَوْلَادِ، وَالنَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) حَيٌّ، لَا يَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{نسائی/الکبری/٥٠٢١. ابن ماجة: ٢٥١٧. دارقطنی ٤/١٣٥. ابن حبان: ٤٣٢٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ)و لەسەردەمی جێنشینی ئەبو بەکریشدا، کەنیزەکی دایکی منداڵی خۆمانمان دەفرۆشت، بەڵام کاتێ کە عومەر بوو بەجێنشین، جڵەوگیریی لێ کردین لەوە، ئیتر ئێمەیش فەرمانەکەی عومەرمان نەشکاندو وازمان لەفرۆشتنی کەنیزەکی دایکی منداڵمان هێنا. {د/ن – س/ح}.

بێژەی نەسائی: لەپێشدا ئەو کەنیزەکانەمان دەفرۆشت، کە دایکی منداڵمان بوون، وە ئەو سەردەمە پێغەمبەر خۆی لەژیاندا بوو، وە ئەوەی بەخراپ نەدەزانی، وە ڕەخنەی نەبوو لەئاستی. {تاج/٢، لاپەڕە: ٤٥٣ چاپی چوارەم، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٤}.

٨١٢- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {نَهَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عَنْ بَيْعِ فَضْلِ اَلْمَاءِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: {وَعَنْ بَيْعِ ضِرَابِ اَلْجَمَلِ}.

{پوختەی موسلیم ٩٧٩ = شیحا ٣٩٨٠ + پوختەی موسلیم ٩٨٠ = شیحا ٣٩٨٣ مسلم ١٥٦٥}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لەفرۆشتنی ئاوێ زیاد بێ لەپێداویستی خاوەنی، بەتایبەتی لەچۆڵ. لە ژمارە: (٩٨٠)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن، هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٤، ژمارە: ١٩٢٨ – ش/د/ت/ن}. بخاری

مـساقاه: ٢٥٥٣، ٢٤٥٤، ٦٩٦٣، ترمـذى. بيـوع/١٢٧٢ + تجريـدى بوخـارى/٣، ژمـاره: ١٠٠٧ = ٢٢٨٤ بوخـارى} + {تـاج/٢، زنجيره: ١٤٨، لاپـەڕە: ٣٣٣، ژمـارە: ١٧٩١ چـاپـى چوارەم}.

لەگێڕانەوەى ژمارە: (٣٩٨١) مسلم/شيحادا، دەڵێ: جابيرى كوڕى عەبدوڵلا (ڕەزاى خودايـان لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) جڵەوگيرى دەكرد لەفرۆشتنى پەڕينى نێرە وشتر).

٨١٣- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ عَسْبِ اَلْفَحْلِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژمارە: ١٠٠٧ = ٢٢٨٤ بوخارى}:

ئيبنـو عومـەر (ڕەزاى خودايـان لێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) نەهى كردووە لەكرێى پەڕينى نێر لەمێ، وەك ئەوە ئەسـپێ بپەڕێ لەماينێ، يا ماينێ لەنێرەكەرێ چاك بكرێ، وە خـاوەنى ئەسـپەكە، يـان خاوەنى نێرەكەرەكە، كرێى ئەو پەڕينە لەخاوەنى ماينەكە وەربگرێ. {تـاج/٢، زنجيرە: ١٤٨، لاپەڕە: ٣٣٣، ژمارە: ١٧٩١}.

ئيبنـو بـاز (ڕەحمـەتى خـوداى لێ بـێ) دەڵـێ: تەرمـەزى بەڕشـتەيەكى دروسـت (صحيح) دەگێڕێتـەوە: ئەنەسـى كـوڕى ماليـك (ڕەزاى خـوداى لێ بـێ) فەرمووى: پياوێ لەهۆزى كيلاب لە پێغەمبەرى پرسى: ئايا دروستە نێر بەپارە بپـەرێنرێ لـەمێ. پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) ڕێگـەى ئـەوەى پـێ نـەدا. كابراكـەيش گـوتى: ئـەى پيغەمبـەرى خـودا! ئێمـە زۆرجـار نێـر لـەمێ دەپەڕێنين، مانگـا كـەڵ دەدەيـن، مـاين لەئەسـپ چـاك دەكـەين، خـاوەن مانگـاو ماينەكە بەخششمان پێ دەدا، ئەى ئەمەيان چۆنە؟ پێغەمبەر (دروودى خـوداى لەسەر بێ) ڕێگەى بەخشش وەرگرتنى لەسەر ئەوە پێدا.

(ڕوونکردنەوە):

لـە توحفـەتول ئـەحوەذی، شـەرحی تەرمەزیـدا دەفـەرموێ: ئـەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەگەر خاوەنی ئاژەڵە مێنگەکە، دیارییـەك، یـا بەخششێ، کـە بڕیـار نـەدرابێ‌و لەپێشەوە دیـاری نـەکرابێ، بـدا بـەخاوەنی ئاژەڵە نێرەکە، ئەوە دروستە، بەمەرجێ ئەوە بەمەرج نەکیرابێ.

٨١٤- وَعَنْهُ" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَـنْ بَيْـعِ حَبَـلِ اَلْحَبَلَةِ، وَكَانَ بَيْعاً يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ: كَانَ اَلرَّجُلُ يَبْتَـاعُ اَلْجَـزُورَ إِلَـى أَنْ تُنْـتَجَ اَلنَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتَجُ اَلَّتِي فِي بَطْنِهَا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ٩٧١ = ٢١٤٣، ٢٢٥٦، ٣٨٤٣ بوخـاری. پوختەی موسلیم ٩٣٧ = ٣٧٨٩ شيحا = مسلم ١٥١٤}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەو جۆرە فرۆشتنەی کە دەبەستێ بـەزایینی بەچکەی ناوسکی وشتری ئاوسەوە! کە ئەم جۆرە فرۆشتنە لەسەردەمی نـەزانی، پێش هاتنی ئیسلامدا باو بووە، خەڵك دەیانکرد لەسەریەکێ لەم دوو شێوەیە:

یەکـەم: پیـاوێ وشـترێکی دەکـڕی، بـە بەهایـەکی دیـاری کـراوی نـەدراوی دواخراو، بەوادەی ئەوەندە کە ئەو وشترە بزێ‌و سکەکەشی گـەورە ببـێ‌و بـزێ، ئەوسا بەهاکە بدات.

دووەم: بەچکەی ئەو بەچکەیە کەوا لەسکی ئەم وشترەدا، لەتۆم کڕی بە ئەوەندەو ئەوەندە!. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٠٨}.

٨١٥- وَعَنْهُ" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلْوَلَـاءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری. عتق: ٢٥٣٤، ٦٧٥٦. پوختەی موسـلیم ٨٩٨ = ٣٧٦٧ = مـسلم ١٥٠٦. أبوداود. فرائض: ٢٩٢٥. نسائی. بيوع: ٤٦٧٣. تحفة الأشراف/٧١٨٦}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جڵـەوگیریی کـردووە لەفرۆشـتنی سـەرداریی (وەلاء)و بەخشینی بەکەسێکی تر. {تاج/٢، زنجیره: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٣ — ش/د/ت/ن}.

(ڕوونکردنەوە):

لەپێـشەوە، لـە فـەرمووده‌ی ژمـارە: (٨٠٩)دا، لەبڕگـەی (٣)ی ڕوونکردنەوەکەدا، واتای وەلاء (واتە: سەرداریی)مان ڕوون کردەوە.

٨١٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ بَيْعِ اَلْحَصَاةِ، وَعَنْ بَيْعِ اَلْغَرَرِ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٩٣٩ = شیحا ٣٧٨٧ = مسلم ١٥١٣}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیری کـردووە لەفرۆشـتنی بەردەهاوێـژ (بیـع الحَصَاةِ)و لەفرۆشتنی شـتی نـەزانراوو دەسـت نـەداو (بیـع الغَـرَر). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٩٢ — م/د/ت/ن}.

(ڕوونکردنەوە):

١- فرۆشتنی بەردەهاوێژ (بیع الحَصَاةِ) بەسێ واتا، واتاکراوە:

آ- فرۆشـیار دەڵێ: لـەم جـل‌و بەرگانـە ئـەوەیانم پێـت فرۆشـت، کـە ئـەم بەردەم تێ گرت، بەری بکەوێ.

ب- ئەم شتەم پێت فرۆشت، ئەوەنـدە سەرپـشکی‌و مـافی پەشـیمانیت بـۆ هەیە، هەتا ئەم چەوە فڕێ دەدەم.

ج- کاتێ چەوێکم گرتە ئەو شتە، ئەوە لەجیاتی گوتەی فرۆشتن.

٢- بەیعول غەرەر: ئەو جۆرە فرۆشتنەیە، بەدیمەن باشە، بەڵام وەکـی تـر کڕیـار تـەفرەو دەستەشـکێن دەکـا، بـەڵام وەکـی تـر زۆرجـار بـەزیانی کڕیـار

دەشكێتەوە، وەك فرۆشتنی شتی نەزانراوو دەست نەداو، وەك فرۆشتنی مەل بەحەواوە، یان ماسی لەچەمو دەریادا، یان شتی بزر بوو.

٨١٧- وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنِ اِشْتَرَى طَعَاماً فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم ٩٠٩ = ٣٨١١، ٣٨٢٦، ٣٨٢٢، ٣٨٢٣، ٣٨٢٤، ٣٨٢٥ مسلم شيحا = مسلم ١٥٢٨. تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٦٧ = ٢١٣٢، ٢١٣٥ فتح الباری شرح صحیح البخاری. أبوداود. بیوع. طعام: ٢١٣٥، ٣٤٩٧. ترمذی. بیوع: ١٢٩١. نسائی. بیوع: ٤٦١٢. تحفة الأشراف/٥٧٣٦}:

**پوختەی گێڕانەوەكان:**

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوكی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ خۆراكێكی لەكەسێكی تر كڕی، تا خۆی بەتەواوی وەری نەگرێ، نەی فرۆشێتەوە بەكەسێكی تر!).

ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: وادەزانم هەموو شتێكی تریش لەم لایەنەوە وەك خۆراك وایە!. {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٣ چاپی چوارەم}.

٨١٨- وَعَنْهُ قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أحمد: ٩٥٨٢. ترمذی: ١٢٣١. نسائی ٧/٢٩٥. ابن حبان: ٤٩٧٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی نەدەدا كە دوو كرداری كڕینو فرۆشتن بەیەكەوە گرێ بدرێن. {بڕوانە فەرموودەكەی دوایی بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە}.

٨١٩- وَلِأَبِي دَاوُدَ: {مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوَكَسُهُمَا، أَوْ اَلرِّبَا}.

{أبوداود: ٣٤٦١. صحیح الجامع: ٦٩٤٣، الصحيح المسند: ١٣٧٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كەسێ دوو فرۆشتن لەیەك فرۆشتندا ئەنجام

بدا، وەك ئەوە بڵێ: من ئەم خانووەت پێ دەفرۆشم بە ئەوەندە، بەو مەرجە تۆیش ئەسپەکەی خۆتم پێ بفرۆشی بە ئەوەندە، ئەوکەسەی شتی وا بکا، ئەوە حاڵ لەیەکێ لەم دوو ئەگەرە خاڵی نییە: یان دەبێ سەوداکاری وا، کەمترینەکەیان هەڵبگرێ، یاخود تووشی سوود خواردن دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٠ — د/ت: ص — واتە: ئەبو داوودو تەرمەزی گێڕاویانەتەوە، پێشەوا تەرمەزی بە تەندروستی داناوە}.

(ڕوونکردنەوە):

نموونەیێ تری ئەم بابەتە: فرۆشیار بەکڕیار دەڵێ: ئەوا ئەم بزنەم فرۆشت بەتۆ، بەحازر بە (١٠٠) دینار، بەقەرز بە (١٥٠) دینار. ئەوە یا دەبێ کەمەکە کە حازرەکەیە قەبووڵ بکا یان هەردوولا تووشی سوو خۆری دەبن.

٨٢٠- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { لَا يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ وَلَا شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ، وَلَا رِبْحُ مَا لَمْ يُضْمَنْ، وَلَا بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَالْحَاكِمُ. وَأَخْرَجَهُ فِي " عُلُومِ اَلْحَدِيثِ " مِنْ رِوَايَةِ أَبِي حَنِيفَةَ، عَنْ عَمْرٍو اَلْمَذْكُورِ بِلَفْظِ: " نَهَى عَنْ بَيْعٍ وَشَرْطٍ " وَمِنْ هَذَا اَلْوَجْهِ أَخْرَجَهُ اَلطَّبَرَانِيُّ فِي " اَلْأَوْسَطِ " وَهُوَ غَرِيبٌ.

{أبوداود: ٣٥٠٤. ترمذی: ١٢٣٤. نسائی ٧/٢٨٨/٤٦٣٠ ابن ماجة: ٢١٨٨. أحمد ٢/١٧٤. حاكم ٢/٢١. رقم: ٢١٨٥ طبرانی فی الأسط/٤٣٦١. حاكم فی علوم الحديث ص١٢٨}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دروست نییە کە قەرزو فرۆشتن ببەسترێن بەیەکەوە، وەك ئەوە شتێ بایی (١٠) دە دینار بێ خاوەنەکەی بەکڕیار بڵێ: ئەمە دەفرۆشم بەتۆ بە (٩) نۆ دینار، بەمەرجێ (٥٠) دینارم بەقەرز بدەیتێ، چونکە ئەمە بەر ئەو فەرموودەیە دەکەوێ کە

دەفەرموێ: (هەر قـەرزێ قازانجـێ ڕابكێـشێ دەبـێ بەسـوود). هـەروا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (هـەروەك دروسـت نییـە كـە لەیـەك فرۆشتندا دوو مەرج دابنرێ، وەك ئەوە فرۆشیار بەكڕیار بڵێ: ئـەم جلـەت پـێ دەفرۆشم، بەم دوو مەرجە:

یەكەم: خۆم بۆت دەدوورم.

دووەم: خۆم گازری دەكەم‌و شۆكەی دەشۆرم.

هـەروا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (هـەروەها قـازانجی فرۆشـراوێ كـە هێـشتا دەسـتەبەر نـەكرابێ دروسـت نییـە، وەك شـتێ بكڕێ‌و پێش ئەوەی وەری بگرێ، بیفرۆشێتەوە بەقازانج بەكەسێكی تر).

هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هـەروا دروسـت نییـە فرۆشـتنی شـتێ كـە هـی خـۆت نـەبێ!). هـەتا ئێـرە فەرموودەیـەكی تەندروستە: بەڵام ئەو پارچەیەی كە لەئاخیرەوەیە، حاكم لە (علوم الحديث)دا، لـە ئـەبو حەنیفـەوە، لەعـەمری كوڕی شـوعەیبەوە، لەباوكیـەوە، لەباپیرەیـەوە دەیگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) مۆڵـەتی نـەدەدا، كـە مەرجێ بەپێی یاسانامەی خودا نەبێ، لەمامەڵەی فرۆشـتندا، بەمـەرج بگیرێ. بەڵام ئەم پارچەیەی، كەلەڕێگەی ئەبو حەنیفـەوە، لەعـەمری نـاوبراوەوە ئـەم گێڕانەوەی ئـەم فەرموودەیـە: (نـامۆو غەریبـە). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمـارە: ١٨١١} . بڕوانـە: ژمـارە: (٨٠٩) كـە لەپێـشەوە لـەم پـەڕاوە پیرۆزەیـەدا رابـورد، نموونەكەی بەریرە، كە ئاغاكانی مەرجیان گرتبوو: كە سەرداریی (وەلائە)كـەی بۆخۆیان بێ نموونەیێ بۆ ئێرەیش.

٨٢١- وَعَنْهُ قَالَ: { نَهَى رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) عَـنْ بَيْـعِ اَلْعُرْبَانِ} رَوَاهُ مَالِكٌ، قَالَ: بَلَغَنِي عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، بِهِ.

{مالك في الموطأ (٢/٦٠٩)}:

ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (گەیشتووە بەمن، کەعەمری کوڕی شوعەیب، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەو جۆرە فرۆشتنە، کەفرۆشیار پێشەکی لەکڕیار وەربگرێ، بەمەرجێ ئەگەر کڕیار پەشیمان بۆوە لەمامەڵەکە، پێشەکییەکە بۆ فرۆشیار بێ).

٨٢٢– وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: { اِبْتَعْتُ زَيْتاً فِي اَلسُّوقِ، فَلَمَّا اِسْتَوْجَبْتُهُ لَقِيَنِي رَجُلٌ فَأَعْطَانِي بِهِ رِبْحاً حَسَناً، فَأَرَدْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى يَدِ اَلرَّجُلِ، فَأَخَذَ رَجُلٌ مِنْ خَلْفِي بِذِرَاعِي، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا هُوَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، فَقَالَ: لَا تَبِعْهُ حَيْثُ اِبْتَعْتَهُ حَتَّى تَحُوزَهُ إِلَى رَحْلِكَ" فَإِنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) نَهَى أَنْ تُبَاعَ اَلسِّلَعُ حَيْثُ تُبْتَاعُ، حَتَّى يَحُوزَهَا اَلتُّجَّارُ إِلَى رِحَالِهِمْ } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.

{أحمد ١٩١/٥. أبوداود: ٣٤٩٩. ابن حبان: ٤٩٨٤. حاكم ٤٦/٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بڕێ ڕۆن زەیتوونم لەبازاڕ کڕی، کاتێ مسۆگەرم کردو بووبە هی من، پیاوێکم پی گەیشت قازانجێکی باشی پێیمدا، خەریکبوو دەست بنێمە ناودەستیو پێی بفرۆشمو سەوداکە کۆتایی پێ بهێنم، لەوکاتەدا کەسێ لەپشتمەوە قۆڵی گرتمو نەیهێشت گرێ بەستی فرۆشتنەکە تەواو بکەم، کە ئاوڕم دایەوە ڕوانیم کە زەیدی کوڕی پابیتە، فەرمووی: (لەو جێگەیەدا کە کڕیوتە مەیفرۆشەرەوە، هەتا وەری دەگریتو دەیبەیتەوە بۆ جێگەو ڕێگەی خۆت، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لەوە کە کڕیار کاڵا لەو جێگەیەدا بفرۆشێتەوە کە خۆی لەوێدا کڕیویەتی، بازرگانەکان کاتێ شتێ دەکڕن، کە وەری دەگرنو دەیگوێزنەوە بۆ دووکانو جێگەو ڕێگەی خۆیان ئەوسا بیفرۆشنەوە!) .

٨٢٣- وَعَنْهُ قَالَ: { قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي أَبِيعُ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ وَآخُذُ اَلدَّرَاهِمَ، وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ وَآخُذُ اَلدَّنَانِيرَ، آخُذُ هَذَا مِنْ هَذِهِ وَأُعْطِي هَذِهِ مِنْ هَذِا؟ فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسِعْرِ يَوْمِهَا مَا لَمْ تَتَفَرَّقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أبوداود: ٣٣٥٤. ترمذی: ١٤٤١. نسائی ٢٨١/٧. ابن ماجة: ٣٢٦٢. أحمد ١٣٩/٢. حاكم ٥٠/٢}:

دیسان ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من مامەڵەو سەودای وشترەکەم، لە بازاڕەکەی بەقیع، جاری وا هەیە وشترەکە دەفرۆشم بەدیناری زێڕ، بەڵام کڕیارەکە بەدرهەمیَ زیو بەهاکەم دەداتێ، جاری وایش هەیە وشترەکەی پێ دەفرۆشم بەدرەمی زیو، بەڵام بەهاکە بەدیناری زێڕ وەردەگرم، واتە: گەڵێ جار زیو لەباتی زێڕ وەردەگرمو گەڵێ جاریش زێڕ لەجیاتی زیو وەردەگرم، ئایا بڕیاری شەرعی ئەم جۆرە کڕینو فرۆشتنە چۆنەو چییە؟ حەڵاڵە یان حەرامە؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەم دوو مەرجە ئەم جۆرە سەودایە قەیدی نییەو دروستە):

یەکەم: ئەگەر زێڕت لەباتی زیو وەرگرت، یان زیوت لەجیاتی زێڕ وەرگرت، دەبێ هەم زێڕەکەو هەم زیوەکە بەنرخی ئەو ڕۆژە وەربگیرێ کە سەوداکەی تیادا ئەنجام دراوە.

دووەم: دەبێ کڕیارو فرۆشیار بەرلەوە کە لەیەکتری جیا ببنەوە، تەواوی بەهای فرۆشراوەکە وەربگیرێ لەلایەنی فرۆشیارەوە.

(ڕوونکردنەوە):

گریمان تۆ کاڵایەکت فرۆشت بەلالەحە، بەپێنج لیرەی زێڕ، ئەو ڕۆژە لیرەی زێڕ بە (دە) درەمی زیو بوو، لەپاشا ڕێککەوتن لەسەر ئەوە کە تۆ بەهای کاڵایەکە بە درەم لە لالەحە وەربگریت، لەکاتی وادا دەبێ ئەم دوو خاڵە ڕەچاو بکرێ:

خاڵی یەکەم: بەرلەوە لەیەکتری جیاببنەوە دەبێ دینارەکان بەنرخی ئەو ڕۆژە بقەبڵێنرێن بەدرەم = ٥×١٠پەنجا درەمی زیو، کە بەهای پێنج دینارەکەن.

خاڵی دووەم: دەبێ تۆ تەواوی بەهاکە لە لالەحەوە بکرێ، نابێ هیچی لەلا بمێنێ، دەنا دەبێ بەسوود (ڕیبا).

٨٢٤- وَعَنْهُ قَالَ: { نَهَى (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) عَـنِ الـنَّجْشِ } مُتَّفَـقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری ٢١٤٢، ٦٦٦٣. پوختەی موسلیم: ٩٤٠ = شیحا ٣٧٩٧ = مسلم ١٥١٦. نسائی. بیوع: ٤٥١٧. ریاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە/٣/١٥٨٠}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی کردووە لە کۆستەکۆستەو زەمی درۆ بۆ تەفرەدانی کڕیار. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٥ چاپی چوارەم}.

٨٢٥- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا)" {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) نَهَى عَنْ اَلْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَالْمُخَابَرَةِ، وَعَنْ اَلثُّنْيَا، إِلَّا أَنْ تُعْلَمَ } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اِبْنَ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{أحمد ٣/٣١٩ - ١٤٤٩١. پوختەی بوخاری ٣/٩٨٩ = ٢٢٠٧ بووخاری. أبوداود: ٣٤٠٥. ترمذی: ١٢٩٠. نسائی ٧/٣٧}:

لەتاجول ئوصولا ئاوایە: {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە موحاقەلەو لە موزابەنەو لە موعاوەو موخابەرەو لە ئیستیثنا، مەگەر موستەسناکە زانراو بێ.

٨٢٦- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) عَـنِ اَلْمُحَاقَلَـةِ، وَالْمُخَاضَـرَةِ، وَالْمُلَامَـسَةِ، وَالْمُنَابَـذَةِ، وَالْمُزَابَنَـةِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٨٩ = ٢٢٠٧ بوخاری}:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە: موحاقەلەو موخاضەرەو لە مولامەسەو مونابەذەو لەموزابەنە.

(ڕوونکردنەوە):

١- موحاقەلە واتە: قەرسیلکاری، بریتییە لەفرۆشتنی قەرسیل‌و شینایی نەدووراوە بەگەنم‌و جۆ، یان بەدانەوێڵەی تر، موخاضەرە واتە: فرۆشتنی بەروبووم‌و میوەو دانەوێڵە بەسەوزی، پێش ئەوەی کە بگەیێ، مولامەسە واتە: فرۆشتن بەدەست لێدان، مونابەذە واتە: فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەکتری، موزابەنە: بەرسیلەکاریی واتە: فرۆشتنی روتاب‌و بەرسیلەی ترێ بەسەر دارەوە، بەخورماو مێوژ، بەپێوانەیەکی دیاری کراو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٩ چاپی چوارەم} .

٢- ئەوەی کە دەفەرموێ: نەهی کردووە لە ئیستثناء مەگەر موستەسناکە زانراو بێ. مەبەست ئەوەیە کە تۆ بڵێیت: ئەوا ئەو خەرمانە، یان ئەو باخە، یا ئەو ڕانە مەڕەم فرۆشت بەتۆ هەندێکی نەبێ، ئەمە دروست نییەو گرێ بەستەکە دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر جیاکراوەکە زانراو بوو، ئەوە دروستە، وەك ئەوە بڵێ: ئەوا ئەم کۆمەڵە مەڕەم فرۆشت بەتۆ تەنها ئەو تاقە بەرانە نەبێ کەوا لەناویانا، ئەمە دروستە چونکە فرۆشراوەکە دیارە، کەهەموو کۆمەڵە مەڕەکانە بێجگە لەبەرانەکەی ناویان!.

٨٢٧– وَعَنْ طَاوُسٍ، عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { لَا تَلَقَّوْا اَلرُّكْبَانَ، وَلَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ ". قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ: " وَلَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ " قَالَ: لَا يَكُونُ لَهُ سِمْسَارًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژماره: ٩٧٤ = ٢١٥٨، ٢١٦٣، ٢٢٧٤ بوخارى. پوختەى موسليم/٩٤١ = شيحا ٣٨٠٢ = صحيح مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٥٢١}:

طاووس (رەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ئيبنو عەبباس (رەزاى خودايان لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (مەچن بەپير كاروانييەوە، كە كووتاڵو شمەك دەهێنن بۆ بازاڕ، هەتا پێش ئەوەى كە بگەنە ناو بازاڕ، كاڵاكەيان بەهەرزان لێ بكڕنو خۆتان بەگران بيفرۆشنەوە، وەشاريش شت بۆ لادێيى نەفرۆشێ).

طاووس (رەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: گوتم بە ئيبنو عەبباس قوربان! ئەوەى كە دەفەرموێ: (شاريش شت بۆ لادێيى نەفرۆشێ). واتاى چييە؟ فەرمووى: (نەبێ بەدەلاڵى). {رياض/٤، زنجيرە: ٢٥٥، ژمارە: ١٧٧٥} + {تاج/٢، زنجيرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٢، ١٨١٣}.

(ڕوونكردنەوە):

يەكێ تر لەفەقێو شاگردە ناودارەكانى عەبدوڵلاى كوڕى عەبباس، طاووسى كوڕى كيسانە، بەڕەگەز فارسە، گێڕانەوەى لەهەر چوار عەبدوڵلاكانەوە ئەنجام داوە، هەروا لە ئەبو هورەيرەو عائيشەو زەيدى كوڕى ثابيتو زەيدى كوڕى ئەرقەمەوە، لەچينى دووەمى موسوڵمانانە، كەپێيان دەگوترێ: پەيڕەوان (تابعين).

بەخزمەت پەنجا كەس لەهاوەڵانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) گەيشتووە، ئيبنو عەبباس دەيفەرموو: باوەڕم وايە كە طاووس بەهەشتيە.

ئيبنو حيببان دەيفەرموو: (طاووس يەكێكە لە خواناسەگەورەكانى خەڵكى يەمەنو يەكێكە لەگەورە پياوانى پەيڕەوان (تابعين) چل حەجى كردووە، نزاو پاڕانەوەى زۆر گيرا بوو، ئيبنو عويەينە دەفەرموێ: ئەم سێ كەسە دوورەپارێزترين كەس بوون لەدەسەڵات، ئەبو زەڕ لەسەردەمى خۆيدا،

ئەوری لەسەردەمی خۆیدا، طاووس لەسەردەمی خۆیدا. لە مەککە مردووە. عەشامات و جەماوەرێکی زۆر شوێن تەرمەکەی کەوتن، چەند بۆچوونێ سەبارەت بەمەرگی هەیە، لەدەوروبەری ساڵی سەدو شەشی کۆچیدا مردووە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری بەرگی یەکەم فەرمووده ژمارە/٨٣ = ٩٦ فتح الباری شەرحی صەحیحی بوخاری + پوختەی موسلیم ژمارە: ٦٨١، بۆ ژیاننامەی عەطای کوڕی ڕەباح کە ئەویش فەقێو شاگردی ئیبنو عەبباس بووە. (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

٨٢٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { لَا تَلَقَّوا اَلْجَلَبَ، فَمَنْ تُلُقِّيَ فَاشْتُرِيَ مِنْهُ، فَإِذَا أَتَى سَيِّدُهُ اَلسُّوقَ فَهُوَ بِالْخِيَارِ} . رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم: ٩٤١ = شیحا ٣٨٠٢ = مسلم ترقیم محمد فؤاد/١٥١٩. تجرید/٣، ژمارە: ٩٧٤ = ٢١٥٨ بوخاری}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەچن بەپیری کاروانیەوە، کە کووتاڵو شمەك دەهێنن بۆ بازاڕ، هەتا پێش ئەوەی کە بگەنە بازاڕ، کاڵاکەیان بەهەرزان لێ بکڕنو خۆتان بەگران بیفرۆشنەوە، جا ئەگەر کەسێ چوو بەپیر کاروانییەوەو شمەکی لێ کڕی، کاتێ خاوەن کاڵاکە گەیشتە ناوبازاڕو، زانی کەتاڵانفرۆشی کردووەو زۆر خەڵاتەوە، بۆی هەیە کە پەشیمان ببێتەوەو سەوداکە هەڵوەشێنێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٢ چاپی چوارەم} .

٨٢٩- وَعَنْهُ قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلَا تَنَاجَشُوا، وَلَا يَبِيعُ اَلرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلَا تُسْأَلُ اَلْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَكْفَأَ مَا فِي إِنَائِهَا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {لَا يَسُمِ اَلْمُسْلِمُ عَلَى سَوْمِ اَلْمُسْلِمِ} .

{تجريـدی بوخـاری/٣، ژمـاره: ٩٦٩ = ٢١٤٠، ٢١٤٨، ٢١٥٠، ٢١٥١، ٢١٦٠، ٢١٦٢، ٢٧٢٣، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١. شـــيحا: ٣٧٩٤، ٣٧٩٥، ٣٧٩٢}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی دەکرد: لەوەی کەشاریی ببێ بەدەڵاڵ بۆ لادێـی و شـتی بـۆ بفرۆشـێ، وە دەیفـەرموو: (کۆسـتە کۆسـتە لەیـەکتری مەکـەن، سـەودا لەسەر سەودا حەرامە، وە خوازبێنی بەسەر خوازبێنی برای خۆتانـا مەکـەن وە دروسـت نییـە بـۆ ژن کـە داوای تەڵاقـدانی خوشـکی ئـاییـنی خـۆی بکـا، تـا ئـەو بەتەڵاق بداو خۆی بەجێگەکەی شاد ببێ!) .

لەگێڕانەوەی ژمارە: (٣٧٩١ — مسلم/شیحا)دا، لە تاجدا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (سـەودا لەسـەر سـەودای بـرای ئـاییـنی خۆتـان مەکـەن، مەگەر بەمەرجێ ئەو برایەتان ڕێگەتان پێ بدا). لەگێڕانەوەی ژمـارە: (٣٧٩٢ — مسلم/شیحا)دا، ئاوایە:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (دروسـت نییـە کـە موسـوڵمان سـەودا بەسـەر سـەودای بـرای ئـاییـنی خۆیـدا بکـا). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٥٢، ژمـارە: ١٨١٤ چـاپی چوارەم} .

٨٣٠– وَعَنْ أَبِي أَيُّوبَ اَلْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ وَالِدَةٍ وَوَلَدِهَا، فَـرَّقَ اَللَّـهُ بَيْنَـهُ وَبَـيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَـاكِمُ، وَلَكِـنْ فِـي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ. وَلَهُ شَاهِدٌ.

{أحمد رقم: ٢٣٥٤٦. ترمذی رقم: ٥١٦٦. دارقطنی رقم: ٢٥٦. حـاكم رقـم: ٢٣٣٤. طبرانی رقم: ٤٠٨٠. بیهقی رقم: ١٨٠٨٩. دارقطنی رقم: ٢٥٧}:

ئـەبو ئـەییوبی ئەنـصاری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ لەدوونیادا دایك و بەچککە لەیەکتر دابڕێ و لەیەکتر دووریان بخاتەوە، خودایش لەڕۆژی قیامەتا، لەتۆڵەی ئەوەدا، ئەو کەسە دوور دەخاتەوە لەدۆست و خۆشەویستانی خۆی!). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٢٥ چاپی چوارەم}.

دانـەر (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەڵـێ: ئەحمـەدو تەرمـەزی و حـاکم گێڕاویانەتـەوە، پێـشەوا ئەحمـەد بەصـەحیحی دانـاوە، بـەڵام لەڕشـتەی ئـەم فەرموودەیەدا قسە لـەوە کـراوە کـە فەرموودەیـەکی لاوازی بـێ هێـزە، گەرچی شایەتێکی تری هەیە کە دەبێ بە بەهێز بۆی.

٨٣١– وَعَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { أَمَرَنِي رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ أَبِيعَ غُلَامَيْنِ أَخَوَيْنِ، فَبِعْتُهُمَا، فَفَرَّقْـتُ بَيْنَهُمَـا، فَـذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَـالَ: أَدْرِكْهُمَـا، فَارْتَجِعْهُمَـا، وَلَـا تَبِعْهُمَـا إِلَّـا جَمِيعًا } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، وَقَدْ صَـحَّحَهُ اِبْـنُ خُزَيْمَـةَ، وَابْـنُ اَلْجَـارُودِ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ، وَالطَّبَرَانِيُّ، وَابْنُ اَلْقَطَّانِ.

{أحمد رقم: ١٠٤٥. ابن الجارود: ٥٧٥. حـاكم ٢/٦٣. ترمـذي: ١٢٨٤. ابـن ماجة: ٢٢٤٩}:

پێـشەوا عـەلی کـوڕی ئـەبو طالیـب (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دوو خـولامی کۆیلـەی بـەدیاری داپـێم، هەردووکیان برا بوون، جا فـەرمانی پـێم کـرد، هـەردووکیانم فرۆشـت وە جیـام کردنەوە لەیەکتری، وەباسی ئەوەم کـرد بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووی پـێم: (بـڕۆ فریایـان بکـەوە، سـەوداکە هەڵوەشـێنەرەوەو وەریـان بگرەوە، ئەگەر ویستت بیانفرۆشیت بەیەکـەوە بیانفرۆشـە). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٢٦}.

٨٣٢- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { غَلَا اَلسِّعْرُ بِالْمَدِينَةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ اَلنَّاسُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! غَلَا اَلسِّعْرُ، فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِنَّ اَللَّهَ هُوَ اَلْمُسَعِّرُ، اَلْقَابِضُ، اَلْبَاسِطُ، الرَّازِقُ، وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اَللَّهَ (تَعَالَى)، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَطْلُبُنِي بِمَظْلِمَةٍ فِي دَمٍ وَلَا مَالٍ"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبوداود: ٣٤٥١. ترمذی: ١٣١٤. ابن ماجة: ٢٢٠٠. أحمد ٨٥/٣. ابن حبان: ٤٩٣٥}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەمەدینە نرخی شت گران بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا، مەردوم گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نرخی شت تەواو گران بووە، نرخی شت دانی بۆمان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا هەرخۆی نرخدانەرەو، نرخی شت دەبڕێ، وە هەر خۆی ڕۆژیدەرەو رزق و رۆژی دەدا، وەهەر خۆی رزق و رۆژی و هەموو شتی دەگرێتەوەو کەمی دەکا، یا گوشادو زۆری دەکا، وەمن ئومێد دەکەم کە هەتا دەچمەوە دیوانی خودای گەورە، کەس لەئێوە داواچی نەبێ لەسەرم، کە داوای هەقی خۆیم لێ بکا، ئیتر ئەو هەقە چ خوێن بێ چ ماڵ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ١٨٠٦ – د/ت/ن – س/ص}.

٨٣٣- وَعَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/ ٩٤٣ = شیحا ٤٠٩٨. أبوداود. بیوع: ٣٤٤٧. ترمذی. بیوع: ١٢٦٧}:

مەعمەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ شت بکڕێ و هەڵی بگرێ بۆ کاتی گرانی هەتا بەگران بیفرۆشێتەوە، ئەو کەسە هەڵەکارو تاوانبارە).

جا به سەعیدی کوڕی موسەییەبیان گوت: خۆتۆ خۆشت ئەمە دەکەیت، ئەی ئەمە چەنی بەچەندە؟ فەرمووی: مەعمەر خۆشی کە راوی ئەم فەرموودەیە، لە پێغەمبەرەوە، ئەویش ئەمەی دەکرد!. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ١٨٠٧ چاپی چوارەم}.

مەعمەری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی نافیع، قوڕەیشییە، لە موسوڵمانە دێرینەکانە، کۆچی کردووە بۆ حەبەشە، جارجارێ پێی دەڵێن: مەعمەری کوڕی ئەبو مەعمەر، فەرموودەی لەموسلیمو ئەبوداوودو تەرمەزیو ئیبنو ماجەدا هەیە. درەنگ کۆچی کرد بۆ مەدینە، دوایی لەمەدینە نیشتەجێ بوو.

٨٣٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تَصُرُّوا اَلْإِبِلَ وَالْغَنَمَ، فَمَنِ اِبْتَاعَهَا بَعْدُ فَإِنَّهُ بِخَيْرِ اَلنَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا، إِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا، وَإِنْ شَاءَ رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ}. وَفِي رِوَايَةٍ: {لَهُ، عَلَّقَهَا} اَلْبُخَارِيُّ: {رَدَّ مَعَهَا صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، لَا سَمْرَاءَ} قَالَ اَلْبُخَارِيُّ: وَالتَّمْرُ أَكْثَرُ.

{تجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٤٥، ژمارە: ٩٧٢ = ٢١٥١، ٢١٤٨ بوخاری. پوختەی موسلیم ٩٢٨ = شیحا ٣٨١٠، ٣٨١١ = ١٥١٥ مسلم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێ ما وشترێ، یان مەڕێ، یا بزنێ، یا ئاژەڵێکی شیرداری کڕی، بۆ فێڵو تەفرەدان چەند ڕۆژێ نەدۆشرا بوو، هەتا کڕیاری پێ هەڵخەڵەتێنێو وابزانێ کە بەشیرە، ئەوە لەکاتی وادا، لەپاش دۆشینی ئەو ئاژەڵە، ئەگەر کڕیار هەستی کرد خەڵەتاوەو بەفێڵەکەی زانی، ئەوە خۆی لەماوەی سێ ڕۆژدا، سەرپشکە لە یەکێ لەم دوو بڕیارە:

یەکەم: ئەگەر حەزدەکا بڕیاری دامەزراندنی کڕینو فرۆشتنەکە دەداو ئاژەڵەکە هەڵدەگرێو پێی ڕازی دەبێ.

دووەم: ئەگەر حەزیش دەکا دەیداتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، بەڵام دەبێ مەنێ خورما، نەوەك گەنم، بدا بەفرۆشیار لەجیاتی شیرەکەی. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ١٨٠٢ – ش/د/ت}.

٨٣٥– وَعَنِ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَنِ اِشْتَرَى شَاةً مَحَفَّلَةً، فَرَدَّهَا، فَلْيَرُدَّ مَعَهَا صَاعًا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بوخاری: ٢١٦٤}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرکەسێ مەڕێ، یابزنێکی کڕی، بۆ تەفرەدانی کڕیار، چەند ڕۆژێ نەدۆشرا بوو، وەدوایی نەیویستو لەکاتی پێویستدا دایەوە بەسەر فرۆشیارا، دەبێ مەنێ خۆراك لەگەڵ ئاژەڵەکەدا بدا بەفرۆشیار.

ئیسماعیلی لەم فەرموودەیە ئەمەی زیاتر کردووە: (دەبێ کڕیار مەنێ خورما لەگەڵ ئاژەڵەکەدا بدا بەخاوەنەکەی).

٨٣٦– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا ، فَقَالَ: " مَا هَذَا يَا صَاحِبَ اَلطَّعَامِ؟ " قَالَ: أَصَابَتْهُ اَلسَّمَاءُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ. فَقَالَ: أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ اَلطَّعَامِ" كَيْ يَرَاهُ اَلنَّاسُ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/ ١٢٣٥ = شیحا ٢٧٩، ٢٨٠. صحیح مسلم/١٠٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەلای کۆمەڵێ خۆراکەوە ڕابورد، دەستی پیا کرد، لەناوەوە تەڕ بوو، فەرمووی: ئەی خاوەنی خۆراك! ئەم تەڕییە چییە؟ گوتی: ئەوە باران لێی داوە، ئەی پیغەمبەری خودا! فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی نەدەبوو بیخەیتە سەرەوە، هەتا خەڵك ببینن؟ کەسێ ساختەیی‌و گزیمان لێ بکا لەئێمە نییە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٥ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە: ١٥٧٩}.

٨٣٧- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ حَبَسَ اَلْعِنَبَ أَيَّامَ اَلْقِطَافِ، حَتَّى يَبِيعَهُ مِمَّنْ يَتَّخِذُهُ خَمْراً، فَقَدَ تَقَحَّمَ اَلنَّارَ عَلَى بَصِيرَةٍ}. رَوَاهُ اَلطَّبَرَانِيُّ فِي " اَلْأَوْسَطِ " بِإِسْنَادٍ حَسَنٍ.

{أخرجه البيهقي في شعب الإيمان/ ٥/١٧ رقم: ٥٦١٨، باطِلٌ، السلسلة الضَّعِيفَةِ}:

عەبدوڵلا کوڕی بورەیده لەباوکیەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەکاتی تری ڕنیندا، تری هەڵبگرێ هەتا بیفرۆشێ بەکەسی کەبیکا بەمەیو ئارەق، ئەوە سوور خۆی دەزانێ کە دڕ بەئاگری دۆزەخ دەداو خۆی فڕێ دەداتە ناوی!).

دانەر پێشەوا، ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی حەجەری عەسقەلانی، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: تەبەرانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە (المعجم الأوسط)دا، بەڕشتەیەکی جوان گێڕاویەتەوە.

٨٣٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَضَعَّفَهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَأَبُو دَاوُدَ وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ، وَابْنُ اَلْقَطَّانِ.

{أبوداود: ٣٥٠٨. ترمذي: ١٢٨٥. نسائي ٧/٢٥٤. ژمارە: ٤٤٩٠. ابن ماجة: ٢٢٤٣. حاكم/٢/١٥. ابن الجارود/٦٢٧. ابن حبان/٤٩٢٨}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دەستکەوتی فرۆشراو بۆ کڕیارە، لەو ماوەیەدا کە لەلایەتی، لەپێش پەشیمان بوونەوەدا، لەجیاتی دەستەبەریی، چونکە کڕیار لەو ماوەیەدا زامنو دەستەبەرە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ١٨٠٤}.

٨٣٩- وَعَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنـهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَعْطَاهُ دِينَارًا يَشْتَرِي بِهِ أُضْحِيَّةً، أَوْ شَاةً، فَاشْتَرَى بِهِ شَاتَيْنِ، فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ، فَأَتَاهُ بِشَاةٍ وَدِينَارٍ، فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ، فَكَانَ لَوْ اِشْتَرَى تُرَابًا لَرَبِحَ

فِيهِ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ. وَقَدْ أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ فِي ضِمْنَ حَدِيثٍ، وَلَمْ يَسُقْ لَفْظَهُ.

{البخاري: ٣٦٤٣أحمد/١٩٥٧٣. أبوداود/٣٣٨٥. ترمذي/١٢٥٨}:

عورووەی باریقی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دینارێکی زێڕی پێیم دا، کە قوربانییەکی، یا مەڕێکی پێ بکڕم بۆی، منیش بەو دینارە دوو مەڕم کڕی، یەکێکیانم فرۆشتەوە بەدینارەکەو دینارێك و مەڕێکیشم بردەوە بۆی، ئەویش کە لەحاڵەکە حاڵی بوو، نزای بۆم کرد: کەخودای گەورە پیت و فەڕو پیرۆزیی بخاتە مامەڵەو سەودامەوە، ئیتر لەوە دوا ئەگەر خۆڵی ئاسایم بکڕیایە قازانجم دەکرد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ١٨٧٣ — د/ت/ب}.

دانەر دەفەرموێ: بوخاریش ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.

بڕوانە: تجریدی بوخاری، بەرگی چوارەم لاپەڕە/١٣٣ چاپی یەکەم ژمارە: ١٤٤٨. کەزۆر نزیکە لەم گێڕانەوەی ئێرە:

(ڕوونکردنەوە):

عورووەی باریقی (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵێکی پێغەمبەری ناودارە، ڕەوگە ماینی زۆری هەبوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەغەزاکانی شامدا بەشداری کردووە، زۆرتر فەرموودەکانی خەڵکی کووفە دەیگێڕنەوە، لە موقدمەی فتح الباریدا، دەفەرموێ: لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، لەشام دادەنیشت، دوایی پێشەوا عوثمان ناردی بۆ کووفە، فەرموودەکانی لای خەڵکی کووفە هەن، عورووە حەفتا ماینی ڕاگرتبوو بۆ غەزا، یەکەم قازی کووفە بوو. بڕوانە: تجرید/٤، ژمارە: ١٤٤٨.

٨٤٠- وَأَوْرَدَ اَلتِّرْمِذِيُّ لَهُ شَاهِداً: مِنْ حَدِيثِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ.

{سنن الترمذی/١٢٥٧}:

شایەتەکە لە تەرمەزیدا، لە ژمارە: (١٢٥٧)دا، ئاوایە:

حەكیمی كوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دینارێكی زێڕی پێم دا، كەبچم قوربانی پێ بكڕم بۆی، منیش بەو دینارە قوربانییەكم كڕی، فرۆشتمەوە بەقازانج، دینارێكم لێ قازانج كرد، جا بەو قازانجە مەڕێكی ترم كڕی بۆ قوربانی، ئەوسا مەڕە قوربانیەكەو دینارێكم بردەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (درودی خودای لەسەر بێ) (مەڕەكە بكە بە قوربانیو دینارەكەش بكە بەخێر).

٨٤١- وَعَنِ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ شِرَاءِ مَا فِي بُطُونِ اَلْأَنْعَامِ حَتَّى تَضَعَ، وَعَنْ بَيْعِ مَا فِي ضُرُوعِهَا، وَعَنْ شِرَاءِ اَلْعَبْدِ وَهُوَ آبِقٌ، وَعَنْ شِرَاءِ اَلْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ، وَعَنْ شِرَاءِ اَلصَّدَقَاتِ حَتَّى تُقْبَضَ، وَعَنْ ضَرْبَةِ اَلْغَائِصِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ، وَالْبَزَّارُ، وَالدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ابن ماجة/٢١٩٦. تيرمیذی/١٥٦٣. ضعيف، الإرواء/١٢٩٣}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی دەكرد لەم جۆرە سەودایانە:

١- كڕینی بەچكەی ناوسكی ئاژەڵ هەتا دەزێ.

٢- لەكڕینی شیری ناو گوان، مەگەر بۆ پێوانەیەكی دیاری كراو.

٣- لەكڕینی بەندەی هەڵهاتوو.

٤- لەكڕینی دەستكەوتی غەزا، هەتا دابەش نەكرێ.

٥- لەكڕینی زەكاتو سەرفیترە، هەتا خێر پێكراو وەری ئەگرێ.

٦- لەو سەودایەیش كە مەلەوان بەكەسێ دەڵێ: خۆم دەكەم بەناو ئەم ئاوەدا، بۆ دەرهێنانی مرواریو شتی وا، هەرچیم دەرهێنا لەگۆترە بۆ تۆ، بە ئەوندە پارەی دیاری كراو!.

٨٤٢- وَعَنِ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تَشْتَرُوا اَلسَّمَكَ فِي اَلْمَاءِ" فَإِنَّهُ غَرَرٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَشَارَ إِلَى أَنَّ اَلصَّوَابَ وَقْفُهُ.

{أحمد/٣٦٧٦. ضعيف، الجامع: ١٢٣١}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەئاوی چەم و گۆم و دەریاچەو دەریادا، ماسی مەکڕن، چونکە شتی وا، زۆرینەی کات، بەزیانی زۆری کڕیار دەشکێتەوەو سەردەکێشێ بۆ تەفرەدان).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەد گێڕاویەتەوەو ئاماژە دەکا بۆ ئەوە: کە قسەی ڕاست و دروست ئەوەیە: کە ئەم فەرموودەیە مەوقووف بێ لەسەر ئیبنو مەسعوود نەوەك مەرفووع بێ بۆ پێغەمبەر.

٨٤٣- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ تُبَاعَ ثَمَرَةٌ حَتَّى تُطْعَمَ، وَلَا يُبَاعَ صُوفٌ عَلَى ظَهْرٍ، وَلَا لَبَنٌ فِي ضَرْعٍ} رَوَاهُ اَلطَّبَرَانِيُّ فِي " اَلْأَوْسَطِ " وَالدَّارَقُطْنِيُّ. وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ فِي " اَلْمَرَاسِيلِ " لِعِكْرِمَةَ، وَهُوَ اَلرَّاجِحُ. وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً مَوْقُوفاً عَلَى اِبْنِ عَبَّاسٍ بِإِسْنَادٍ قَوِيٍّ، وَرَجَّحَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ.

{المعجم الأوسط للطبراني/٣٧٠٨. دارقطني/٣/١٤. بيهقي٥/٣٤٠. عبدالرزاق/٨/٦٣ رقم: ١٤٣١٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لەفرۆشتنی بەری دارو درەخت و سەوزەو شینایی هەتا پێ دەگات و بەکەڵکی خواردن دێ، نابێ خوری و موویش بەرلەوە ببڕێتەوە، بەسەرپشتی ئاژەڵەکەوە بفرۆشرێ، هەروا نابی شیریش لەگوانی ئاژەڵدا بفرۆشرێ. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٦}.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لێرەدا ئاماژە دەکا بۆ ئەمە:

١- تەبەرانی لە (المعجم الأوسط)داو دارەقوطنی، ئاوا بەمەرفووعی دەیگێڕێتەوە.

٢- ئەبوداوود بە مورسەلی عیکریمەی دائەنێ، ئەمەیش پەسەندترە.

٣- دیسان ئەبو داوود دەری هێناوەتەوە بەڕشتەیەکی بەهێزو بە مەوقووفی لەسەر ئیبنو عەبباسی دادەنێ، بەیهەقیش ئەمەی لەلا پەسەندە.

٨٤٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلْمَضَامِينِ، وَالْمَلَاقِيحِ} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ، وَفِي إِسْنَادِهِ ضَعْفٌ.

{صحيح الجامع: ٦٩٣٧، عن ابن عباس}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لەفرۆشتنی بەچکەی ناو سکی ئاژەڵو لەفرۆشتنی ئاوو تۆوی نێرێ لەپەڕین لەمێ.

٨٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً بَيْعَتَهُ، أَقَالَهُ اَللَّهُ عَثْرَتَهُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ٦٠٧١ الصحيح المسند: ١٣٦٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ چاوپۆشی لەهەڵەی موسوڵمانێ بکاو هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە، وەك ئەوە یەکێ لە سەودایەکا خەڵەتابێ، یا پەشیمان بێو بیەوێ سەوداکە هەڵوەشێنێتەوە، بەرابەرەکەیشی، کە کڕیارە یا فرۆشیارە یا هەرکەسی ترە، رازی بێو سەوداکە تێك بدەنەوە، هەرکەسی ئاوا بکا، خودایش چاوپۆشی لەو دەکاو باری لاری بۆ ڕاست دەکاتەوە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٨٢ لاپەڕە: ٣٢٩ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم باسە (٨٤٥ — ٧٩٩ = ٤٦) یەکسانە بە (٤٦) چلو شەش فەرموودە.

## ٤٠- باسی سەرپشکیو پەشیمانبوونەوە
## بَابُ: الخِيَارِ

٨٤٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {إِذَا تَبَايَعَ اَلرَّجُلَانِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا وَكَانَا جَمِيعاً، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا اَلْآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا اَلْآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ فَقَدَ وَجَبَ اَلْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا اَلْبَيْعَ فَقَدْ وَجَبَ اَلْبَيْعُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بوخاری. بیوع/٢١١٢. نسائی. بیوع/٤٤٨٣. تحفة الأشراف/٨٢٧٢. پوختەی موسلیم/٩٤٤ = شیحا ٣٨٣٣ = صحیح مسلم ترقیم محمد فؤاد/١٥٣١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاوێ شتێکی بە پیاوێکی تر فرۆشت ئەوە هەردوو لایان سەرپشکنو مافی پەشیمان بوونەوەیان بۆ هەیە، هەتا بەیەکەوەبن، تا ئەو دەمەی کە لەیەکتری جیادەبنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کرد بەسەرپشك، کە مافی سەرپشکیو پەشیمان بوونەوەی بۆ هەبێ، بۆ ماوەی سێ رۆژ، یان کەمتر، ئەوە ئەو مافەی بۆ هەیە، یا کردی بەسەرپشك کە سەوداکە هەڵبگرێو قوبوولی بکاو کەس مافی سەرپشکیو پەشیمانەبوونەوەی نەمێنێ، وە لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە سەوداکە بەتەواوی دامەزرێو کەس مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە، با بەجەستەیش لەیەکتری جیا نەبنەوە، ئەگەر کەسی شتێکی فرۆشت بەکەسێ، وە دوایی لەیەکتری جیابوونەوە وە لەو ماوەیەدا کەسیان فرۆشتنەکەی هەڵنەوەشاندەوە، وە سەرپشکیان بۆ ماوەی سێ رۆژ یا کەمتر بەمەرج نەگرت، ئەوە دیسان فرۆشتنەکە بەتەواوی دامەزراوەو مافی هەڵوەشاندنەوەو پەشیمان بوونەوەیان نامێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٨ چاپی چوارەم}.

٨٤٧- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلْبَائِعُ وَالْمُبْتَاعُ بِالْخِيَارِ حَتَّى يَتَفَرَّقَا، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَفْقَةَ خِيَارٍ، وَلَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يُفَارِقَهُ خَشْيَةَ أَنْ يَسْتَقِيلَهُ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ إِلَّا اِبْنَ مَاجَهْ، وَالدَّارَقُطْنِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ. وَفِي رِوَايَةٍ: {حَتَّى يَتَفَرَّقَا مِنْ مَكَانِهِمَا}.

{أحمد/٦٧٢١. تيرميذی/١٢٤٧. نسائی. فی الكبری/٦٠٣}:

عەمری کوڕی شوعەیب، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گشت فرۆشیارو کڕیارێ، سەوداکەیان بەتەواوی دانامەزرێو سەرپشکی دانیشگە (خیار المجلس)یان بۆ هەیە، هەتا لەیەکتری جیا دەبنەوەو یەکێکیان کۆڕی دانیشتنەکە بەجێ دەهێڵێت، ئیتر مافی خیار مجلیس بۆ کەسیان نامێنێو سەوداکە بەتەواوی لەنێوانیان دائەمەزرێ، مەگەر بۆ ماوەی سێ رۆژ یا کەمتر، مافی پەشیمان بوونەوەو سەرپشکی بەمەرج گیرابێ، ئەوە پابەندبوون بەو مافەوە مەرجەو بەجیابوونەوە لەیەکتری ئەو مافە نافەوتێ، هەروا ئەگەر بڕیاری دامەزراندنی سەوداکەیان داو رازی بوون بەوە کە خیار مجلسیش نەبێ، ئیتر سەوداکە بەتەواوی دائەمەزرێو خیارالمجلیس رۆڵو بایەخو کاریگەری نامێنێ، لەهەمان کاتدا، زۆر ناباش‌و ناپەسەندە، کە لایەکیان کۆڕی دانیشتنەکە بەجێ بهێڵێ، لەترسی ئەوە کەلایەنەکەی تر مافی خیارالمجلس بەکار بهێنێو سەوداکە هەڵوەشێنێتەوە).

(روونکردنەوە):

١- سەرپشکی (واتە: خیار) دەبێ بەدوو بەشەوە:

یەکێکیان پێی دوگوترێ خیاری مەجلیس، واتە: سەرپشکی نیشتنگا، واتە: مافی پەشیمان بوونەوە لەسەوداکە، بەمەرجێ کەهێشتا کڕیارو فرۆشیار لەیەکتری جیا نەبووبێتنەوە.

ئەوی تریان: خیاری شەرتە، واتە: بەمەرج گرتنی سەرپشکی بۆ ماوەیێ، بەمەرجێ ئەو ماوەیە لەسی رۆژی زیاتر نەبێ.

٢- سەرپشکی دانیشتگا، مافی چەسپاوی هەردوو لایانە، هەتا لەیەکتر جیادەبنەوە، کە لەیەك جیابوونەوە، ئیتر سەوداکە دادەمەزرێو سەرپشکیی نیشتنگا نامێنێ.

٣- جیابوونەوە ئەوەیە: کە هەردوولایان بەلەش کۆڕی گرێدانی سەوداکە بەجێ بهێڵنو هەریەکێکیان بەلایەکا بڕۆن، یا یەکێکیان کۆڕی دانیشتنەکە بەجێ بهێڵێ.

٨٤٨- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: ذَكَرَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي اَلْبُيُوعِ فَقَالَ: {إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: لَا خَلَابَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٣١، ژمارە: ٩٥٧ = ٢١١٧، ٢٤٠٧، ٢٩٦٤ بوخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ٩٤٦ = شیحا/٣٨٣٨ = مسلم/١٥٣٣. أبو داود. بيوع/٣٤٥٩. تیرمیذی. بيوع/١٢٤٦. نسائی. بيوع/٤٤٦٩. تحفة الأشراف/٣٤٢٧}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد: کە لە سەوداو مامەڵەدا دەخەڵەتێ، فەرمووی پێی: (کاتێ سەودای شتێ دەکەی لەکەسێ، پێی بڵێ: بەبێ فرۆفێڵو فۆڵبڕین).

جا پیاوەکە کاتێ کەشتێکی سەودا دەکرد دەیگوت: بەبێ فڵو فێڵو فۆڵبڵێن!!. چونکە پیاوەکە پس بوو، زمانی دەگرت لەقسەکردنا، پیتێکی دەکرد بەپیتێکی تر، لامی بەیێ گۆ دەکرد، لەباتی لاخیلابەتە، دەیگوت: لاخییابەتە.

{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، لاپەڕە: ٣٢٣، ژمارە: ١٧٧١}.

## ٤١- باسی سوود (ریبا)
## بابُ: الرِّبَا

٨٤٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَعَنَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) آكِلَ اَلرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: " هُمْ سَوَاءٌ "} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختـەی موسـلیم ژمـارە: ٩٥٥ = مـسلم تـرقيم الـشيخ مـأمون خليـل شيحا/٤٠٦٩. صحيح مسلم/١٥٩٨}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (ڕەزای خودایان لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) نەفرینی کردووە لەمانە: لەسوودخۆرو لە سوود وەرگرو لەو کەسە دەینووسیّو لەو کەسەیش دەبیّ بەشایەتی سەودای سوود.**

**وە پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (ئەمانە هەموویان لە تاوانباری‌و نەفرین لێکراویدا چوون یەکن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٣٩ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٧، ژمارە: ١٦١٥}.**

٨٥٠- وَلِلْبُخَارِيِّ نَحْوُهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي جُحَيْفَةَ.

{بوخاری. بيوع/٢٢٣٨}:

**لەتاجول ئوصولدا، ئەم فەرموودەیە ئاوایە:**

**ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) ڕێگەی نەداوە بەهای سەگ‌و بەهای خوێن‌و کرێی خاڵکوت وەربگیریّ، وەڕێگەی نەداوە کە ژن خاڵ بکوتیّ بۆخۆی، هەروەها ڕێگەی سوودخۆرو سوود دەری نەداوە، وە نەفرین‌و لەعنەتیشی کردووە لەوێنەگر!. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٣٧ چاپی چوارەم}.**

٨٥١- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { اَلرِّبَا ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا أَيْسَرُهَا مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ اَلرَّجُلُ أُمَّهُ، وَإِنَّ

أَرْبَى اَلرِّبَا عِرْضُ اَلرَّجُلِ اَلْمُسْلِمِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ مُخْتَصَراً، وَالْحَاكِمُ بِتَمَامِهِ وَصَحَّحَهُ.

{ابن ماجة. رقم: ٢٢٧٥. حاكم. رقم: ٢٢٥٩}:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سووخۆریی حەفتاو سێ پلەیە، ئەو پلەیان کە تاوانو گوناهەکەی لەهەموویان کەمترە، وەك ئەوە وایە پیاو زیناو داوێنپیسی لەگەڵ دایکی خۆیدا بکا، قیزەونترین سووخۆری ئەوەیە کە مرۆڤ بەناڕەوا دەم بژەنێتە ناموسی پیاوی موسوڵمان!).

٨٥٢- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تَبِيعُوا اَلذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلَّا مِثْلًا بِمِثْلٍ، وَلَا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلَا تَبِيعُوا اَلْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلَّا مِثْلًا بِمِثْلٍ، وَلَا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلَا تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِباً بِنَاجِزٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تەجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٤٩، ژمارە: ٩٧٩ = بوخاری/٢١٧٧، ٢١٧٦، ٢١٧٨ - مسلم ترقيم شيحا/٤٠٦٧، ٤٠٣٠ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٥٨٤}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سلاو لەسەر گیانی پیرۆزی) دەفەرموێ: (زێڕ بە زێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورما خوێ بەخوێ، دەبێ دەقاودەق بێو بەقەد یەك بنو بەبێ زیادو کەم بن، نابێ حازر بەبزر (نادیار) بفرۆشن، وەك ئەوە لایەکیان زێڕەکەی حازر بێو ئەولاکەی تریان، زیوەکەی دواخراو بێ). {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٥٥، ژمارە: ١٨٤١، زنجیرە: ١٥٤ چاپی چوارەم}.

٨٥٣- وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { اَلذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ

بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، مِثْلًا بِمِثْلٍ، سَوَاءً بِسَوَاءٍ، يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا اِخْتَلَفَتْ هَذِهِ اَلْأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٩٤٩ = شیحا/٤٠٣٩ = مسلم/١٥٨٧. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٩. ترمذی. بیوع/١٢٤٠}:

**عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورماو خوی بەخوێ، دەبێ دەقاودەق بەقەد یەك بنو ڕێکاوڕێك وەك یەك بنو دەست بەدەست بن، ئەگینا ئەگەر وانەبوو، وەك کەم بەزۆر، یا حازر بەناحازر، ئەوە دەبی بەسوود، بەڵام ئەگەر هەردوو شتەکە لەچەشنی یەکتر نەبوون، وەك گەنم بەجۆ، یا زێڕ بەزیو، چۆن ئارەزوو دەکەن ئاوا بیفرۆشن، بەمەرجی دەست بەدەست بێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤١ چاپی چوارەم}.**

٨٥٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَزْناً بِوَزْنٍ مِثْلًا بِمِثْلٍ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ وَزْناً بِوَزْنٍ مِثْلًا بِمِثْلٍ، فَمَنْ زَادَ أَوْ اِسْتَزَادَ فَهُوَ رِبًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم/شيحا/٤٠٤٤ = مسلم/١٥٨٨}:

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕ دەبێ دەقاودەق بەقەد یەك بنو کێشی هەردوولایان چوون یەك بن، هەروا زیو بەزیو دەبێ دەقاو دەق بەقەد یەك بنو چوون یەك بن، دەنا ئەگەر وانەبوو، ئەوەی کەزیاتر دەداو ئەوەی کە زیادە وەردەگرێ هەردوولا تووشی سووخواردن دەبن).**

٨٥٥- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا){ "أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِسْتَعْمَلَ رَجُلًا عَلَى خَيْبَرٍ، فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟ " فَقَالَ: لَا، وَاَللَّهِ يَا رَسُولَ اَللَّهِ،

إِنَّا لَنَأْخُذُ اَلصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ وَالثَّلَاثَةِ فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " لَا تَفْعَلْ، بِعِ اَلْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ اِبْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا} وَقَالَ فِي اَلْمِيزَانِ مِثْلَ ذَلِكَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژماره: ٩٨٨ = ٢٢٠١، ٢٣٠٢، ٤٢٤٤، ٤٢٤٦، ٧٣٥٠، ٢٢٠٢، ٢٣٠٣، ٤٢٤٥، ٤٢٤٧، ٧٣٥١. پوختەی موسلیم/٩٥٤ = شیحا/٤٠٦٣}:

ئەبو سەعیدی خودری‌و ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی کرد بەسەرکاری سەر قەڵای خەیبە، پیاوەکە هاتەوە خورمایەکی نایابی هێنا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا خورمای خەیبەر هەمووی ئاوایە؟ وەك ئەمە گشتی ئاوا نایاب‌و هەڵبژاردەیە؟)

پیاوەکە گوتی: نەبەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵام مەنی لەم خورما نایابە لەباتی دوو مەن لەخورمای ئاسایی وەردەگرین، وە دوومەن لەجیاتی سێ مەن!

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (شتی وامەکەن با نەبێ بەسوود، واتە: با نەبێ بە ریبا، بەڵام خورما ئایەخەکە بفرۆشن بەپارە، لەپاشا ئەو پارەیە چەندی کرد، خورمای نایابی پێ بکڕن). {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٦٧، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ١٨٧٠ چاپی چوارەم}.

لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەوە، مامۆستا عەسقەلانی ئامارە دەکا بۆ فەرموودەی ژمارە (پوختەی موسیلم ٩١٣ = شیحا ٤٠٥٧) کە ئەمە دەقەکەیەتی:

ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی ئەنصاری، لەخێڵی بەنی عەدی، کەناوی سەوادی کوڕی غەزییە بوو، کردی بەسەرکاری سەر قەڵای خەیبەر، کەهاتەوە خورمایەکی نایابی بۆیان هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) پێی فەرمووو: (ئایا خورمای خەیبەر هەمووی هەروا باشەو ئاوایە؟). پیاوەکە فەرمووی: نە بەخودا، ئەی پیغەمبەری خودا! بەڵکوو مەنێ لەم خورما نایابە دەکڕین بەدوو مەن خورمای جەڵەبی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا وامەکەن، بەلام دەبێ سەر بەسەر بێ، یاخود ئەم خورما نایابە بفرۆشن‌و بەپارەکەی لەو ئایەخە بکڕن، یان بە پێچەوانەوە بکەن، ئیتر خوای بەپێوانەبێ، یان بەکێشانە بێ هەروا).

٨٥٦- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ : {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ بَيْعِ اَلصُّبْرَةِ مِنَ اَلتَّمْرِ لا يُعْلَمُ مَكِيلُهَا بِالْكَيْلِ اَلْمُسَمَّى مِنَ اَلتَّمْرِ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٩١٤ = شیحا/٣٨٢٩ = صحیح مسلم ترقیم/محمد فؤاد عبدالباقی/١٥٣٠}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی (نەهی)ی کردووە: لەفرۆشتنی کۆمەڵە خورما لەگۆترە، بە ئەندازەیێ خورمای تر کەپێوانەی زانراو بێ، وەك ئەوە گەلێ کەس دەڵێن: ئەم کۆمەڵە گەنمە کەهێشتا نەپێوراوە، لەبڕ لەسەر من بە بیست ڕبە گەنم. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤٢}.

٨٥٧- وَعَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { اَلطَّعَامُ بِالطَّعَامِ مِثْلاً بِمِثْلٍ " وَكَانَ طَعَامُنَا يَوْمَئِذٍ اَلشَّعِيرَ } رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٩٠٨ = ٤٠٥٦ شیحا = صحیح مسلم/١٥٩٢}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

مەعمەری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) خولامەکەی خۆی نارد، مەنێ گەنمی داپێی، فەرمووی پێی: (ئەم گەنمە بفرۆشەو بەپارەی گەنمەکە، چەندی کرد، جۆم بۆ بکڕە پێی).

خولامەکـەیش چـوو گەنمەکـەی گۆڕییـەوە بەمـەنێ جـۆو هەنـدێ زیاتریش، جا کاتێ مەعمـەر هاتـەوە، خولامەکە پێـی گوت کە ئاوام کـردووە، مەعمـەریش پێـی فـەرموو: بۆچـی شـتی وا دەکـەی؟ بـڕۆ زیادەکە بـەرەوە بـۆ خاوەنی، گەنمەکە چەندە ڕێك بەقەد ئەو وەربگرەو بەس، یەك بەیەك نەزیاد، نەکـەم، چـونکە مـن بۆخـۆم، لـە پێغەمبـەرم دەبیـست دەیفـەرموو: (خـۆراك بەخۆراك، هەرچەشنێ بەچەشنێ خـۆی سەربەسـەر، وەکوو یـەك بـەبی زیـادو کەم!).

مەعمەر فەرمووی: ئەو سەردەمە خۆراکمان بەس جۆ بـوو، بـە شـێوەی گشتی. بە مەعمەر گوترا: (جا کەی جۆ لەچەشنی گەنمە، جۆ چەشنێکەو گەنم چەشنێکی ترە، کەواتە: زیادەکە قەیدی نییە؟).

مەعمەر فەرمووی: بەڕاستی مـن دەترسـم، کـە هاوچەشـن بـن، چـونکە جۆوگەنم لەیەکترەوە نزیکن‌و بـە هەردووکیـشیان دەگـوترێ: خـۆراك، ئەوکاتـە دەبێ بەسوودو سوودیش نادروستە.

(ڕوونکردنەوە):

١- ڕێبازی جەماوەری شەرعزانەکان: گـەنم‌و جـۆ دوو جـۆری جیاجیـان، هاوجۆرو هاوچەشـن نـین، لەبـەر ئـەوە دروسـتە کـە یـەکێکیان زیـاتر بـێ، ئـەم بۆچـوونەی مەعمـەر لەبـەر وەرعو دووربینیـە، دەنـا گۆڕینـەوەی گـەنم بـەجۆ، زیادیشی هەبێ دروستە.

٨٥٨- وَعَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { اِشْتَرَيْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ قِلَادَةً بِاِثْنَيْ عَشَرَ دِينَاراً، فِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ، فَفَصَلْتُهَا فَوَجَدْتُ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ اِثْنَيْ عَشَرَ دِينَاراً، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: " لَا تُبَاعُ حَتَّى تُفْصَلَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختـەی موسـلیم/٩٥٢ = شـیحا/٤٠٥١ = صـحیح مـسلم/محمـد فؤاد/١٥٩١}:

فـوضـالـەی كـوڕی عوبەیـد (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی ڕزگـاركردنی قـەڵای خەیبـەر، گەردانەیـەكم كـڕی بـە (١٢) دوازدە لـیرەی زێـڕ، هەندێكی زێڕو هەنـدێكی مـوورو بـوو، بـەڵام كـە هـەڵم وەشـاندو ئاڵتوونەكـەم لـەمووروەكان جیـا كـردەوە، تەماشـام كـرد:زیـاتر لـەدوازدە هـەر لـیرەی زێـڕی تیابوو!

جـا كـە ئەمـەم عـەرزی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـرد، فـەرمووی: (دروودی خـودای لەســەر بـێ) (تـا جیانەكرێتــەوە نافرۆشـرێ).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٩١ – م/د/ت/ن} .

(ڕوونكردنەوە):

ئەمەی سەرەوە دەقی ژمارە: (٤٠٥٢)ی صەحیحی موسلیمە، كە مامۆسـتا شـێخ خـەلیل مـەئموون شـیحا ژمـارەی بـۆی دانـاوە، ئەمـەیش لـەدواوە دەقـی وەرگێڕانی ژمارە: (٤٠٥١ شیحا)یە:

فوضالـەی كوڕی عوبـەیر ئەنـصاری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لەغەزای خەیبەردا، لەخەیبەر گەردانەیەكی تێكەڵ لەموورو لەزێڕیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) كـەهی دەسـتكەوتی جـەنگی بوو، دەیانویست كە بیفرۆشن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی كـرد: زێڕەكـەی نـاو گەردانەكـەیان جیـاكردەوە، ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی پێیـان: (زێـڕ بـەزێڕ، لـەكاتی فرۆشـتندا، دەبـێ بەكێشانە هاوسـەنگ بـن!). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٤٨، ژمـارە: ١٧٩١، چـاپی چوارەم، لاپەڕە: ٣٣٤} .

٨٥٩- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً } رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ.

{صحيح الجامع/٦٩٣٠. أبو داود/٣٣٥٦. ترمذى/١٢٣٧. نسائى/٧/٢٩٢. ابن ماجة/٢٢٧٠. أحمد/٣/٣١٠. ابن الجارود/٦١١. بيهقى/٥/٢٨٨}:

**لەتاجول ئوصولی پیرۆزدا ئاوایە:**

**سەموورەی کوڕی جوندوب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە، واتە: جڵەوگیریی کردووە، لەفرۆشتنی زیندەماڵ بەزیندەماڵ، وەك مەڕ بەمەڕ، یا بزن بەبزن، ئەگەر دەست بەدەست نەبێ. لەگێڕانەوەیەکا:**

**گیانلەبەر یەك بەدوو دروست نییە، ئەگەر دوابخرێ، بەڵام ئەگەر دەست بەدەست بێ قەیناکا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢ان ژمارە: ١٨٢١ چاپی چوارەم}.**

٨٦٠- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ اَلْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمْ اَلْجِهَادَ، سَلَّطَ اَللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ مِنْ رِوَايَةِ نَافِعٍ عَنْهُ، وَفِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ. وَلِأَحْمَدَ: نَحْوُهُ مِنْ رِوَايَةِ عَطَاءٍ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْقَطَّانِ.

{صحيح الجامع/٦٧٥. أبو داود/٣٤٦٢. أحمد/٢/٢٨. مابن القطان/٣/١٩}:

**ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکاتێ شتتان کڕی بەقەرزو دەست بەجێ فرۆشتتانەوە بەفرۆشیارەکە، بەنەختی بەڵام بەهەرزانتر، وە کەوتنە شوێن کلکی گاو گۆتاڵو دەستتان دایە کشتوکاڵو ماڵداریی و وازتان هێنا لەغەزاکردنو خەباتگێڕان، واتە: هەرکاتێ دەستتان کرد بەفڕوفێڵو تەڵەکەبازیو لەپێناوی کۆکردنەوەی ڕیتەو پیتەو پڕوپاتاڵی جیهاندا، لەشەقامەڕێی شەریعەتو یاسانامەی خودا، لاتان داو، پەلاماری حیلەشەرعیو فێڵەشەرعی کۆلکە مەلاتان داو، وازتان لەکۆششو تێکۆشان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام هێنا، هەرکاتێ ئەمە حاڵتان بوو، ئەوکاتە خودا دووچاری کەساسیو**

ژێردەستەییتان دەکا، جا هەتا نەگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئیسلام، خودا ئەو بەرگی کەساسیو ژێر دەستییە، کە وەك کاڵا بە بەرتان بڕاوە، لەبەرتانی داناکەنێ!).

ئەبوداوود (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لەنافعەوە، لەبارەی ڕشتەکەیەوە بێ دەنگ بوو. عەسقەلانیش دانەری ئەم پەڕاوە پیرۆزە دەفەرموێ: ڕشتەکەی وتوویژی لەسەرە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢ان ژمارە: ١٨٣١، لاپەڕە: ٣٥٠ چاپی چوارەم}.

پێشەوا ئەحمەدیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، بەڵام لە عەطا ئەوە، پیاوانی ڕشتەکەی متمانەدارن، ئیبنو قەططان بە فەرموودەیەکی ساغو دروستی داناوە.

٨٦١- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ شَفَعَ لِأَخِيهِ شَفَاعَةً، فَأَهْدَى لَهُ هَدِيَّةً، فَقَبِلَهَا، فَقَدْ أَتَى بَابًا عَظِيماً مِنْ أَبْوَابِ اَلرِّبَا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَفِي إِسْنَادِهِ مَقَالٌ.

{احمد/٥/٢٦١. أبو داود/٣٥٤١. بيهقي/٣/١٦٩}:

ئەبو ئومامەی باهیلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ تکایێ بکا بۆ برای ئایینی خۆی، براکەیشی بەم بۆنەیەوە دیارییەکی پێبدا، ئەوە بابەتێکی زۆر گەورەی لە بابەتەکانی سوودو سوودخۆری ئەنجام داوە!).

ئەحمەد گێڕاویەتەوە، هەروا ئەبو داوود، بەڵام وتوویژ لەسەر ڕشتەکەی کراوە، کە پلەکەی تاچەندێ دروستو بێگەردە.

(ڕوونکردنەوە):

زانایانی ڕاڤەکارانی ئەم فەرموودەیە، پوختەی گوتەکەیان ئەمەیە: (تکا کردن، کە لەزاراوەی ئەمڕۆدا ناسراوە بە واسیتەو میانەکاری، دەبێ بەدوو بەشی سەرەکییەوە، یەکێکیان خودی تکاکارییەکە نادروستە، وەك ئەوە کابرا تکا بکا لەلای کەسێ کەناهەقییەك بکا بۆ کەسێ، ئەوە نادروستو ناڕەوایە، هەر

سوودو قازانجێ، بەهەر ناوێکەوە بێ، بەم بۆنەیەوە بگات بە تکاکارەکە، ئەوە نادروستو نارەوایە).

بەشی دووەم: کەدروستو ڕەوایەو هۆی پاداشی باشی لای خودایە، وەك ئەوە کە پیاوێ تکا بکا لەلای دەسەڵاتدارێ، کەمافێکی ڕەوا بۆ کەسێ جێبەجێ بکا، لەکاتی وادا، وا باشە تکاکارەکە بەم بۆنەیەوە، دیاریو دەسەنە لەتکا بۆکراوەکە وەرنەگرێ، هەتا نەبی بە بەرتیل، بەڵام ئەگەر جۆری دیارییەکە لەو بابەتە بوو، کە لەشەرعا پێی دەگوترێ موکافەئەو پاداشی چاکە بەچاکە ئەوە هەندێ زانا دەفەرموون: ئەم جۆرەیان قەیناکا.

٨٦٢- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: { لَعَنَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلرَّاشِي وَالْمُرْتَشِيَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{أبو داود/٣٥٨٠. ترمذی/١٣٣٧. ابن حبان/٥٠٧٧. حاكم/٤/١١٥. أحمد/٢/١٦٤. ابن ماجة/٢٣١٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرینو نەفرەتو لەعنەتی خودا لە بەرتیلدەرو لە بەرتیلخۆر!). تەرمەزی بە تەندروستی داناوە.

٨٦٣- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" {أَنَّ رَسُولَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَهُ أَنْ يُجَهِّزَ جَيْشًا فَنَفِدَتْ اَلْإِبِلُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ عَلَى قَلَائِصِ اَلصَّدَقَةِ. قَالَ: فَكُنْتُ آخُذُ اَلْبَعِيرَ بِالْبَعِيرَيْنِ إِلَى إِبِلِ اَلصَّدَقَةِ} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ وَالْبَيْهَقِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{حاكم/المستدرك/٢/٦٥. بيهقى/٥/٢٨٧. أبو داود/٣٣٥٧. دارقطنى/٢/٦٩ - ٧٠}:

دیسان عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کرد، کە

لەشكرێ ئامادە بكەم، وشترەكان بەشیان نەكرد بۆ تەدارەك و سازكردنی لەشكرەكە، پێویستیمان بە وشتری تر هەبوو، بۆ ئەمە عەرزی پێغەمبەرم كرد، ئەویش فەرمانی پێم كرد، كە بەقەرز وشتر بەوشتر بكڕم، هەتا وشتری زەكاتمان بۆ دێ، جا منیش بەسەر وشتری زەكات كە هەركاتێ بۆمان هات، وشترێكی حازرم دەكڕی بەدوو وشتری ئەوكاتەی كە وشتری زەكات دێت بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

دانەر مەلای عەسقەلانی (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) دەفەرموێ: (پێشەوا حاكم و پێشەوا بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، پیاو گەلی رشتەكەی جێگەی متمانەن).

٨٦٤- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنِ الْمُزَابَنَةِ" أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْماً أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبِ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ زَرْعاً أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٧٦ = بوخاری/٢١٧١، ٢١٧٢، ٢١٨٥، ٢٢٠٥. مسلم/شیحا/٣٨٧٣. بڕوانە: پوختەی موسلیم/٩١٨، ٩٢٠ = مسلم/١٥٤٢}:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی (نەهی) كردووە لە موزابەنە (بەكوردی واتە: بەرسیلە كاریی) كە بریتییە لەم جۆرە سەوداو مامەڵەیانە:

١- لەفرۆشتنی بەری باخە خورما، بە فەریكە خورمایی، كەپێی دەگوترێ: روتاب، بەخورمای پێگەیشتوو بەپێوانە.

٢- لەفرۆشتنی بەری رەزە ترێ بەمێوژ بەپێوانەی دیاریكراو، وەك ئەوە ترێ رەزەكەیی پێ بفرۆشێ، بەبیست تەنەكە مێوژ.

٣- لەفرۆشــتنی دەغــڵو دانەوێڵــە، کــە نەدووراوەتــەوە، یــا والەشــاراو خەرماندا، بە ئەندازەیێ دیاریکراو لە دانەوێڵە بەپێوانـە، وەك ئـەوە بڵێ: ئـەم پارچە گەنمەت لێ دەکڕم، چی تیادابوو بۆ مـن، بـەدوو تـەغار گـەنم. پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەم چەشنە سەودایانە لەهـەموویان، چـونکە میـوەی باخەکـە نـازانرێ، بـە مـسۆگەری چـەندە، هـەروا دانەوێڵـەی کێڵگەکە زنازانرێ چەندی تیادەبێ.

٨٦٥- وَعَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {سَـمِعْتُ رَسُـولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) سُئِلَ عَنِ اِشْتِرَاءِ اَلرُّطَبِ بِالتَّمْرِ. فَقَالَ: أَيَـنْقُصُ اَلرُّطَـبُ إِذَا يَبِسَ؟ " قَالُوا: نَعَمْ. فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ} رَوَاهُ اَلْخَمْـسَةُ، وَصَـحَّحَهُ اِبْـنُ اَلْمَـدِينِيِّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{مالك/الموطأ/١٨٢٦. أبو داود/٣٣٥٩. ابن ماجة/٢٢٦٤. ترمـذى/١٢٢٥. نسائى/٧/٢٦٨ وفي الكبرى/٦٠٩١، ٦٠٩٢}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم گـوێم لێ بـوو، پرسـیارکرا لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەبارەی کڕینـی خورمـا بـە ڕوتـاب (واتـە: فرێکـە خورمـا) فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا ڕوتاب کە وشك بوو، وە تەواو گەییو بوو بـە خورمـای گەییو کەم دەکا یانا؟) گوتیان: بەڵێ، کەم دەکا. پێغەمبەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەهی لەشـتی وا کـرد، کـە خورمـا بفرۆشـرێ بـە ڕوتـاب. {تـاج/٢، لاپەڕە: ٣٤٦، زنجیرە: ٥/١٥٢، ژمارە: ١٨٢٠ چاپی چوارەم}.

٨٦٦- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا)" {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلْكَالِئِ بِالْكَالِئِ، يَعْنِي: اَلدَّيْنِ بِالـدَّيْنِ} رَوَاهُ إِسْـحَاقُ، وَالْبَـزَّارُ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضــــعيف الجـــامع/٦٠٦١. مالــــك/٢/٦٢٨. بيهقــــى/٥/٢٩٠. عبدالرزاق/٨/٩٠}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی کردووە لەفرۆشتنی قەرز بەقەرز.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ڕشتەکەی لاوازە.

(ڕوونکردنەوە):

ڕاڤە نووسان لەبارەی واتای ئەم فەرموودەیەوە، ئەم نموونانەیان هێناوەتەوە:

١- وەك ئەوە دارا، ئەسپێ لەبارام بەسەد دینار، بەقەرز دەکڕێ، بۆماوەی ساڵێ، کاتێ سەری ساڵ دێت، دارا بە بارام دەڵێ: نیمە کەبەهای ئەسپەکەت پێ بدەم، دەی سەد دیناری بەهای ئەسپەکەم پێ بفرۆشە بە (١٢٠) سەدو بیست دینار، بەقەرزی ساڵێ تر، ئەویش ڕازی دەبێ و سەد دینارە قەرزەکەی پێ دەفرۆشێ بە (١٢٠) سەدو بیست دینار، بەقەرزی ساڵێ. شتی وا نادروستەو ناڕەوایە.

٢- وەك ئەوە ئاری سەد ڕبە گەنمی، بەقەرزی ساڵێ داوە، بەدانا، زانا بەئاری دەڵێ: گەنمە قەرزەکەتم پێ بفرۆشە، کەوا لەسەر دانا، بەسەد دینار، بەقەرزی دوو مانگ، ئەویش ڕازی دەبێ و لەسەر ئەو شێوەیە گەنمە قەرزەکەی سەر دانا، بەقەرزی دوو مانگ، بەسەد دینار دەفرۆشێ بەزانا. ئەمەیش هەر نادروستە.

(ڕوونکردنەوە):

پوختەی باسەکانی کڕین و فرۆشتن هەتا ئێرە:

١- نامەی کڕین و فرۆشتن هەتا ئێرە (٨٦٦ – ٧٩٩ = ٦٧) شەست و حەوت فەرموودەیە.

٢- سەوداو مامەڵەو کەسابەتی حەڵاڵ تاعەتێ جوانەو مایەی سەربەرزی هەردوو جیهانە.

٣- کۆمەڵێ شت هەیە پیسو زیانبەخشن، بۆ هۆشو لەشو سامانو خێزان، وەك ئارەقو مردارەوە بوو، وەك بوتو قومارو تلیاكو زۆر شتی تری لەم بابەتە، ئەوە هەموو مامەڵەیێ کە لەم بابەتەبێ نادروستەو ناڕەوایەو دانامەزرێو پیسەو چەپەڵە.

٤- کڕێی لەشفرۆشو بەهای سەگو بەرازو کڕێی کوڵە نانیو فاڵچی حەرامو پیسە، هەروا بەهای پشیلە.

٥- ڕاگرتنی سەگ، بەبێ مەهانەیەکی ڕەوا نادروستە.

٦- مەرجی ناڕەوا، لەسەوداو مامەڵەدا بایەخی نییە.

٧- ئەو کەسانەی کەبەهۆی شیر خواردنەوە دەبن بەخۆییو بەمەحرەمی یەکتری (فەرموودەی ژمارە: ٨١٠).

٨- قەدەغەکردنی ئاوی زیادە لە موسوڵمانان، بەبێ مەهانەی دروست نادروستە.

٩- ئاوی نێریی، وەك تۆوی ئەسپو کەڵەگا، نافرۆشرێ، بەڵام بەخشیش لەکاتی وادا دروستە.

١٠- کۆمەڵێ فرۆشتن، کە شەرع نەهی لێیانکردووە.

١١- فرۆشراو هەتا وەرنەگیرێو بەتەواوی نەبێ بەماڵی تۆ نافرۆشرێ بەکەسێ تر.

١٢- فروفێڵو قۆڵبڕینو کۆستە کۆستەو کڕیار تەفرەدانو گزی لەمامەڵەدا، زۆر تاوانێ گەورەیە.

١٣- سەودا لەسەر سەودا دروست نییە.

١٤- واباشە بەپێی توانا، لەمامەڵەی کڕینو فرۆشتندا، دایكو بەچکە لەیەکتر دانەبڕرێن.

١٥- دانانی نرخ بۆشت بەپێی ڕۆژ، بڕوانە: ژمارە: ٨٣٢.

١٦- قورخکردنی بژێوی خەڵكو هەڵگرتنی بۆ کاتی گرانی نادروستە.

١٧- مەرجگرتنی سەرپشکیو هەڵوەشانەوەی سەودای فرۆشتن (بڕوانە: ژمارە: ٨٣٤، ٨٣٥).

١٨- فرۆشتنی تریو خورماو میوە بەکەسێ، کە سوور بزانی دەیکا بەمەیو بادە نادروستە.

١٩- لەو ماوەیەدا، کە یەکێ لەدوو لاکەی گرێدانی سەودای فرۆشتن، هەقی هەڵوەشاندنەوەیان هەیە، لەو ماوەیەدا سوودو قازانجی فرۆشراو بۆ کڕیارە، لەباتی بەخێوکردنیو دەستەبەرکردنی.

٢٠- چاوپۆشی لەهەڵەی موسوڵمان، کارێ پەسەندە، وەك ئەوە کەسێ لەکڕینی شتێ پەشیمان بێ، فرۆشیار شتەکەی لێ وەربگرێتەوە، یا بەپێچەوانەوە.

٢١- دوو جۆرە سەرپشکی هەیە، لەسەودادا، یەکەم: سەرپشکی دانیشتنگە. دووەم: خیار الشرط (بڕوانە: ژمارە: ٨١٧).

٢٢- لە فەرموودەدا، نەفرینو نەفرەت لەهەندێ کەس کراوە: وەك سووخۆرو وێنەگر.

٢٣- بڕوانە: پوختەی صەحیحی موسلیم ژمارە: ٩٧١ روونکردنەوە.

## ٤٢- مۆڵەتی فرۆشتنی بەری دارە دۆخەدراوە، باسی فرۆشتنی بنکی دارو بەروبووم

## بابٌ: الرُّخْصَةُ فِي العِرَايَا وَبَيْعِ الأُصُولِ والثِّمَارِ

٨٦٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) رَخَّصَ فِي اَلْعَرَايَا: أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا كَيْلاً } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {رَخَّصَ فِي اَلْعَرِيَّةِ يَأْخُذُهَا أَهْلُ اَلْبَيْتِ بِخَرْصِهَا تَمْرًا، يَأْكُلُونَهَا رُطَبًا}.

{بوخاری. بیوع: ٢١٧٣، ٢١٨٤ = پوختەی بوخاری/٩٨٢م = ٢١٨٨، ٢١٩٢، ٢٣٨٠. پوختەی موسلیم/٩١٩ = شیحا/٣٨٥٧}:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەســەر بــێ) مۆڵــەتی بەیعولعــەرایای داوە، کــە خــاوەن باخەکــە، لــە هەژارەکــەی دەکرێتــەوە، دەیقــەبڵێنێ بــە ئەنــدازەیێ خورمــای دیــاریکراو، وە خۆیان بەروتابی دەیخۆن).

٨٦٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) رَخَّصَ فِي بَيْعِ اَلْعَرَايَا بِخَرْصِهَا، فِيمَـا دُونَ خَمْـسَةِ أَوْسُـقٍ، أَوْ فِـي خَمْـسَةِ أَوْسُقٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ٩٨٤ = بوخـاری/٢١٩٠، ٢٣٨٢. پوختەی موسلیم/٩٢٠ = شیحا/٣٨٦٩ = مـسلم/١٥٣٤. أبـو داود. بیـوع/ ٣٣٦٤. ترمذی. بیوع/١٣٠١. نسائی. بیوع/٤٥٥٥}:

ئــەبو هــورەیرە (ڕەزای خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ڕێگــەی فرۆشــتنی بــەری دارە بەدۆخــە (عــەرایا)ی داوە، کەبەســەر دارەکــەوە بخــەملێنرێ بــە خورمــای پێگەیــشتووی ڕنــراو، بەمــەرجێ لەپێنــج وەسق کەمتر بێ، یا فەرمووی: بەمەرجێ لەپێنج وەسـق تـێ نەپـەڕێ). {تاج/٢، ژمارە: ١٨٣٥}.

٨٦٩- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ بَيْعِ اَلثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا، نَهَى اَلْبَائِعَ وَالْمُبْتَاعَ} مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَكَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلَاحِهَا؟ قَالَ: " حَتَّى تَذْهَبَ عَاهَتُهُ ".

{بوخــاری/١٤٨٦، ٢١٩٤. پوختــەی موســلیم/٩١٧ = شــیحا/٣٨٤٠ = مسلم/١٥٣٤. أبو داود. بیوع/٣٣٦٧. تحفة الأشراف/٨٣٥٥}:

ئیبنــو عومــەر (ڕەزای خودایــان لێ بــێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی کردووە لەفرۆشـتنی بـەری دارخورمـا، یـا بـەری داری بەری تر، تا ماتە دەدا، سوور یا زەرد هەڵدەگەڕێ، وە لەفرۆشتنی دانەوێڵە لەناو کەلووەکەیدا، بەرلەوە کەسپی هەڵگەڕێو لەدەردو بەڵای ئاسمانی ڕزگاری

ببێ، جڵەوگیریی کردووە لەم جۆرە سەودایە، چی بۆ فرۆشیار، چی بۆ کڕیار).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٧} .

لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا (١٤٨٦) دەفەرموێ: هەموو جارێ کە پرسیاری لێ دەکرا، لەبارەی ئەوەوە کەکەی بەروبووم بەکەڵکی خواردن دێو سوودی لێ وەردەگیرێ، دەیفەرموو: کاتێ کە بەدیمەن لەدەردو ئافەت رزگاری بووبێ!).

(ڕوونکردنەوە):

١- عەرایا، بەچەند واتایێ، واتاکراوە، بەڵام پوختەی ئەو واتایانە ئەمەیە: (کە خاوەن باخ، دارێ، دوو دار، لەباخەکەی، دەدا بەهەژارێ، کەخۆیان باخیان نەبێ، تا بەرەکەی بخۆنو لەپاشا دارەکە هی خۆیەتیو دەبێتەوە بەهی خاوەن باخەکە، هەروەك چۆن بزنە بەدۆخە، بەهاران دەدرێ، بەئاغا، یا بەهەژارێ، یا بەماڵێ رەشایی کە ئاژەڵیان نەبێ، هەتا شیرو ماستو دۆکەی بخۆنو پایز کە بزنەکە وشکی کرد، دەیدەنەوە بەخاوەنی، دارە دۆخەیش (واتە: عەرایاش) شتێکە لەم بابەتە. ئاژەڵی دۆخە پێی دەگوترێ مەنیحە، دارە دۆخەیش پێی دەگوترێ عەرایا، جاری وادەبێ ئاژەڵەکە وشترە، یا بزنە، دارەکەش خورمایە یا هەنجیرە...تاد.

جا گەلێ جار رێ دەکەوێ، هەژارەکە بەرەکەی بەکارناهێنێ، جا هەتا بەئامو شۆی زۆر، یا بەناوەخت ئازاری خاوەن باخەکە نەدات، شەرع، لەبەر ناچاری، رێ دەدا کە خاوەن باخەکە، بەرەکەی لێ بکڕێ بەسەر دارەکەوە، دەیقەبڵێنن بە خورمای ڕنراو، یا بەهەر مێوەیەکی تر، بەپێی جۆرو چەشنی دارە دۆخەکە، بە ئەندازەیەکی دیاریکراو، خاوەن باخەکە لەباتی روتاب، یا ئەو میوەی کەوا بەدارە دۆخەکەوە، ئەو ئەندازە خورما، یا مێوژ، یا هەر مێوەیەکی تر، کە دیاریکراوە، دەدا بەهەژارەکە.

٢- بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ١٧٧، لاپەڕە: ٤٠١. باسی (دۆخە: منیحە) + {زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٣٧، ١٩٣٨} .

٨٧٠- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلثِّمَارِ حَتَّى تُزْهَى. قِيلَ: وَمَا زَهْوُهَا؟ قَالَ: " تَحْمَارُّ وَتَصْفَارُّ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{پوختەی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٨٦ = ٢١٩٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٩٢٤ = شیحا/٣٨٨٨ + پوختەی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٨٧ = بوخاری/٢١٩٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی (واتە: جڵەوگیریی، واتە: نەهی) کردووە لەفرۆشتنی بەروبووم، هەتا ماتە نەدات، پێیان گوت: ئەی پیغەمبەری خودا! ماتەدان واتای چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەوەتە کەسوور ببێ، یا وا زەرد هەڵگەڕێ کە نیشانەی سەرەتا گەیینی پێوە دیاری دابێ، بەشێوەیێ وا کە بەکەڵکی خواردن بێت). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٦}.

٨٧١- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ بَيْعِ اَلْعِنَبِ حَتَّى يَسْوَدَّ، وَعَنْ بَيْعِ اَلْحَبِّ حَتَّى يَشْتَدَّ} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أبو داود/٣٣٧١. ترمذی/١٢٢٨. ابن ماجة/٢٢١٨. أحمد/٣/٢٢١. ابن حبان/٤٩٩٣. حاكم/٢/٢٣. صحيحٌ، الإرواء/١٣٦٦}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەفرۆشتنی ترێ، تا رەش دەبێ، وە لەفرۆشتنی دانەوێڵە بەسەوزی تا دەنکەکەی تەواو رەق دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٧}.

٨٧٢- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَوْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ ثَمَراً فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلَا يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا. بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ؟} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَ بِوَضْعِ اَلْجَوَائِحِ}.

{پوختەی موسلیم/٩٢١ = شیحا/٣٩٥٢ + ٣٩٥٧ = محمد فؤاد/١٥٥٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودا لەخۆی و لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر تۆ بەبرای موسوڵمانی خۆت، بەری باخێ، یا دارێ، بفرۆشیت، جا دەردێکی کوشندەی بنەبڕکەر لێی داو فەوتانی، دروست نییە بۆ تۆ کە هیچ لەبەهاکەی لێ وەربگریت، ئاخر لەباتی چی ماڵی براکەت بەناڕەوا بەخۆڕایی وەردەگریت؟).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢١}.

(ڕوونکردنەوە):

١- (وَضْعُ الجَوَائح) بابەتێکی شەرعییە، دوورو درێژە، دیدو بۆچوون و ڕای زانایان لەبارەیەوە، بەچەند جۆرێکە بەکۆی دەنگ لەکاتی ڕوودانی کارەساتی وادا، فرۆشیار پیاوەتی و پارمەتی و چاوپۆشی لەبیر نەچێ.

ئەوەوی (پڕگۆڕەکەی لەنووربێ) دەفەرموێ: (ئەگەر بەروبوومێ فرۆشرا، فرۆشیار تەسلیمی کڕیاری کرد، بەم ڕەنگە ڕێگەی دا کە بیڕنێ، بەڵام بەرلەکاتی ڕنینی، دەردو بەڵای ئاسمانی لێیدا، شافیعی و حەنەفی و کەسانی تریش دەفەرموێ: (ئەوە کڕیار خۆی بەرپرسیارە، فرۆشیار بۆی هەیە کە بەهاکەی لێ بستێنێ، بەڵام وا پەسەندە کە چاوپۆشی لێ بکات). {بڕوانە: تاجول ئوصول/٢، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠، ١٩٢١ چاپی چوارەم}.

٢- لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەوە، دانەر (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) ئاماژە بۆ گێڕانەوەی ژمارە (٣٩٥٧ شیحا) دەکا، کە دەڵێ: وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَ بِوَضْعِ اَلْجَوَائِحِ}. واتە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە، کە لەکاتی فەوتان و تووشبوونی بەروبوومی ڕەزو باخدا، بە دەردو کارەسات و بەڵایەکی ئاسمانی، فرۆشیار پیاوەتی لەبیر نەچێ، جا یادەست لە بەهاکە هەڵ بگرێ، یا بەشێکی لێ دابشکێنێ بۆی).

٨٧٣- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنِ اِبْتَاعَ نَخْلًا بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ، فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ اَلَّذِي بَاعَهَا، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ اَلْمُبْتَاعُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٤٥ = بوخاری/٢٣٧٩. مسلم/شیحا/٣٨٨٢ = صحیح مسلم/١٥٤٣}:

لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ دارە خورما، یا باخە خورمای کڕی، پاش موتوربەکردنی، بەرەکەی بۆ فرۆشیارەکەیە، لەبەرئەوە مافی هاموشۆو ئاودانو شتی وای هەیە، تا بەرەکەی دەڕنێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ کە بەرەکەی بۆ خۆی بێو فرۆشیاریش لەکاتی گرێدانەکەدا بەوە ڕازی بێ، وەکەسێ کۆیلەیێ بکڕێ، کە کۆیلەکە ماڵی هەبێ، ماڵەکەی هی ئەو کەسەیە کە دەیفرۆشێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ کە ماڵی کۆیلەکە بۆ خۆی بێ).

(ڕوونکردنەوە):

١- باسی ژمارە (٤٢) (٨٧٣ — ٨٦٦ = ٧) حەوت فەرموودەی واتیادا.

٢- فرۆشتنی قەرزێ بەقەرزێ تر نادروستە.

## ٤٣- باسەکانی سەلەمو قەرزو بارمتە (ڕەهن)
## أبْوَابُ السَّلَمِ وَالقَرْضِ وَالرَّهْنِ

٨٧٤- عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: قَدِمَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْمَدِينَةَ، وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي اَلثِّمَارِ اَلسَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقَالَ: {مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٣، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٩٩٨ = ٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٤١، ٢٢٥٣. پوختەی موسلیم/٩٦٧ = شیحا/٤٠٩٤. أبو داود. بیوع/٣٤٦٣. ترمذی.

بيــوع/١٣١١. نــسائی. بيــوع/٤٦٣٠. ابــن ماجــة. تجــارات/٢٢٨٠. تحفــة الأشراف/٥٨٢٠}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی بـێ) فـەرمووی: کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لەمەککەوە کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە، ڕوانـی لەمەدینـە خـەڵك بەسـەر بـەری دارو درەخـت‌و شـینایی‌و دانەوێڵـە، سەلەمیان دەکرد، بۆماوەیی ساڵێ، یا دوو ساڵ.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسـێ سـەلەم بەسـەر خورمـا، یـان بەسـەر شـتێ تـر دەکـا، بـا ئەنـدازەی شـتە سـەلەم بەسـەر کراوەکە دیاری بێ، وەك دەڕ بەگەنم، یان بەکێشانە زانـراو بـێ، وەك سـەد کیلۆ خورما، هەروەها بۆ ماوەی چەندیشە، ماوەکە ناوببرێ، وەك ساڵێ، یـا دوو سـاڵ، یا مانگێ، یـا دوو مـانگ، یـا وەرزێ دانەوێڵـەی ئەمـساڵ). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ١٨٤٧ — بۆ باسی سەلەم بڕوانە: فیقهی ئاسان/٤٥١/٢، زنجیرە: ١٨٨}.

لەگێڕانـەوەی ژمـارە: (٢٢٤١) بوخاریـدا: (مَـنْ أَسْـلَفَ فـي شَـيْءٍ). واتـە: هەرکەسێ سەلەم بەهەر شتی دەکا، بـا ئەنـدازەی شـتە سـەلەم بەسـەر کراوەکـە دیـاری بـێ، یـا کێـشانەی بزانـرێ، هـەروەها بـۆ مـاوەی چەندیـشە نـاوببرێ!. {تاج/٢/٣٥٨، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ١٨٤٧ چاپی چوارەم}.

٨٧٥– وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، وَعَبْدِ اَللَّهِ بْـنِ أَبِـي أَوْفَـى (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَا)قَالَا: {كُنَّا نُصِيبُ اَلْمَغَانِمَ مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) وَكَانَ يَأْتِينَـا أَنْبَاطٌ مِنْ أَنْبَاطِ اَلشَّامِ، فَنُـسْلِفُهُمْ فِـي اَلْحِنْطَـةِ وَالـشَّعِيرِ وَالزَّبِيـبِ - وَفِـي رِوَايَـةٍ: وَالزَّيْتِ - إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى. قِيلَ: أَكَانَ لَهُمْ زَرْعٌ؟ قَالَا: مَا كُنَّا نَسْأَلُهُمْ عَنْ ذَلِـكَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{پوختــەی بوخــاری = تجریــدی بوخــاری/٣، لاپــەڕە/٧١، چ/١، زنجـیرە: ٤٠، ژمارە: ٩٩٩ و ژمارەی دوای کە ژمارەی بۆ دانــەنراوە = بوخــاری/ ٢٢٤٢، ٢٢٤٤، ٢٢٥٥}:

عەبدوڕەحمانی كوڕی ئیبنو ئەبزاو عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرموویان: بەسـەرینی پێغەمبـەر خـوّی (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەروا بەسـەرینی ئـەبو بـەكرو عومـەریش كاتـێ جێنـشین بـوون، دەستكەوتی جەنگمان دەست دەكەوت، كاتێ جووتیارەكانی شام دەهاتن بۆلامان، بۆ مەدینە، بەسـەر گـەنمو جـۆو مێـوژو خورمـاو ڕۆنـی زەیتـوون، پارەمـان بـە سەلەم پێیان دەدا، بەپێوانەیەكی دیاری، وەهەتا ماوەیەكی دیاریو زانراو.

گوترا: باشە، پارەكەتان بەسەلەم دەدا بەو جۆرە كەسانە، كە بنـكو بـاخو بنەتۆو ئەو شتانەیان هەبوو، كە سەلەمتان بەسەر دەكردن؟

فـەرموویان: پرسـیاری ئـەوەمان لێ نـەدەكردن، كـە ئایـا ئێـوە كـشتوكاڵو ئاژەڵو شتی واتان هەیە، كە سەرچاوەی هەبوونی ئەم شتانەن، چونكە شـتی وا لەبابەتی سەلەما مەرج نییە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ١٨٤٨} .

(ڕوونكـردنەوە):

عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبزای خوزاعی، هاوەڵێكی ناسـراوی پێغەمبـەرە، لەپشتی پێغەمبەرەوە نوێژی كردووە، لەكووفە نیشتەجێ بوو.

عەبدوڕەحمان دەیفەرموو: لە نەبەردی (صەفین)دا، لەگەڵ (٨٠٠) هەشت سەد كەس لەوانـەی، كـە ئامـادەی پـەیمانی (بیعـة الرضوان) بـوونو پـەیمانیان بەسـت لەگـەڵ پێغەمبـەردا، لـەڕۆژی حودەیبییـەدا، لەگـەڵ هەشـت سـەد كـەس لەوانەدا، لەگەڵ سوپای عەلی كـوڕی ئـەبو تالیبـدا، بەشـداریم كـرد، لەنەبـەردی صەفیندا، شەستو سێ لەو كۆمەڵەی (بیعة الرضوان)ە لەو شەڕەدا كـوژران، كـە یـەكێكیان عـەمماری كـوڕی یاسـیر بـوو. عەبـدوڕەحمان دەفـەرموێ: لەپـشتی عومەرەوە نوێژی تەرمم لەسەر تەرمەكەی دایكی موسـوڵمانان (زەینـەبی كچی جـەحش) كـردووە، كـە یەكـەم هاوسـەری پێغەمبـەر بـوو، لـەپاش مـەرگی پێغەمبەر، مەرگ بوو بەمیوانی. عەبدوڕەحمان لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمە، قورئانزانێكی جوانو فەرائیززانێكی باش بوو، گێڕانەوەی

له پێغەمبەرو له (ئەبزا)ی باوکیەوەو له ئەبوبەکرو عومەرو عەلیو کەسانی ترەوە هەیە، سەعیدو عەبدوڵلا کوڕی بوون، لەگەڵ کەسانی تردا، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە. دوازده فەرموودەی لەخودی پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، عومەری کوڕی خەطاب دەیفەرموو: (یەکێکە لەو بەختەوەرانە، کە خودای گەورە بەهۆی قورئانەوە بەرزی کردوونەتەوەو لەناو پایە بەرزانا پایەی بەرزەوە کردوون!).

عەبدوڵلای کوڕی ئەوفا، ژیاننامەی لەپێشەوە له ژماره (٣٠٥)دا رابورد.

٨٧٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ اَلنَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا، أَدَّى اَللَّهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَهَا يُرِيدُ إِتْلَافَهَا، أَتْلَفَهُ اَللَّهُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ١٠٤٦ = ٢٣٨٧ بوخاری}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ ماڵی کەسێ وەربگرێو لەدڵەوە نیازی دانەوەی هەبێ، ئەوە خودا بۆی هەڵدەسوڕێنێو ئەو ماڵە دەداتەوە، بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ ماڵی خەڵك ببا، بۆ ئەوەی کە لرفی لێ بداو لەناوی بداو نیازی دانەوەی نەبێ، ئەوە خودا خۆی لەناو دەبات). {تاج/٢، زنجیره: ١٦٤، ژماره: ١٨٨٤}.

٨٧٧- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ تعالى عَنْها) قَالَتْ: {قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ فُلَاناً قَدِمَ لَهُ بَزٌّ مِنَ اَلشَّامِ، فَلَوْ بَعَثْتَ إِلَيْهِ، فَأَخَذْتَ مِنْهُ ثَوْبَيْنِ بِنَسِيئَةٍ إِلَى مَيْسَرَةٍ؟ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَامْتَنَعَ} أَخْرَجَهُ اَلْحَاكِمُ، وَالْبَيْهَقِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{أحمد/١٤٧. ترمذی/١٢١٣. نسائی/٧/٢٤٩. حاكم في المستدرك/٢/٢٨. بیهقی/٤/٤٢}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پیغەمبەری خودا! فیسارە کەس لەشامەوە کوتاڵی بۆ هاتووە، بۆچی

نانێری بۆلای كه بەشی دووپارچه جل، قوماشی بەقەرز لێ بكڕی، هەتا كاتی هەبوون؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم مەبەستە كەسێكی نارد بۆلای، بەڵام خاوەن كوتاڵەكە ڕازی نەبوو نەیدا.

٨٧٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَلَبَنُ اَلدَّرِّ يُشْرَبُ بِنفقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَعَلَى اَلَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ اَلنَّفَقَةُ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژمارە: ١٠٨١ = بوخارى/٢٥١٢، ٢٥١١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وڵاخی سواری، ئەگەر لەبارمتەدا دانرا بوو، دروستە كەبارمتە وەرگر سواریی پێ بكا، ئاژەڵی شیرداریش ئەگەر لەبارمتەدا دانرا بوو، دروستە بۆ بارمتە وەرگر كەشیرەكەی بخوات، كورتو پوخت مەسرەفی وڵاخەكەیش، یا ئاژەڵەكەیش لەسەر ئەو كەسەیە، كەسواری ئەو وڵاخە دەبێ، یا شیری ئەو ئاژەڵە دەخوات، دیارە كە بارمتە وەرگرەكەیە!).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمارە: ١٨٥١ چاپی چوارەم}.

٨٧٩- وَعَنْهُ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {لَا يَغْلَقُ اَلرَّهْنُ مِنْ صَاحِبِهِ اَلَّذِي رَهَنَهُ، لَهُ غُنْمُهُ، وَعَلَيْهِ غُرْمُهُ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَالْحَاكِمُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ. إِلَّا أَنَّ اَلْمَحْفُوظَ عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ وَغَيْرِهِ إِرْسَالُهُ.

{دارقطنى/٣/٣٢. حاكم/٢/٥٨. مراسيل أبي داود/١٨٦ - ١٨٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بارمتەكراو داناخرێ لەخاوەنەكەی، كە لە بارمتەدا دایناوەو نابێ بەهۆی ئەوەوە كە نەتوانێ قەرزەكە بداتەوە، بارمتەكار لێی زەوت بكا، بەروبوومی بارمتەكراو بۆ خاوەنەكەیەتی، زیانو خەرجیشی لەسەر خۆیەتی).

دانـەر مـەلای عەسـقەلانی (رەحمـەت‌و سۆزو میهرەبـانی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: دارەقـوطنـی‌و حـاکم گێڕاویانەتـەوە، پیـاوانی ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـە، هـەموویان متمانـەدارن، گەرچـی ڕەوانکـراو لـەلای ئـەبوداوودو کەسانی تریش ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مورسەل بێ.

٨٨٠- وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا فَقَدِمَتْ عَلَيْهِ إِبِلٌ مِنَ اَلصَّدَقَةِ، فَأَمَرَ أَبَا رَافِعٍ أَنْ يَقْضِيَ اَلرَّجُلَ بَكْرَهُ، فَقَـالَ: لَـا أَجِدُ إِلَّا خَيَارًا رَبَاعِياً؟ فَقَالَ: " أَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خِيَـارَ اَلنَّـاسِ أَحْـسَنُهُمْ قَـضَاءً} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٩٥٧ = شیحا/٤٠٨٦ + ٤٠٨٤ = صحيح مسلم ترقيم محمد فـؤاد/١٦٠٠ + تجريـدى بوخـارى/٣، ژمـارە: ١٠١٤ = بوخـارى/٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩. ترمذى. بيوع/١٣١٦، ١٣١٧. نسائى. بيوع/٤٧٠٧ + رياض/٣، زنجيرە: ٢٤٠، ژمارە: ١٣٦٧}:

ئەبو رافیع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) پارێنە وشترێکی لەپیاوێ قەرزکرد، لەپاشا وشتری زەکاتی بـۆ هـات، فەرمانی بەمن کرد، کە پارێنە وشترە قەرزەکە لەو وشترانە بدەمـەوە بـەخاوەن قەرزەکـە، منـیش چـووم تەماشـای وشـترەکانم کـرد، وشـتری بـچکۆلەیان تیـادا نەبوو، جا چوومەوە بـۆ خزمـەتی‌و عـەروزیم کـرد: قوربـان! مەگـەر وشـترێکی سەرەی پێ بدەین، وشتری بچووکی لەتەمـەنی وشـترەکەی خۆیـدا، لـەناو وشـترە زەکاتەکاندا نییە، بۆ ئەمە چی دەفەرموویت؟!

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (وشـترێکی سـەرەی گـەورەی پـی بدە، قەیدی نییە، با وشتری وەجەڵی قەرزەکە باشتریش بێ لـەناو وشـترە قـەرز کراوەکـە، چـونکە باشـترینی ئـەو خەڵکـە ئەوانـەیانن، کـە قـەرز زۆر بـەجوانی دەدنـەوە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٨١ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

ئەبو رافیعی بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڵێن: ناوی ئیبراهیم بووە، هەندێ دەڵێن: ناوی ئەسلەم، یان هورموز، یان ثابیت بووە، بەرەگەز قیبطی یە، کاتێ عەباسی مامەی پێغەمبەر ئیسلام بوو، ئەبو رافیع ئەم موژدەیەی دا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش لەموژدانەی ئەوەدا ئازادی کرد، ئەبو رافیع ئامادەی نەبەردەکانی ئوحودو خەندەق و دوا ئەوانیش بووە، گەرچی لەپێش بەدردا ئیسلام بووە، بەلاّم ئامادەی جەنگی بەدر نەبووە، چونکە لەکاتی قەومانی نەبەردی بەدردا ئەو لە مەککە بووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنیزێکی ئازادکراوی خۆی لێ مارە کرد کەناوی سەلما بوو، کاتێ ماریەی قیبطی یە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری بوو، سەلما مامانی بوو، ئەبو رافیع لەساڵی (٣٥) سیی و پێنجی کۆچیدا مەرگ بوو بەمیوانی لە شاری مەدینە، هەندێ دەڵێن: لەپێش مەرگی عوسماندا، هەندێ دەڵێن: لەپاش مەرگی عوسماندا مردووە.

٨٨١- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): {كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ مَنْفَعَةً، فَهُوَ رِبًا} رَوَاهُ اَلْحَارِثُ بْنُ أَبِي أُسَامَةَ، وَإِسْنَادُهُ سَاقِطٌ.

{ضعيف الجامع/٤٢٤٤}:

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەر قەرزێ سوودێ ڕابکێشێ بۆ قەرزدەر ئەوە دائەنرێ بەسوودو ریبا).

دانەر دەفەرموێ: ڕشتەی ئەم فەرموودەیە زۆر لاوازو بێ هێزە، بەلاّم دوو شاهیدی هەیە، کەبرێتین لە ژمارە: (٨٨٢و ٨٨٣) کەوان لەپاش ئەم ژمارەیەوە.

٨٨٢- فەرموودەی پێشوو ئەم شاهیدەی هەیە: (وَلَهُ شَاهِدٌ ضَعِيفٌ عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عند البيهقي).

هاوەڵی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوبێ) فضالەی کوڕی عوبەید دەفەرموێ: (هەموو قەرزێ کە کەڵکی هەبێ بۆ خاوەنی قەرزەکە، ئەوە شێوەیەکە لەشێوەکانی سوود).

٨٨٣- وَآخَرُ مَوْقُوفٌ عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ سَلَامٍ عِنْدَ اَلْبُخَارِيِّ.

{البخاری/٣٦٠٣، ٣٨١٤}:

ئەبو بوردە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: چووم بۆ مەدینە، بە خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام گەیشتم، پێی فەرمووم: بابچین بۆ ماڵەوە، لەوێ قاوتو خورما بخۆ. لەپاشا فەرمووی: تۆ لەوڵاتێکیت، سووخۆری لەوێ باویەتی، ئەگەر مافێ، شتێکت لەسەر کەسێ بوو، بەو بۆنەیەوە، بارێ کا، یا بارێ جۆ، یا بارێ گیای، بەدیاری هێنا بۆت، وەری مەگرە لێی چونکە ئەوە سوووودە.

## ٤٤- باسی نابووتبوونو لاتکەوتنو دەستبەست (حیجر)

## بَابُ: التَّفْلِيسِ وَالحَجْرِ

٨٨٤- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری: ٢٤٠٢. پوختەی موسلیم/٩٦٥ = شیحا/٣٩٦٨ = مسلم/١٥٥٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ خودی ماڵی خۆی، بەسەر گرتەوە،

لەلای پیاوێکی لاتکەوتوو، ئەوە هی خۆیەتیو بەو ڕەواترە هەتا کەسێکی تر).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٦٥، ژمارە: ١٨٩٤}.

٨٨٥- وَرَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَمَالِكٌ: مِنْ رِوَايَةِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ مُرْسَلًا بِلَفْظِ: {أَيُّمَا رَجُلٌ بَاعَ مَتَاعًا فَأَفْلَسَ اَلَّذِي اِبْتَاعَهُ، وَلَمْ يَقْبِضِ اَلَّذِي بَاعَهُ مِنْ ثَمَنِهِ شَيْئًا، فَوَجَدَ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، وَإِنْ مَاتَ اَلْمُشْتَرِي فَصَاحِبُ اَلْمَتَاعِ أُسْوَةُ اَلْغُرَمَاءِ}. وَوَصَلَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ، وَضَعَّفَهُ تَبَعًا لِأَبِي دَاوُدَ.

{مالك/٢/٦٧٨. أبو داود/٣٥٢٠. بيهقى/٦/٤٦}:

ئەبو داوودو مالیك (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) لەگێڕانەوەی ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان بە مورسەلی دەگێڕنەوە، بەم بێژەیە: (هەر پیاوێ شتێکی بەکەسێ فرۆشت، دوایی کڕیار لاتکەوت، لەهەمان کاتدا فرۆشیار لە بەهاکەی هیچی وەرنەگرتبوو، وەخودی ماڵی خۆی بەسەر گرتەوە لەلای ئەو پیاوە، ئەوە هی خۆیەتیو بەخۆی ڕەواترە، تا کەسێکی تر، بەڵام ئەگەر کڕیار مرد، ئەوسا فرۆشیار شتەکەی خۆی بەسەر گرتەوە لەلای، ئەوە ئەو شتە ناوکۆییە لە نێوانی خاوەن قەرزەکاندا.

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەیهەقی ئەم فەرموودەیەی بە موتتەصیلی، واتە: بە مەرفووعی، گێڕاویەتەوە، وە بەلاوازی داناوە، لەوەدا شوێن ئەبوداوود کەوتووە.

٨٨٦- وَرَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ: مِنْ رِوَايَةِ عُمَرَ بْنِ خَلْدَةَ قَالَ: أَتَيْنَا أَبَا هُرَيْرَةَ فِي صَاحِبٍ لَنَا قَدْ أَفْلَسَ، فَقَالَ: لَأَقْضِيَنَّ فِيكُمْ بِقَضَاءِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى الله

عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ أَفْلَسَ أَوْ مَاتَ فَوَجَدَ رَجُلٌ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِـهِ} وَصَـحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَضَعَّفَ أَبُو دَاوُدَ هَذِهِ اَلزِّيَادَةَ فِي ذِكْرِ اَلْمَوْتِ.

{أبو داود: ٣٥٢٣. ابن ماجة/٢٣٥٨. حاكم/٢/٥٨}:

عومەری کوڕی خەلدە فەرمووی: چووین بۆلای ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزمان کرد: برادەرێکمان هەیە، شتمان لەلایەتیو ئێستا لات کەوتووە، ئەمە چی لێ بکەین؟ فەرمووی: لەم پرسەی ئێوەدا، ئەو بڕیارە دەدەم، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی خۆی دەیدا کە ئەمەیە:

(کەسێ لات کەوتوو نابووت بوو، یا مرد، کەسێکی تر ماڵی خۆیی لەلای ئەو کەسە نابوووتە، یا مردووە، بەسەرگرتەوە، ئەوە خۆی لەپێشترە بەو ماڵە، هەتا کەسێکی تر).

حاکم گێڕاویەتەوەو بە تەندروستی دداناوە، بەڵام ئەبوداوود بە لاوازی داناوە، بەتایبەتی ئەو زیادەیەی کە لە فەرموودەکەدا، لەبارەی مردنەوە هەیە، کە دەفەرموێ: (...لەلای ئەو کەسە نابووتە (مردووە) بەسەر گرتەوە). {ضعيف الجامع/٥٤٦٣}.

٨٨٧- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ اَلشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { لَيُّ اَلْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَعَلَّقَهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/٤/٢٢٢/١٨١١٠. أبو داود: ٣٦٢٨. ابن ماجة/٢٤٢٧. نسائي/٧/٣١٦ وفي الكبرى/٦٢٤٢. بوخاری عَقِبَ رقم: ٢٤٠٠} + {البخاري تعليقاً قَبْلَ رقم: ٢٤٠١ في المساقاة}:

عەمری کوڕی شەرید (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەرچەوتی دارا

هەم ئابڕووی دەباو هەم سزادانی حەڵاڵ دەکا!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ١٨٨٩ چاپی چوارەم }.

(ڕوونکردنەوە):

عەمری کوڕی شەرید خۆی لەپەیڕەوانە، واتە: تابیعیە، لەهۆزی ثەقیفە، دادەنرێ بەخەڵکی طائیف، باوکی هاوەڵی پێغەمبەرە، ناوی (الشریدُ بن سوید الثقفی) خەڵکی حەزرەمەوتە، لەبنەڕەتدا، هەندی تر دەڵێن لەبنەڕەتدا خەڵکی حیجازە، شەرید دەفەرموێ: لەسەفەرێکا، نزیکەی سەد شیعری ئومەییەی سەلتم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندەوە جا پێغەمبەر فەرمووی: (وەك لە شێعرەکانیەوە دەردەکەوێ، ئومەییە ئەوەندەی نەماوە، کە بە موسوڵمان دابنرێ!).

٨٨٨- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي ثِمَارٍ اِبْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ " فَتَصَدَّقَ اَلنَّاسُ عَلَيْهِ، وَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِغُرَمَائِهِ: " خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٩٢٢ = شیحا/٣٩٥٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ بەری باخی کڕی، لەپاشا بەرەکە فەوتاو پیاوەکە تێ شکاو بوو بەژێر قەرزو قۆڵەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە داواکە بەرزەوە کرا بۆلای، فەرمووی: (خێری پێ بکەن‌و زەکاتی پێ بدەن!).

خەڵکەکەیش وایان کردو خێرو زەکاتیان پێ دا، بەڵام ئەو ئەندازەیەی کە دایان پێی، بەشی بژاردنی قەرزەکەی نەکردبەتەواوی، جا حەزرەت

(دروودی خودای لەسەر بێ) بەخاوەن قەرزەكانی فەرمووی: (چیتان دەست كەوتووە بیبەن، ئیتر هەر ئەوەتان دەكەوێ‌و بەس). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠ چاپی چوارەم}.

٨٨٩- وَعَنِ اِبْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ" (رضى الله عنه): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حَجَرَ عَلَى مُعَاذٍ مَالَهُ، وَبَاعَهُ فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَيْهِ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ مُرْسَلًا، وَرُجِّحَ.

{أبو داود في المراسيل/١/١٦٢. حاكم. رقم: ٢٣٤٨. بيهقي. رقم: ١١٠٤١. دار قطني/٤/٢٣٠}:

ئیبنو كەعبی كوڕی مالیك (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: موعاذی كوڕی جەبەل، قەرزار بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حیجری دانا لەسەر ماڵەكەی، دوایی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ماڵەكەیی فرۆشت بۆ بژاردنەوەی قەرزەكەی سەری.

(ڕوونكردنەوە):

كەعبی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) تاقانەی باوكی بوو، ناودارە بە (كەعبی شاعیر) یەكێكە لەشاعیرە ناودارەكانی موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا، یەكێكە لەو سێ كەسەی كە ئەم ئایەتە لەبارەیانەوە هاتووە:

{وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ - التوبة/١١٨}.

هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، چوار فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەكۆتایی تەمەنیدا كوێر بوو بوو، عەبدوڵڵای كوڕی چاوساغی بوو، لەسەر فەرمایشتی مامۆستای عەینی، دانەری (عمدة القاری شەرحی صەحیحی

بوخاری) لەساڵی پەنجای کۆچیدا، لەمەدینە مردووە {بڕوانە: ریاض/١/٣٤، ژمارە: ٢١ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٢٨}.

ئەم کوڕەی کە ئەم فەرموودەیەی ئێرەی دەگێڕێتەوە، ناوی عەبدولڕەحمان بوو، عەبدولڕەحمان لە کوتوبو سیتتەدا گێڕانەوەی هەیە، گێڕانەوەی لەکەعبی باوکیو عەبدوڵڵای برایو جابیرو عائیشەو کەسانی تریشەوە هەیە.

٨٩٠- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: { عُرِضْتُ عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ أُحُدٍ، وَأَنَا اِبْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعُرِضْتُ عَلَيْهِ يَوْمَ اَلْخَنْدَقِ، وَأَنَا اِبْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَأَجَازَنِي} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبَيْهَقِيِّ: " فَلَمْ يُجِزْنِي، وَلَمْ يَرَنِي بَلَغْتُ ". وَصَحَّحَهَا اِبْنُ خُزَيْمَةَ.

{تجريدی بوخاری/٣/١١٢٣ = ٢٦٦٤، ٤٠٩٧ بوخاری. پوختەی موسلیم/١١١٤ = ٤٨١٤ = شیحا/٤٨١٤ = صحیح ترقیم محمد فؤاد/١٨٦٨}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود چواردەساڵ بووم، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) تەماشای کردم تا بزانێ بەکەڵکی جەنگ دێم یانا، بەڵام لەبەر بچووکی تەمەنم بەگەندی نەکردم، بەڵام ڕۆژی غەزای خەندەق پازدەساڵ بووم، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەمان مەبەست تەماشای کردمو هەڵی سەنگاندمو ڕێگەی پێ دام، کە هاوبەشی بکەم لەو نەبەردەدا.

نافیع فەرمووی: عومەری کوڕی عبدولعزیز، کاتێ جێنشین بوو، واتە: خەلیفە بوو، چووم بۆ سەردانیو ئەم فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆی، جا عومەری کوڕی عەبدولعزیز فەرمووی: ئەم چیرۆكو سەرگورشتەیە، ڕادەو سوونری جیاکردنەوەی بچووكو گەورەیە لەیەکتری، جا بۆیە نامەی نووسی بۆ سەرکارو کارمەندەکانی لەسەر ناوچەو دەڤەرەکانیان:

(كه ئەوەی تەمەنی پازده ساڵی تەواو كردووه، بەشی بۆ دابنێن و لەخێرو شەڕدا، حسێبی پیاوی بۆ بكەن، ئەوەیشی كه تەمەنی لەوه كەمتر بێ، دای بنێن بە وردەخێزان و لەچاك و لەخراپا، حاڵی حاڵی مناڵە!). {تاج/١، زنجیره: ٥١، ژماره: ٣٧٩ – ش/د/ت/ن} .

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەگێڕانەوەیەكی بەیهەقیدا، كه ئیبنو خوزەیمه بەتەندروستی داناوه دەفەرموێ: ئیبنو عومەر فەرمووی: مۆڵەتی نەدام كه هاوبەشی بكەم لەو نەبەردەدا، چونكه وای دانام كه رەسیده (باڵغ) نەبووم.

٨٩١– وَعَنْ عَطِيَّةَ اَلْقُرَظِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {عُرِضْنَا عَلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَوْمَ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُهُ، فَكُنْتُ فِيمَنْ لَمْ يُنْبِتْ فَخُلِّيَ سَبِيلِي} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{نسائی/٦/١٥٥. صحيح، سنن أبي داود: ٤٤٠٤} :

عەطییەی قورەظی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی غەزای بەنی قورەیظە، ئێمە كه ئەوسا هێشتا جووڵەكه بووین، یەكە یەكە نیشانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەدراین، هەتا مناڵ لەپیاو جیابكرێتەوه، جا ئەو جووڵەكەیەی كەبەری مووی لێ هاتبوو دەكوژرا، ئەوەیشی كەبەری مووی لێ نەهاتبوو بەرەڵڵا دەكرا، من خۆم یەكێك بووم لەوانه كەهێشتا موویان لێ نەهاتبوو، بۆیه بەرەڵڵا كرام. {تاج/٢، زنجیره: ١٥، ژماره: ٢٠٠٨ – ت – س – ص - ن} .

بێژەی نەسائی ئاوایه: ئیتر ئەوەی كه رەسیده بوو بوو، وه شەیتانی بوو بوو، یا بەری مووی لێ هاتبوو دەكوژرا، وه ئەوەیشی كه وەها نەبوو وازی لێ دەهێنرا.

(ڕوونکردنەوە):

عەطییەی قورەزی نازانرێ، ناوی باوکی چییە، کاتێ جوولەکەکانی بەنی قورەیزە خۆیان دا بەدەستەوە، ئەویش دیل دەکرێ، ئەوکاتە لەبەر ئەوەی مێرد منالْ بووەو ڕەسیدە نەبووە بەرەڵلا کراوەو نەکوژراوە، لەکووفە نیشتەجێ بوو، دادەنرێ بەصەحابەی پێغەمبەر، ئەصحابوسونەن فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە.

٨٩٢- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ عَطِيَّةٌ إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا} وَفِي لَفْظٍ: {لَا يَجُوزُ لِلْمَرْأَةِ أَمْرٌ فِي مَالِهَا، إِذَا مَلَكَ زَوْجُهَا عِصْمَتَهَا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَصْحَابُ اَلسُّنَنِ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{احمد/٦٦٨١. ترمذی: ١٣٩٠. نسائی/٢٣٣٢}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دروست نییە هاوسەر شتی مێردی ببەخشێ، مەگەر مێردەکەی ڕێگەی پێ بدا). لە (لەفظ = گوتە)یەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ ژن تەصەروف لەماڵی خۆیدا بکا، کاتێ مێرد بوو بەخاوەنی ئەو ژنە).

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەدو ئەصحابی سونەن، کە ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائین، بێجگە لە تەرمەزییان ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، حاکم بە صەحیحی داناوە. تکایە بڕوانە: ژمارە: (٦٥٦ + ٦٥٧) کە لە زنجیرە: (٢٩)دا ئەم دوو ژمارەیە ڕابوردن.

زۆرینەی زانایان و ڕاڤەنووسان دەفەرموون:

٢- مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوە نییە کە ژنی مێرددار لەماڵی خۆیدا دەستبەستی شەرعی بخرێتە سەرو نەتوانێ بەبێ ڕەزاو مۆڵەتی مێردەکەی،

نەتوانێ شتێ لەماڵی خۆی ببەخشێ، یا بیکا، بەخێر، یا بیفرۆشێ، هەتا هەر گەردان (تصرف)ێکی تری تیادا بکا، بەڵکوو مەبەست لەم فەرموودەیە، یەکێکە لەم دوو مەبەستە، یا مەبەست ئەم دوو مەبەستە هەردووکیانە:

آ- ئەگەر ژنەکە داناو زاناو ژیرو هۆشیار نەبوو، بەڵکوو کەودەنو مامەڵەنەزان بوو، وە قازانجو زیانی خۆیی بەباشی نەدەزانی، وەك منداڵو شێت، ئەوە لەم کاتەدا مێردەکەی مافی ئەوەی هەیە، کەنەهێڵێ زیان لەخۆیو لەمێردەکەی بدات، چونکە سوودی ماڵی ژن، هەروا سوودی ماڵی پیاو بۆ هەردووکیانە.

ب- یا مەبەست ئەوەیە، کە ژنەکە دڵی مێردەکەی بداتەوەو دڵی ڕابگرێو هەرچی دەکەن بەڕاوێژو تەگبیری هەردوولایان بێ، چونکە ماڵ، چی هی پیاو بێ، چی هی ژن بێ وەکوو ناوکۆیی وەهایە لەنێوانی هەردووکیانا، زیان لەماڵی پیاو، زیانە بۆ پیاوەکەیشو بۆ ژنەکەیش، هەروا زیان لەماڵی ژن، زیانە لەهەردوولایان.

٨٩٣- وَعَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ اَلْهِلَالِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَلْمَسْأَلَةَ لَا تَحِلُّ إِلَّا لِأَحَدِ ثَلَاثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا ثُمَّ يُمْسِكَ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اِجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُولَ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَى مِنْ قَوْمِهِ: لَقَدْ أَصَابَتْ فُلَانًا فَاقَةٌ، فَحَلَّتْ لَهُ اَلْمَسْأَلَةُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم/٥٦٨ = ٢٤٠١ = مسلم تەرقیم (شیحا = الشیخ خلیل مەئموون شیحا) = صحیح مسلم ترقیم محمد فؤاد: ١٠٤٤}:

قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باربوویەکم لەئەستۆی خۆم گرتبوو. واتە: چووبوومە ژێر چەردەیێ ماڵی بڕیاردراو، کەبیدەم لەپێناوی ناوبژیکردنی دوو دەستەی ناکۆکا. جا بۆ ئەم مەبەستە، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە داوای

پیتاکم لێی کرد بۆ ئەم مەبەستە: فەرمووی پێم (درودی خودای لەسەر بێ) (بمێنەرەوە تا زەکاتمان بۆ دێ، لەوە بەشت دەدەم بۆ ئەو کارە کەپێی هەڵدەستێت، ئەنجا فەرمووی: (ئەی قەبیصە! دەرووزەو پیتاك کۆکردنەوە دروست نییە، بۆ ئەم سێ مەبەستە نەبێ:

یەکەم: بۆ پیاوێ دروستە کە چووبێتە ژێر ئەندازەیەك ماڵ بۆ کوژانەوەی ئاژاوەیەك، بۆ ئەمە دروستە کە ئەوەندە پیتاكو یارمەتی کۆبکاتەوە تا ئەو ئەندازە دیاری کراوە پەیدا دەکاو بەس، ئیتر دەبێ واز بهێنێ.

دووەم: بۆ پیاوێکیش کە قورتێکی هاتبێ بەسەرداو، هەژار کەوتبێ، بۆ ئەویش دروستە کە ئەوەندە پیتاك کۆبکاتەوە، هەتا گوزەرانی پێ دەکاو ژیانی پێی دەچێ بەڕێوە.

سێیەم: بۆ پیاوێکیش کە (٣) سێ پیاوی هۆشیار، لەهۆزی خۆی، شایەتی بۆ بدەن، کەفیسارەکەس هەژارو نابووت بووە، جا بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە باربوویی وەربگرێ، تا گوزەرانی پێی بچێ بەڕێوە.

یا فەرمووی: (تا گوزەرانی پێ دەکات، ئەی قەبیصە! ئیتر لەمانە بترازێ سواڵو دەرووزەوشت کۆکردنەوە بەناوی یارمەتییەوە، ناڕەوایەو نادروستەو خاوەنەکەی بەناڕەوایی دەیخوات!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٢٤٧ چاپی چوارەم} .

قەبیصەی کوڕی موخاریقی عەبدوڵڵای کوڕی شەددی هیلالی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەبەصرە نیشتەجێ بوو، لەبنەماڵەیەکی خانەدان بوو، لەئەفرادی موسلیمە واتە: لە صەحیحەیندا، هەر لەموسلیمدا فەرموودەی هەیە، لە صەحیحی بوخاریدا فەرموودەی نییە، یەکێ لەڕاویەکانی قەطەنی کوڕی خۆی بوو، یەکێ تریان ئەبو عوسمانی نەهدی بوو. {بڕوانە: ژمارە: ٦٦٤} .

## ٤٥- باسی ڕێکەوتن
## باب: الصُّلحْ

٨٩٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ اَلْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { اَلصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ اَلْمُسْلِمِينَ، إِلَّا صُلْحاً حَرَّمَ حَلَالاً وَ أَحَلَّ حَرَاماً، وَالْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ، إِلَّا شَرْطاً حَرَّمَ حَلَالاً وَأَحَلَّ حَرَاماً} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ. وَأَنْكَرُوا عَلَيْهِ". لِأَنَّ رَاوِيَهُ كَثِيرَ بْنَ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ ضَعِيفٌ. وَكَأَنَّهُ اِعْتَبَرَهُ بِكَثْرَةِ طُرُقِهِ.

{ترمذی رقم: ١٣٥٢. بیهقی رقم: ١١١٣٤. حاكم رقم: ٧٠٥٩. دار قطنی/٢٧/٣، رقم: ٩٨}:

عەمری كوڕی عەوفی موزەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەناو موسوڵمانانا ڕێككەوتن دروستەو ڕەوایە، بەتایبەتی بۆ كردنەوەی كێشە كۆمەڵایەتییەكان، بێجگە لەو ڕێككەوتنەی كە ڕەوا بكا بەناڕەوا، یان ناڕەوا بكا بە ڕەوا، وە موسوڵمانان لەسەر مەرجی خۆیانن، مەرگەر مەرجێ كە حەڵاڵ حەرام بكا، یا حەرام حەڵاڵ بكا.

{تاج/٢، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ١٨٧٤ چاپی چوارەم}.

(ڕوونكردنەوە):

عەمری كوڕی عەوفی كوڕی زەیدی موزەنی هاوەڵی پێغەمبەرە، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مردووە، لە موسوڵمانە دێرینەكانە، گێڕانەوەی لە پێغەمبەرەوە هەیە، بوخاری بەتەعلیق گێڕانەوەی لێیەوە ئەنجام داوە.

٨٩٥- وَقَدْ صَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ.

{صحیح سنن الترمذی/١٣٥٢}:

گێڕانەوەكەی ئیبنو حیببان ئاوایە:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕێککەوتن و صوڵح، لەناو موسوڵمانانا دروستە، مەگەر ڕێکەوتنێ کەڕەواو دروستە بکا بەناڕەواو نادروست یا ناڕەواو نادروست بکا بە ڕەواو دروست).

٨٩٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " قَالَ: {لَا يَمْنَعُ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ ". ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟ وَاَللَّهِ لَأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٣، لاپـەڕە: ١٦١، ژمـارە: ١٠٦٩ = ٢٤٦٣، ٥٦٢٧، ٥٦٢٨ بوخاری. پوختەی موسـلیم/٩٦٩ = شـیحا/٤١٠٦ = صـحیح موسـلیم تـرقیم فؤاد/١٦٠٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ڕێگـەی دراوسـێ بـدەن کـە سـەری دەسـتەك و گوێـسەوانە لەسـەر دیـواری ئێـوە دابنـێن). لەپاشـا ئـەبو هـورەیرە فەرمووی: ئەوە بۆچی دەتان بینم لووتەلان لەم فەرمایشتە! دەمسا بەیەزدانی پاك خۆشیتان بێ و ترشیتان بـێ، مـن ئـەرکی سەرشانی خـۆم بـەجێ دەهێـنمو ئەم فەرمایـشتو ئامۆژگارییانـە وەك گـوڵمێخ دەکوتم بـەناو شانتانا. {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٦}.

٨٩٧- وَعَنْ أَبِي حُمَيْدٍ اَلسَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ أَنْ يَأْخُذَ عَصَا أَخِيهِ بِغَيْرِ طِيبِ نَفْسٍ مِنْـهُ} رَوَاهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ فِي " صَحِيحَيْهِمَا ".

{احمد/٥/٤٢٥. بیهقی/٦/١٠٠. رقم: ١١٣٠٥ابن حبان/٥٩٧٨}:

ئـەبو حومەیـدی ساعیدی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (دروسـت نییـە بـۆ موسـوڵمان کـەدار

دەستێ بەو بێ ئەهمییەتە، بەناڕەوا لەبرای موسوڵمانی خۆی بستێنێ، مەگەر بەرەزای خۆی).

## بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحيم
## ٤٦- هەواڵەو بەرەو ڕووو کردنەوەو دەستەبەری
## بابُ: الحَوَالَةِ والضَّمانِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم زنجیرە: ٢١٤ لاپەڕە: ٥٧١ + زنجیرە: ٢١٥ لاپەڕە: ٥٢٤ + تجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٨٩، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ١٠٠٨ هەتا ژمارە: ١٠٠٩ + تاج/٢، زنجیرە: ١٦٦، ژمارە: ١٨٩٧ هەتا ١٩٠٠}.

٨٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَطْلُ اَلْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةِ أَحْمَدَ: {فَلْيَحْتَلْ}.

{تجریدی بوخاری/٣، زنجیره: ٤٣، ژماره: ١٠٠٨ = ٢٢٨٧، ٢٢٨٨، ٢٤٠٠ بوخاری. پوختەی موسلیم ٩٦٢ = شیحا ٣٩٧٨ = مسلم/١٥٦٩. أبوداود. بیوع: ٣٣٤٥. نسائی. بیوع: ٤٧٠٥. ریاض/٤، زنجیره: ٢٨٤، ژماره: ١٦١١/١٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەری نازدارو خۆشەویستەوە، دەفەرموێ: (قەرزکوێریی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە، زۆر ناڕەوایە، ئەگەر ڕێکەوت کەسێکتان لەلایەنی قەرزاری خۆیەوە، بەرەو ڕووی کەسێکی دەوڵەمەند کرایەوە، کە ئەوکەسە دەوڵەمەندە، لەباتی قەرزارەکەی خۆی، قەرزەکەی پێ بداتەوە، ئەوە بابچێ قەرزەکەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٦، ژمارە: ١٨٩٧، ج/٤ - چاپی چوارەم}.

لەگێڕانەوەیەکی ئیمامی ئەحمەددا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێ لەئێوە شتێکی لەسەر کەسێ هەبوو، وە ئەو

کەسە ناردی بۆ سەر کەسێکی ترو رووبەڕووی کەسێکی تری کردەوەو پێی گوت برۆ ئەو مافەی هەتە لەسەر من لەفیسارەکەسی وەربگرەوە، ئەوە لەکاتی وادا بابچێ مافەکەی لەکەسی دووەم وەربگرێ).

٨٩٩- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {تُوُفِّيَ رَجُلٌ مِنَّا، فَغَسَّلْنَاهُ، وَحَنَّطْنَاهُ، وَكَفَّنَّاهُ، ثُمَّ أَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقُلْنَا: تُصَلِّي عَلَيْهِ؟ فَخَطَا خُطًى، ثُمَّ قَالَ: " أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟ " قُلْنَا: دِينَارَانِ، فَانْصَرَفَ، فَتَحَمَّلَهُمَا أَبُو قَتَادَةَ، فَأَتَيْنَاهُ، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: اَلدِّينَارَانِ عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " أُحِقَّ اَلْغَرِيمُ وَبَرِئَ مِنْهُمَا اَلْمَيِّتُ؟ " قَالَ: نَعَمْ، فَصَلَّى عَلَيْهِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أحمد/٣/٣٣٠، أبوداود رقم: ٣٣٤٣. نسائي رقم: ١٩٦٢. ابن حبان رقم: ٣٠٦٤. حاكم/٢/٦٦}.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەئێمە مرد، جا شۆردمانو حەنووتو بۆنمان لێ داو کفنمان کرد، ئەوجا بردمان بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا نوێژی مردووی لەسەر بکەین لەپشت پێغەمبەرەوە بەجەماعەت، وە عەرزی پێغەمبەرمان کرد: بفەرموو نوێژی تەرمی لەسەر بکە، ئەویش چەند هەنگاوێکی نا کەبچێ نوێژی لەسەر بکا، ئەوجا فەرمووی: ئایا قەرزی لەسەرە یان نا؟ گوتمان: بەڵێ دوو لیرەی زێڕی لەسەرە. فەرمووی: (دە خۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن) پێغەمبەر گەڕایەوە، هەتا ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەو دوو لیرە قەرزە لەسەر من، من دەیاندەمەوە ئەی پێغەمبەری خودا!).

پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مافی خاوەن قەرزەکە بەتەواوی جێبەجێ دەکەی؟) ئەبو قەتادە فەرمووی: بەڵێ.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوا گەردنی مردووەکە لەو دوو لیرەیە ئازاد بوو).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر کرد. {تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٤٩ = ٢٣٩٩، ٢٢٩٨، ٤٧٨١، ٥٣٧١، ٦٧٣١، ٦٧٤٥، ٦٧٦٣ بوخاری. پوختەی موسلیم ژمارە: ٩٩٩ = شیحا ٤١٣٣} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ١٨٩٢ — ش/د/ت/ن + ژمارە: ٤١٠ لەپوختەی موسلیم}.

٩٠٠- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ اَلْمُتَوَفَّى عَلَيْهِ اَلدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: "هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟ " فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلَّا قَالَ: " صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ " فَلَمَّا فَتَحَ اَللَّهُ عَلَيْهِ اَلْفُتُوحَ قَالَ: "أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {فَمَنْ مَاتَ وَلَمْ يَتْرُكْ وَفَاءً}.

{تەخریجەکەی لەصەحیحەیندا، لە ژمارە: (٨٩٩)دا، لەپێشەوە رابورد}.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو، تەرمی مردوویان دەهێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا نوێژی مردووی لەسەر بکا، وادەبوو مردووەکە قەرزار بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەوەندەی ماڵ لەپاش خۆی بەجێ هێشتووە کە بەشی دانەوەی قەرزەکەی سەری بکات؟).

جا ئەگەر عەرزیان بکردایە: بەڵێ، ئەوا نوێژی لەسەر تەرمەکەی دەکرد، دەنا ئەگەر بیانگوتایە ئەوەندەی ماڵ لەپاش بەجێ نەماوە کە بەشی دانەوەی قەرزەکەی سەری بکات بەتەواوی، دەیفەرموو: (دەی کەوایە خۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن!).

بەڵام بەرەبەرە کەخودای گەورە دەرووی دارایی، بەهۆی فتوحاتو وڵات ڕزگار کردنەوە، لە حەزرەت کردەوە، مردوو ئەگەر قەرزاریش بوایە، نوێژی لەسە دەکردو ئاماژە بەئایەتی {النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ – سورة الأحزاب/٦}

دەیفەرموو: (من دڵسۆزترو لەپێشترم بۆ گشت موسوڵمانێ، لەهەموو کەسێکی تر، هەتا لەخودی خۆشی لەپێشترم بۆی، جا ئەگەر موسوڵمانێ مردوو، قەرزار بوو، وە قەرزی لەسەر بوو، ئەوە قەرزەکەی لەسەر من، ئەگەر خۆی ماڵی لەپاش بەجێ نەمابوو، من قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر ماڵی تری لەپاش بەجێ مابوو، ئەوە بۆ کەلەپوور بەرەکانیەتی!).

٩٠١- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا كَفَالَةَ فِي حَدّ} رَوَاهُ اَلْبَيْهَقِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف الجامع: ١٣٠٩}:

لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دەستەبەر بوون لەحەددی شەرعیدا دانامەزرێ!).

(ڕوونکردنەوە):

وەك ئەوە کەسێ حەددی دەستبڕینی لەسەر بێ، لەبەر ئەوەی دزی کردووە، ئەگەر کەسێ گوتی: دەستەبەرم کە ئامادەی بکەم بۆ دەستبڕین، ئەگەر ئامادەیم نەکرد، دەستی من ببڕن لەجیاتی ئەو!

ئەم جۆرە دەستەبەرییە دانامەزرێ بەپێی فەرموودەکە.

## ٤٧- باسی هاوبەشیو سەرکاریی
## بابُ: الشَّرِكَةِ وَالوَكَالةِ

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١٦١، لە ژمارە: ١٨٦٦وە هەتا ژمارە: ١٨٧٣ + تجریدی بوخاری/٣ لە ژمارە: ١٠١٢وە هەتا ژمارە: ١٠١٨ + زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١٠٧٥ هەتا ژمارە: ١٠٨٠}.

٩٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {قَالَ اَللَّهُ: أَنَا ثَالِثُ اَلشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَإِذَا خَانَ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِمَا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أبوداود: ٣٣٨٣. حاكم/٢/٦٠. بيهقى ٦/٧٨، رقم: ١١٢٠٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە دەفەرموێ: هەموو دوو هاوبەشێ من كەسی سێیەمیانم، واتە: لەپشتیانم بەو مەرجە كە گزیو دەستپیسی لەیەكتری نەكەن، بەڵام هەركاتێ گزییان لە یەكتری كردو لەگەڵ یەكا ناپاك بوون، ئیتر من لەبەینیان دەردەچمو شەیتان دەبێ بەهاوبەشیان). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ١٨٦٦}.

٩٠٣- وَعَنْ اَلسَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ اَلْمَخْزُومِيِّ {أَنَّهُ كَانَ شَرِيكَ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَبْلَ اَلْبَعْثَةِ، فَجَاءَ يَوْمَ اَلْفَتْحِ، فَقَالَ: "مَرْحَباً بِأَخِي وَشَرِيكِي} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَةَ.

{أحمد/٣/٣٢٥/١٥٥٨٧. أبوداود: ٤٨٣٦. ابن ماجة: ٢٢٨٧}:

سائیبی مەخزوومی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەپێش ئەوەدا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ببێ بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من هاوبەشی بووم پێكەوە شتمان دەكڕیو دەمانفرۆشتو بازرگانیمان دەكرد، لەرۆژی ئازاد كردنی مەككەدا، كەهات فەرمووی پێم: (مەرحەبا لەبرای خۆشەویستمو لەهاوبەشی باشم).

(ڕوونكردنەوە):

سائیبی كوڕی ئەبو سائیب، لەموئەللەفەتول قولوبە، بەڵام موسوڵمانێكی جوانی لێ دەرچوو، تەمەنی زۆر درێژ بوو، هەتا سەردەمی مەعاوییە ژیاوە، خۆی دەیگوت: لەپێش هاتنی ئیسلاما لەگەڵ پێغەمبەردا، بەهاوبەشی بازرگانیمان دەكرد.

٩٠٤- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {اِشْتَرَكْتُ أَنَا وَعَمَّارٌ وَسَعْدٌ فِيمَا نُصِيبُ يَوْمَ بَدْرٍ..} اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ النَّسَائِيُّ وَغَيْرُهُ.

{نسائي/٥٧/٧. أبوداود: ٣٣٨٨. ابن ماجة: ٢٢٨٨}:

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منو عەمماری كوڕی یاسیرو سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص لەڕۆژی غەزای بەدردا بووین بەهاوبەشو بڕیارماندا: هەرچیمان دەست كەوت بەیەكسانی دابەشی بكەین لەناو خۆمانا.

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصول دا ئاوایە:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: منو عەممارو سەعد بووین بەهاوبەشو بڕیارماندا: هەرچیمان دەست كەوت لەڕۆژی غەزای بەدردا بۆ هەموومان بێ. ئەوەبوو سەعد دوو دیلی گرتو هێنای، بەڵام منو عەممار هیچمان دەست نەكەوت ئیتر ئەو دوو دیلەمان بەش كرد بۆ هەرسێكمان. {تاج/٢/١٦١، ژمارە: ١٨٦٨ - ن - سند منقطع — ن}.

٩٠٥- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {قَالَ: أَرَدْتُ اَلْخُرُوجَ إِلَى خَيْبَرَ، فَأَتَيْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "إِذَا أَتَيْتَ وَكِيلِي بِخَيْبَرَ، فَخُذْ مِنْهُ خَمْسَةَ عَشَرَ وَسْقًا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَصَحَّحَهُ.

{أبوداود: ٣٦٣٢}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لە تاجدا:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ویستم بچم بۆ خەیبەر، چووم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سڵاوم لێ كردو عەرزیم كرد: نیازم هەیە بچم بۆ خەیبەر، فەرمووی: كەچوویتە لای سەركارەكەم پازدە وەسقی لێ وەربگرە، ئەگەر داوای نیشانەی لێ كردیت

دەستت دابنێ لەسەر ددانەی سینەی. (ضَعْ يَدَكَ عَلَى ترقُوَتِه – ژمارە: ١٨٧٢، تاج/٢، زنجیرە: ١٦١).

٩٠٦– وَعَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَعَثَ مَعَهُ بِدِينَارٍ يَشْتَرِي لَهُ أُضْحِيَّةً..} اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ فِي أَثْنَاءِ حَدِيثٍ، وَقَدْ تَقَدَّمَ.

{لە ژمارە: ٨٣٩ دا وەرگەڕاوەکەی ڕابورد بەتەواوی}:

٩٠٧– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {بَعَثَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عُمَرَ عَلَى اَلصَّدَقَةِ..} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٢/١٢٩، ژمارە: ٧٠٦ = ١٤٦٨ بوخارى. پوختەى موسليم ٥٠٥ = شيحا ٢٢٧٤ = صحيح مسلم ٩٨٣. نسائى. زكاة/٢٤٦٦. أبوداود. زكاة/١٦٢٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عومەری کوڕی خەطابی نارد، کردی بەسەرکاری سەر زەکات، کە کۆی بکاتەوە، گوترا: ئیبنو جەمیلو خالیدی کوڕی وەلیدو عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زەکاتەکەیان نەداوە!!

کەئەم هەواڵە درا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبنو جەمیل تۆڵەی ئەوە دەستێنێ، کە لەپێش ئیسلام بوونیدا هەژار بوو، لەپیتو فەڕی ئیسلامەو لەسایەی خوداو پێغەمبەرەوە، ئێستا دەوڵەمەند بووە، واتە: ئەم کارەی ئیبنو جەمیل، ئەوپەڕی سپڵەییو پێنەزانییە، بەڵام ئێوە ناهەقی لەخالیدی کوڕی وەلید دەکەن، چونکە خالید تەنانەت زریەکەیو چەكو تفاقی جەنگی خۆی تەرخان (وەقف) کردووە لەڕێگەی خودادا، ئیتر چۆن زەکات نادات، عەبباسی کوڕی عەبدول موتتەلیبیش، کەهەق مامەی منە، کە پێغەمبەری خودام، بەڵێنتان دەدەمێ ئەو زەکاتەی کە لەسەریەتی دەیدات، وە ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا دەبێ بدات).

ئـەوجا فـەرمووی: (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) (ئـەی عومـەر! ئـەوە نازانی کەمامەی پیاو لەجێی باوکیەتی؟). {بۆ باسی ئیبنـو جەمیل بڕوانـە: تجریدی بوخاری/٢/٧٠٦}.

٩٠٨- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَحَـرَ ثَلَاثًا وَسِتِّينَ، وَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يَذْبَحَ اَلْبَاقِيَ} اَلْحَدِيثَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم محمد فؤاد/١٢١٨}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: ئینجـا پێغەمبـەر (درورودی خـودای لەسـەر بـێ) ڕۆیـشت بـۆ کوشـتنگا (مەنحـەر: کوشـتارگە: قەسـابخانە)کـەو لـەوێ بەدەسـتی خـۆی شەسـتو سـی وشـترى سـەربڕی، ئینجـا چـەقۆکەی دا بەعـەلیو عـەلیش بـاقی مەنـدەی وشـترە دیارییەکانی پێغەمبەری سەربڕی، وە پێغەمبەر (درورودی خودای لەسـەر بێ) عەلی کرد بەهاوبەشی خۆی لەم وشترە دیارییانەدا، کەهێنابووی بۆ هـەژارانی بەیت.

ئەم فەرموودەیە بەدوورو درێژی لەپێشەوە لە ژمـارە (٧٥٩ زنجیرە: ٣٧) لەم کتێبەدا رابورد.

٩٠٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) فِـي قِـصَّةِ اَلْعَـسِيفِ. قَـالَ اَلنَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ عَلَى اِمْرَأَةِ هَذَا، فَإِنْ اِعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَـا..} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٣٢ = ٢٧٢٤، ٢٧٢٥. مسلم شیحا ٤٤١٠ = صحیح مسلم ١٦٩٨}:

لەتاجو تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرموویان: پیـاوێکی دەشـتەکی هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر (درورودی خـودای

لەسەر بێ) وەعەرزی کرد: قووربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆبیت‌و خودا ئەگەر بەپێی نامەی خودا، بڕیارم بۆ نەدەیت!

هاوداوەکەیشی، کەوادیار بوو لەو زرنگتر بوو گوتی: بەڵێ باشە، بەپێی نامەی خودا، کە قورئانی پیرۆزە، بڕیارمان بۆ بدەو دادگاییمان بۆ بکە، وە ڕێگەیشم پێ بدە تا من لەپێشا قسە بکەم. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێدام‌و فەرمووی: (ئادەی بڵێ). گوتی: کوڕێکی من لەلای ئەم پیاوە ڕەنجبەر بوو، ژنەکەی خراپ کردووە، داوێنپیسی لەگەڵدا کردووە، بەمنیان گوت: گوایە کوڕەکەم دەبێ بەردەباران بکرێ تا دەمرێ. جا من لەتۆڵەی کوڕەکەما سەد سەر مەڕم پێدا لەگەڵ کەنیزەکێکا، لەپاشا کاتێ لەزانایانی شەرعم پرسی، فەرموویان: کە کوڕەکەی من سەد داری حەددی لێ دەدرێ‌و ساڵێ دوور دەخرێتەوە، وە ژنەکەی ئەمیش بەردەباران دەکرێ.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەپێی فەرمانی نامەی خودا بڕیار دەدەم لەنێوانتانا، کەنیزەك‌و سەد سەر مەڕەکە دەدرێتەوە بەتۆ، کوڕەکەت سەد داری حەددی لێ دەدرێ‌و ساڵێ دوور دەخرێتەوەو ڕەهەنە دەکرێ، ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆلای ژنەکەی ئەم پیاوە، ئەگەر هاتوو چووە ژێری‌و دانی نا بەئیشەکەداو پێی نا لەداوێنپیسی، ئەوا بەردەبارانی بکە، جا کە ئونەیس چوو بۆلای، ژنەکە پێی لێ نا، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی دا، ژنەکەیان سەنگوسارد کرد هەتا مرد. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٤ — ش/د/ت/ن}.

## ٤٨- باسی پێلێنان
## بابُ: الإقْرار

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٥٤٠، زنجیرە: ٢٢٣ هەتا زنجیرە: ٢٢٤}.

٩١٠- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {قُلِ اَلْحَقَّ، وَلَوْ كَانَ مُرًّا} صَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ.

{أحمد رقم: ٢١٤٥٣. ابن حِبّانَ ٣٦١}:

ئەمە دەقی وەرگەڕاوی ئەم فەرموودەیە، لە (سُبُلُ السَّلام)دا:

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستم (دروودی خودای لەسەر بێ) ئامۆژگاری کردم:

یەکەم: تەماشای حاڵی لای خواری خۆم بکەم، وە تەماشای حاڵی لای سەرووی خۆم نەکەم، مەبادا بەهرەی خودا بەکەم بزانم.

دووەم: هەمیشە هەژارانم خۆشبوێ وەلێیان نزیك ببمەوە.

سێیەم: هەمیشە سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنم، با ئەوانیش پەیوەندی لەگەڵ مندا بپچڕێنن‌و خراپ بن بۆمان.

چوارەم: قسەی ڕەوا بکەم، با تاڵیش بێ.

پێنجەم: لەپێناوی ڕەزای خوادا، لەکەس نەترسم.

شەشەم: وە لەکەس داوای شت نەکەم.

حەوتەم: ذیکرو یادی (لاَحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاّ باللهِ)ی زۆر بکەم، چونکە ئەم وشە پیرۆزە خەزنەیەکە لە خەزنەکانی بەهەشت.

## ٤٩- باسی خواستەمەنی (عاریە)
## بابُ: العَارِيَةِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٥٤٥، زنجیرە: ٢٢٤}.

٩١١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {عَلَى اَلْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{أحمد/٥/٨/٢٠٣٤٦. ابن ماجة: ٢٤٠٠. تیرمذی ١٢٦٦. نسائی في الكبرى/٥٧٥١}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەو شتەی کەهی خۆی نییەو لەکەسێ وەری دەگرێ، لەکاتو ساتی پێویستدا بیداتەوە پێی!). حاکم بەصەحیحی داناوە.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەم (٣) سێ شتە:

یەکەم: شتی زەوتکراو دەبێ بدرێتەوە بەخاوەنی.

دووەم: خواستەمەنی، کاتێ خوازیار کاری پێ نەماو کاری خۆی پێ تەواو کرد، دەبێ بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنی.

سێیەم: سپاردە هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە، دەبێ بدرێتەوە پێی. ئەگەر لەم بارودۆخانەدا، خاوەنی ڕاستەوخۆی شتەکە نەمابوو، دەبێ شتە سپاردەکە، یاخوازراوەکە، یا خواستەمەنییەکە، ڕادەستی کەلەپوورگرەکانی بکرێ.

٢- سەموورەی کوڕی جوندوبی هیلال، پێی دەگوترێ: ئەبو سەعید، لەبەصرە نیشتەجێ بوو، زۆر ڕقی لەحەرورییەکان بوو، دەستی لەهەر

کەسێکیان گیر ببوایە دەیکوشت، وە دەیفەرموو: (کوژراوی ئەمانە بەدترین کوژراون، سەرجەمی موسوڵمان بەکافر دادەنێن‌و بەناڕەوا خوێنیان دەڕێژن).

ئیبنو سیرین‌و حەسەنی بەصری‌و پیاوماقوڵانی بەصرە: وەسپی جوانی سەموورەیان دەکرد. سەموورە یەکێ بوو لەو کەسانە کە بەزۆری‌و بەباشی‌و بەڕەوانی فەرموودەی زۆری پێغەمبەری دەگێڕایەوە. لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، لەبەصرە لەساڵی (٥٨) پەنجاو هەشتی کۆچیدا مردووە، لەکارەساتێکی دڵتەزێندا مردووە، تووشی برك‌و كۆڵنج‌و لەرزوتایەکی سەخت دەبێ، قازانگێ پڕ دەکەن لەئاوی کوڵاو، لەسەری دائەنیشێ، تا چاك ببێتەوە بەڵام بەهەڵە دەکەوێتە ناوی‌و دائەپلۆخێ‌و دەمرێ.

٩١٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَدِّ اَلْأَمَانَةَ إِلَى مَنْ اِئْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَحَسَّنَهُ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَاسْتَنْكَرَهُ أَبُو حَاتِمٍ اَلرَّازِيُّ وَأَخْرَجَهُ جَمَاعَةٌ مِنَ الحُفَّاظ وَهُوَ شَامِلٌ لِلْعَارِيَةِ.

{أبوداود/٣/٢٩٠ رقم: ٣٥٣٥. تیرمذی رقم: ١٢٦٤. حاكم رقم: ٢٢٩٦. بيهقى رقم: ٢١٠٩٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سپاردە بدەرەوە دەستی ئەو کەسە کەمتمانەی پێ کردوویت‌و بەدەستپاك‌و ئەمینداری داناویت، بەهیچ شێوەیێ خیانەت‌و ناپاکی لەکەسێ مەکە کە ئەو خیانەت‌و ناپاکی لێت کردووە). دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەبو داوود گێڕاویەتەوە، هەروا تەرمەزی بە فەرموودەیەکی حەسەنی داناوە، حاکم بەصەحیحی داناوە، ئەبو حاتەمی ڕازی ئەم فەرموودەیەی بەمونکەر داناوە، وە کۆمەڵێ لەفەرموودە شوناسان ئەم فەرموودەیان دەرهێناوە، وە ئەم فەرموودەیە خواستەمەنیش دەگرێتەوە).

٩١٣- وَعَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا أَتَتْكَ رُسُلِي فَأَعْطِهِمْ ثَلَاثِينَ دِرْعاً "، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! أَعَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ أَوْ عَارِيَةٌ مُؤَدَّاةٌ؟ قَالَ: بَلْ عَارِيَةٌ مُؤَدَّاةٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد: ١٨١١٤. أبوداود: ٣٥٦٦. نسائي في الكبرى: ٥٧٤٤}:

**صەفوانی کوڕی یەعلا فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: نوێنەری خۆم دەنێرم بۆ لات، کەهاتن (٣٠) سیی زریەو (٣٠) سیی وشتریان پێ بدە.**

**منیش عەرزیم کرد: قوربان ئەی پیغەمبەری خودا! ئایا ئەمە تەنها خواستەمەنییەو ئەگەر ماو نەفەوتا، لەپاش جێبەجێ کردنی کاری خۆت پێی، دەیدەیتەوە پێم، یاخود هەرچەندە خواستەمەنییە بەڵام ئەگەر لەلای تۆ فەوتا، بۆم دەبژێریتەوە؟**

**فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەمە خواستەمەنییە، ئەگەر ماو نەفەوتا دەیدەمەوە پێت، خۆ ئەگەر فەوتایش ئەوا هیچ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ١٨٨٠ — د — سند صالح - ن}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**یەعلای کوڕی ئومەییەی تەمیمی (ڕەزای خودای لێ بێ) کەپێشی دەگوترێ: یەعلای کوڕی مونیە، بەناوی دایکیەوە، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، پیاوێکی دەوڵەمەندی زۆر سەخی بوو، ئامادەی غەزای تائیفو حونەینو تەبووك بووە، لەخزمەتی پێغەمبەردا، نۆزدە فەرموودەی هەیە، لەموقەدیمەی فەتحولباریدا دەفەرموێ: سێ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، یەکێکیان کە فەرموودەی ژمارە: (٦٧٧)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمە، کەوا لەبەرگی دوودا. یەکێ لەڕاویە ناودارەکانی صەفوانی کوڕیەتی.**

یەعلا پیاوێکی ناوداری لێهاتوو بوو، لەبەر ئەوە لەکاتی فەرمانڕەوایی هەرچوار جێنشینەکانی پێغەمبەردا، ڕۆڵی گەورەی بینیوە، ئەبوبەکری صەدیق کردی بەکاربەدەستی سەر حەلوان، لەکاتی جەنگی ریددەدا، لەسەردەمی عومەردا بوو بەکارمەند لەسەر هەندی لەوڵاتی یەمەن، لەسەردەمی عوسمانیشدا بوو بەکاربەدەستی عوسمان لەسەر صەنعاء، ئەوساڵەی کەعوسمان شەهید کرا، هات بۆ حەج، زۆر لەدژی بکوژانی عوسمان بوو، وەخەباتی زۆری لەدژیان گێڕا، لەگەڵ عائیشەدا، ئامادەی جەنگی ئەلجەمەل بوو، ئەو حوشترەی کە لەو جەنگەدا، لەژێر عائیشەدا بوو، کە شەڕەکە بەناوی ئەو حوشترەوە ناوی دەرکرد، ناوی عەسکەر بوو، یەعلا بەدووسەد لیرە کڕیو بەخشی بە حەزرەتی دایکە عائیشە. لەم ڕووداوە دڵتەزێنەدا سواری بوو!

لەپاشا لەگەڵ پێشەوا عەلی دا، ئامادەی شەڕی صەفین بوو، لەم شەڕەدا لەساڵی (٣٨)ی کۆچیدا شەهید کرا (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). {بڕوانە: پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٦٧٧}.

٩١٤- وَعَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِسْتَعَارَ مِنْهُ دُرُوعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ. فَقَالَ: أَغَصْبٌ يَا مُحَمَّدُ؟ قَالَ: بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَأَحْمَدُ وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{السلسلة الصحيحة: ٦٣١. أبوداود: ٣٥٦٢. نسائي في الكبرى: ٥٧٤٧. حاكم في المستدرك برقم: ٢٣٠١}:

صەفوانی کوڕی ئومەییە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆمەڵێ زریەی بەخواستن لێ خواستم، لەڕۆژی غەزای حونەیندا، منیش پێیم گوت: ئەی محمد! ئایا ئەمە زەوت کردنەو زەوتی دەکەی لێم، یاچییە؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەڵاما فەرمووی: نا، زەوتکردن نییەو زەوتیان ناکەم لێت، بەڵکوو ئەمە خواستەمەنییەو دەستەبەرکراوە، من دەیدەمەوە پێت، ئەگەر نەما دەیبژێرم بۆت!.

(ڕوونکردنەوە):

١- صەفوانی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف، ناسراوە بە ئەبو ئومەییەی‌و بە ئەبو وەهب، لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، لەترسی لەشکرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵهات‌و ڕای کرد، هەتا عومەیری کوڕی وەهب‌و وەهبی کوڕی عومەیر، داوایان لە پێغەمبەر کرد، کە بەڵێن‌و پەیمانیان پێ بدا کە نەیکوژێ‌و ئازاد بێ بۆخۆی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمانی دا پێی‌و عاباکەی خۆی دا پێیان کە بەڵگەی ئەو ئەمان پێدانە بێ. جا وەهبی کوڕی عومەیر ڕۆیشت صەفوانی هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

جا کاتێ صەفوان گەیشتە لای پێغەمبەر، لەوڵاخەکەی دانەبەزی‌و گوتی: بەقسەی ئەم پیاوە، کە وەهبی کوڕی عومەیرە، تۆ ئەمانت بەمن داوە، کە بۆ ماوەی دوومانگ لەوڵاتدا بسوڕێمەوە بۆ خۆم، لەسەروماڵی خۆم دڵنیا بم، کەس دەستم بۆ نەبا، ئەمە وایە یان نا؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: ئەی باوکی وەهب! بفەرموو دابەزە.

گوتی: نا، دانابەزم هەتا دڵنیام نەکەیت.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (تۆ دابەزە، ئەوا چوار مانگ دڵنیایی (ئەمانی)م دا پێت، کە بەئازادی‌و سەربەستی لەوڵاتا بۆخۆت بسوڕێیتەوە! ئەوجا صەفوان دادەبەزێ، وە لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی غەزای حونەین دەبێ، هەروا ئامادەی غەزای طائیف دەبێ، بەڵام بەر ئەوە موسوڵمان ببێ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم دوو

غەزایـــەدا بەخشـــشی زۆری دا پێـــی. جـا صـــەفوان موسـولْمان بـــوو، وە موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زریەکانی دایەوە پێی، نەیویستنەوەو عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئێستا ئیسلام بووم، هەموویانم بەخشی لەپێناوی خوادا. ژمارەی زریەکان چل بوون، هەندێ دەڵێن: سەد زریە بوون، صەفوان لەخانەدانەکانی قورەیش بوو، ژنەکەی لەپێش خۆیدا بەمانگێ ئیسلام بوو بوو، کەصەفوان ئیسلام بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەربەنیکاحی یەکەمیان ژنەکەی دایەوە پێی. لەپاش ئیسلام بوون صەفوان لەمەککە دانیشت، لەپاشا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بوو بەمیوانی عەبباسی مامەی پێغەمبەر، کە عەبباس باسی ئەمەی کرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپاش ئازادبوونی مەککە، کۆچکردن نەما).

پیاوێکی زۆر زمان ڕەوان بوو، لەساڵی چل و دووی کۆچی لەمەککە مردووە.

٩١٥- وَأَخْرَجَ لَهُ شَاهِدًا ضَعِيفًا عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ.

{الحاكم: ٢٣٠١. وقالَ الذَّهَبِيُّ عَلَى شَرْطِ مسلِمٍ}:

پێشەوا حاکم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەئیبنو عەبباسەوە، شایەتێکی بۆ فەرموودەی ژمارە: (٩١٤) دەرهێناوە، کە ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵکوو خواستەمەنی دەستەبەرکراوە).

## ٥٠- باسی زەوتکردن
## بابُ: الغَصْب

٩١٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {مَنْ اِقْتَطَعَ شِبْرًا مِنْ اَلْأَرْضِ ظُلْماً طَوَّقَهُ اَللَّهُ إِيَّاهُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/۳، ژمـاره: ۱۰٦۳ = ۲٤٥۱، ۲٤٥۲، ۳۱۹۸. مختـصر صحیح موسلیم/۲، لاپـەڕە: ٤٨٣، زنجـیرە: ٧٦٠، ژمـارە: ٩٧٠ = شـیحا ٤١١٠، ٤١١٣ = مسلم: ١٦١٠}:

لەموختەصەری صەحیحی موسلیما، چاپی یەکەم، لاپەڕە: ٤٨٣، ژمـارە: ٧٦٠، ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئـەروای کچی ئووەیس، سکاڵای ئەوەی دەکرد: کەسەعیدی کوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) بەشێ لەزەوییەکەی ئەوی داگیر کردووە، لەلای مەروانی کوڕی حەکەم سکاڵای ئـەوەی لێـی کـرد، کـە ئەوکاتـە مـەڕوان مـیری سـەر مەدینـە بـوو، سـەعید فـەرمووی: منـێ کەبـەگوێی خـۆم لـەم بارەیـەوە هەڕەشـەی گـەورەم لـەزاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسـەر بێ) بیستبێ، دەچـم زەوی لەو زەوت دەکەم؟!

مەڕوان فەرمووی: چیت لـەم بارەیـەوە لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیـستووە؟ سـەعید فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو:

(هەرکەسێ بـەناڕەوا، بـەزۆرو ستەم، بستێ زەوی یا زیـاتر، داگـیر بکـا، لەڕۆژی قیامەتا، ئـەو بـستە زەوییـە، بەهـەر حـەوت چینـەی زەمینـەوە، وەك کەڵەمە لەملی گادا، ئاوادەکرێ بەتەوقو دەکرێتە ئەستۆی).

مەڕوان فەرمووی بەسەعید: ئەم فەرموودەیـە بەسـە کـەببێ بـە بەڵگـە لەسـەر ڕاسـتگۆیی تـۆ، سـەبارەت بـەداوای ئـەم ژنـە، لەبـەر ئـەوە لـەپاش ئـەم بەڵگەیە داوای بەڵگەی ترت لێ ناکەمو داوای ژنەکەی ڕەت کردەوە.

سـەعید فـەرمووی: خودایـە! تـۆ ئاگـات لێ هەیـە، کـە ئـەم ژنـە، ئـەم بوختانەی بۆ من کرد، کە گوایـە بەناهـەق زەویـم لێ داگیر کـردووە، خودایـە!

ئەگەر درۆ دەكاو بوختانم بۆ دەكا، چاوی كوێركەو لەناو ئەم زەوییەی خۆیدا بەكوشتی بدە.

فەرمووی: جا ئەروا نەمردو ما هەتا كوێر بوو، جارێكیش لەزەوییەكەی خۆیدا كە لەپاڵ زەوییەكەی سەعید بوو دەسوڕایەوە، لەپڕ كەوتە ناو بیرێكەوەو مرد!! ئاوا هەردوو نزاكەی سەعید كە لە ئەروای كرد گیرا بوو، هەم كوێر بوو، هەم لەناو زەوییەكەی خۆیدا كوژرا. {ریاض/١، زنجیرە: ٢٦، فەرموودەی ژمارە/٢٠٦/٤ + تاج/٥، لاپەڕە: ٣٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٢٧ - چاپی چوارەم}.

٩١٧- وَعَنْ أَنَسٍ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ اَلْمُؤْمِنِينَ مَعَ خَادِمٍ لَهَا بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا فَكَسَرَتِ اَلْقَصْعَةَ، فَضَمَّهَا، وَجَعَلَ فِيهَا اَلطَّعَامَ. وَقَالَ: " كُلُوا " وَدَفَعَ اَلْقَصْعَةَ اَلصَّحِيحَةَ لِلرَّسُولِ، وَحَبَسَ اَلْمَكْسُورَةَ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ. وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَسَمَّى اَلضَّارِبَةَ عَائِشَةَ، وَزَادَ: فَقَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {طَعَامٌ بِطَعَامٍ، وَإِنَاءٌ بِإِنَاءٍ} وَصَحَّحَهُ.

{پوختەی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٧٤ = ٢٤٨١، ٥٢٢٥}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی ژنێ لەژنەكانی بوو، كە عائیشەی كچی ئەبوبەكری صەدیق بوو، ژنێكی تری، بە كارەكەرێكی خۆیا، لەگەنێ خواردەمەنی بۆ نارد، ژنەكەی تەنگە گرتیو دەستی كێشا بە لەگەنەكەداو شكاندی. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو لەتی لەگەنەكەی نووساندەوە بەیەكەوەو خواردەمەنییەكەی تێ كردەوەو فەرمووی: (دایكتان تەنگە دەیگرێو دڵی پڕبووە، بۆیە لەگەنەكەی هەوێكەیی شكاند، ئێوە بخۆن).

ئـەوانیش خواردیـان، جـا کـە لەگـەنی ژنەکـەی تریـشی هـات، واتــە: لەگەنەکەی عائیشەیش هات، کە ئـەو کاتـە پێغەمبـەرو کۆمـەڵێ لـە هـاوەڵانی لـەوێ بـوون، دیـسان پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بەهاوەڵـەکانی فەرموو: (بخۆن) رابـەرو لەگەنـە شکاوەکەیـشی گل دایـەوە، هـەتا لێبوونـەوە، ئەوسا لەگەنە ساخەکەی دا بەکارەکەرەکەو، لەگەنە شکاوەکەی گل دایەوە، بـۆ ئەوژنەی، کە عائیشە بوو، کە لەگەنی ژنەکەی تری شکان). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٦٣، ژمارە: ١٨٨١} .

دانـەر، مامۆسـتای عەسـقەلانی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: بوخاریو تەرمەزی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، تەرمەزی نـاوی ئـەو ژنـەی دیـاریکردووە کـە قەرەوانەکـەی شـکاندووە، کـە عائیـشە بـوو، وە ئەمـە ئـەو گێڕانەوەی تەرمەزییە، کە دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی بۆ دەکا:

ئەنـەس (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) لـەماڵی عائیـشەی هاوسـەری بـوو، یـەکێ لەژنـەکانی، لـە لەگـەنێکا هەندێ خواردەمەنی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) عائیـشە ئەمـەی پـێ نـاخۆش بـوو، لەبەرئـەوە، یـەك چـەپاڵەی کێـشا بـە لەگەنەکـەدا، لەگەنەکە شکاو خواردەمەنییەکە رژا. کە عائیشە هاتەوە سەرخۆی فەرمووی: ئەی پیغەمبەری خودا! تۆڵەی ئەم کارە ناشایستەی من کردم چییە؟

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (دەبێ بیبژێریت، خۆراکـێ وەك خۆراکەکەی خۆیو لەگەنێ وەك لەگەنەکەی خۆی بدەیتەوە پێی!).

٩١٨- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَلَيْسَ لَهُ مِـنْ اَلـزَّرْعِ شَـيْءٌ، وَلَهُ نَفَقَتُهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ. وَيُقَالُ: إِنَّ اَلْبُخَارِيَّ ضَعَّفَهُ.

{أحمد/١٥٩١٥. ترمذی/١٣٦٦} :

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ لەزەوی کەسێکی تردا، بەبێ مۆڵەتو ڕەزابوونی خۆی، شتێ بچێنێ، وەك گەنمو جۆو چەڵتووكو بامێو شتی تری وا، ئەوە لەو چینراوە هیچی ناکەوێ، بەڵام چی خەرج کردووە تیادا ئەوەی دەکەوێتەوە!).

٩١٩- وَعَنْ عُرْوَةَ بْنِ اَلزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنْ اَلصَّحَابَةِ" مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ رَجُلَيْنِ اِخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي أَرْضٍ، غَرَسَ أَحَدُهُمَا فِيهَا نَخْلًا، وَالْأَرْضُ لِلْآخَرِ، فَقَضَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِالْأَرْضِ لِصَاحِبِهَا، وَأَمَرَ صَاحِبَ اَلنَّخْلِ أَنْ يُخْرِجَ نَخْلَهُ. وَقَالَ: " لَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

{أبو داود/٣٠٧٤. مالك/٢/٧٤٣. الدارقطني في العِلَل/٤/٤١٥}:

عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو پیاو لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سکاڵایان کرد، گوتیان: ئەمە زەوی یەکێکمانەو ئەوی ترمان کردوویەتی بەباخە خورما؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا کە زەوییەکە بۆ خاوەنەکەیەتی، وە فەرمانیشی کرد بەخاوەنی دارە خورماکان، کە دارە خورماکانی لابەرێ، وە فەرمووی: (گەڕی ناڕەوا هیچی لێ سەوز نابێ!).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٦٧، ژمارە: ١٩٠١ + پوختەی بوخاری، ژمارە: ١٠٢٨}.

٩٢٠- وَآخِرُهُ عِنْدَ أَصْحَابِ " اَلسُّنَنِ " مِنْ رِوَايَةِ عُرْوَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ. وَاخْتُلِفَ فِي وَصْلِهِ وَإِرْسَالِهِ، وَفِي تَعْيِينِ صَحَابِيِّهِ.

{سنن أبي داود/٣٠٧٤. صحيح، الإِرْواء/١٥٢٠}:

دانەر دەفەرموێ:

١- ئەصحابی سونەن، کە ئەبو داودو تەرمەزیو نەسائین ئاخری ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، لە عورووەوە، لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە.

٢- ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە ئەم فەرموودەیە موتتەصیلە، یا مورسەلە.

٣- ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە ئەو هاوەڵە کێیە.

٩٢١- وَعَنْ أَبِي بَكْرَةَ" (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: فِي خُطْبَتِهِ يَوْمَ اَلنَّحْرِ بِمِنًى. {إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ٦٠ = ٦٧، ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧. مختصر صحيح مسلم بەکوردی، ژمارە: ١٠٢١ = صحيح موسليم تەرقيمی شێخ خەليل مەئموون شيحا = ٤٣٥٩، ٤٣٥١. تحفة الأشراف/١١٦٨٢}:

ئەبوبەکرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی جەژنی قوربانـدا، لەمینا، لەحەجی مـاڵاوایـیدا، بەسـەر پـشتی وشـترەکەیەوە، وتـارێکی بـۆ جـەماوەری حاجییـەکان دا، لـەو وتـارەدا فەرمووی: (چەرخ چووەتەوە دۆخی جارانی خۆیو، زەمـان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی، کە خودای گەورە ئاسمانـەکانو زەوی دروست کـردو شەوو ڕۆژو مانگو ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بەدوانزە مـانگو هـەموو مانگێ لەدوانزە مانگەی خودا کەوتۆتەوە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیو (نَسِيءُ = دواخـستن) نـەما، وە وەك سـەردەمی پێغەمبـەرەکان (درووودی خـودا لـە پێغەمبەری خۆشمانو لەوانیش بێ) ئەوەی ڕەوایە بووەتەوە بـەڕەواو، ئـەوەی ناڕەوایە بووەتەوە بەناڕەوا، وە ئەو گۆڕانو دەستکاریی شەریعەتو یاسانامەی خودایە، کە لەسەردەمی نەزانیدا کرابوون، هەموو ڕاست کراونەتـەوە، وە ئـەم مانگانە چواریان مانگی حەرامنو خاوەنی ڕێزو قەدرو نرخو بەهاو بایەخنو لەبەرئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر زۆر تیا حەرامـە، وەئـەم چوار

مانگـه سـيانيان بـەرودوانو بەشـوێن يـەكادێن: كـە ناوجـەژنانو نۆمينـەو موحـەڕەمن، ئـەوی تريـشيان تەنيايـە، كـە مـانگی ڕەجەبـە كـە نـاوداره بـە ڕەجەبی هۆزی موضەر، لەبەرئەوە كە هۆزی موضـەر زۆر قـەدری ئـەم مانگـە دەگرن، كە دەكەوێتە نێوانی جومادای دووەمو كوڵە مانگەوە).

ئەوجا خۆشەويست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم مانگـە چ مانگێكە؟)

گوتمـان: خـوداو پێغەمبـەری خـودا باشـتری لێ دەزانـن. فـەرمووی: جـا پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ماوەيــێ خــامۆش بــوو تەنانــەت خامۆشـييەكەی وا درێـژەی كێـشا، زەينمـان بـۆ ئـەوە ڕۆيـشت كـە ناوەكـەی بگۆڕێو نـاوێ تـری لێ بنـێ، بـەڵام فـەرمووی: (ئـەرێ ئەمـە مـانگی نۆمينـەی حاجيـان نييـە كـە حـەجی تيادەكـەن؟). گوتمـان: خـوداو پێغەمبـەری خـودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: (ئەی ئەم شاره چـی شـارێكە؟). گوتمـان: خـوداو پێغەمبـەری خـودا باشـتری لێ دەزانـن. فـەرمووی: جـا ديـسان ماوەيـێ تـر بـێ دەنگ بوو، تەنانەت زەينمان بۆئەوە چوو كە ناوەكەی بگۆڕێو ناوێكی تری لێ بنێ. فەرمووی: (ئەرێ ئەمە شـاری مەككـە نييـە؟). گوتمـان: بـەڵێ خۆيـەتی. فەرمووی: (ئەی ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێكە؟).

گوتمان خوداو پێغەمبەری خـودا باشـتری لێ دەزانـن. فـەرمووی: ديـسان ماوەيەكی تر خامۆش بوو، ديسان گومانمان بۆئەوە چوو كە ناوەكەی بگۆڕێو ناوێكی تری لێ بنێ، بەڵام فەرمووی: (ديـاره كەئەمـە ڕۆژی جـەژنی قوربانـە، كـە قوربـانی تيـادا دەكـرێ). گوتمـان: بـەڵێ ئـەوە، ئـەی پيغەمبـەری خـودا! فـەرمووی: (دەی بـاش بـاش بـزانن كەسـەرو مـاڵو نامووسـتان لەيـەكتری نادروسـتو حەرامـە، وەك چـۆن شـكاندنی ڕێـزی ئـەم ڕۆژەتـان نادروسـتو حەرامـە ئـاوا، بەتايبـەتی ئەگـەر ئـەو ڕێزشـكاندنە لـەم شـارەتانا بـێو لـەم مانگەتانا بێ).

وه فــەرمووی: (وه بــەزوییش ئێــوه دەچــنەوه بــەردیوانی خــودای پــەروەردگارتان، یەکــه یەکــه پرســیارتان لێ دەکــات، ســەبارەت بــەکارو کردەوەکانتان، جا نەکەن پاش مەرگی من پاشگەز ببنەوەو، وەك جاری جاران ببنەوه بە هۆزی خۆخۆرو بەشیر گەردنی یەکتری بپەڕێنن!

هۆشیاربن، بـا ئامادەبوانی ئـەم وتـارو ڕێو ڕەسمانـە، خۆیـان لەبـەریان بکەنو ئـەم فەرموودانـەی مـن بـەجوانی ڕەوان بکەنو ئەوسا بـەپێی تـەوانا رایـان بگەیـەنن بەکەسـانێ کـە ئێـستا ئامـاده نـین لێـرەو دادەنـرێن بـەنادیار، چونکه ئومێده هەندێ کەس لەوانەی کە ئەم فەرموودەو فەرمایشتانەیان پێ راگەیەنرێ، ئەوان باشتر لێیان تێ بگەنو لێیـان حـاڵی بـبنو بەهەنـد وەریـان بگرن، هەتا زۆر لەو کەسانەی کە بەگوێی خۆیان لەمن دەیانبیستن!).

لەپاشـا خۆشەویـست (سـەرو مـاڵو ڕۆحو هەسـتو نەسـت بـەقوربانی گەردی بەرپێی دینەکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: (دەی ئێوه بەشایەت بن کە ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناو ئەوەی پێویست بـێ لـەم بارەیەوه بەئێوەم راگەیاند). {تاج/٢، زنجیره: ١١٢، ژمـاره: ١٦٠٩} + {ریـاض/١، لاپەڕە: ١٩٤، زنجیره: ٢٦، ژماره: ٢٠٦/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- سـەعیدی کـوڕی زەیـد، کـه لـەژماره (٩١٦)دا رابـورد، نـاوی تـەواوی: (سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری ئەلعەدەوییه (ڕەزای خودای لێ بـێ) لـه موسـوڵمانه هـەره پێـشینەکانه، پێـشەوا عومـەر لـەماڵی ئـەودا ئیـسلام بـووه، سەعید مێردی فاطیمەی کچی خەطاب بوو، کە خوشکی پێشەوا عومـەر بـوو، سـەعید یەکێکـه لـەو ده کەسـه کـه پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەژیانی خۆیدا، موژدەی بەهەشتی پێیان داوه، ئامادەی گـەلێ غـەزاو جـەنگو نەبەردەکانی پێغەمبەر بووه، وەك غەزای یەرمووك، بەشداری لە ئـازادکردنی دیمەشــقدا کــردووه، ســەعیدی کــوڕی حــەبیب دەیفــەرموو: ئــەم زاتانــە،

لەخزمــەتی پێغەمبــەردا لەیــەك پلــەو پایــەدا بــوون، ئەبوبــەكرو عومــەرو عوسمانو عەلیو سەعدو سـەعیدو طـەلحەو زوبـەیرو عەبـدوڕەحمانی كـوڕی عــەوف. ئــەم زاتانــە لــە جــەنگو نەبــەردو كوشــتارگاكاندا، لەبــەردەمی پێغەمبەرەوە بوون، لەنوێژدا لەپشتیەوە بوون، سەعید پیاوێكی گـەنم ڕەنگی تووكن بوو، نزاو پاڕانەوەی زۆر گیرابوو، زەیدی باوكی پیاوێكی ڕۆشنبیر بـوو، لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم بـوو (دروودی خودای گـەورەی لەسـەر بـێ) خـوێنو مردارەوەبـووی نـەدەخوارد، هـەروا گۆشـتی ئـاژەڵێكی نـەدەخوارد كـــەناوی بـــتو ئەنـــصابی لـــەكاتی ســـەربڕیندا، لێ هێنرابـــێ، لـــەپێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا، بەخزمەتی پێغەمبەر دەگا، بەڵام فریای هـاتنی ئیسلام ناكەوێ. ئیبنو عەبدولبەڕ، لە ئیستیعابا ڕاگوێز دەكا:

(سـەعیدی كـوڕی زەیـد، دەچـێتە خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەر بێ) عەرزی دەكا: قوربان! باوكم ئەوەبوو كەخۆت دیوتەو خەڵك باسی كردووە بۆت، كەواتە: نزای باشی بۆ بكەو بۆی بپاڕێرەوە، كەخودا لێی خـۆش بێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

(باوكت لەڕۆژی دواڕۆژدا كە زینـدوو دەكرێتەوە، بەیەك نەتەوەی تەواو دادەنرێ).

سەعید (٣) سێ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لە موسـلیما فـەرموودەی هەیە، سەعید لەكۆتایی تەمەنیدا لە عەقیق دەمرێ، تەرمەكەی دەبەنەوە بـۆ مەدینــە، لــەوێ بــەخاكی دەســپێرن. لەســاڵی (٥٥) پــەنجاو پێنجــی كۆچــیدا دەمرێ، لەسەردەمی جێنشینیی موعاوییەدا، تەمەنی نزیكی حەفتاو سێ ساڵ بووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە سەعیدو لەباوكی بێ).

٢- عـوروەی كـوڕی زوبــەیر (ڕەزای خــودای لێ بــێ) كـچەزای حــەزرەتی ئەبوبەكری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، كـە هاوسـەری پێغەمبــەر بوو، زانایـەكی گـەورە بـوو، هەمیـشە لەگـەڵ كۆمـەڵێ زانـای تـری وەك خـۆی،

ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشەی پووری دەبوون، کە عائیشە لەماڵی خۆیدا، لەمەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو راگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەرو تەفسیری ئایەتەکانی قورئان. عوروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە بەرزەکانی پەیڕەوان (واتە: تابیعین) کە پێشیان دەگوترێ: (تابیعین: شوێنکەوتوان: چینی دووەمی موسوڵمانان لەپاش پێغەمبەر، کەچینی یەکەم هاوەڵو یارو یاوەرانو یاریدەدەرانیەتی، وەچینی دووەم شوێنکەوتوانی ئەوانن).

یەکێکە لەحەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لەزاراوی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەریعەتزانەکان) کە ئەم زاتانەن:

١- عوروە.

٢- سەعیدی کوڕی موسەییەب.

٣- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە.

٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.

٥- سلێمانی کوڕی یەسار.

٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت.

٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

دایکی عوروە ناوی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیقە، کە خوشکی باوکیی عائیشەیە، خاوەنی ئەم شانازییانەیە:

١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، مێردی پوورە عائیشەیەتی.

٢- ئەبوبەکری صەدیق باپیریەتی، باوکی دایکیەتی.

٣- زوبەیری کوڕی عەوام باوکیەتی {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم بەکوردی: بەرگی/٤، لاپەڕە: ٣٤٢، ژمارە: ١٦٤٥}.

٤- ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق دایکێتی.

٥- عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق لەدایکەوە پووریەتی.

عوروە ساڵی (٢٠) بیستی کۆچی لەدایك بووە، لەنەوەدو چواری کۆچی مردووە، کۆمەڵەی فەرمووودەزانەکان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە. واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو موسلیمە، لەناو پەیڕەواندا، عوروەی کوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، بۆ بەهرەی پترو شارەزابوونی تەواو لەژیننامەی ئەم بنەماڵە مەزنە بڕوانە: {مختصر صحیح مسلم/٢، لاپەڕە: ٢٠٨، ژمارە: ٧٠١ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢، ٣٣١٩ + تەجریدی بوخاری بەرگی یەکەم ژمارە: ٣ + ژمارە: ٣٤٩ - ٦٠٢ بوخاری + ژمارە: ٧٥ تەجرید + تاج/٣، زنجیرە: ٣٧ چاپی چوارەم + تاج/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩ چاپی چوارەم}. بڕوانە: ژمارە/٩٤١ کە لەدواوە دێ (روونکردنەوە).

## ٥١- باسی بەش هەڵگرتنەوە (شوفعە)
## بَابُ: الشُّفْعَةِ

{بڕوانە تاجول ئوصول/٢، زنجیرە: ١٥٨ + فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٥٥٠، زنجیرە: ٢٣٦ + تەجرید/٣، لاپەڕە: ٧٢، زنجیرە: ٤١ + صحیح مسلم/٢، زنجیرە: ٧٥٨، ژمارە: ٩٦٨، لاپەڕە: ٤٨٢}.

٩٢٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {قَضَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ اَلْحُدُودُ وَصُرِّفَتْ اَلطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{بخاری. شفعة: ٢٢٥٧. پوختەی موسلیم = مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٦٨ = شیحا/٤١٠٤}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەقی شوفعە واتە: (بەشی هاوبەش‌و خانوو شتی وای هاوسێ هەڵگرتنەوە)ی داناوە، لەهەموو شتێکا کە هاوبەشی بێ‌و هێشتا دابەش نەکرابێ، بەڵام ئەگەر شتەکە جیاکرایەوەو سنوور دانراو توخوب نیشانە کراو ڕێگەوبان دیاری کرا، ئیتر هەقی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ.

٩٢٣- وَفِي رِوَايَةِ مُسْلِمٍ: {اَلشُّفْعَةُ فِي كُلِّ شِرْكٍ: أَرْضٍ، أَوْ رَبْعٍ، أَوْ حَائِطٍ، لَا يَصْلُحُ – وَفِي لَفْظٍ لاَ يَحِلُّ – أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يَعْرِضَ عَلَى شَرِيكِهِ}. وَفِي رِوَايَةِ اَلطَّحَاوِيِّ: قَضَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شَيْءٍ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{تاج/٢، لاپەڕە: ٣٦١، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٢ چاپی چوارەم – ش/د/ت/ن} بێژەی (م = موسلیم) ئاوایە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوفعەی داناوە، لەهەموو شتێکا کە هاوبەشی بێ‌و هێشتا دابەش نەکرا بێ، وەك زەوی‌و بێستان‌و باخ لەو شتانەی کە قەبووڵی شوفعە دەکەن، جا لەکاتی وادا دروست نییە بۆ هاوبەش کە بەشەکەی خۆی بفرۆشێ، هەتا هاوبەشەکەی ئاگادار نەکاتەوە، جا هاوبەشەکەی کەیفی خۆیەتی: یان بەشی هاوبەشەکەی هەڵدەگرێتەوە، یان وازی لێ دەهێنێ، گریمان ئەگەر هاوبەش بەبێ ئاگادارکردنەوەی هاوبەشەکەی، بەشی خۆی فرۆشت، هاوبەشەکەی لەپێشترە بەهەڵگرتنەوەی ئەو بەشە فرۆشراوە. {موسلیم ترقیم شیحا ٤١٠٥}.

لەگێڕانەوەی طەحاویدا، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری داوە کە لەهەموو شتێکا، هاوبەش بۆی هەیە، کە بەشی هاوبەشی خۆی هەڵبگرێتەوە. دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پیاوانی

ڕشتەی ئەم گێڕانەوەیەی طەحاوییە، هەموویان باوەڕ پێ کراو وجێگەی متمانەی فەرموودەشوناسەکانن.

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەپیاوانی ڕشتە (سەنەد)ی فەرمووده گێڕەوەکانیەتی، واتە: ڕاویەکانی، ئەمانە ئەگەر هەمووشیان ژن بن، هەرپێیان دەگوترێ (رِجال السند = پیاوانی ڕشتە) ناگوترێ (نِساءُ سَنَدِ الحديث = ژنانی ڕشتەی فەرموودەکە).

٩٢٤- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {جَارُ اَلدَّارِ أَحَقُّ بِالدَّارِ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَلَهُ عِلَّةٌ.

{صحيح الجامع: ٣٠٨٩}:

لەتاجا ئاوایە: سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دراوسێی خانوو، لەبەرترە بەخانووی دراوسێکەی، وەهەروەها هاوسای زەویش لەبەرترە بەزەوی هاوسا. {د/ت/ن – ح/ص. تاج/٢، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٤ چاپی چوارەم}.

لێرەدا دەفەرموێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە.

٩٢٥- وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {اَلْجَارُ أَحَقُّ بِصَقَبِهِ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ، وَفِيهِ قِصَّةٌ.

{مختصر صحيح البخاری = پوختەی بوخاری = تجریدی بوخاری/٣، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ١٠٠٠ = ٢٢٥٨، ٦٩٧٧، ٦٩٧٨، ٦٩٨٠، ٦٩٨١ بوخاری}:

لەتجریدی بوخاریدا ئاوایەو چیرۆکەکەی واتیادا:

ئەبو ڕافیع (ڕەزای خودای لێ بێ) کە ئازادکراوی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، فەرمووی پێی: ئەی سەعد! ئەو دوو ماڵەم کەوان لەناو خانووەکەی تۆدا

بیانكڕە لێم. سەعیدیش پێی فەرموو: بەخودا نایانكڕم لێت میسوەری كوڕی مەخرەمەیش كەلەوێ بوو، بەسەعدی فەرموو: بەخودا دەبێ بیانكڕیت لێی، سەعدیش فەرمووی: كەوای لێ هات، بەخودا چوار هەزار درەم زیاترت پێ نادەم، ئەویش بەقەرزێ كە بكرێ بەچەند پشكێ (بەچەند قیستێ) ئەبو رافیعیش فەرمووی: (بەم بەشەم كەوا لەناو خانووەكەی تۆدا، پێنج سەد دیناری زێڕیان پێم داوە، كەدەكاتە پێنج هەزار درەم، بەڵام لەبەر ئەوەی كەبەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە، كە دەیفەرموو: (دراوسێ لەپێشترە بۆ هەڵگرتنەوەی لاتەنیشتی خۆی، هەتا كەسێكی تر) لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەبوایە، بەچوار هەزار درەمم نەدەدا بەتۆ، لەكاتێكا كە كەسانی تر ئامادەن كە بەپێنج هەزار درەم لێم بكڕن، ئیتر ئەبو رافیعماڵەكەی بەو نرخە دا بە سەعد، كەچوار هەزار درەم بوو.

٩٢٦- وَعَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ، يُنْتَظَرُ بِهَا - وَإِنْ كَانَ غَائِبًا - إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{أحمد: ١٤٣٠٣. تیرمذی: ١٣٦٩. نسائی فی الكبری: ٦٢٦٤}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دراوسێ لەپێشترە بەهەڵگرتنەوەی زەوی دراوسێ، بەمەرجێ رێگەی هەردوولایان یەك رێگەبێ، ئەگەر دراوسێی حازریش نەبێ دەبی چاوەنواڕی بكرێ، هەتا ئامادە دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٥ چاپی چوارەم — د/ت/ن — ح/ح}.

٩٢٧- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلشُّفْعَةُ كَحَلِّ اَلْعِقَالِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ وَالْبَزَّارُ، وَزَادَ: "وَلَا شُفْعَةَ لِغَائِبٍ" وَإِسْنَادُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف جِداً، الإرْوَاء: ١٥٤٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وەك چۆن وشتری تەراوتۆڕ، ئەشکیلەکەی بکرێتەوە، ئەگەر گورج جڵەوی نەگیرێ دەڕواو لەدەست دەردەچێ، شوفعەیش ئاوایە).

ئیبنو ماجەو بەززار گێڕاویانەتەوە، بەززار ئەمەی پترە: (شوفعە بۆ نادیار (غائیب) نییە). {فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٥٥٢، زنجیرە: ٢٢٦}.

## ٥٢- باسی قازانج بەهاوبەشی (قِراض)
## بابُ: القِراضِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٢٢٧}.

٩٢٨- عَنْ صُهَيْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {ثَلَاثٌ فِيهِنَّ اَلْبَرَكَةُ: اَلْبَيْعُ إِلَى أَجَلٍ، وَالْمُقَارَضَةُ، وَخَلْطُ اَلْبُرِّ بِالشَّعِيرِ لِلْبَيْتِ، لَا لِلْبَيْعِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف جِداً، ضعيف الجامع: ٢٥٢٥}:

صوهەیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیت و فەڕو پیرۆزی وا لەم سێ شتەدا):

یەکەم: فرۆشتن بەقەرز، چونکە کارئاسانییە بۆ کڕیار.

دووەم: مامەڵەی قازانج بەهاوبەشی.

سێیەم: باراشی تێکەڵ لەگەنم و جۆ، کەبۆ خواردنی خێزان بێ، نەوەك بۆ فرۆشتن. ئیبنو ماجە بەڕشتەیەکی لاواز گێڕاویەتەوە.

(ڕوونکردنەوە):

صوهەیبی کوڕی سەنانی کوڕی خالیدی موصڵی، پاشان ڕۆمی، پاشان مەککەیی، پاشانتر مەدینەیی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لە موسوڵمانە هەرە

پێشینەکانە، لەپێناو خوداو پێغەمبەرۆ ئیسلاما، ئەشکەنجەو ئازاری زۆری چەشتووە، صوهەیب بەڕەگەز عەرەبە، بە منالی، ڕۆم دیلی دەکەن، لەبەر ئەوە زمانی ئەوان باشتر فێر دەبێ، باوکی صوهەیب یا مامەی، کاربەدەستی کیسرا دەبێ، لەسەر شاری (الأبلة) هەوارگەیان لەخاکی موصل بووە، سوپای ڕۆم هێرش دەبەنە سەر ناوچەکە، صوهەیب دیل دەکەن، جا لەناو ئەواناو لەناو ڕۆما گەورە دەبێو پەروەردە دەبێ، جا لەبەر ئەوە زمانی ئەوان باشتر دەزانێو ناو دەردەکا بەصوهەیبی ڕۆمی!!

هەتا هۆزی کەلب دەیکڕنو دەیهێنن بۆ مەککە، لەوێ عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان دەیکڕێو ئازادی دەکا، لەگەڵیدا لەمەککە نیشتەجێ دەبێ، هەتا ئیبنو جەدعان دەمرێ، ئەوجا صوهەیب (ڕەزای خودای لێ بێ) کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لەمانگی ڕەبیعی یەکەما لە قەباء، بەرلەوە بچێتە ناو مەدینەوە، بەخزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگات، وە ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕگاکانی تری پاش بەدریش لەخزمەت پێغەمبەردا دەبێ لەڕیزی لەشکری ئیسلاما. واقیدی دەفەرموێ:

صوهەیبو عەمماری کوڕی یاسیر، لەیەك ڕۆژدا موسوڵمان بوون، دەڵێن: صوهەیب دەفەرموێ: لەپێش ئەوەی کە پێغەمبەر ببێ بە پێغەمبەر، من هەر هاوڕێی پێغەمبەر بووم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ باوەڕی تەواوی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، باوەك چۆن منالی خۆی خۆش دەوێ، ئاوا صوهەیبی خۆش بوێ!).

صوهەیب لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا لەمەدینە مردووە، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردووە، کوڕەکانی صوهەیب کە ئەمانەن: حەمزە، سەعد، صالح، صەفی، عباد، عوثمان، حەبیب، موحەممەد، هەموویان فەرموودەیان لەباوکیانەوە گێڕاوەتەوە (ڕەزاو

ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ). {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢٠٩٣}.

٩٢٩- وَعَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّهُ كَانَ يَشْتَرِطُ عَلَى اَلرَّجُلِ إِذَا أَعْطَاهُ مَالًا مُقَارَضَةً: أَنْ لَا تَجْعَلَ مَالِي فِي كَبِدٍ رَطْبَةٍ، وَلَا تَحْمِلَهُ فِي بَحْرٍ، وَلَا تَنْزِلَ بِهِ فِي بَطْنِ مَسِيلٍ، فَإِنْ فَعَلْتَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَقَدْ ضَمِنْتَ مَالِي} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ. وَقَالَ مَالِكٌ فِي " اَلْمُوَطَّأِ " عَنْ اَلْعَلَاءِ بْنِ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ يَعْقُوبَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: {أَنَّهُ عَمِلَ فِي مَالٍ لِعُثْمَانَ عَلَى أَنَّ اَلرِّبْحَ بَيْنَهُمَا} وَهُوَ مَوْقُوفٌ صَحِيحٌ.

{دارقطني رقم: ٢٤٢. لبيهقي: ١١٣٦٠}:

حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ پارەیەکی، بەقازانج بەهاوبەشی دەدا بەپیاوێ، ئەم مەرجانەی دادەنا بۆی:

یەکەم: کە ئاژەڵو زیندەماڵی پێ نەکڕێ.

دووەم: لەدەریادا بازرگانی پێ نەکاو سەوداو مامەڵەی ناو دەریای پێوە نەکات.

سێیەم: ئەو ماڵەی کە دەیکڕێ لەجێگەیێ کە ئەگەری لافاوی هەبێ داینەنێت.

ئەوجا بەکابرای دەگوت: ئەگەر شتی وا بکەی، ئەوا دەستەبەری ماڵەکەی منیو ماڵەکەم، ئەگەر لەکاتی وادا فەوتا ئەوا دەبێ بیبژێری بۆم. دارەقوطنی گێڕاویەتەوە، پیاوانی ڕشتەکەی متمانەدارن. {صحيح الإرواء: ١٤٧٢}.

مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە (المُوَطَّأ)دا، دەگێڕێتەوە لەعلائی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی یەعقوبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە: دەڵێ:

ماوەیـێ ئیـشم بـەماڵێکی عوسمـانی کـوڕی عەففانـەوە دەکـرد، بـەقازانج بەهاوبەشی.

دانـەر (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: موقـوفێکی تەندروسـتە، لەسەر عوسمانی کوڕی عەففان، کەجێگەنشینی سێیەمە.

## ٥٣- باسی باخەوانی (موسوقات)و بەکرێدان
## بابُ: المُسَاقَاةِ وَالإِجَارَةِ

{بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ٣٨٨ + لاپەڕە: ٣٦٣ لە زنجیرە: ١٥٩ + ١٧٠ ژمارە: ١٨٥٧ هەتا ژمارە: ١٩٣٠ + فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٢٣٠ لاپـەڕە: ٥٥٩ + تجریـد/٢، لاپـەڕە: ١٢٣، زنجـیرە: ٤٧ + مختـصر صـحیح مـسلم بـەکوردی/٢، لاپـەڕە: ٤٨٨، زنجیرە: ٧٦٢ هەتا زنجیرە: ٧٧٠ نامەی ژمارە: ١٩ لە ژمارە: ٩٧٢ هەتا ٩٨٠}.

٩٣٠- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" {أَنَّ رَسُولَ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ، أَوْ زَرْعٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْـهِ. وَفِـي رِوَايَةٍ لَهُمَا: فَسَأَلُواهُ أَنْ يُقِرَّهُمْ بِهَا عَلَى أَنْ يَكْفُوا عَمَلَهَا وَلَهُمْ نِـصْفُ اَلثَّمَـرِ، فَقَـالَ لَهُمْ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {نُقِرُّكُمْ بِهَا عَلَى ذَلِكَ مَـا شِـئْنَا "، فَقَـرُّوا بِهَا، حَتَّى أَجْلَاهُمْ عُمَرُ}. وَلِمُسْلِمٍ: {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) دَفَـعَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ نَخْلَ خَيْبَـرَ وَأَرْضَـهَا عَلَـى أَنْ يَعْتَمِلُوهَـا مِـنْ أَمْـوَالِهِمْ، وَلَـهُ شَـطْرُ ثَمَرِهَا}.

{تجریـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ١٠٢٥ = ٢٣٢٨ بوخـاری. مختـصر صـحیح مـسلم/٢، ژمـارە: ٩٧٧ = ٣٩٣٩، ٣٩٤٠ شـیحا = مـسلم ١٥٥١ + تجریـدی بوخاری/٢، ژمارە: ١٠٢٩ = ٢٣٣٨ بخاری}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کاتـێ وڵاتـی خەیبـەری ئـازاد کـرد، دایـەوە بەخـەڵکی

خەیبـەر، کەبـەنیوەیی بەرهـەمی بهێـنن، چـی میـوەو بـەروبوومیو چـی دانەوێڵەو شینایی بەنیوەیی.

لەگێڕانەویەکی تـری بوخـاریو موسـلیم دا، کـە ئەمـە دەقەکەیـەتی لـە تجریدی بوخاری ژمارە: ١٠٢٩ - ٢٣٣٨ بوخاری:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێـشەوا عومـەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، جوولەکەو گاورەکانی لـەحیجاز کـردە دەرەوەو خـاکی حیجـازی پـێ چـۆڵ کـردن، هـۆی ڕەوایـی ئـەم کـارەی عومەریش دەگەڕێتەوە بـۆ ئـەم داسـتانە: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) کاتێ سەرکەوت بەسەر قەڵای خەیبەردا، ویستی بـە جوولەکـەکانی چـۆڵ بکا، چونکە بەئازاد کردنی خەیبەر، لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە، خاكو زەوی خەیبەر هەموو بوو بەهی خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان، لەهی جوولەکەکان دەرچوو، جا کە پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) ویـستی خەیبـەر بـە جوولەکەکان چۆڵ بکـا، جوولەکـەکان داوایـان لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بـێ) کـرد، کـە لـەوێ بیانهێڵـێ، هـەتا زەویو زارەکـەی بەرهـەم بهێـنن، بەمــەرجێ جوولەکــەکان کارەکــان ئــەنجام بــدەنو کــارو ئــیشو فــەرمانی بەرهەمهێنانی لەسەر ئەوان بێ، بەڵام بەروبوومەکـەی بـەنیوەیی بـێ: نیـوەی بـۆ موسـوڵمانانو نیـوەی بـۆ جوولەکـەکان. پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە لەسـەر ئەمە ڕێکدەکەوینو مـافی مانـەوەتان پـێ دەدەین، هەتا خۆمان ئارەزوومان هەبێ!!)

ئیتر ئەوانیش بەمـە ڕازی بـوونو لـەوێ مانـەوە، هـەتا ئـەو سـەردەمەی عومەر ئەوێی پێ چۆڵ کـردنو ڕەهەنـەی کـردن بـۆ تـەیماو ئـەریحا. {شـیحا ٣٩٤٤}.

لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا، کە لە ژمـارە (٣٩٤٣)ی تـەرقیمی شـێخ

ئیبنـو عومـەر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: (کاتـێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قـەڵای خەیبـەری ئـازاد کـرد: باخـە خورماکانی خەیبەرو زەوی کشتوکاڵەکەی دایـەوە پێیـان، کەبـەماڵو پـارەو پـوولی خۆیـان کاریـان تیـا بکـەنو بەرهـەمیان بهێـنن، بـەنیوەیی، نیـوەی بـۆ وەرزێڕەکـانو نیوەی بۆ پێغەمبەر). {تاج/٢، ژمارە: ١٩١٥، لاپەڕە: ٣٨٨ چاپی چوارەم}.

٩٣١- وَعَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: {سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) عَنْ كِرَاءِ اَلْأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ؟ فَقَالَ: لَا بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا كَانَ اَلنَّاسُ يُؤَاجِرُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ، وَأَقْبَالِ اَلْجَدَاوِلِ، وَأَشْيَاءَ مِنْ اَلزَّرْعِ، فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا، وَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلَّا هَذَا، فَلِذَلِكَ زَجَرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ فَلَا بَأْسَ بِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِيهِ بَيَانٌ لِمَا أُجْمِلَ فِي اَلْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ مِنْ إِطْلَاقِ اَلنَّهْيِ عَنْ كِرَاءِ اَلْأَرْضِ.

{تجريد/٣، رقم: ١٠٢٤ = ٢٣٢٧، ٢٣٣٢، ٢٧٢٢. مختصر صـحيح مـسلم بەکوردی/٢، ژمارە: ٩٧٤ = ٣٩٢٩ شيحا. أبوداود. بيوع: ٣٣٩٢. نسائی. أيمـانو نذور/٣٩٠٨. تحفة الأشراف/٣٥٥٣}:

حـەنطـەلـەی کـوڕی قەیـسی ئەنـصاری (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) فەرمووی: لەرافیعی کوڕی خەدیجم پرسی: لەبارەی بەکرێدانی زەوی بـەپارەو بـەزێڕو بـەزیو، فـەرمووی: (کـاری وا دروسـتەو هـیچ قەیـدی نییـە، ئەوەنـدە هەیـە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) زەوییـان دەدا بەکرێ، لەسەر ئەوەی کە لەسەر لێوارو ئەمبەرو ئەوبـەری ماکاوەکـان دەڕوێ، یان لەسەر قەدو دەمی دێراوەکان دەڕوێ. یان لەسەر شکارتەیێ، ڕێ دەکەوتن لەسەر ئـەوە کـە ئەوانـەی گـوتران بـۆ خـاوەن زەوییەکـە بـنو ئـەوی تـری بـۆ وەرزێرەکە بێ، جا زۆر جاری وا ڕێ دەکەوت، هـی ئاغاکـە باشـی دەهێنـاو هـی وەرزێرەکـە خـراپ، یـا بەپێـچەوانەوە، وە ئەمـە تـەنها شـێوەی بەکرێـدانی زەوییان بوو، وەگەلێ جار ئەم بارودۆخە سەری دەکێشا بۆ کێشەو بەرە، لەبـەر

ئەوە سەرزەنشت دەكران، لەسەر ئەو جۆرە مامەڵەیە، چونكە زۆرجار سەری دەكێشا بۆ زیانو تێشكان (غەرەر)ی لایەكیان، بەڵام زەوی دان بەكرێ لەسەر كرێیەكی دیاری كراوی دابینكراو هیچ قەیدی نییە!). دانەر: پێشەوای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەم گێڕانەوەی پێشەوا موسلیمدا، ئەو موجملە روونكراوەتەوە كە لە (متفق علیه)یدا، لەسەر شێوەی رەهاو بەبێ بەندو مەرج نەهی كراوە لەزەوی كشتوكاڵ بەكرێدان.

٩٣٢- وَعَنْ ثَابِتِ بْنِ اَلضَّحَّاكِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ اَلْمُزَارَعَةِ وَأَمَرَ بِالْمُؤَاجَرَةِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ أَيْضًا.

{مختصر صحيح مسلم ٩٧٥ = شيحا ٣٩٣٣ = صحيح مسلم ١٥٤٩}:

عەبدوڵڵای كوڕی سائیب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی عەبدوڵڵای كوڕی مەعقیل (رەزای خودای لێ بێ) لەبارەی بەكرێدانی زەویو زارەوە بەملكانە، پرسیارمان لێ كرد؟ فەرمووی: ثابیتی كوڕی ضەحاك (رەزای خودای لێ بێ) بەقسەی خۆی دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەكرد لەدانی زەوی بەملكانە، بەڵام فەرمانی دەكرد كەبەپارەو شتی تری وا بدرێ بەكرێ، وە فەرمووی: (شتی وا قەیدی نییە).

(روونكردنەوە):

١- ثابیتی كوڕی ضەحاك، یەكێكە لەهاوەڵە ناودارەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەنصارییە، واتە: لەدەستەی ئەنصارە، لەدەستەی كۆچكاران نییە، لەكۆمەڵەی (أصحاب الشَجَرَة)یە، كەپێیان دەگوترێ: كۆمەڵەی (بەیعەتی ریزوان = دەستەی پەیمانی خۆشنوودی). بەڵام ئەوكاتە كە ئامادەی ئەم پەیمانە پیرۆزە ناودارە بوو، منداڵ بوو، ئامادەی غەزای بەدرو صوڵحی حودەیبییەو غەزای خەندەقو غەزای حەمرائول ئەسەد بووە.

لەئیصابەدا دەفەرموێ: لەساڵی (٣) سێی بیعثەتدا لەدایك بووە، واقیدیش (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەسێی کۆچیدا لەدایك بووەو لەچل‌و پێنج دا مردووە. {بڕوانە: تجریدی بوخاری ژمارە: ٦٤٧ - ١٣٦٣ بوخاری}.

٩٣٣- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)" أَنَّهُ قَالَ: {إِحْتَجَمَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَعْطَى اَلَّذِي حَجَمَهُ أَجْرَهُ} وَلَوْ كَانَ حَرَاماً لَمْ يُعْطِهِ. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری بەکوردی/٣، لاپەڕە: ٢٧، ژمارە: ٩٥٤ = ٢١٠٣، ١٨٣ بوخاری. مختصر صحیح مسلم بەکوردی بەرگی دووەم لاپەڕە: ٤٥٥ ژمارە: ٩٣٥ = شیحا ٤٠١٨}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەبو طەیبە، کە کۆیلەی بەرەبابی بەنی بەیاضە بوو، کەڵەشاخی گرت لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباتی کرێکەی مەنێ خورمای پێداو، فەرمانی کرد بەخاوەنەکەیشی کە لەسەرانەکەی کەم بکاتەوە، ئەویش وایکرد، دەی ئەگەر مزو هەقدەستی کەڵەشاخگر حەرام بوایە، پێغەمبەر شتی وای نەدەکرد، کەخۆی کرێی کەڵەشاخگر بدات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ١٧٦٦، ١٧٧٠ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

آ- کەڵەشاخگرتن حەڵاڵە.

ب- لەدەرمانە هەرە باشەکانە، لەسوننەتدا مەدحی کراوە، {بڕوانە تاجول ئوصول بەرگی دووەم لاپەڕە: ٣٢٢ چاپی چوارەم، زنجیرە: ١٤٦، ژمارەکانی: ١٧٦٥، ١٧٦٦، ١٧٧٠}.

ج- خۆتیمارکردن ڕەوایەو دروستە.

د- هەقدەستی پزیشك‌و تیمارکەرو چارەسەری پزیشکی دروستە.

هـ- تكاكردن لەلای كاربەدەستو خاوەن مافو خاوەن قەرزو سەركار، بۆ داشكاندنی مافی خۆیانو بۆ یارمەتیو كارئاسانی لەگەڵ خواردەستا، كاری پەسەندو دروستە.

٩٣٤- وَعَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {كَسْبُ اَلْحَجَّامِ خَبِيثٌ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٩٣٤ = ٣٩٨٨ ترقيم شێخ خەلیل مەئموون شیحا = صحيح مسلم، ترقيم محمد فؤاد/١٥٦٨}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

رافیعی كوڕی خەدیج (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهای سەگ چەپەڵە، هەروا كرێی ژنی داوێنپیس، كە لەسەر لەشفرۆشی وەری دەگرێ، هەروا دەسكەوتی كەڵەشاخگر پیسە كەلەباتی كەڵەشاخگرتن وەری دەگرێ).

٩٣٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {قَالَ اَللَّهُ عَزَ وَجَلَّ ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا ، فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اِسْتَأْجَرَ أَجِيرًا ، فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{تجريدی بوخاری/٣ ژمارە: ٩٩٥ = ٥٢٢٧، ٢٢٧٠ بوخاری. لەسەرچاوەكانیدا دەڵێ: لەموسلیما نەمان دۆزییەوە، رەنگە هەڵەی خامەبێ}:

لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری سەروەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ئەم سێ جۆرە كەسەیە، لەرۆژی قیامەتا خۆم بەتایبەتی داواچیم لەسەریان: ئەو كەسەیەی كەبەهۆی ناوی پیرۆزی منەوە كەسێك هێمن دەكاتەوە، وەك ئەوە پەیمان دەدا بەكەسێكو سوێند بەخودا دەخوا كە ئەو

پەیمانە دەباتەسەر، یا لەبەرخوا تەماداری دەکا کە ئەوشتەی دەداتیێ، یابۆی دەکا، کەچی لەپاشا دەستخەڕۆی دەکاو، پەیمانەکەی دەشکێنیێو ناپاك دەردەچیێ، دووەم پیاویێ: ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشیێو بەهاکەی بخوات، سێیەم: پیاویێ کرێکاریێ بەکریێ بگریێو کاری خۆی پیێ تەواوبکاو، کەچی کرێکەی نەداتیێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٩٣ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

مرۆڤی ئازاد، کڕینو فرۆشتنو هبەو بەخشینو کردنی بەوەقف دانامەزریێ. بەڵام ئەگەر کەسیێ بڵیێ: نەزربیێ لەسەرم ئەم منالەی خۆم، یا منالیێ لە منالەکانم بکەم بەمەلا، یا بەپزیشك، ئەوە نەزرەکەی دادەمەزریێ، دەبیێ بەپێی توانای خۆی نەزرەکەی بەجیێ بهێنیێ، لەم سیێ شتەدا کەلەم فەرموودەیەدا هەڕەشەیان لیێ کراوە، جیاوازی لەنێوانی پیاوو ژندا نییە، ناوهێنانی پیاو لە فەرموودەکەدا، بۆ نموونەیە، نەوەك بۆ بەندو مەرج (بەندو مەرج، واتە: قید وشرط). چونکە ئەگەر وشەی (ڕەجول - پیاو) مەرج بیێ، دەبیێ ئەم سیێ کارە بۆ ژن دروست بیێ ئەنجامیان بدات، دەی وانییە، چونکە ئەم سیێ کارە چی بۆ پیاو، چی نبۆ ژن دروست نییە ئەنجامیان بدەن.

٩٣٦- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ أَحَقَّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ حَقًّا كِتَابُ اَللَّهِ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٣، لاپەڕە: ٨١، ژمارە: ١٠٠٦ = ٢٢٧٦، ٥٠٠٧، ٥٧٣٦، ٥٧٤٩ بخاری. مختصر صحیح مسلم بەکوردی/٤، ژمارە: ١٤٤٩ = ٥٦٨٩ فتح الملهم = ٥٦٩٧ ترقیم شیحا}:

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریو موختەصەری صەحیحی موسلیمو تاجول ئوصولدا دوورو درێژە، ئەمە دەقی وەرگەڕاوە کوردییەکەیەتی لە پوختەی موسلیمدا، بەرگی/چوارەم، ژمارە: ١٤٤٩ = شیحا/٥٦٩٧}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: دەسـتەیێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بووین، چووین بـۆ سـەفەرێ، ڕۆیشتین هەتا لای خێڵێ عەرەبدا، لاماندا، ویستمان کە بـەمیوان قـەبووڵمان بکـەن، بـەڵام خێڵەکـە ڕازی نـەبوونو دایـان نـەکردینو میوانـدارییان پـێ نەکردین، جا ئاغای خێڵەکە شت پێوەی دەدا، وە بەزۆرشت هـەوڵی لەگـەڵ دەدەن، بەڵام سوودی نابێ بۆی، تـا هەنـدێکیان دەڵێن: بـۆ ناچـن بـۆ نـاو ئـەم کاروانییە، کە لێرەدا لایان داوە، سابەشکوو چارەسەرێ لەلای کەسێکیان هەبێ. جـا دەڕۆن بۆلایـانو دەڵـێن: سـەرخێڵەکەمان شـت پێـوەی داوەو، بەزۆرشـت هـەوڵمان لەگـەڵی داوە، بـەڵام سـوودی نییـە بـۆی، ئایـا لـەلای کەسـێ لـەئێوە چارەیێ، چارەسەرێ دەست دەکەوێ؟

یەکێکیان (کە ئیمامی نەوەوی - ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ - دەفـەرموێ: ئەبو مووسا خۆی بووە) دەڵێ: بەخودا من نووشتەی گەزەندە دەزانمو دەکەم، بەڵام بەخودا چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لێتان کـرد، کەچـی ئێـوە داتـان نەکردینو ڕازی نەبوون، دەی منیش دووعاو نزاو نووشتەتان بۆ ناکەم، هەتا سەرقەڵەمانەیەکمان بۆ بڕیار نەدەن.

ئـەنجا ڕێکـەوتن لەسـەر بڕکـەیێ ڕان، ئـیتر ئـەبو مووسـایش لەگـەڵیان دەچـێ بـۆلای سـەرخێڵەکەیانو لـەوێ سـوورەتی {الْحَمْـدُ للّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ} بەسەریا دەخوێنێو بەتەڕایی دەمی، کەمێ تفـی لێ دەدا، وەهـەتا حـەوت جـار ئەمە دووبارە دەکاتەوە، وەهـەموو جارێ لەپێـشا سـوورەتی فاتحـە دەخوێنـێ، وەئـەنجا بەتـەڕایی دەمـی تفـی لێ دەدا، بەتایبـەتی لەجێگـەی ئازارەکـە، ئـیتر کابرای شتپێوەداو، وەك وشترێ لەپەت بەربێ، دەستو پای کرایەوەو هەسـتاو کەوتـە گـەڕو ڕۆیـشتنو یـەك دەنـك پەلـەقاژێو پەلـەفرتێو پەلەپرووسکێی نـەما. فەرمووی: ئیتر ئەو سەرقەڵەمانەی کە لەسەری پێکهاتبووین بەتـەواوی دایان پێمان.

جا هەندێ کەسیان گوتیان: با بەشی بکەین لەناو خۆمانا، بەلام نزاخوێنەکە فەرمووی: دابەشی مەکەن هەتا دەچینەوە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و راستی رووداوەکەی عەرزدەکەین، هەتا بزانین ئەو لەمبارەیەوە چی دەفەرموێ. جا کەهاتنەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و ئەمەیان بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: (چۆنت زانی کەئەوە دووعایە؟!). فەرمووی: (خۆی شتێ راست بوو، خودا خۆی خستیە ناودڵمەوە). فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): باشتان کردووە، دەی دابەشی بکەنو پشکێکیش بۆمن دابنێن لەگەڵ خۆتاندا هەتا بەتەواوی دڵنیابن لە دروستیی کارەکەتانو لە حەلاڵی سەرقەڵەمانەکەتانو لەو کرێیەی کەوەرتان گرتووە).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش دابەشکردنەکە دیسانەوە رەزامەندیی خۆی دەربڕی بەزەردە خەنەیێ).

لەگێڕانەوەیەکی تاجول ئوصولدا: (هەندێ کەسیان ئەمەیان بەدڵ نەبوو، وە دەیانگوت: تۆ ئەی ئەبو مووسا! لەسەر نامەی خودا کرێت وەرگرتووە. تا کاتێ هاتینەوە بۆ مەدینە، گوتیان: ئەی پیغەمبەری خودا! ئەبو مووسا لەسەر قورئانی نامەی خودا کرێی وەرگرتووە؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕەواترین شت کە کرێی لەسەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە کەنامەی خودای گەورەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٣٩ چاپی چوارەم + تاج/٣، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٣٠٤٠ ج/٤ - چاپی چوارەم}.

(روونکردنەوە):

یەکەم: بەپێی پەڕاوە گەورەکانی راڤەنامەکان، جەماوەری زانایان دەفەرموون: (وەرگرتنی کرێ لەسەر قورئان لەم شێوە کارانەدا دروستە:

١- کەسێ بەکرێ قورئان فێری کەسێکی تر بکا، لەکاتی وادا دروستە کرێ وەربگرێ، وەك ئەو مامۆستاو مەلایانەی کە حوجرەی منالآنیان هەیە، وە مانگانەیەکی دیاریکراو لەکەسوکاری منالّەکان وەردەگرن.

٢- کەسێ لەسەر قەبری کەسێ بەمانگانەیەکی دیاریکراو قورئان بخوێنێ دروستە، یا خاوەنی گۆڕەکە لەسەرئەوە خەلآتی بکا دروستە.

٣- کەسێ قورئان لەنەوارو شریتو سیدیدا تۆماربکاو بیفرۆشێ دروستە.

٤- کەسێ قورئان بنووسێتەوە، یا چاپ بکا، وەبیفرۆشێ، یا لەسەر پارچە شتێ بنووسێو بیفرۆشێ دروستە.

٥- کەسێ لەسەرئەوە ژنێ مارەبکا کەفێری قورئانی بکا دروستەو هەم مارەییەکەو هەم مارەبڕینەکە دائەمەزرێ.

٦- کەسێ لەپرسەو ماتەمو مەولوودیو بۆنە ڕەواکاندا بەکرێیەکی دیاریکراو، یا بەموکافەئەو بەخشش، قورئان بخوێنێ دروستەو ئەو کرێیەی وەری دەگرێ حەلآڵەو ڕەوایە، هەروا لەسەر شتیوا هەر پاداشێکی تری ڕەوا وەربگرێ دروستەو حەلآڵە.

٧- تەنانەت ئەگەر کەسێ سوورەتی یاسین بەکرێ لەسەر نەخۆشێ بخوێنێ دروستە.

٨- کەسێ نووشتەی ڕەوا بە ئایەتو سوورەتەکانی قورئان بکاتو لەسەرئەوە کرێو سەرقەڵەمانەی دیاریکراو وەربگرێ دروستەو ڕەوایە، هەروا پاداش.

٩- شێوەکاری تری زۆریش هەن، کە دروستە کرێو مزێکی ڕەوا، لەسەر خوێندنو فێرکردنو نووسینەوەو چاپکردنو پەخشی قورئان وەربگیرێ.

ئێستا وابەبەر چاوەوە، ئەم شێوەکارانەی کەلەم خالآنەی سەرەوەدا باسکران، لەهەموو وڵاتەکانی ئیسلامدا، بە بەرچاوی زاناو مەلایانو

ماموستايانەوە ئەنجام دەدرێن، بگرە گەلێ جار ماموستا گەورە ئاینییەکان خۆشیان ئەمە دەکەن‌و بەشداری لەشتی وادا دەکەن‌و کەسیش نەیگوتووە کەشتی‌وا ناڕەوایە.

دووەم: ذیکرو یادی خودایش، لەم خاڵانەدا، وەك قورئان وان، وەك ئەوە کەسێ، کەسێکی تر فێری ذیکرێ لە ذیکرەکان بکا، بەکرێیەکی دیاریکراو.

سێیەم: هەندێ لەزانایان‌و سەرمەزهەبەکان، رایان جیایە، سەبارەت بە دروستی‌و نادروستیی ئەم خاڵانە، یا سەبارەت بەهەندێکیان، بەلام ئەم خاڵانەی من نووسیومن ئەمڕۆ لەجیهانی ئیسلامی‌دا بوون بەباوی جوان‌و خەڵکێکی زۆر لەبەندە باشەکانی خودا، سەرگەرمی ئەنجامدانی ئەم کارانەن‌و کەسیش رەخنەی نییە.

من لێرەدا ئەم خاڵانە تۆماردەکەم، بۆ دروستیی ئەم خاڵانەی سەرەوە:

آ- لە کەرکووك حاجی عبدالرزاق، لەبەری قوریەوە بەرابەر قەلا، لەسەر چەمی خاصە، مزگەوتێکی دروست کرد بەناوی (مزگەوتی حاجی عەبدوزاق) کاتێ خۆی مرد، لەسەر راسپێری خۆی، لەناو مزگەوتەکەی خۆیدا لەهۆدەیەکی تایبەتیدا نێژرا، وەلەسەر راسپێری خۆی مانگانەیەکی رێك‌وپێك بۆ سێ حافظی قورئان بڕابۆوە، بەنۆرە بەشەوو بەڕۆژ قورئانیان لەسەر دەخۆن.

هەموو مەلا باشەکانی کەرکووك کەزوربەیان حەنەفی بوون لەم کارە رەخنەیان نەبوو، وەك ماموستا مەلا مەجیدی قوطب‌و ئیمامی مزگەوتەکە کەناوی مەلا عەزیزی شیلەخانی بوو.

ب- لە فەرموودەیەکی ئیمامی موسلیمدا، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: «دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللّٰهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ». واتە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (واز لەو

خەڵکە بهێنن با خودای گەورە، بەهۆی یەکترییەوە، رزمق‌و رۆژی حەڵاڵیان پێ بدات). {صحیح موسلیم/شیحا/٣٨٠٥}.

ج- من بەچاوی خۆم بینیم، کە لەبۆنەی مەرگی یەکێ لە ئەمیرەکانی دەوڵەتی کوومیتا، شێخ عبدالباسط موقریئی گەورەی میصری، بەفڕۆکە گەیشتە کوومیت وە لەوێ لەماوەی ماتەم‌و پرسەکەدا، بەدەنگە زوڵاڵ‌و داوود ئاساییەکەی قورئانی دەخوێند‌و ئەو قیرائەتانە تۆمارکرابوون‌و هەتا ئێستایش لەرادیۆ‌و تەلەفیزیوندا، دووبارە دەکرێنەوە، وە کەسیش نەیگوتووە کەشتی وا ناڕەواو نادروستە.

د- ئەم جۆرە کارانە بەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەون، کە دەفەرموێ: «أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ» – مسلم. فضائل. ترقیم شێخ خەلیل مەئموون شیحا). واتە:

(خۆتان لەکاروباری جیهانتان باشتر دەزانن). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٣١٦٩ + مختصر صحیحی موسلیم/٤، لاپەڕە: ١١٣، چاپی/١، ژمارە: ١٤٦٢ + ٤١- نامەی نووشتەو نزاو دووعا لە ژمارە: ١٤٤٣ بۆ ١٤٦٢}.

٩٣٧– وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَعْطُوا اَلْأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ.

{ابن ماجة رقم/٢٤٤٣. صحيح، الإرواء: ١٤٩٨}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەپێش ئەوەدا کە کرێکار ئارەقەکەی وشک ببێتەوە کرێکەیی پێ بدەن!).

٩٣٨، ٩٣٩– وَفِي البَابِ عَنْ أبي هُرَيرة (رضى الله عنه) عِنْدَ أَبِي يَعْلَى والبَيهَقِيّ، وَجَابِر عِنْدَ الطَّبَرَانِي وكُلُّهَا ضِعَافٌ.

{أبو يعلى. رقم:٦٦٨٢. طبراني في المعْجَم الصَّغيرِ رقم: ٣٤. وَعَزَاهُ الأَلْبَـانِيُّ في الإِرْوَاءِ: ٥/٣٢٤، رقم: ١٤٩٨ للطبراني في المعجم الأوسط/١/١٤٩/١}:

ئەمە پوختەی ئەم فەرموودانەیە كە دانەر لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەكات:

١- فەرموودەی ژمارە (٩٣٧) كە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە بوو.

٢- ئـەبو هـورەیرە لـە پێغەمبـەرەوە، رێـك وەك فەرموودەكـەی ئیبنـو عومەر لە پێغەمبەرەوە، واتە: ژمارە (٩٣٧)، (أبُو يَعْلَى رقم/٦٦٨٢).

٣- جابیر لە پێغەمبەرەوە... تادوایی رێـك وەك فـەرموودەی ژمـارە: ٩٣٧ {وعَزَاهُ الألباني فِي الإِرْوَاءِ (٥/٣٢٤، رقم: ١٤٩٨) للطبراني في الأَوْسَطِ (١/١٤٩/١)}.

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: ئـەم فەرموودانـە، كـە لـەئیبنو عومـەرو ئـەبو هـورەیرەو جـابیرەوە دەرهێنـراون، هەموویان لاوازو زەعیفن. بەڵام بەپێی نوسخەی (بلوغ المرام من أدلةِ الأحكام) كە لەبەرگەكەی نووسراوە:

نُسْخَةٌ مَشْكُولَةٌ وَمُخَرَّجَةُ الْأَحَادِيثِ عَلَى كُتُبِ كُلٍّ مِنْ:

١- العَلاَّمَةَ/ محمد ناصرالدين الألباني رحمه الله تعالى.

٢- العَلاَّمَةَ/ مقبل بـن هـادي الـوادعي رحمـه الله تعـالى بـەڵام بـەپێی ئـەم نوسـخەیە، فـەرموودەی ژمـارە: (٩٣٧) كـە لـەئیبنو عومەرەوەیـە بـە صـەحیح دانـراوە، لەسـەر قـسەی ئـەلبانی لـە (الإِرْوَاء = مختـصر إرواء الخليـل في تخـريج أحاديـث مَنَـارِ الـسَّبِيلِ للـشيخ الأَلْبَـانِي – مكتبـة الـشيخ الألبـاني – في المَكْتَبَـةِ الإِسْلامِيَّةِ الشَّامِلَةِ).

٩٤٠- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: {مَنِ اِسْتَأْجَرَ أَجِيراً، فَلْيُسَمِّ لَهُ أُجْرَتَهُ} رَوَاهُ عَبْدُ اَلرَّزَّاقِ وَفِيهِ اِنْقِطَـاعٌ، وَوَصَلَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ مِنْ طَرِيقِ أَبِي حَنِيفَةَ.

{مُـصَنَّف عَبْـدِ الـرزاق (١٥٠٢٤). و وَصـله أبـو نعـيم في مـسند أبـى حنيفـة (ص٨٩) وَأيْضاً البيهقى/٦/١٢٠}:

ئـەبو سـەعيدى خـودرى (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێ کرێکارێ بەکرێ دەگرێ باکرێکەیی بۆ دیاری بکا).

## ٥٤- باسی ئاوەدانکردنەوەی ویرانە (إحْياءُ المَوَاتِ)

## بابُ: إحْياءُ المَوَاتِ

٩٤١- عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنهُمَا)" أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ عَمَّرَ أَرْضاً لَيْسَتْ لِأَحَدٍ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا} قَـالَ عُـرْوَةُ: وَقَـضَى بِـهِ عُمَرُ فِي خِلَافَتِهِ. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدی بوخاری/٣، ژماره: ١٠٢٨ = بوخاری/٢٣٣٥}:

عـوروەی کـوڕی زوبـەیر (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: عائیـشەی پـوورم (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کەسـێك زەوییـەکی بـێ خـاوەن ئـاوەدان بکاتـەوە، کـەهی کەسێکی تر نـەبێ، ئـەوە دەبـێ بـەهی خۆیو ئـەو لەپێـشترە پێـی لەکەسـێکی تر).

عورووە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب، لەکاتی جێنشینی خۆیدا، بـەپێی ئـەم فەرموودەیـە حـوکمی دەکـرد. {تـاج/٢، زنجیرە: ١٦٧، ژمارە: ١٩٠١ — ب/د/ت}.

لەتاجا دەفەرموێ: لەگێڕانەوەیەکا: {بڕوانە: ژمارە: ٩١٩}.

(کەسێ زەوییەکی بێ خاوەن ئاوەدان بکاتەوە، کەهی کەسێکی تر نـەبێ، ئەوە ئـەبێ بـەهی خـۆی، وەگـەڕی زۆرداریـش لـەو زەوییـەدا، هیـچی لێ سـەوز نابێت(١).

**(ڕوونكردنەوە):**

**عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام، کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشە دەبوون، کە لەماڵی خۆیدا لەمەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).**

**عوروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە ڕێزدارە مەزنەکانی پەیڕەوان، کەپێیان دەگوترێ: (تابعین: چینی دووەمی موسوڵمانان).**

**یەکێکە لەحەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلام، کە لەزاراوی شەرعو یاسانامەی خوادا، ناودارنو ناسراون بە (فُقَهَاءُ السبعةِ - فوقەهای سەبعە = حەوت شەرعزانەکان).**

**کەئەم زاتانەن:**

**١- عوروە.**

**٢- سەعیدی کوڕی موسەییەب.**

**٣- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە.**

**٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق.**

**٥- سلێمانی کوڕی یەسار.**

**٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت.**

**٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.**

**هەندێ دەڵێن: حەوتەمیان: ئەبوبەکری کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی حاریثە. هەندێ تر دەڵێن: حەوتەمیان: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانە.**

ناوی دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیقە، کە خوشکی باوکیی عائیشەیە، خاوەنی ئەم شانازییانەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، ئەبوبەکری صەدیق باپیرەتی، زوبەیر باوکیەتی، ئەسماء دایکیەتی، عائیشە پوریەتی، خوشکی دایکیەتی، لەباوکەوە، ساڵی بیستی کۆچی لەدایك بووە، لەنەوەدو چوارا مردووە (٩٤ – ٢٠ = ٧٤) نزیکەی حەفتاو چوار ساڵ ژیاوە، کۆمەڵەی فەرمووده زانەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە. واتە: جێگەی متمانەی ئەوان بووە، کەواتە لە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمو ئەبو داوودو نەسائیو تەرمەزیو ئیبنو ماجەدا فەرموودەی هەیە. لەناو تابیعیندا، عوروەی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە. {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٧٨٤} + {ژمارە: ٩٢١ کە لەپێشەوە رابورد (روونکردنەوە)}.

٩٤٢- وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ أَحْيَا أَرْضاً مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ} رَوَاهُ اَلثَّلَاثَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ. وَقَالَ: رُوِيَ مُرْسَلاً. وَهُوَ كَمَا قَالَ، وَاخْتُلِفَ فِي صَحَابِيِّهِ، فَقِيلَ: جَابِرٌ، وَقِيلَ: عَائِشَةُ، وَقِيلَ: عَبْدُ اَللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، وَالرَّاجِحُ اَلْأَوَّلُ.

{أبو داود/٣٠٧٣. ترمذی/١٣٧٨. نسائی في الكبرى/٥٧٦١}:

سەعیدی کوڕی زەید، کە یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ زەوییەکی مردوو، کەبێ خاوەن بێ، ئاوەدان بکاتەوەو زیندووی بکاتەوە، ئەوە ئەو زەوییە دەبێ بەهی خۆی).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی گێڕاویانەتەوە، تەرمەزی بەحەسەنی داناوە، وە تەرمەزی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە بەشێوەی مورسەلیش گێڕدراوەتەوە، وە ئەم قسەیەی تەرمەزی وەك دەڵێ وایەو ئەم فەرموودەیە بە مورسەلیش گێڕدراوەتەوە، بەڵام راجیایی هەیە لەوەدا، کە ئایا ئەو صەحابەیەی کەئەم فەرموودەیە

مورسەلە لەسەر ئەو کێیە؟ گوتراوە: ئەو هاوەڵە جابیرە، گوتراویشە کە عائیشەیە، گوتراویشە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، بەهێزترینی ئەم گوتانە یەکەمە، کە فەرموودەکە مورسەلی ئیبنو عومەر بێ.

٩٤٣- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ اَلصَّعْبَ بْنَ جَثَّامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا حِمَى إِلَّا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژمارە: ١٠٤١ = ٢٣٧٠، ٢٠١٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: صەعبی کوڕی جەثثامە (ڕەزای خودای لێ بێ) هەواڵی بەمن داوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پاکژو پاوەند بەس بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا هەیەو بەس).

لەتاجا ئەمەی پترە: فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەقیعی کردبوو بەپاکژ، وەپێشەوا عومەریش لەکاتی جێنشینی خۆیدا، سەرەفو ڕەبەزەی کردبوو بەپاوەند، بۆ لەوەڕی وشتری زەکات. {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٧، ژمارە: ١٩٠٢}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مەبەست لەپاکژو پاوان پارچەیێ زەوی لەوەڕاوییە، کەسێ، یا دێیەك، دەیکەن بەپاکژ، ئیتر نابێ کەس ڕانو گایەلو وشتری تیادا بلەوەڕێنێ، مەگەر بەپێی یاساو ڕێسایەك، کە لەناو خۆیانا لەسەری ڕێککەوتوون، وەك ئەوە لەوەڕی پێ دەشتەکان بۆ هاوینو لەوەڕی شاخەکان بۆ زستان کە لەوەڕ کز دەبێ.

٢- مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیداو کەجێنشینی ئەو لەپاش ژیانی ئەو، لەسەردەمی حوکمڕانی خۆیدا، مافی ئەوەیان هەیە کە پارچەیێ زەوی، یاشاخێ، یا دەشتێ

بکەن بەپاوان‌و بۆ مەبەستێکی ڕەوا، بەنموونە: بگوترێ لەوەڕی شاخی گۆیـژە قەدەغەیـە لەسـەر ئـاژەڵی زەکـاتی دەوڵـەت، کەسـێ تـر نابـێ ئـاژەڵ لـەو لەوەڕگایەدا بلەوەڕێنێ. یا بگوترێ: شاخی پیرەمـەگروون پاوەنـد بـێ بـۆ ئـەو بزن‌و مەڕە کێویانەی کە لەوێ دەژین!.

٩٤٤- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَهْ.

{أحمد رقم: ٢٨٦٧. ابن ماجة: رقم: ٢٣٤١ صحيح، إِرْوَاءُ الغَليل: ٨٩٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەزیان نە وەڵامی زیان بەزیان!).

(ڕوونکردنەوە):

واتـە: دروسـت نییـە کەسـێ بـەناڕەوا زیـان لەکەسـێ بـدات، وەك ئـەوە بچێ خەرمانەکەی بـەناڕەوا بـسووتێنێ. کـابرای خـەرمان سووتاویش لـەباتی بچێ شکاتی لێ بکاو لـەدادگا مـافی شـەرعی خـۆی لێ وەربگـرێ‌و خەرمانەکـەی پـێ ببـژێرێ، لـەباتی ئـەوە ئـەویش بچێ خـەرمانی خەرمانـسووتێنی یەکـەم بسووتێنێ. ئەمە پێی دەڵێن: پاداشـی زیـان بـەزیان، شـتی وایـش لەیاسـانامەدا نادروستە.

٩٤٥- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدِ مِثْلُهُ، وَهُوَ فِي اَلْمُوَطَّإِ مُرْسَلٌ.

{صحيح الإرواء: ٨٩٦}:

ئیبنـو ماجـە لـە ئـەبو سـەعیدی خودرییـەوە، لـە پێغەمبـەرەوە، فەرموودەیەکی ئاوا دەگێڕێتەوە.

٩٤٦- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ أَحَاطَ حَائِطًـا عَلَـى أَرْضٍ فَهِـيَ لَـهُ} رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْجَارُودِ.

{أبو داود: ٣٠٧٧. ابن الجارود: ١٠١٥. صحيح الجامع: ٥٩٥٢}:

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ حەساری بۆ پارچەیێ زەوی بێ خاوەن بکاو بەدەوریا، دیواری، یان پەرژینێ بکا، ئیتر دەبی بەهی خۆی!).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست ئەوەیە، یەکێ لەبەڵگەی ئاوەدانکردنەوەی زەوی وێرانەی بێ خاوەن ئەوەیە کەسێ پەرژینی بۆ بکا، یا دیوارێ بەدەوریدا بکا.

٩٤٧- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ حَفَرَ بِئْرًا فَلَهُ أَرْبَعُونَ ذِرَاعًا عَطَنًا لِمَاشِيَتِهِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ابن ماجة رقم: ٢٤٨٦. حَسَنٌ، صحيح الجامع: ٦٢٠٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەشوێنێ بیرێ هەڵبکەنێ، بەدەوری ئەو بیرەدا، هەتا (٤٠) چل باڵ دەبێ بە پەچە بۆ حەوانەوەی ئاژەڵەکەی).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست ئەوەیە بەپێی یاسانامەی خودای گەورە، کەسێ: لەجێگەیەکی لەباردا، بەتایبەتی لەچۆڵو دەشتدا، بیرێ هەڵبکەنێ، بۆ ئاودانی ئاژاڵەکەی، بەهەرچوار لای ئەو بیرەدا هەتا چل باڵ دەبێ بە بەستو قەدەغەی ئەو بیرە.

زیراع (واتە: باڵ) برێتییە لەنزیکەی دوو لەسەر سێی مەترێ.

٩٤٨- وَعَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَقْطَعَهُ أَرْضًا بِحَضْرَمَوْتَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أبو داود: ٣٠٥٨. تيرمذي: ١٣٨١. ابن حبان: ٧٢٠٥}:

عەلقەمەی کوڕی وائیل (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەضرەمەوت کەشارێکە وا لەوڵاتی ئەحقاف، پارچەیێ زەوی پی بەخشیم، وە موعاوییەی لەگەڵ دا ناردم، هەتا بۆم جیا بکاتەوەو بۆم دیاری بکات. {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٠، ژمارە: ١٩٤٧ — د/ت: صحیح}.

(ڕوونکردنەوە):

وائیلی کوڕی حوجر هاوەڵێکی مەزنی پێغەمبەرە، لە قەیلەکانی حەضرەمەوتە، لەنێوانی سەعوودیەو یەمەنو عەدەنو دەریای عومان دایە. قەیل بەشایەك دەگوترێ کەپایەی لەخوار پایەی شاهەنشاوە بێ، هەروا حوجری باوکی لە پاشایانی حەزرەمەوت بووە. وائیل بەخواستی خۆی هات بۆ مەدینەو موسوڵمان بوو، دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر شێوەی موعجیزە، موژدەی ئەمەی لەپێشدا بەهاوەڵەکانی داو پێی فەرموون: (وا وائیلی کوڕی حوجر لە حەضرەمەوتەوە، لەو وڵاتە دوورەوە دێ بۆلاتان، بەخۆشی خۆی دێ، کەس بەزۆر نەیهێناوە، بەڵکوو لەبەر ئەوە دێ چونکە حەزی لەدۆستایەتی خوداو پێغەمبەری خودایە).

جا کاتێ وائیل گەیشتەجێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشوازییەکی گەرمی لێ کردو نزیکی کردەوە لەخۆیو عاباکەی خۆی بۆ ڕاخستو خۆیو ئەو دوو بەدوو لەسەری دانیشتنو وائیلی لەجێگەی دانیشتنی خۆیدا دانیشاندو فەرمووی: (خودایە! وائیلو نەوەی وائیلو نەوەی نەوەی وائیل پیرۆزو فەرداربکە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وائیلی کرد بەسەرکاری خۆی لەسەر قەیلەکانی وڵاتی حەضرەمەوت، وە موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەگەڵا ناردەوە بۆ وڵاتی خۆی، موعاوییە لەڕێ پیادە بوو، بەڵام وائیلی کوڕی حوجر بەسواری وشترە مێیەکی خۆی بوو، موعاوییە لەڕێ

سکاڵای حاڵی خۆی لەلای وائیل کردو پێی گوت، گەرمای چەوو لـی ڕێگەکـە، زۆری بۆ هێناوم، وائیلیش پێی گوت: لەسێبەری وشترەکەوە بڕۆ، سێبەرەکە بکە بـەپێڵاو بـۆ خـۆت. موعاوییـە گـوتی: ئـەوە دادم نـادات، بریـا لەپاشکۆی خۆتەوە جێت دەکردمەوە!

وائیـل پێـی گـوت: دە وسـبە، لـەکوێ تـۆ شـایانی ئـەوەیت، کـە ببـی بەپاشکۆی پاشایان، وائیـل مـا هـەتا موعاوییـە بـوو بەجێنـشین، وائیـل چـوو بـۆلای، موعاوییـە ناسـییەوە بـەخێرهاتنێکی شـایانی لێ کـردو ئەمـەی وەبـیر هێنایـەوەو ویـستی خـەڵاتی پـێ بـدا، وائیـل وەری نـەگرتو گـوتی: مـن داراو دەوڵەمەندم، بیدە بەکەسێ کە کاری پێی هەبێ، بەڵام گوتی: خۆزگەم لـەکاتی خـۆی لەبـەردەم خۆمـەوە سـوارم دەکـردی. وائیـل لەئـەفرادی صـەحیحی موسلیمە، لەصەحیحی بوخاریـدا فـەرموودەی نییـە، وائیـل (ڕەزای خـودای لێ بێ) لەکاتی جێنشینی موعاوییەدا بەمەرگی خودا مردووە. {بڕوانە: مختصر صحیحی موسلیم/١، ژمارە: ٢٧٧ شیحا ٨٩٤}.

٩٤٩- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم) أَقْطَعَ اَلزُّبَيْرَ حُضْرَ فَرَسِهِ ، فَأَجْرَى اَلْفَرَسَ حَتَّى قَامَ، ثُمَّ رَمَى سَوْطَهُ. فَقَالَ: " أَعْطُوهُ حَيْثُ بَلَغَ اَلسَّوْطُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَفِيهِ ضَعْفٌ.

{ضعيف، سنن أبي داود: ٣٠٧٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) لـە زەوییـەکانی جوولەکـەکانی بـەنی نـەضیر، ئەوەنـدەی زەوی بڕدا، بۆ زوبەیری کوڕی عـەوام، کـە سـەرێ ئەسپەکەی بـەغار تـاو بـدا، لەکوێدا ئەسپەکە وەستا، ئەوەندە بۆ ئـەو بێ. جا زوبـەیر ئەسپەکەی بـەتاو غاردا بەچوار ناڵە بردی، هەتا ئەسپەکە وزەی لێ بـــڕاو ڕەق ڕاوەســـتا، لەوێشەوە زوبەیر قەمچییەکەی خۆی هەڵدا.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکوێوە ئەسپەکەی غار داوە، هەتا ئەو جێگەیە کە قەمچییەکەی گەیشتۆتە ئەوێ، بەخەڵاتی بیدەن پێی!).

دانەر مامۆستای عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لاوازە.

٩٥٠- وَعَنْ رَجُلٍ مِنْ اَلصَّحَابَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: اَلنَّاسُ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ: فِي اَلْكَلَأِ، وَالْمَاءِ، وَالنَّارِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح الجامع: ٦٧١٣}:

ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بەڕشتەی خۆی دەگێڕێتەوە کەپیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو لەهەموو یارو یاوەرانی بێ) دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەردا چووم بۆ غەزا، لێیم بیست دەیفەرموو: (مەردوم لەم سێ شتەدا هاوبەشن: لە لەوەڕو لە ئاوو لەئاگردا).

ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە، پیاوانی ڕشتەکەی متمانەدارن.

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

پێشەوا ئەبو داود (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە بەسەنەدێکی صالح: بەڕشتەیەکی گونجاو، دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (موسوڵمانان لەم سێ شتەدا هاوبەشن: لە ئاوو لەوەڕو لەئاگردا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٤، ژمارە: ١٩٣٠ ج/٤ = چاپی چوارەم، لاپەڕە: ٣٩٩}.

(ڕوونکردنەوە):

آ- بڕوانە: مختصر صحيح مسلم، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٧٧٠، ژمارە: ٩٨٠، ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ بۆ ئەم بابەتە کراوە، پوختەکەی ئەم دوو خاڵەیە:

١- کورت و پوخت: خاوەنی بیرو کارێزو چەم، ئەگەر ئاوەکەی لەخۆی زیاد بوو، نابێ لەئاتاج و لەپێویستی خەڵکی تر قەدەغەی بکا، تەنانەت نابێ لەئاژەڵ و لەڕان و ماڵات و گیانلەبەرانیش قەدەغەی بکات.

٢- بەڵام ئەگەر کەسێ ئاوی بیرو کارێزو چەمێ کە موڵکی خۆی بێ، بیدات بەموڵکانە بۆ ئەوەی کە شینایی و کشتوکاڵی لەبەرا بکرێ، ئەوە دروستە و بەر ئەم قەدەغەیە ناکەوێ، هەروا ئەگەر کەسێ کارگەیێ دابنێ و ئاوی زۆری تیادا ئامادە بکاو بیکاتە دەفرو شتی واوەو دوایی لێی بفرۆشێ ئەوە قەیدی نییە. هەروا ئاگریش وەك فرۆشتنی نەوت و غازو کارەباو دارو خەڵوزو شقارتەو چەرخ و شتی تری لەم بابەتانە دروستەو قەیدی نییە. بەڵام دەبێ سەوداو مامەڵە بەم جۆرە شتانەوە، دەوڵەت و میری، سەرپەرشتی بکات، هەتا سەرنەکێشن بۆ پێچەوانەی مەبەست لێیان.

ب- بەشێوەی گشتی، ئەمڕۆ دونیا گۆڕاوە، لەبەر ئەوە دەبێ بۆ ئەم جۆرە بابەتانە:

١- میری (دەوڵەت) سەرپەرشتی کارگەو دابەشکردنی زەوی و زارو تاپۆکردنی خانوبەرە بکات.

٢- لیژنەی جۆراوجۆر لەپسپۆڕان دابنرێ بۆ بڕیاردان لەسەر ئەم جۆرە شتانە، هەتا نەبێ بە تێکەو لێکە.

٣- فەرمان و یاساو دەستوورو ڕێنماییەکانی میری لەم لایەنەوە، ئەگەر لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلام دەرنەچێ و بۆ بەرژەوەندو قازانجی گشتی

بـیٚ، جیٚبـەجیٚ کردنیـان ئـەرکێکی ئاینییـە، سەرپێـچیکەر لای خـودا بەرپرسیارە.

ج- ئەگەر کەسیٚ بلٚیٚ: ئێمە خۆ مەلا نین، چۆن بزانین کەبڕیارەکانی دەوڵەت لەرووی ئاینییەوە شەرعییەتی هەیە یان نا، ئەوە دەڵێین:

(ئەم پرسیارە جێگەی خۆیەتی، لەبەر ئەوە هەرکاتیٚ موسوڵمانیٚ، لـەم لایەنەوە گومانێکی بۆ پەیدا بوو، با لەئەهلی عیلم پرسیار بکا، هەم خوداو هەم خەڵك لەخۆی ڕازی بکا!).

د- لێرەدا پرسیاریٚ دەکریٚ:

ئایا دروستە بۆ میری، کێویٚ، شاخیٚ، دەشتیٚ بکات بەپاوان، بۆ جۆرە گیاندارو ئاژەڵیٚ، کە ڕاو نەکرێنو قەڵاچۆ نەکرێن، وەك لەناوچەیەکی دیاری کراوی وەك قەراغ، یاشاربازێڕ، ڕاوی کەو، یان ڕاوی بزنەکێویو مەڕە کێوی قەدەغە بکریٚ؟

بە بۆچوونی من شتی وا بەر یاسای (مصالح مرسلة) دەکەویٚ، بەتایبەتی ئەگەر بڕیاری وا لە لیژنەیەکی پسپۆڕی واوە دەربچیٚ، کە بەرژەوەندی ئایینیو جیهانی گەل بپارێزیٚ، بەتایبەتی تر، ئەگەر ئەو ئاژەڵە، یان ئەو گیانلەبەرە، رووبەڕووی قەڵاچۆ بوون ببیٚ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: «لَوْلاَ أَنَّ الْكِلاَبَ أُمَةٌ مِنَ الأُمَمِ أَكْرَهُ أَنْ أُفْنِيَهَا لأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا».

واتە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: (لەبەر ئەوە نەبیٚ کە سەگیش دادەنرێن بەنەتەوییٚ لە نەتەوەکان، کە خودا دروستی کردوون، حەزناکەم کەلەناویان بەرم، دەنا دەستوورم دەدا کە بیانکوژن).

لە فەرموودەدا هەیە، کە خودا گلەیی لە پێغەمبەریٚ لە پێغەمبەران دەکاو دەفەرمویٚ: «أَنْ قَدْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ».

واتــه: تــۆ یــەك مێرووولـە گـازی لێ گرتـی، کەچـی یـەك نەتـەوەت لـە نەتەوەکان فەلاچۆ کرد کە تەسبیحاتی خودایان دەکرد.

هـ- باخی ئاژەڵ و حەدیقـەی حـەیوانات، ملکـی دەوڵـەتن، مـاڵی میریـن، هەموو ریزێکی شەرعیان هەیە، هەرکەسێ زیانیان لێ بدا بەرپرسە.

و- کەسێ ڕاو بکـا، لـە مەحمیپەیـەکی حـەیوانی دا، لەشـەرعا بڕیـاری تایبەتی خۆی هەیە.

ز- تــەحریمکردنی ڕاوو بڕینــی ڕووەك لەئیــسلاما پێـشینەی هەیــە، ئـەوەتا لـە حەرەمــەین (مەککـەو مەدینـە)دا شـتی وا قەدەغەیـەو حەرامـە. {بڕوانە: زنجیرە: ٣٦، لە ژمارە: ٧٥١ - ٧٥٨}.

## ٥٥- باسی وەقف
## بابُ: الوَقف

{بڕوانــە: تـاج/٢، زنجـیرە: ١٨١ هـەتا زنجـیرە: ١٨٣ لـە ژمـارە: ١٩٥١ هـەتا ژمـارە: ١٩٥٨ + مختـصر صـحیح مـسلم/٢، نامـەی ژمـارە: ٢٢، زنجـیرە: ٧٨٣ لـە ژمارە: ١٠٠٠وە هەتا ژمارە: ١٠٠١ لـە زنجیرە: ٧٨٣وە هـەتا زنجیرە: ٧٨٥ + فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٥٨٠ زنجیرە: ٢٣٧ لە لاپەڕە: ٥٨٠وە هەتا ٥٨٣}.

٩٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) أَنَّ رَسُـولَ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا مَاتَ اَلْإِنْسَانُ اِنْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِـنْ ثَلَـاثٍ: صَـدَقَةٍ جَارِيَـةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠١ = ٤١٩٩ شیحا. تیرمذی. أحكـام: ١٣٧٦. نسائی. وصایا: ٣٦٥٣. تحفة الأشراف: ١٣٩٧٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ئادەمیزاد دەمـرێ، هـەموو کردەوەیـەکی کۆتایی دێ، ئەم سێ جۆرەیە نەبێ:

یەکەم: خێرێکی نەبڕاوە (وەك مزگەوتو کاریزو بیرو پردو دەستاڕو شتی تری وەقف).

دووەم: زانینی بەسوودو بەکەڵك (وەك دانانی کتێبی باش بەنیازی پاكو پێگەیاندنی فەقێو قوتابیو شاگردی باشی بەسوودی بەکەڵك بۆ گەلی ئیسلام).

سێیەم: منداڵو وەچەیەکی باش، کە دووعاو نزای باشی بۆ بکا، یا خێری تری بۆ بکا). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٣، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ٩٤٩/٢ + تاج/١، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٣٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- خێری نەبڕاوە زۆر زۆرە، وەك هەموو جۆرە وەقفێ، زەوی بێ، باخ بێ، وەك دروستکردنی پردو مزگەوتو تەکیەو خانەقاو میوانخانە بۆ ڕێبوار، وەك وەقفی دەستارو ئاشو هەڵکەندنی بیرو دروستکردنی فێرگەو قوتابخانەو هەتیوخانەو... تاد.

٢- لەڕووی یاسای ئایینەوە زانستی بەسوود، دەبێ بەچەند بەشو جۆرێکەوە:

آ- زانستی ئایینی ڕووت ئەوە ناسراوو زانراوە، وەك فێربوونی باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەرو بە قورئانو بە ئەرکانی ئیسلامو بەئەرکە ئایینییەکان.

ب- دانانی کتێبی دینیو زانستەکانی تر کە پەیوەندییان هەیە، بەفێربوونی زانستە شەرعییەکانەوە، وەك ڕێزمانو نەحوو صەرفو أصولی فیقەو بلاغەو ڕەوانبێژی.

ج- زانستو عولوومە کیفائییەکان، کە لەم جۆرەیە هەموو پیشەیەکی باش، کە کاروباری موسوڵمانان، بەبێ ئەو پیشانە ناچن بەڕێوە، وەك

دارتاشیو بەرگدرووییو ئاسنگەریو بازرگانیو هەموو پیشەیەکی تری باشی ناو کۆمەلگا.

کەواتە: وەستایێ کە شاگردێ، فێری ئاسنگەری، یا دارتاشی، یا چەخماخسازی، یا جۆلایی، یا نانەوایی یا پزیشکی، یا ئەندازیاریی، یا بەنایی، یا شۆفێری، یا ئاودێری، یا باخەوانی، یا هەرپیشەیەکی تری بەسوود بکات، ئەوە بەر بڕیارو حوکمی ئەم فەرموودەیە دەکەوێو دەبێ بەکەسێ لەوانەی کە لەپاش خۆیان زانستی بەسوود بەجێ دەهێڵنو خێری ئەو زانستەیان لەگۆڕا پێ دەگا.

٩٥٢- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {أَصَابَ عُمَرُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللّٰهِ ! إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِنْهُ. قَالَ: " إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا ، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا". قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُبَاعُ أَصْلُهَا، وَلَا يُورَثُ، وَلَا يُوهَبُ، فَتَصَدَّقَ بِهَا فِي اَلْفُقَرَاءِ، وَفِي اَلْقُرْبَى، وَفِي اَلرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اَللّٰهِ، وَابْنِ اَلسَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ صَدِيقاً} غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ مَالاً. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {تَصَدَّقْ بِأَصْلِهِ، لَا يُبَاعُ وَلَا يُوهَبُ، وَلَكِنْ يُنْفَقُ ثَمَرُهُ} .

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٤١ = بوخاری/٢٧٦٤، ٢٧٣٧، ٢٧٧٢. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ١٠٠٠ = ٤٢٠٠. أبو داود. وصایا: ٢٨٧٨. ترمذی. أحکام: ١٣٧٥. ابن ماجة. صدقات: ٢٣٩٦. تحفة: ٧٧٤٢}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عومەر لە خەیبەر، زەوییەکی دەستکەوت، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڕاوێژی پێ بکا، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پارچەیێ زەویم چنگ کەوتووە لەخەیبەر، ئەوەتی هەم ماڵی وا نایابم نەبووە، دەمەوێ بیکەم

بەخێر تۆ دەفەرمووی بیکەم بەچی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەگەر حەزدەکەی خۆی بکە بە وەقفو، دەرامەتەکەی بکە بەخێر!).

جا عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەر ئەم شێوەیە کردی بەخێر، جێ زەوییەکە خۆی نەدەفرۆشرێ، نە دەکڕرێ، نە بەکەلەپوور دەبرێ، نە دەبەخشرێ).

فەرمووی: عومەر دەرامەتەکەی وەقف کرد لەسەر ئەم کەسانە: لەسەر هەژاران‌و خزم‌و خوێشان‌و لەڕێی ئازادکردنی کۆیلەداو لەڕێگەی خوداداو، لەسەر ڕێبوارو میوان، وە ئەو کەسەیشی کە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکا، گوناهی لەسەر نییە ئەگەر بەشێوەیەکی پەسەند خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی دۆست‌و برادەری بدا، بەمەرجێ لێی نەکا بەماڵ‌و بیکا بەهی خۆی). {تاج/٢، زنجیره: ١٨١، ژماره: ١٩٥٣}.

ئەمەیش دەقی ئەو گێڕانەوەیە لە تەجریدی بوخاریدا کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا: {تجریدی بوخاری/٣، ژماره: ١٠٤١ = ٢٧٦٤ بخاری}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) زەوییەکی دەست کەوت، لەبەرابەر مەدینە بوو، ناوی ثەمغ بوو، پڕی بوو لەباخە خورما، کات سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، ڕۆیشتە خزمەتی عەرزی کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! ماڵێکی زۆر چاکم دەست کەوتووە، دەمەوێ بیکەم بەخێر، تۆ دەفەرمووی بیکەم بەچی؟ فەرمووی: (ئاوا، بیکە بەوەقف: جێ زەوییەکە خۆی وەقف بێ، نە دەفرۆشرێ، نە دەبەخشرێ، نە بەکەلەپوور دەگیرێ بەڵام دەرامەتەکەی دەبەخشرێ بەپێشیاوانی).

ئیتر عومەریش لەسەر ئەو شێوەیەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیشانیدا، جێ زەوییەکەی کرد بە وەقف‌و دەرامەت‌و دەسکەوتەکەی کرد بەخێر، وە ئەو خێرەیش بۆ ئەم جۆرە کەسانەبێ: بۆ

خەباتگێڕانو تێکۆشەرانی ڕێگەی خوداو، بۆ ئازادکردنی کۆیلەو بۆ نەداراو هەژارانو بۆ میوانو بۆ ڕێبوارانو، بۆ خزمانو خوێشانێ کە پێشیاوبن، وە ئەو کەسەیشی کە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکا، کەپێی دەگوترێ: (مُتَولِّي) گوناهی لەسەر نییە، ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەوا خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی دۆستو برادەری خۆی بدا، بەمەرجێ لێی نەکا بەهی خۆیو نەیکا بەماڵو پاشەکەوتی بکا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٨ – باسی وەقف ژمارە: ١٩٥٣ + فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، باسی وەقف، زنجیرە: ٢٣٥}.

٩٥٣– لەپێشەوە لەژمارە (٦٣٢)دا رابورد.

## ٥٦- باسی شت بەخشینو عومراو روقبا
## بابُ: الهِبَةِ وَالعُمْرى والرُّقْبى

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١٧٦ هەتا زنجیرە: ١٧٩ لە ژمارە: ١٩٣٣وە هەتا ژمارە: ١٩٤٥ + فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ٢٣٨ + زنجیرە: ٢٣٩}.

٩٥٤– عَنْ اَلنُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: { إِنِّي نَحَلْتُ اِبْنِي هَذَا غُلَامًا كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " أَكُلُّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا"؟. فَقَالَ: لَا. فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " فَارْجِعْهُ"}. وَفِي لَفْظٍ: {فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِيُشْهِدَهُ عَلَى صَدَقَتِي. فَقَالَ: " أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ"؟. قَالَ: لَا. قَالَ: " اِتَّقُوا اَللَّهَ ، وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ " فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ اَلصَّدَقَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ قَالَ: {فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي" ثُمَّ قَالَ: " أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا لَكَ فِي اَلْبِرِّ سَوَاءً"؟ قَالَ: بَلَى . قَالَ: " فَلَا إِذًا}.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٠٤ = ٢٥٨٧ + مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩١ = شیحا/٤١٦١ + ٩٩٠ = شیحا/٤١٥٧}:

لەصەحیحی موسلیمو تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: بـاوکم بـڕێ لەماڵەکـەی خـۆی بەخـشی بـەمن، عـەمرەی کـچی ڕەواحـەی دایکـم، گـوتی بەباوکم: مـن بەمـەرازی نـابم، هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نەکـەی بەشـایەت لەسـەر ئـەم خەڵاتـە، جـا بـاوکم منـی بـرد بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) هـەتا بیکـا بەشـایەت لەسـەر ئـەم بەخششە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێـی فـەرموو: (ئایـا هـەموو مناڵەکانی ترت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟). باوکم فەرمووی: نەء، حەزرەت (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (لـەخودا بترسـن‌و بـێ فـەرمانی ئـەو زاتە مەکەن‌و بەیەك چاو تەماشای هـەموو مناڵـەکانتان بکـەن‌و دادپـەروەربن لەنێوانیانا، چونکە خودا وای پێخۆشە).

فەرمووی: جا لەسەر فەرمانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) باوکم لەبەخشینەکەی پەشیمان بۆوەو لەمنی سەندەوە. {تاج/٢، لاپـەڕە: ٤١٦، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨، چاپی چوارەم. دەقـی ژمـارە: ٩٩٠. لـە مختـصر صـحیح مسلم دا، ژمارە: (٩٩١)ی مختصر صحیح مسلم ئاوایە، کـە گێڕانـەوەی دووەمـی ئێرەیە:

نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خـودا لـەخۆی‌و لـەباوکی‌و لـەدایکی) فـەرمووی: بـاوکم هـەڵی گـرتم‌و بردمـی بـۆلای پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) گوتی: ئـەی پیغەمبـەری خـودا! تـۆ بەشـایەت بـە کەئـەوا ئـەوەو ئەوەم لەماڵەکەم بەخشی بە نوعمانی کوڕم. فەرمووی: (ئایـا گـشت کوڕەکـانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟). بـاوکم فـەرمووی: نـەء، فـەرمووی: (دە کەسێکی تر بکە بەشایەتی ئەمـە، مـن شـایەتی وا نـادەم). لەپاشـا فـەرمووی: (ئەی حەزیش ئەکـەی کـە کوڕەکانـت هـەموویان وەك یـەك بـۆت بـاش بـن؟). باوکم فەرمووی: (بەڵێ) فەرمووی: (کەواتە نابێ). {تاج/٢، زنجیـرە: ١، ژمـارە: ١٩٥٨ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەم جۆرە بەخشینەدا، جیاوازی لەنێوانی کوڕو کچدا نییە.

٢- لەڕاڤەنامەکانا دەفەرموێ: ئەم جۆرە پێبەخشینە ئەگەر منداڵەکانی تری ڕازی بن دروستە.

٣- لەگێڕانەوەی یەکەمی ئێرەدا، بەخششەکەی کە بەشیر داویەتی بەنوعمانی کوڕی، پیاوێکی کۆیلە بووە.

٤- لەوڵاتی خۆمان هەتا ئێستایش واباوە، بەتایبەتی لەلادێکان، باوك ژن دێنێ بۆ کوڕی خۆی، وە مەسرەفی شایی بۆدەکا، ئەوە بەپێی ئەم فەرموودەیە، چەند کوڕی هەبێ، واباش و شەرعی‌یە، کە مەسرەفی ژنهێنانیان لەسەر ماڵی باوکیان بێ، مەرجیش نییە، کە چەندی بۆ شایی کوڕی یەکەمی خەرج کردووە، ئەوەندەیش بەبێ زیادو کەم بۆ زەماوەندی کوڕی دووەم خەرج بکا، وە هەروەها باوك کاتێ ژن بۆ کوڕێکی دەهێنێ‌و ماڵی بۆ جیادەکاتەوە، هەنێ ماڵی پێویستیشی بۆ ئەم قۆناغە دەداتێ، ئەمەیش هەروەها.

هەروا لەوڵاتی خۆمان واباوە، کچ کەشوو دەکا، لەماڵی باوکی جیازیی بۆ دەکرێ، دەبێ لەم لایەنەیشەوە، باوك‌و دایك لەنێوانی کچەکانیانا دادپەروەربن‌و پابەندبن بە باوی جوانی ناو کۆمەڵگای خۆیانەوە، چونکە عورف – کەباوی جوانی ناو کۆمەڵگایە – یەکێکە لەبنەماکانی بڕیارە شەرعییەکان.

٩٥٥– وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ : قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {لَيْسَ لَنَا مَثَلُ اَلسَّوْءِ، اَلَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ} .

{تجريدى بوخارى = مختصر صحيح البخارى/٣، ژمارە: ١١٠٥ = ٢٥٨٩، ٢٦٢١، ٢٦٢٢، ٦٩٧٥ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٨٩ = شيحا/٤١٥٢. نسائى. هبة: ٣٦٩٣}:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ دەسەنەو بەخششی خۆی، دووبارە هەڵبگرێتەوە، یان بیسەنێتەوە لەوکەسەی کەپێی بەخشیوە، ئەوە وەك ئەوسەگە وایە، کە دەڕشێتەوەو لەدوایی‌دا سەرلەنوێ ڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە!).**

**لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕەفتاری ناشیرین لەئێمە ناوەشێتەوە: وەك ڕەفتاری ئەوکەسەی کە لەدەسەنەو بەخشش‌و خەڵاتی خۆی پەشیمان دەبێتەوە، ئەوە وەك سەگ وایە، کە دەڕشێتەوە، ئەوجا کەبرسی بوو دەیخواتەوە!).**

**٩٥٦- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُعْطِيَ اَلْعَطِيَّةَ ، ثُمَّ يَرْجِعَ فِيهَا " إِلَّا اَلْوَالِدُ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ"} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.**

{أحمد رقم: ٢١١٩. أبو داود. رقم: ٣٥٣٩. ترمذى. رقم: ٢١٣٢. نسائى. رقم: ٣٦٩٠. حاكم رقم: ٢٢٩٨. بيهقى. رقم: ١٧٩٦. ابن حِبَّانَ. رقم: ٥١٢٣}:

**ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیان‌و لەباوکیان) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوی موسوڵمان کەشتێکی بەخشی، یا خەڵاتێکی دا بەکەسێ، ئیتر دروست نییە بۆی کەلێی پەشیمان ببێتەوە، مەگەر باوك‌و دایك‌و باپیرەو نەنك، دوورو نزیکیان، بەڵام بۆ ئەمانە کەشتێ ببەخشن بە منداڵ‌و نەوەو وەچەی خۆیان، دروستە لێی پەشیمان ببنەوە).** {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٨، ژمارە: ١٩٤١}.

٩٥٧- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْبَلُ اَلْهَدِيَّةَ، وَيُثِيبُ عَلَيْهَا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بوخاری: ٢٥٨٥}:

عائیـشه (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) دیاریی وەردەگرتو پاداشی شیاوی خاوەن دیارییەکەی دەدایـەوە).

{تاج/٢، زنجیرە: ١٧٦، ژمارە: ١٩٣٣، چاپی چوارەم}.

٩٥٨- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {وَهَبَ رَجُلٌ لِرَسُـولِ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَاقَةً، فَأَثَابَهُ عَلَيْهَا، فَقَالَ: " رَضِيتَ" ؟ قَالَ: لَا. فَزَادَهُ، فَقَالَ: "رَضِيتَ"؟ قَالَ: لَا. فَزَادَهُ. قَالَ: "رَضِيتَ" ؟ قَالَ: نَعَمْ}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/٢٦٨٧. ابن حبان/٦٣٨٤}:

ئیبنـو عـەبباس (رەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ وشـترە مێنگەیەکی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لەپاشا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) پاداشـی ئـەوەی دایـەوەو بـەکابرای فـەرموو: (ئایـا بـەم پاداشـەی مـن، لەسـەر دیارییەکـەت رازی بوویـت؟) کـابرا گـوتی: نـەء، جـا پێغەمبـەر زیـاتری دایـەو دیـسان پێـی فـەرموو: (ئایـا رازی بوویت؟). پیاوەکە دیسان گوتی: نەء، جادیسانەوە زیاتری دایەو پێی فـەرموو: (ئایا رازی بوویت؟) کابرا لەسەری جارێ سێیەما گوتی: بەڵێ رازی بووم.

لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

عـارەبێکی دەشـتەکی نێوونـە وشـترێکی بـەدیاری هێنـا بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوەودوا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشەش نێوونە وشتر تۆڵەی کـردەوە بـۆی، کەچـی کـابرا هێـشتا هـەر لالـووت بوو، کە ئەمە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتەوە، سـتایش‌و سوپاسـی جـوانی خـودای کـردو فـەرمووی: (فیـسارەکەس وشـترە مێـچکەیەکی

بەدیاری هێنابوو بۆم، لە تۆڵەی ئەوەدا شەش نێوونە وشتری داوەپێی، کەچی هێشتا هەر لووتەلایە! بەڕاستی نینازم هەبوو کەئیتر دیاری لەکەس وەرنەگرم، مەگەر لە قورەیشی، یا لەئەنصاری، یا لەثەقەفی، یا لەدەوسی). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٣٥٥٦}.

٩٥٩- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {اَلْعُمْرَى لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلَا تُفْسِدُوهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِي أُعْمِرَهَا حَيًا وَمَيِّتًا، وَلِعَقِبِهِ}. وَفِي لَفْظٍ: {إِنَّمَا اَلْعُمْرَى الَّتِي أَجَازَهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنْ يَقُولَ: هِيَ لَكَ وَلِعَقِبِكَ، فَأَمَّا إِذَا قَالَ: هِيَ لَكَ مَا عِشْتَ، فَإِنَّهَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا}. وَلِأَبِي دَاوُدَ وَالنَّسَائِيِّ: {لَا تُرْقِبُوا، وَلَا تُعْمِرُوا، فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئًا أَوْ أُعْمِرَ شَيْئًا فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ}.

{تجريدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١١٤ = ٢٦٢٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩٢ = شيحا ٤١٦٦ + ژمارە: ٩٩٣ = شيحا/٤١٧٢. أبو داود. بيوع: ٣٥٥٠. ترمذی. أحكام: ٣١٤٨. نسائی. عُمْرى: ٣٧٤٤. ابن ماجة. هبات: ٢٣٨٠. تحفة الأشراف: ٣١٤٨}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاری داوە، ئەگەر کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێ، پێی بڵێ: کە هەتا ماویت ئەم شتە بۆ تۆبێ، ئەوە دەبێ بەهی ئەو کەسە کەپێی بەخشراوە، پاش مردنیشی ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنی پێشووی، بەڵکوو دەبێ بەهی کەلەپوور گرانی پێبەخشراوەکە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ١٩٤٢. تەجرید/٣، ژمارە: ١١١٤}.

جابیر فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەست بەماڵی خۆتانەوە بگرن، بەفیڕۆو داغانی مەکەن، ئەوەیش بزانن کە هەرشتێ کە بەناوی زیندەبەخش (عوامر)وە ببەخشن و بیدەن بەکەسێ،

دەبێ بەهی ئەوکەسە، چی بەزیندوویی، چی بەمردوویی، لەپاش خۆشی دەبێ بەهی ئەوکەسە پێ بەخشراوە، وە بەپێی یاسای کەلەپوور دەبێ بەهی وەچەو نەوەکەی). {مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩٣}.

لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیما:

دیسان جابیر فەرمووی: ئەو عومرایەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی پێ داوەو دایمەزراندووە، ئەوەتا کە بەخشەر بڵێ: ئەمە بۆ خۆت‌و بۆ نەوەو وەچەت، بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەمە بۆ خۆت تاماویت، ئەوە دەبێتەوە بەهی خاوەنەکەی. جاران پێشەوا زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) بەم چەشنە فەتوای دەدا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ١٩٤٤ + صحيح مسلم تەرقیم شیحا/٤١٦٧ + مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩٢ = شیحا/٤١٦٦}.

لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داوودو نەسائی‌دا:

جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (روقبا، یا عومرا لەگەڵ کەسێ مەکەن، بەخەیاڵی ئەوە کە لەپاش مەرگی پێ بەخشراوەکە ببێتەوە بەهی خۆتان، چونکە نابێتەوە بەهی ئێوە، بەڵکوو دەبێ بەهی میراتبەری عومرا، یا روقبا لەگەڵ کراوەکە). {صحيح الجامع/٧٢٨٢}.

(روونکردنەوە):

عومرا لە عومری عەرەبی وەرگیراوە، کە بەمانا مان‌و تەمەن‌و ژیانە، وەك ئەوە کەسێ بەکەسێ تر بڵێ: ئەم باخەی من بۆ تۆ هەتا ماویت، یا پێی بڵێ: ئەم شتەم بەخشی بەتۆ، تاخۆت ماویت بۆ خۆت‌و لەپاش خۆت بۆ منداڵ‌و وەچەو نەوەت. کەواتە: عومرا دوو جۆرە: ئەم شتە بۆخۆت هەتا ماویت، بەڵام لەپاش مەرگی تۆ ببێتەوە بەهی خۆم. روقبایش لەماددەی (موراقەبە) وەرگیراوە، کە بەواتا (چاوەنوارِی)یە، وەك ئەوە پێی بڵێ: ئەمەم دابەتۆ، وە هەردوکمان چاوەڕوانی مردنی یەکتری دەکەین، ئەگەر من لەپێشا

مـردم ئـەوا بەیـەكجاری ببـێ بـەهی خـۆت، وە ئەگـەر تـۆیش لـەپێش منـدا مردیت، ئەوا ببێتەوە بەهی خۆم.

٩٦٠- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اَللّٰهِ، فَأَضَاعَهُ صَاحِبُهُ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِـرُخْصٍ، فَـسَأَلْتُ رَسُـولَ اَللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ. فَقَالَ: " لَا تَبْتَعْهُ، وَإِنْ أَعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ ...} اَلْحَدِيثَ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریـد/٢، ژمـارە: ٧١٦ = ١٤٩٠، ٢٦٢٣، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣ بوخـاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٨٨ = ٤١٣٩ شيحا. نسائي. زكاة: ٢٢٦١٤. ابن ماجة. صدقات: ٢٣٩٠ تحفة الأشراف: ١٠٣٨٥}:

لەپوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عومـەری كـوڕی خـەتاب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ئەسـپێكی نایـابم هـەبوو، لەڕێگـەی خـودادا بەخـشیم بـە غـەزاكاری، بـەڵام خاوەنەكـەی قەدری نەزانیو زۆر بێ خزمەتی كرد، منیش ویستم لێی بكڕمەوە، بـەزەینی خۆم گوتم: هەرزانفرۆشـی دەكـاو بەهـەرزان دەیفرۆشـێ، چـونكە تـەواو لـەڕو لاوازی كردبـوو، بـۆ ئەمـە پرسـیارم لـە خۆشەویـست كـرد (دروودی خـودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نـە بیكـڕەرەوەو، نـە هـیچ بەخـشینێكی خـۆت بـەپارە هەڵبگرەوە، با ئـەو كەسـەی كـە بەخـشیوتە پێـی، بەیـەك درەمـیش بیداتـەوە پێـت، چـونكە ئـەوەی كـە خێـرو بەخـشراوی خـۆی بكڕێتـەوە، یـا بیقـەبڵێنێ بەپارەو بـەو پارەیـە هـەڵی بگرێتـەوە، ئـەوە وەك سـەگێ وایـە كـە ڕشـانەوەی خۆی بخواتـەوە). {ریـاض/٤، زنجیرە: ٢٨٥، ژمـارە: ١٦١٢ + تـاج/٢، زنجـیرە: ١٧٨، ژمارە: ١٩٤٠ چاپی چوارەم = ج/٤}.

٩٦١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَالَ: {تَهَادُوْا تَحَابُّوا} رَوَاهُ اَلْبُخَـارِيُّ فِـي " اَلْـأَدَبِ اَلْمُفْـرَدِ " وَأَبُـو يَعْلَـى بِإِسْـنَادٍ حَسَنٍ.

{حسن، الإرواء: ١٦٠١. أبو يعلى/١١٤٨}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دیاری بەرن بـۆ یـەکتری، چونکە دیـاری بـردن بـۆ یـەکتری، دەبـێ بەهـەوێنی خۆشەویـستی لـەنێوانتانا). پێـشەوا بوخـاری (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) لـەکتێبی (الأدب المفـرد)دا، دەیگێڕێتـەوە، ئـەبو یەعلایش بەڕشتەیەکی جوان دەیگێڕێتەوە.

٩٦٢- وَعَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {تَهَادَوْا، فَإِنَّ اَلْهَدِيَّةَ تَسُلُّ اَلسَّخِيمَةَ} رَوَاهُ اَلْبَزَّارُ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف، الجامع/٢٤٩٢}:

ئەنـەس (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (دیـاریی پێـشکەشی یـەکتری بکـەن، چونکە دیـاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێشێ، ئافرەت بۆ ئافرەتی دراوسێی خۆی، هـیچ دیاری‌و دەسەنەو کاسە ئاوسێیەك بەکەم نـەزانێ، ئەگـەر دیارییەکـەی لاسمی مەڕێکیش بێ بابۆی بەرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٧، ژمارە: ١٩٣٦}.

٩٦٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَا نِسَاءَ اَلْمُسْلِمَاتِ! لَا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ١٠٩٥ = ٢٥٦٦، ٦٠١٧ بوخـاری. مسلم/١٠٣٠}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەی ژنـە موسـوڵمانەکان! بـا ژن بـۆ ژنـی دراوسێی خۆی هیچ دیاری‌و... تاد). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٧٦، ژمـارە: ١٩٣٦ چـاپی چوارەم}.

٩٦٤- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: {مَنْ وَهَبَ هِبَةً، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا، مَا لَمْ يُثَبْ عَلَيْهَا} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ وَصَحَّحَهُ، وَالْمَحْفُوظُ مِنْ رِوَايَةِ اِبْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ قَوْلُهُ.

{ضعيف. الجامع/٥٨٨٣}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ شتێکی بەخشی بەکەسێ بەنیازی ئەوەی کە پاداشی لەسەر وەربگرێ، ئەوە خۆی شایانترە بەو بەخششەی، مادەم پاداشی وەرنەگرتبێ لەباتی).

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەبەرکراو (محفوظ)ی تەواو، لەگێڕانەوەی ئیبنو عومەر بۆ ئەم فەرموودەیە، ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە مەوقووفە لەسەر عومەرو قسەی عومەرە، مەرفووع نییە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

(ڕوونکردنەوە):

١- دیاری گۆڕینەوەو بەخشش‌و خەڵات‌و دەسەنە سوننەتە، بەمەرجێ نیاز پاک بێ‌و سەرنەکێشێ بۆ بەرتیل‌و بەرتیلکاری. دیاری‌و خەڵات‌و بەخشین‌و بەخشش‌و دەسەنە جۆریان زۆرە.

ئەوشتەی دەکرێ بەدیاری، مەرجە حەڵاڵ بێ، کەواتە: سەگی ڕاوی دەبێ بۆ دیاری.

## ٥٧- باسی دۆزراوە
## بَابُ: اللُّقَطَةُ

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، لەژمارە: ١٩٥٩ — ١٩٦٥ + تجریدی بوخاری/٣، زنجیرە: ٥٠، لاپەڕە: ١٤٩، لەژمارە: ١٠٥٥ هەتا ژمارە: ١٠٥٦ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم زنجیرە: ٢٤٠ باسی هەڵگرتنی شتی داکەوتوو}.

٩٦٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَرَّ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بِتَمْرَةٍ فِي اَلطَّرِيقِ، فَقَالَ: " لَوْلَا أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لَأَكَلْتُهَا"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژماره: ١٠٥٦ = ٢٤٣١ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٥١٥ = شيحا/٢٤٧٠ + تەجريد/٢، ژماره: ٧١٥ = ١٤٨٥، ١٤٩١، ٣٠٧٢. تحفة الأشراف: ١٤٣٨٣}:

**له تەجريدى بوخاريدا ئاوايه:**

**ئەبو هورەيره (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (جاروبار وادەبێ كە دەچمەوە بۆ ماڵەوە، دەبينم وا دەنكێ خورما، لەسەر نوێنەكەم كەوتووە، منيش هەڵى دەگرمو، دەمەوێ بيخۆم، بەڵام دوايى بيردەكەمەوە دەترسم كەهينى زەكات بێ، لەبەرئەوە فڕێى دەدەمو نايخۆم!).**

**لەتاجول ئوصولا ئاوايه:**

**ئەنەس (رەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەسەرەڕێ، دەنكێ خورماى دۆزييەوە فەرمووى: (نەبادا هى زەكات بێ، دەنا دەمخوارد). {تاج/٢، زنجيره: ١٩، ژماره: ١٢٥٥}.**

٩٦٦- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ اَلْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: " اِعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَشَأْنُكَ بِهَا". قَالَ: فَضَالَّةُ اَلْغَنَمِ؟ قَالَ: "هِيَ لَكَ، أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ: فَضَالَّةُ اَلْإِبِلِ؟ قَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ اَلْمَاءَ، وَتَأْكُلُ اَلشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژماره: ٧٩ = ٩١، ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢ بوخارى. مختصر صحيح البخارى/٣، ژماره: ١٠٦٠ = شيحا/٤٤٧٧}:

زەیدی کوڕی خالیدی ئەلجوهەنی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ): حوکم‌و بڕیاری زێڕو زیوی دۆزراوەو شتی داکەوتەی تری دۆزراوە چییە؟

فەرمووی: (پڕیاسکەو دەمبێنەکەی نیشانە بکە، وەهەتا ساڵێ جاڕی بۆ بدەو ناونیشانی هەڵبدە، جا ئەگەر لەوماوەدا خاوەنەکەی پەیدابوو، ئەوا بیدەرەوە پێی، ئەگەر چەسپانی کەهینی خۆیەتی، دەنا چی لێ دەکەی بیکە، یا خەرجی بکە بۆخۆت، وە لەهەمان کاتدا، وایدابنێ کە سپاردە (وەدیعە)یە لەلای تۆ، هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە، دەبێ بیدەیتەوە پێی).

لێشی پرسی: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! ئەی بڕیاری بزن‌و مەڕی گومبوو چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بیبەرەوە، چونکە ئەگەر تۆ نەیبەیتەوەو خاوەنەکەی نەیدۆزێتەوەو برادەرێکی تر نەیباتەوە بۆخۆی، دیارە کە گورگ دەیخوات!).

عەرزیکرد: ئەی قوربان! بڕیاری وشتری بزر چییە؟

فەرمووی: (تۆ دەخڵت چییە بەسەریەوە؟ تۆ دەخڵی مەکە، وشتر پێڵا وو کوندەی خۆی پێ هەیە، بۆ خۆی ئاو دەخواتەوەو لەوەڕ دەخوا، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوەو دەیباتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٦٠، ١٩٦١}.

٩٦٧- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {مَنْ آوَى ضَالَّةً فَهُوَ ضَالٌّ ، مَا لَمْ يُعَرِّفْهَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٦٢ = شیحا/٤٤٨٥}:

دیسان زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ شتێکی گومبوو بدۆزێتەوەو حەشاری بدا بۆ خۆی‌و بەپێی یاسانامەی خودا، ناونیشانی

هەڵنەدا، ئەوە خۆشی گومڕایەو ڕێگەی ڕاستی بزرکردووە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٥٩}.

(ڕوونکردنەوە):

زەیـدی کـوڕی خالیـدی جوهـەنی، لـەپیاوانی صـەحیحی بوخـاریو صەحیحی موسلیمەو لەپەڕاوە گەورەکانی تـری فـەرموودەیـشدا فـەرموودەی هەیــە، (٨١) هەشــتاو یــەك فــەرموودەی لــە پێغەمبــەرەوە گێڕاوەتــەوە، لەبوخاریدا پێنج فەرموودەی هەیە، لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا، ئاڵای لەشکری هۆزەکەی خۆی، کە هۆزی جوهەینـە بـوون بـەوبوو، گێڕانـەوەی لـە پێغەمبەرو لە عوثمانو لەئەبو طەلحەو لـە عائیـشەوە ئـەنجام داوە، کۆمـەڵێ کە دوانیـان کوڕی خـۆی بـوون فـەرموودەکانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، ئامـادەی ڕۆژەکـەی صـوڵحی حودەیبییـە بـووە، ڕاجیاییـەکی زۆر لەسـاڵی تەمـەنیو مردنیو جێگەی مردنی هەیە، هەندێ دەڵێن: سـاڵی حـەفتاو هەشـتی کۆچـی لەتەمـەنی هەشـتاو پێـنج سـاڵیدا، لەمەدینـە مـردووە، هەنـدێ تـر دەڵـێن: لەمیسر، لەساڵی پەنجادا لەتەمەنی حەفتاو هەشت ساڵیدا مـردووە، لەکووفـە نیشتەجێ بوو، دەڵێن: هەر لەوێش مردووە، لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا، هـەر ئەو ناوی زەیدی کوڕی خالید بـووە، ئـەم فەرموودەیـەی زەیـدی کـوڕی خالیـد (مُتفقٌ علیهِ)یە، واتە: پەسـەندی هـەردوو پـیرە، کـە شـێخی بوخـاریو شـێخی موسـلیمن، کەواتـە: زەیـد لـەرجالی صـەحیحەینە، کـە صـەحیحی بوخـاریو صەحیحی موسلیمن. {بڕوانە: موختەصەری صەحیحی موسلیم/١، ژمارە: ٥٦، لاپەڕە: ٩١ - ٩٢ چ/١}.

٩٦٨- وَعَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَوَيْ عَدْلٍ، وَلْيَحْفَظْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَـا، ثُمَّ لَا يَكْتُمْ، وَلَا يُغَيِّبْ، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا، وَإِلَّا فَهُـوَ مَـالُ اَللَّـهِ يُؤْتِيـهِ مَـنْ

يَشَاءُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/١٧٦٢٠. أبو داود/١٧٠٩. ابن ماجة/٢٥٠٥. نسائي في الكبرى/٥٧٧٦. صحيح الجامع/٦٥٨٦، الصحيح المسند/١٠٥٤}:

عيياضی كوڕی حيمار (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر كەسێ گومبوویەكی دۆزییەوە، با دوو شایەتی دادپەروەر بگرێ بەشایەتو، پریاسكەو بوخچەو دەمبێنەكەی نیشانە بكا، ئەوجا حەشاری نەداو لێی بێ دەنگ نەبێو بەردەوام ناو بەناو جاڕی بۆ هەڵ بدا، جا ئەگەر خاوەنەكەی پەیدابوو ئەوە هی خۆیەتی، دەنا ئەوە ماڵو سامانی خودایەو بەخواستی خۆی بەكێی دەدا دەیدات).

(ڕوونكردنەوە):

عيياضی كوڕی حيماری ئەل‌موجاشيعی، دۆستێكی دێرینی پێغەمبەر بووە، لەبەصرە نیشتەجێ بوو، كۆمەڵێ فەرموودە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، كە یەكێكیان ئەم فەرموودەی ئێرەیە، لە ئەفرادی صەحیحی موسلیمە، لەسەر فەرمایشتی إصابەی شێخی عەسقەلانی، واتە: عيياض لەبوخاریدا فەرموودەی نییە، عيياض لەپێش ئیسلامبوونیدا، دیارییەك دەبا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لێی وەرناگرێ.

باوكی ناوی حيمار بووە، كە بەواتا گوێدرێژە لەزمانی كوردی خۆمانا. هەندێ لەیاسا ناسانی شەرع، گۆڕیویانە بە (حەممار) كە لەزمانی كوردیدا بەواتا خاوەن گوێدرێژو كەرداره، گوایە ئەقڵ نایگرێ كە مرۆڤ ناوبنرێ بەناوی گوێدرێژەوە، مامۆستای عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: شتی وا دەست تێوەردانی بێ بەڵگەو بێ نیشانەیە. بەڵام گەرچی

ئەم ناوە ناشیرینانە ناباش‌و ناپەسەندن‌و یاسانامەی خودا ئایەخیان دەکاو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەردەمی خۆیدا زۆریانی گۆڕیوە بەناوی جوانی لەبار، بەڵام هەتا ئێستایش ریشەکەن نەبوون لەناو کۆمەڵگادا، بەبۆنەی سەیر سەیرەوە، وەك:

١- لەناو عەرەبانا باوبووە، لەکات‌و ساڵی لەدایك بوونی منداڵەکەدا، چی لەلایاندا بوایە، ناوی ئەوشتە، یا ئەو ئاژەڵە، یا ئەو شتەیان لەمنداڵەکە دەنا، وەك لەوکاتەدا قالۆنچەیەکیان دەدی ناویان دەنا (جوعەل = قالۆنچە).

٢- دایك‌و باوك ئەوەندە تامەزرۆی منداڵ بوون، دەیانگوت: مەرج بێ، هەر منداڵمان ببێ ناوی بنێین: دار، یا مار، یا هار، یا زار. گوایە: بەڵکوو خودا بەزەیی پیایانا بێتەوەو منداڵیان پێ بدا. {تاجول ئوصول/٥، زنجیرە: ٦١ هەتا زنجیرە: ٦٧ لەژمارە: ٥٣٩١ هەتا ژمارە: ٥٤٢١}.

٩٦٩- وَعَنْ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ لُقَطَةِ اَلْحَاجِّ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٦١. أبو داود. لقطة: ١٧١٩}:

عەبدورەحمانی کوڕی عوسمانی تەمیمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لە هەڵگرتنەوەی شتی داکەوتووی حاجی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٥، ژمارە: ١٩٦٤، ١٩٦٥}.

(روونکردنەوە):

عەبدورەحمان برازای طەلحەیە، لەئازادبوانی رۆژی رزگارکردنی مەککەیە، ئامادەی غەزای یەرمووك بووە، لەگەڵ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحدا. گێڕانەوەی لە موسلیمدا هەیە، بەڵام لە بوخاریدا گێڕانەوەی نییە، واتە: لە ئەفرادی صەحیحی موسلیمە، هەندێ دەفەرموون لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا لەیەك رۆژدا، لەساڵی حەفتاو سێی کۆچی، لەمەککە کوژراوە،

هەندێ تر دەفەرموون: لە ئەلحەرووره نێژراوە. كاتێ مزگەوتی حەرام گەوره كراوە، گۆڕەكەی كەوتۆتە ناو مزگەوتەكەوە. {بڕوانە: موختەصەری صەحیحی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٦١}.

٩٧٠- وَعَنْ اَلْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَلَا لَا يَحِلُّ ذُو نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَلَا اَلْحِمَارُ اَلْأَهْلِيُّ، وَلَا اَللُّقَطَةُ مِنْ مَالِ مُعَاهَدٍ، إِلَّا أَنْ يَسْتَغْنِيَ عَنْهَا}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{صحيح الجامع/٢٦٤٣}:

میقدامی كوڕی مەعدیكەریب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم شتانە نادروستو حەرامن:

١- خواردنی گۆشتی دڕندەیێ كە كەڵبەی هەبێ.

٢- خواردنی گۆشتی كەریماڵی.

٣- خواردنو بردنی گومبووی خاوەن پەیمان، مەگەر خۆی دەستی لێ هەڵگرتبێو كاری پێی نەمابێ.

(ڕوونكردنەوە):

١- میقدامی كوڕی مەعدیكەریبە، كەسناو (كونیە)ی (أبو كریمە)یە، لە ئەصڵا خەڵكی شامە، لەهاوەڵە منداڵەكانی پێغەمبەرە، عەرزیانكرد: ئەی ئەبو كەریمە! خەڵك دەڵێن: تۆ پێغەمبەرت نەدیوە؟ فەرمووی: (با، بەخوا بەخزمەتی گەیشتووم، جارێ لەگەڵ مامەما دەڕۆیشتم پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەرمەی گوێچكەی گرتمو فەرمووی بەمامەم: (بەزەینی تۆ دەبێ كاتێ كە گەوره بوو ئەم گوێچكە گوشینەی منی لەبیر بمێنێ!). وەبیستیشم دەیفەرموو: (لەمناڵی لەبارچووەوە هەتا ئیختیاری كەفتەكار، لەڕۆژی قیامەتدا لەتەمەنی (٣٠) سیی ساڵیدا حەشر دەكرێن...).

میقدام لەشام دەژیا، فەقێی زۆری هەیە، لەخەڵکی شام، مەبەست لە (فەقێ) لەم جۆرە شوێنەدا، ئەوکەسەیە کە فەرمووده لە مامۆستاکەی وەردەگرێ، لەتەمەنی نەوەدو یەك ساڵیدا، لەشام ئەمری خودای کرد، لەساڵی هەشتاو حەوتی کۆچیدا، لە بوخاریدا دوو فەموودەی هەیە، لەسەر فەرمایشتی موقەددیمەی فەتحولباری.

٢- ناموسوڵمانو بێباوەڕان، بەپێی یاسانامە دەبن بەم چوار بەشەوە:

آ- موعاهەد، واتە: پەیماندار، ئەوانەن کە پەیمانێ یارێکەوتنێ لەنێوانی ئێمەو ئەواندا هەبێ، کە شەڕو شۆڕ نەکەینو بەئاشتی پێکەوە بژین، وەك زۆرینەی دەوڵەتە موسوڵمانەکان لەگەڵ زۆرینەی دەوڵەتە ناموسوڵمانەکانی ئەمرۆدا.

ب- موستەئمەن، واتە: ئەمانپێدراو، وەك ناموسوڵمانێ، کە خەڵکی وڵاتێکی ناموسوڵمان بێ، بەڵام لەبەر بەرژەوەندێ، رێگەی پێ درابێ، کە لەناو ئێمەدا کاربکا، وەك بازرگانیو پزیشکیو هەر کارێکی تر کە موسوڵمانان سوودی لێ وەربگرن.

ج- ئەهلی ذیممە، واتە: هاوولاتییەك لە وڵاتی ئیسلامدا، کە موسوڵمان نەبێو بەپێی دەستووری موسوڵمانان بەخەڵکی وڵات دابنرێ، وەك ئەو گاورو جوولەکانەی کە لەناوماندا، لەکۆنەوە دەژین بەپێی شەرعو یاسا، بەخەڵکی وڵات دادەنرێنو، لەخێرو شەڕدا حاڵیان حاڵی ئێمەیە، بەمەرجێ ناپاکی لە موسوڵمانان نەکەن، ئەمانە. (لَهُمْ مالنا، وَعَلَيْهِمْ مَاعَلَيْنَا).

واتە: وەك هاو وڵاتی، چی مافێ بۆ ئێمەی موسوڵمانان هەیە، بۆ ئەوانی ناموسوڵمانیش هەیە، وەچی ئەرکێ لەسەر ئێمەی موسوڵمانان هەیە، لەسەر ئەوانی ناموسوڵمانیش هەیە).

د- موحاریب، کە ئەو ناموسوڵمانانەن لەگەڵ ئێمەدا لەحاڵەتی شەڕو جەنگدان.

## ٥٨- باسی فەرائیز: دابەشکردنی کەلەپوور لەنێوانی کەلەپووربەرانیدا (فەرائیض)

## بابُ: الفَرَائِض

بڕوانە: ئەم سەرچاوانەیە:

{فیقهی ئاسان بەرگی دووەم، زنجیرە: ٢٤٣ + تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم زنجیرە: ٨٨، لەژمارە: ٢٠٥٩ وە هەتا ژمارە: ٢٠٦٤، بەتایبەتی بڕوانە: (پایانێ - خاتمة) هەتا کۆتایی لاپەڕە: ٣٢١ ج/١ + مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٧٧٨، نامەی ژمارە: ٢١ لەژمارە: ٩٩٤ وە هەتا ٩٩٩ + تاج/٢، لاپەڕە: ٤١٦، لەزنجیرە: ١وە هەتا زنجیرە: ١٠ لەژمارە: ١٩٥١ - ١٩٩٦}.

٩٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَلْحِقُوا اَلْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣١٦ ج/١ = چاپی یەکەم، ژمارە: ٢٠٥٩ = ٦٧٣٢، ٦٧٣٥، ٦٧٣٧، ٦٧٤١ بخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩٥ = شیحا}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو خاوەن بەشێ لەکەسوکاری مردوو، بەشە کەلەپووری دیاریکراوی خۆی پێ بدەن، بەپێی دەقی قورئانەکە، ئەنجا هەرچی لەوان مایەوە، ئەوە بۆ خزمترین کەسی مردووەکەیە، بەمەرجێ نێرینەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ١٩٧٢، ج/٤}.

٩٧٢- وَعَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَرِثُ اَلْمُسْلِمُ اَلْكَافِرَ، وَلَا يَرِثُ اَلْكَافِرُ اَلْمُسْلِمَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{بوخاری/٦٧٦٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٩٤ = شیحا/٤١١٦}:

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نە موسوڵمان کەلەپوور

له ناموسوڵمان وەردەگرێو، نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ هیچیان کەلەپوور لەهیچیان وەرناگرن). {تاج/٢، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٩٦٠، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی هاوڕێو خۆشەویستی پێغەمبەر بوون، نازناوی (الحِبُّ بنُ الحِبِّ = خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست) بوو.

نەخشی نقیمی نەنگوستیلەکەی ئوسامە (حِبُّ رسولِ اللهِ) بوو، کوڕی ئوممو ئەیمەنە، کە لەلەودایەو دایکی شیریی پێغەمبەر بووەو، بەمناڵی پەروەردەی کردووە، ئوسامە ئەوەندە هۆشیارو لێهاتوو بوو، لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردی بەسەرکردەی لەشکر، کاتێ کەپێغەمبەر مرد (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمەنی ئوسامە (٢٠) بیست ساڵ بوو، سەدو بیستو هەشت فەرموودەی هەیە، یازدەیان پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمن، دوو فەرموودەیشی لەبوخاریدا هەیە، کە لەموسلیمدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیێ، لەزاراوی فەرموودەدا دەگوترێ: (لە ئەفرادی بوخارییە). دوو فەرموودەیشی لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، کە لەبوخاریدا نین، بەم جۆرە فەرموودەیەیش دەگوترێ: لە ئەفرادی موسلیمن. کەواتە: کۆی فەرموودەکانی لە صەحیحی بوخاریدا دەکاتە: ١٥+٢ = ١٧، هەروا لەموسلیمدا دەکاتە: ١٥+٢ = ١٧. لە صەحیحەیندا، کە صەحیحی بوخاریو صەحیحی موسلیمن دەکاتە: ١٥+٢+٢ = ١٩ نۆزدە فەرموودە.

ئوسامە لە وادی ئەلقورا، لەساڵی (٥٤) پەنجاو چواری کۆچیدا، لەتەمەنی (٥٥) ساڵیدا، گیانی پاکی سپاردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی پەسەندی هەردوو پیرە، واتە: (متفق علیه)ییە.

ئوسامە هەتا مرد بەشداری لەئاژاوەکاندا نەکردو لەشەڕی موعاوییەو عەلیداو، لە جەنگی صەفین‌و جەمەلیشدا بەشداری نەکرد، لەپاش شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان، ئوسامە بەرکەنار بوو لەئاژاوە گەلەکان، هەتا لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مرد، زۆر لەهاوەڵان‌و لەپەیڕەوان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، وەك ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس {بڕوانە: تەجریدی صەریحی بوخاری/ بەرگی/١، لاپەڕە: ١٣٨ + بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٧، ژمارە: ١٧٥٥ + کۆتایی ژمارە: ٦ کەوا لەپێش ژمارە حەوتی موختەصەری صەحیحی موسلیمەوە + رَفعُ الخَفَا شرح ذات الشِفَا لابن الحاج الکردی ج/١، ص١١١ + تاج/کوردی، بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٢٥ – باسی چاکیی ئوسامە زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٣٣٩١، ٣٣٩٢، ٣٣٩٣، ٣٣٨٦ – ٣٣٩٠، ٣٤٤٥، ٣٤٤٦، لاپەڕە: ١٢٣، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ٢٠١، ٤٠٣}.

٩٧٣– وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فِي بِنْتٍ، وَبِنْتِ اِبْنٍ، وَأُخْتٍ – {قَضَى اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " لِلِابْنَةِ اَلنِّصْفَ ، وَلِابْنَةِ اَلِابْنِ اَلسُّدُسَ – تَكْمِلَةَ اَلثُّلُثَيْنِ– وَمَا بَقِيَ فَلِلْأُخْتِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٦٠ = ٦٧٣٦ بوخاری، ٦٧٤٢}:

ئەم فەرموودەیە لەتەجریدی بوخاری‌و تاجول ئوصولدا ئاوایە:

هوزەیلی کوڕی شەرەحبیل (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لەئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ): (مردوویەك هەیە، کچێك‌و کچێکی کوڕو خوشکێکی هەیە، کەلەپوورەکەیان چۆن لێ دابەش دەکرێ؟).

فەرمووی: نیوەی لەبۆ کچەکەیەتی‌و ئەو نیوەکەی تریشی بۆ خوشکەکەیەتی، کچی کوڕەکەی هیچی ناکەوێ، بشڕۆ بۆ لای ئیبنو مەسعوود، بۆ دڵنیایی تەواو لەویش بپرسە، دەبینی ئەویش هەروەك من دەڵێ‌و لەم

پرسیارەدا پەیڕەوی من دەکا. جا پرسیارکرا لەئیبنو مەسعوود، وەقسەکەی ئەبو مووسایشیان گێڕایەوە بۆی، ئەویش فەرمووی: ئەگەر وابێ، دەبێ من ڕێگەی شەرعم هەڵەکردبێو لەم لایەنەوە سەرم لێ شێوابێ، چونکە ئەم وەڵامە هەڵەیە، بەپێچەوانەی سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەرەوەیە شتی وایش وەك ئەم ئایەتە وایە، کەدەفەرموێ: {قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُهْتَدِينَ – سورة الأنعام/٦، رقم الآية: ٥٦}.

لەبەرئەوە من لەم پرسیارەدا، وەك پێغەمبەر خۆی بڕیار ئەدەمو حوکم دەکەم، ئەم پرسیارە وا دەکرێتەوە:

بۆ کچەکە نیوە هەیە، بۆ کچی کوڕەکەیش شەش یەك هەیە، کە بەهەردوولا دەکەنە دوو سێیەکی تەواو، کەدوو سێ یەك بەشی دیاریکراوی دوو کچو زیاترە، وەهەرچیش لەوان مایەوە بۆ خوشکەکەیەتی. جاچووینەوە بۆلای ئەبو مووساو قسەکەی ئیبنو مەسعوودمان بۆ گێڕایەوە. فەرمووی: (ئێوە کە ئەم زانا گەورەیەتان والەناودا، لەمن مەپرسن، لەوبپرسن، پرسیارەکەتان وەڵام دەداتەوە). {تاجی کوردی/٢، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١٩٦٦، چ/٤ - چاپی چوارەم}.

٩٧٤– وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ. وَأَخْرَجَهُ اَلْحَاكِمُ بِلَفْظِ أُسَامَةَ. وَرَوَى النَّسَائِيُّ حَدِيثَ أُسَامَةَ بِهَذَا اَللَّفْظِ.

{أحمد/٦٦٦٤. ترمذی/٢١٠٨. نسائی في الكبرى رقم: ٦٣٨٢. حاكم رقم: ٢٩٤٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پەیڕەوانی دوو ئایینی جیاجیا، لەیەکتری کەلەپوور ناگرن، وەك ئەوە مێردەکە موسوڵمان بێو ژنەکە

مەسیحی بێ). دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: حاکم ئەم فەرموودەیەی لە ئوسامە وەرگێڕاوەتەوە، هەروەها نەسائی.

٩٧٥- وَعَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم) فَقَالَ: {إِنَّ اِبْنَ اِبْنِي مَاتَ ، فَمَا لِي مِنْ مِيرَاثِهِ ؟ فَقَالَ: " لَكَ اَلسُّدُسُ " فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ، فقَالَ: "لَكَ سُدُسٌ آخَرُ" فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ. فَقَالَ:" إِنَّ اَلسُّدُسَ اَلْآخَرَ طُعْمَةٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ. وَهُوَ مِنْ رِوَايَةِ اَلْحَسَنِ اَلْبَصْرِيِّ عَنْ عِمْرَانَ، وَقِيلَ: إِنَّهُ لَمْ يَسْمَعْ مِنْهُ.

{أحمد/رقم: ٢٠٠٨٨. نسائی/ الکبری/٦٣٣٧. أبو داود/٢٨٩٦. ترمذی/٢٠٩٩}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: کوڕی کوڕم مردووە، من چیم دەکەوێ لە کەلەپوورەکەی؟ فەرمووی: بۆتۆ شەش یەك هەیە، جا کەپیاوەکە هەڵسا بڕوات، بانگی کردوەو فەرمووی پێی: بۆتۆ شەش یەکێکی تریش هەیە، جا کەپیاوەکە ویستی بڕوات، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: شەش یەکەکەی تر بەش نییە، بەڵام بەرماوەیە، چونکە خاوەن بەشەکان کەمن و ئەم شەش یەکەیش بە تەعصیب – واتە: بە باوانێتی – بۆتۆ ماوەتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٧، ژمارە: ١٩٧٩ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەدو ئەبو داوودو تەرمەزی و نەسائی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، تەرمەزی بەصەحیحی داناوە. هەروا دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە حەسەنی بەصری لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەیگێڕێتەوە، لەوەیشدا ڕاجیایی هەیە: کە ئایا حەسەنی بەصری، فەرموودەی لەخودی عیمرانەوە بیستووە یانا؟

٢- ئەم پرسە ئاوا دەکرێتەوە: پیاوێ مردووە، تەنیا دوو کچو باپیرەی لەباوکیەوە لەپاش بەجێماوە. بۆ دوو کچەکە ٣/٢ دوو سێیەك هەیە، بۆ باپیرەکەیشی ٦/١ یەك لەسەر شەش بەفەرز هەیە، ٦/١ یەك لەسەر شەش دەمێنێ، ئەویش دەدرێ بە باپیرەکە، کەواتە: بەجێماوی کوڕە مردووەکە لەم پرسەدا دەکرێ بەسێ بەشەوە (٣/١) یەك لەسەر سێی بۆ کچی یەکەمو (٣/١) یەك لەسەر سێیەکی تری بۆ کچی دووەمو (٣/١) یەك لەسەر سێیەکەی تریش بۆ باپیرەکەیە، بە فەرزو بە تەعصیب.

٩٧٦- وَعَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ" {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) جَعَلَ لِلْجَدَّةِ اَلسُّدُسَ، إِذَا لَمْ يَكُنْ دُونَهَا أُمٌّ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ، وَقَوَّاهُ اِبْنُ عَدِيّ.

{أبو داود/٢٨٩٥. نسائى/كبرى/٦٣٠٤، ٦٣٣٨. ابن الجارود/٩٦٠. ابن عدى/٣/٤١٦}:

ئیبنو بورەید لەباوکیەوە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) شەش یەکی دانا بۆ نەنك، لەحاڵێکا کە دایکی مردووە کە نەمابێ!).
{تاج/٢، زنجیرە: ٧، ژمارە: ١٩٨٣ چ/٤}.

٩٧٧- وَعَنْ اَلْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اَلْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ سِوَى اَلتِّرْمِذِيِّ، وَحَسَّنَهُ أَبُو زُرْعَةَ اَلرَّازِيُّ، وَصَحَّحَهُ وابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أحمد/رقم: ١٧٢٤٣. ابن ماجة/رقم: ٢٧٣٨. بيهقى/رقم: ١١٩٨٩. أبوداود/رقم: ٢٨٩٩. ابن حبان/رقم: ١٠٣٥. ترمذى/رقم: ٢١٠٣. نسائى/كبرى/رقم: ٦٣٥١}:

میقدامی کوڕی مەعدیکەریب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خاڵ کەلەپوورگری کەسێکە، کە کەلەپوورگری تری نەبێ!).

٩٧٨- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ قَالَ: {كَتَبَ مَعِي عُمَرُ إِلَى أَبِي عُبَيْدَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمْ) " أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: " اَللَّهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لَا مَوْلَى لَهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ سِوَى أَبِي دَاوُدَ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{أحمد/١/٢٨/١٨٩. ابن ماجة/٢٧٣٧. ترمذى/٢١٠٣. نسائی/كبری/٦٣١٧}:

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ جێنشین بوو، نامەی بۆ ئەبو عوبەیدە نووسی لە وەڵامی پرسیارەکەیدا، کە لەبابەت کەلەپووری خاڵەوە پرسیاری لە عومەر کردبوو، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (خوداو پێغەمبەری خودا کەلەپوورگری کەسێکن، کە کەلەپوورگری تری نەبێ، خاڵیش کەلەپوورگری کەسێکە، کەلەپوورگری تری نەبێ!).

(ڕوونکردنەوە):

میراتبەران دەبن بەم چەند بەشەوە:

١- خاوەن پشکەکان، وەك ژن، وەك باوكو دایكو باپیرو نەنكو مێردو تاقە کچو دوو کچو زیاترو دوو خوشكو زیاترو... تاد.

٢- باوان (عەصەبە) وەك: کوڕو براو مامو ئامۆزاو کوڕی کوڕو کچ لەگەڵ کوڕداو خوشك لەگەڵ براداو... تاد.

٣- سەروەریو خاوەنێتی، کەپێی دەگوترێ: (وەلاء) وەك ئازادکەرو کەسوکاری ئازادکەر.

٤- خاڵوان کەپێیان دەگوترێ: (ذەویل ئەلئەرحام).

حا ئەگەر مردوویێ لەم چواربەشە کەسی نەبوو کە کەلەپوورەکەی بگرێ، کەلەپوورەکەی هی بەیتولمالە، کە ئێستا پێی دەگوترێ (خەزینەی دەوڵەت).

٩٧٩- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا اِسْتَهَلَّ اَلْمَوْلُودُ وُرِّثَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.
{السلسلة الصحيحة: ١٥٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر منداڵ لەکاتی لەدایکبوونیدا، دەنگی لێوەهات، یا هەر نیشانەیەکی تری ژیانی پێوەبوو، وەك هەناسەدانو پژمەو شتی تریوا، ئەوە کەلەپوور دەگرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣، لاپەڕە: ٤٢٢، ج/٤، ژمارە: ١٩٧٠ — د/ت/ن — ئیبنو حیببان بە صەحیحی داناوە}.

٩٨٠- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَيْسَ لِلْقَاتِلِ مِنَ الْمِيرَاثِ شَيْءٌ} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَقَوَّاهُ اِبْنُ عَبْدِ اَلْبَرِّ ، وَأَعَلَّهُ النَّسَائِيُّ، وَالصَّوَابُ: وَقْفُهُ عَلَى عُمَرَ.
{صحيح الجامع/٥٤٢٢. ترمذی/رقم/٢١٠٩. ابن ماجة/رقم/٢٦٤٥. بیهقی/رقم/١٢٠٢٣. دارقطنی/٤/٩٦}:

عەمری کوڕی شوعەیب، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بکوژ - قاتل) لەکوژراوی دەستی خۆی، کەلەپوور وەرناگرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٩٦٣، ج/٤، لاپەڕە: ٤١٨ — د/ت/ن — سند ضعیف — دارەقطنی — رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ}.

پێشەوا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: نەسائیو دارەقوتنی گێڕاویانەتەوە، ئیبنو عەبدولبەڕ بە بەهێزی داناوە، نەسائی بە دەردەدا (معلول)ی داناوە، قسەی راست ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە

بەرزەوەكراو نەبێ بۆسەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵكوو مەوقووفە لەسەر عەمری كوڕی عاص.

٩٨١- وَعَنْ عبدالله بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ النبي (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَلْوَلاَءُ لُحْمَةٌ كَلُحْمَةِ النَّسَبِ لاَيُبَعُ، وَلاَ يُوهَبُ}. رَوَاهُ الحاكم مِن طريقِ الشافِعِيِّ، عَنْ محمد بن الحسن، عن أبى يُوسُفَ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حبان، وَأَعَلَّهُ البيهقي:

{حسن، صحيح الجامع/٥٥٢٠/أبوداود/٢٩١٧. نسائي/ كبرى/٦٣٤٨. ابن ماجة/٢٧٣٢. ابن عبدالبر/٣/٦١}:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەقداریی ڕشتەیەكە وەك ڕشتەی خزمایەتی، لەبەرئەوە نە دەفرۆشرێو نە دەبەخشرێ!). {بڕوانە: ژمارە: ٨١٥ كە لەپێشەوە رابورد + مختصر صحيح مسلم، بەرگی دووەم، ژمارە: ٨٩٧، ٨٩٨}.

٩٨٢- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ اَلْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {مَا أَحْرَزَ اَلْوَالِدُ أَوْ اَلْوَلَدُ فَهُوَ لِعَصَبَتِهِ مَنْ كَانَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَالنَّسَائِيُّ ، وَابْنُ مَاجَهْ ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْمَدِينِيِّ ، وَابْنُ عَبْدِ اَلْبَرِّ.

{صحيح، الإِرْوَاء/١٧٨٣. الشافعى/١/٣٣٨. ابن حِبَّان/١١/٣٢٦، رقم: ٤٩٥٠. حاكم/رقم: ٧٩٩٠}:

عومەری كوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرچی مافو ماڵێ، لەپاش باوكو دایك بەجێ بمێنێ لەپاش مەرگیان، هەروا هەرچی مافو ماڵێ، لەپاش منداڵ بەجێ بمێنێ لەپاش مەرگیان، لەپاش جیاكردنەوەی پشكی خاوەن بەشەكان، بۆ كەلەپوور بەرەكانیانە لەباوان، ئیتر هەركەسێ بن).

(ڕوونکردنەوە):

لەکوردیدا دەگوترێ: هەقداری ژن، بەوکەسانەی کەباوانی ژنن، دەی لەسەر ئەم بنەمایە (وەلاء) واتە: هەقداری، کە مافێکە بەپێی یاسانامە، دەچەسپێ لەنێوانی ئازادکارو ئازادکراودا، لوحمە خزمایەتیيە.

٩٨٣- وَعَنْ أَبِي قِلَابَةَ ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَفْرَضُكُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ ، وَالْأَرْبَعَةُ سِوَى أَبِي دَاوُدَ ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ ، وَابْنُ حِبَّانَ ، وَالْحَاكِمُ ، وَأُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.

{أحمد/١٢٩٣٥. ترمذی/٣٧٩١. نسائی/کبری/٨١٨٥. إبن ماجة/١٥٤. ابن حِبَّانَ/٧١٣١ صحيح الجامع: ٨٩٥}:

ئەبو قیلابە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترین فەرائیززانتان زەیدی کوڕی ثابیتە!). {فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٦٢٤، زنجیرە: ٢٤٣}.

١- ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی ئەنصاری، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەهۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوفە، باوکی دایکی ناوی ئەسعەدبوو، کەسناو (کونیە)ی ئەبو ئومامە بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمیشی بەناوی باپیرەیەوە ناونا (أبو أُمَامة: أَسْعَد) تەمەنی لە نەوەت تێپەڕی بوو، لەساڵی سەدی کۆچیدا گیانی پاکی سپاردووە.

هەندێ لەژیاننامە نووسەکان دەڵێن: لەگەورە پیاوانی تابیعینە، لەکاتی لەدایکبووندا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەلاشووی بەخورما شیرین کرد، وە نزای پیتو فەڕی بۆیکرد، دوو کوڕی هەبوو بەناوی سەهلو موحەممەد، فەرموودەکانی ئەویانگێڕاوەتەوە.

٢- ئیبنو باز دەفەرموێ: گەرچی دانەر دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە لاوازە، چونکە عیللەتی ئیرسالی واتیادا، بەڵام ئیبنو ماجە ئەم فەرموودەیەی بە رشتەیەکی تەندروست گێڕاوەتەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

(دڵسۆزترین کەس لەنەتەوەی ئیسلامی من بە نەتەوەی ئیسلامی من، ئەبوبەکری صەدیقە، ئەوەیشی کەزیاتر لەهەموویان ئایینی بەتوندی گرتبێ عومەری کوڕی خەطابە، ئەوەیشیان کەزیاتر لەهەموویان شەرمێکی راستو دروستی هەیە عوثمانی کوڕی عەففانە، ئەوەیشیان کە لەهەموویان لەقەزاوەتو دادوەریی بزانێ، عەلی کوڕی ئەبو طالیبە، ئەوەیشیان کە لەهەموویان زیاتر شارەزایی لە یاسانامەی خوادا هەیە موعاژی کوڕی جەبەلە، باشترین فەرائیززانیشیان زەیدی کوڕی ثابیتە، بشزانن کە هەموو نەتەوەیێ ئەمینداڕێکی هەیە، ئەمینداری ئەم نەتەوەی منیش کە نەتەوەی ئیسلامە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحە!).

## ٥٩- باسی راسپێریی (وەسێت)
## بَابُ: الوصَايَا

{بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ٤١٦، زنجیرە: ١ + لاپەڕە: ٤٣٧، زنجیرە: ١١ هەتا زنجیرە: ١٥ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٦٦٠، زنجیرە: ٢٥٣ هەتا زنجیرە: ٢٥٤ + مختصر صحیح مسلم/٢، زنجیرە: ٧٧١، نامەی/٢٠، ژمارە: ٩٨١ هەتا ژمارە: ٩٨٥ + تەجرید/٣، نامەی/٥٩، لەژمارە: ١١٣٦ هەتا ژمارە: ١١٤٥}.

٩٨٤- عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) " أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَا حَقُّ اِمْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُرِيدُ أَنْ يُوصِيَ فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٣٦ = ٢٧٣٨ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٨١ + تاج/٢، زنجيرە: ١١، ژمارە: ١٩٩٧}:

**لەموختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:**

**سالم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بیستم لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ کەبیەوێ راسپێری (وەسیّتی) تیادابکا، هەق وایە، سێ شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێ، هەتا وەسیّتنامەکەی بەنووسراوەیی لەلای خۆیدا دابنێ).**

**ئیبنو عومەر دەیفەرموو: ئەوەتی ئەمەم لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، شەو نەبووە کە راسپێرینامەکەمم لەلانەبووبێ).**

**{تاج/٢، زنجيرە: ١١، ژمارە: ١٩٩٧ — ش/د/ت/ن}.**

**(روونکردنەوە):**

**لەتەجریدی بوخاریدا ئاوایە:**

**(هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ، کەبیەوێ راسپێریی (وەسیّت)ی بۆبکا، هەق وایە کە دووشەوی بەسەردا تێنەپەڕێ هەتا وەسیّتنامەکەی بەنووسراوەیی، لەلای خۆی دادەنێ).**

**٩٨٥- وَعَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَنَا ذُو مَالٍ، وَلَا يَرِثُنِي إِلَّا اِبْنَةٌ لِي وَاحِدَةٌ ، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: " لَا " قُلْتُ : أَفَأَتَصَدَّقُ بِشَطْرِهِ ؟ قَالَ: " لَا " قُلْتُ: أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثِهِ؟ قَالَ: " اَلثُّلُثُ ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ اَلنَّاسَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

{تەجريد/٢، رقم: ٦٢٣ = ١٢٩٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٩٨٢ = شيحا/٤١٨٥. أبو داود. وصايا/٢٨٦٤. ترمذی. وصايا: ٢١١٦. نسائی. وصايا: ٣٦٢٨. تحفة الأشراف: ٣٨٩٠}:

ئەم فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجی ماڵاوایی، کە ناسراوە بەساڵی حەججەتول وەداع، لەمەککە نەخۆشکەوتم، کەشەنگ بووم خەریکبووم بمرم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، بۆ سەردان و هەواڵپرسیم، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەمبینی کە نەخۆشی چی لێ کردووم، ماڵێکی زۆریشم هەیە، تاقە کچێکیشم هەیە، کە کەلەپوورو میراتم لێ بگرێ، جا دەمەوێ کە دووبەش لەسێ بەشی ماڵەکەم بکەم بەخێرو وەسێت و ڕاسپێری، کە لەپاش مردنم بۆم بکرێ بەخێر، واتە: ماڵەکەم بکەم بەسێ بەشەوە دووبەشی بکەم بەخێر، کەبۆم بکرێ لەپاش مەرگم، جا تۆ بۆ ئەمە فەرمانت بەچییە، شتیوا دروستە یانا؟ فەرمووی: (نەء، دروست نییە).

گوتم: دە نیوەی دەکەم بەخێر، دەبێ یانا؟

فەرمووی: (نەء، ئەویش نابێ).

گوتم: دە سێ یەکێکی دەکەم بەخێر؟ فەرمووی: (سێیەك دەبێ، بەڵام سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتربێ باشترە، چونکە تۆ لەپاش مردنی خۆت میراتبەرەکانت بە دەوڵەمەندی و تێرو تەسەلی بەجێ بهێڵیت، گەلێ لەوە باشترە کە بەهەژاری بەجێیان بهێڵیت لەپ لەم و لەو پان بکەنەوەو چاویان لەدەستی خەڵك بێ!).

(ئەوەیش بزانە هەرچی خەرج بکەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە ئەوا پاداشی باشی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت ئەو پاروەە نانەیش کە دەیدەیت بەهاوسەری خۆت، یا ئەو خەرجی و مەسرەفەی کە دەیکەیت بۆ خێزانی خۆت، کە ژێواریان لەسەر تۆیە، ئەم جۆرە مەسرەفەیش، بەمەرجێ بەنیازێکی پاك بێ، ئەویش هەر خێرێکی گەورەیە).

فەرمووی: عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەترسم لە هاوڕێکانم بەجێ بمێنمو لەم نەخۆشییەدا، لەمەککە بمرمو لەگەڵ ئێوەدا نەگەڕێمەوە بۆ ڕەوگەی کۆچو داری هیجرەتم، وە ئەوەیش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (با بەجێش بمێنی گرنگ ئەوەیە تۆ بەنیازی پاك، هەرکارێ بکەی، لەهەرکوێ بیت، بەمەرجێ مەبەستت ڕەزای خودابێ پێی، ئەوە پلەو پایەت لەلای خودای گەورە پێی بەرزتر دەبێتەوە، ئومێدیش دەکەم کەجارێ نەمریو بمێنیو تەمەنت درێژبێو لەپاش ئێمە بمێنیو خودا بتکا بەمایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمانانو ببێ بەهۆی زیانو شکستی بۆ هۆزی بێباوەڕان، ئەی خودایە! کۆچی هاوەڵانم تاسەربێو قەبووڵو گیرابێ، وە پاشگەزیان نەکەیتەوە لێی!).

بەڵام داخەکەم هەژارە: سەعدی کوڕی خەولە، لەمەککە مرد لەدارول هیجرەتەکەی نەمرد، کەمەدینە بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزەیی پیادا هاتەوەو دڵی پێی سووتا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٠٠٠}.

سەعدی کوڕی وەققاص لەپاش ئەم نزاو تکایەی پێغەمبەر بۆی، چاك بۆوەو خودا پیتو فەڕی خستە تەمەنی، چل ساڵی تر ژیا {بڕوانە: ژمارە: ٥٨٢ لەم پەڕاوە کە رابورد}.

٩٨٦- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ رَجُلاً أَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ أُمِّي اُفْتُلِتَتْ نَفْسُهَا وَلَمْ تُوصِ ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا ؟ قَالَ: " نَعَمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تەجرید/٢، ژمارە: ٦٦٢ = ١٣٨٨، ٢٧٦٠ بخاری. مختصر صحیح موسلیم/٢، ژمارە: ٥٣٢ = شیحا/٢٣٢٣ + ریاضی صالحین/٣، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ٩٤٨}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سەعدی کوڕی عوبادە (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد، فەرمووی: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! دایکم لەناکاوا، لەپڕ، بەمەرگی کوتوپڕ مرد، فریانەکەوت کە راسپێری‌و وەسێت بکا، هەتا لەسەر راسپێری خۆی، خێری بۆبکەین، وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە، خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، کە لەپاش مردنی بۆی بکرێ، جا ئایا ئەگەر من ئێستا لەحیاتی خۆی، صەدەقەیێ، خێرێکی بۆ بکەم، پێی دەگاو سوودی دەبێ بۆی؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگا، بۆیبکە). {تاج/١، لاپەڕە: ٥٨١، زنجیرە: ٢٢٩، ژمارە: ١١٦٨، ١١٦٩ + زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٣٣، ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦، ١٣٧ + زنجیرە: ٢٢٤، ژمارە: ١١٥٢ + زنجیرە: ٢٢٥، ژمارە: ١١٥٥، ١١٥٦ + زنجیرە: ٢٢٧، ژمارە: ١١٦٣، ١١٦٤، ١١٦٥ + مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٥٣٢، ٦٠٥، ٦٠٦، ١٠٠٣ + بەرگی/٢، ژمارە: ٥٧٠، ٤٨٢، ٤٨٣، ٤٨٤، ٤٧٥، ٤٧٧، ٤٧٩، ٤٦٥، ٤٥٦، ٥٠٠ + تاجول ئوصول بەکوردی/٣، لاپەڕە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٢٦، ٢٥٢٧، ٢٥٢٨ + مختصر صحیح البخاری بەکوردی/١، ژمارە: ١٥٩ — ڕوونکردنەوەیێ + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٥٠٠ + تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٥ هەتا ژمارە: ١٨٢٦}.

**(ڕوونکردنەوە):**

بەپێی شەرحە گەورەکان‌و ڕاڤە نامەکانی فەرموودە، وە بەپێی ئەو فەرموودانەی کە ئێستا ئاماژەمان بۆ جێگەکانیان کرد، ئەم چەند خاڵە ڕوون دەکەینەوە {بڕوانە: شەرحی: فَتْحُ ذِی الجَلَالِ وَالإِکرام}:

یەکەم: هەر خێرو چاکەیێ، کە دەکرێ بۆ مردوو، لەڕووی ئەنجامدەریەوە، دەبن بەدوو بەشی سەرەکییەوە:

بەشی یەکەم: بریتین لە خزم‌و کەسوکاری مردووەکە، وەك منداڵی مردووەکەو وەچەو نەوەی‌و، وەك باوك‌و دایکی‌و، وەك براو مامی‌و ئامۆزاو،

وەك خاڵو خاڵۆزاو، وەك هاوسەریو، وەك هەموو خزمو كەسوكارێكی تری مردووەكە، لەدوورو نزیكیان.

بەشی دووەم: بریتی‌یە لەكەسێكی بێگانە، كە خێرێ بكا بۆ دۆستێكی مردووی خۆی، یا خێرێ بكا بۆ مردوویەكی خۆشەویستی خۆی، وەك: فەقێ عەمرەیێ بكا بۆ مامۆستایەكی خۆی كەمردبێ، یا سۆفییەك حەجێكی سوننەت بكا بۆ شێخ عەلائەددینی بیارە، یا بۆ حاجی كاك ئەحمەدی شێخ، یا بۆ ئیمامی غەزالی (رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

دووەم: ئەو خێرو چاكەیەی كەدەكرێ بۆ مردوو، لەڕووی جۆرو چییەت (ماهیة)ی خێرەكەوە، لەچەند روویەكەوە دابەش دەكرێ، وەك: زارەكی، واتە: قەولی، وەك: كردەیی، واتە: عەمەلی. وەك: جەستەیی رووت، واتە: (جەستەیی پەتی: بَدَنِي مَحْض) وەك: رۆژوو، وەك: خێری سامانی پەتی، وەك: زەكات، وەك: خێری ئاوێتەو تێكەڵ لەسامانیو جەستەیی، وەك: حەجو عەمرە.

جاپاش ئەم روونكردنەوەیە بەدڵنیایی‌یەوە عەرزی خوێنەری ئازیز دەكەم:

١- خێری ماڵی، كە كەسوكار بیكەن بۆ مردووی خۆیان، لەلای جەماوەری زانایان، پێی دەگاتو سوودی دەبێ بۆی، وەك: ئەوە منداڵی مردووەكە، یا برای، یا دایكی، یا مامەی، گایەكی بۆبكا بەخێر، یا بیرێكی بۆ بكات بەوەقف، یا دیناری، یا كولێرەیەكی بۆبكا بەخێر.

٢- خزمو كەسوكار دەتوانن، رۆژوو بۆ مردووی خۆیان قەزا بكەنەوە، قەرزیان بۆ بدەنەوە، حەجو عەمرە، چی سوننەت، چی فەرز، بۆ مردووی خۆیان بكەن، بەڵكوو دەتوانن نوێژیشی بۆ بگێڕنەوەو نەزری بۆ جێبەجێ بكەن.

٣- بێگانەیش دەتوانێ دروستە کە خێرێکی سامانی بکات بۆ مردوو، وەك: کەسێ قوربانی بکا بۆ حەزرەتی عائیشە، یا بیرێ بکا بەوەقف بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی، یا پردێ دروست بکاو خێرو پاداشەکەی ببەخشێ بەگیانی ئیمامی عەسقەلانی (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

٤- سەبارەت بەپەرستشی جەستەیی پەتی، وەك: نوێژو رۆژوو و خوێندنی قورئانو خەتمەی قورئانو صەلاواتو زیکری خودا، هەروا سەبارەت بەهەموو جۆرە خێرێکی تر، کە ماڵی بێ، یا جەستەیی بێ، یا تێکەڵ بێ ئەم دوانە، چی خزم ئەنجامی بدات، وەچی بێگانە ئەنجامی بدات، لەم بارەیەوە ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

«أَيُّ قُرْبَةٍ فَعَلَهَا الْمُسْلِمُ وَجَعَلَ ثَوَابَهَا لِمَيِّتٍ مُسْلِمٍ أَوْ (مُسْلِمٍ) حَيٍّ نَفَعَهُ».

واتە: هەر خێرێ لەهەر جۆرێ بێ، موسوڵمان ئەنجامی بدات، وە پاداشەکەی ببەخشێ بە موسوڵمانێکی مردوو، یا ببەخشێ بە موسوڵمانێکی زیندوو، سوودی دەبێ بۆی!).

هەروەها پێشەوا ئیبنو تەیمییە (رەحمەتی خودای لێ بێ) سەبارەت بەم بابەتە، بەدەق دەفەرموێ:

«قَوْلُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاثَةٍ ...» لَمْ يَقُلْ إِنَّهُ لَمْ يَنْتَفِعْ بِعَمَلِ غَيْرِهِ، فَإِذَا دَعَا لَهُ وَلَدُهُ كَانَ هذَا مِنْ عَمَلِهِ الَّذِي لَمْ يَنْقَطِعْ، وَإِذَا دَعَا لَهُ غَيْرُهُ لَمْ يَكُنْ مِنْ عَمَلِهِ وَلكِنَّهُ يَنْتَفِعُ بِهِ – الفَتَاوَى – ٢٤/٣١٢».

حا بۆ روونکردنەوەی پرسەکە، دەڵێم:

(پوختەی فەتواکان، کە جێگەی متمانەبێو موسوڵمان سەبارەت بەم بابەتە پشتی پێ ببەستێ، ئەمەیە: مەبەست لەو فەرموودەیەی کە لەپێشەوە لەم پەڕاوەدا لە ژمارە (٩٥١)دا رابورد، مەبەست لێی: کردەوەی باشی خۆی لەدوا مەرگی کۆتایی دێ، تەنیا لەوسێ رێگەیەوە نەبێ، کە لەفەرموودەکەدا دیاریکراون، لەبەرئەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

نەیفەرمووە: کردەوەی باشی موسوڵمانی تر، ئایا بێگانەبێ، یا خزم، سوودی نییە بۆ مردوو، لەبەرئەوە، گومان نییە لەمەدا: (کە هەرکەسێ خێرێ ئەنجام بدا، چی ماڵیو سامانی بێ، وەچی جەستەیی پەتی بێ، وەچی تێکەڵ بێ لە جەستەییو سامانی، وە خێرو پاداشەکەی ببەخشێ بە موسوڵمانێکی مردوو، سوودی دەبێ بۆی).

واباشە لەپێش ئەنجامدانی ئەو کردەوە باشەدا، نیەتی وابێ کە پاداشی ئەو کردەوە باشە، بۆ فیسارە کەس بێ، وە لەکاتی دەست پێ کردن بەو کردەوە باشە، کەسەکە دیاری بکا، وەك ئەوە لەکاتی دابەستنی ئیحرامی حەج، یا عەمرەدا، بۆ مردوو بڵێ: (نیەتمە ئیحرامی حەج دادەبەستم لەجیاتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرریسو خێرو پاداشی ئەم حەجە دەبەخشم بەو).

یا کاتێ رۆژوو دەگێڕێتەوە بۆ دایکی، لەشەودا بڵێ: (نیەتمە سبەینێ بەرۆژوو دەبم بۆ خوا، لەجیاتی رۆژووی قەرزی سەر دایکم).

یا بڵێ: (نیەتمە دوو رکات نوێژی بەیانی دەگێڕمەوە بۆ باوکمو دەیکەم بۆ خودا ئەڵڵاهوئەکبەر).

٥- بەکۆی دەنگ، نزاو پاڕانەوەو داوای لێ کخۆشبوونو تکاکردنو داوای پایەی بەرزو داوای بەهەشتو نازو بەهرەیو داوای ژیانی پڕ لەنازو نیعمەتی ناوگۆڕو داوای رزگاربوون لەهەموو مەینەتەکانی رۆژی قیامەتو قوتاربوون لە ئاگری دۆزەخو لەسزای گۆڕو لەئازاری حەشرو بەرزەخ، بەبێ هیچ گومانێ، بەکۆی دەنگ، ئەم جۆرە کارو کردەوەیانە، کە زیندوان دەیکەن بۆ مردووان، کارێ پەسەندو زۆر باشنو سوننەتێکی گەورەن، بەڵکوو لەهەندێ کاتدا دەبن بەفەرزو پێویست.

٩٨٧- وَعَنْ أَبِي أُمَامَةَ اَلْبَاهِلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: {إِنَّ اَللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقّ حَقَّهُ ، فَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ}

رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ ، وَحَسَّنَهُ أَحْمَدُ وَالتِّرْمِذِيُّ ، وَقَوَّاهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ.

{أحمد/٥/٢٦٧. أبوداود/٣٥٦٥. ترمذى/٢١٢٠. ابن ماجة/٢٧١٣. إبْنُ الجارود/٩٤٩١. صحيح الجامع/١٧٨٩}:

**ئەم فەرمووده‌یە لە تاجول ئوصولدا ئاوایە:**

**ئەبو ئومامەی ئەلباهیلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، لە وتارەکەی ساڵی حەجی ماڵاوایی‌دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو خاوەن مافێ خودا مافی خۆی داوەپێی، کەوابوو ئیتر وەسێتو راسپێری دروست نییە بۆ کەلەپووربەر، مناڵیش هی مێردە شەڕواڵپیس ئەگەر داوای مناڵی ژنێ بکا، کە مێردی هەبێو بڵێ مناڵەکە لەوەو لە مێردەکەی نییە، شەڕواڵپیس لەم بارەدا بەردەبارانی بۆ دەمێنێتەوەو لەسەر پێلێنانی خۆی سەنگەسار دەکرێ، یا حەددی شایانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، لەو دنیایش لێپرسینەوەیان لەسەر خودایە، هەرکەسێکیش حاشا لەباوکی خۆی بکاو کەسێکی تر بکا بەبابی خۆی، یا حاشا لەخاوەن (مەولا)ی خۆی بکاو کەسێکی تر بکا بەمەولاو سەرداری خۆی، ئەوە نەفرینو لەعنەتی خودای لێ بێ، پەیتا پەیتا هەتا رۆژی قیامەت. نابێ ژن — لەماڵی مێردی — هیچ ببەخشێ، مەگەر بەڕەزای مێردەکەی). عەرزیکرا: ئەی پیغەمبەری خودا! هەتا خواردەمەنیش نابێ ببەخشێ، ئەگەر مێردەکەی رەزای لەسەر نەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، نابێ بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی خواردەمەنیش ببەخشێ بۆ ئێوە خواردەمەنی بەچی دەزانن، خواردەمەنی باشترین ماڵی ئێمەیە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٢٠٠٢، لاپەڕە: ٤٤٠ چاپی چوارەم — ت/د/ن — سند صحیح}. {بڕوانە: ژمارە: ٦٥٦}.**

٩٨٨- وَرَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ مِنْ حَدِيثِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، وَزَادَ فِي آخِرِهِ: {إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اَلْوَرَثَةُ} وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

{منكر، الإِرْوَاء/١٦٥٦}:

داره قوطنیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە، وە لەکۆتاکەیەوە، ئەمەی پترە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (... راسپێری دروست نییە بۆ میراتبەر، مەگەر کەلەپوور بەرەکان خۆیان ئارەزوو بکەن!).

٩٨٩- وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: " قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ اَللَّهَ تَصَدَّقَ عَلَيْكُمْ بِثُلُثِ أَمْوَالِكُمْ عِنْدَ وَفَاتِكُمْ " زِيَادَةً فِي حَسَنَاتِكُمْ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ.

موعاذی کوڕی جەبەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە لەکاتی مەرگتانا، بەخششێکی گەورەی پێتان بەخشیوە، ئەویش ئەوەیە کە رێگەی پێتان داوە، کەسێیەکی ماڵەکانتان بکەن بە راسپێری، کە بۆتان بکرێ بەخێر لەپاش مەرگتان، هەتا ببێ بەزیادە خێر بۆتان).

٩٩٠- وَأَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْبَزَّارُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ.

واتە: ئەم فەرموودەیە کە دارە قوطنی لە موعاذەوە گێڕاویەتەوە، ئەحمەدو بەززاریش لەئەبو دەردائەوە گێڕاویانەتەوە.

٩٩١- وَابْنُ مَاجَهْ: مِنْ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ. وَكُلُّهَا ضَعِيفَةٌ ، لَكِنْ قَدْ يَقْوَى بَعْضُهَا بِبَعْضٍ. وَاَللَّهُ أَعْلَمُ.

واتە: ئیبنو ماجەیش لەئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتەوە، وە ئەم گێڕانەوانە گشتیان لاوازو بێ هێزن.

(ڕوونکردنەوە):

١- دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (بَابُ قَسْمِ الصَّدَقَاتِ) لەکۆتایی نامەی زەکاتەوە رابورد {بڕوانە: باسی ژمارە: ٣٠، لە ژمارە: ٦٦٢ هەتا ژمارە: ٦٦٨}.

٢- هەروا دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (بَابُ قَسْمِ الفَيْءِ وَالغَنِيمَةِ) لەکۆتایی (كِتَابُ الجِهَادِ)ی‌یەوە دێت.

## بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم
## ٨- نامەی ژنهێنان
## كِتَابُ النِكَاح

{بڕوانە: التاج الجامع للأصول فی أحاديث الرسول، بەرگی دووەم، وەرگەڕاوە کوردییەکەی، زنجیرە: ٢٢ هەتا زنجیرە: ٨٠، لە ژمارە: ٢٠٣٤ هەتا ژمارە: ٣٢٨٥ + تجریدی بوخاری/٥ لە ژمارە: ١٧٤٣ هەتا ژمارە: ١٧٨٥ + فیقهی ئاسان/٢ زنجیرە: ٢٥٥ لاپەڕە: ٦٧٢ هەتا زنجیرە: ٣٠١، لاپەڕە: ٨٢٦ + مختصر صحیح مسلم، بەرگی دووەم، زنجیرە: ١١، لاپەڕە: ٢٩٠ لە ژمارە: ٧٩٤ هەتا ٨٤٧}.

٩٩٣- عَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ لَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَا مَعْشَرَ اَلشَّبَابِ ! مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ اَلْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ " فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ".} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٨٧٨ = ١٩٠٥، ٥٠٦٥، ٥٠٦٦ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، لاپەڕە: ٢٩٠، ژمارە: ٧٩٤ = شیحا ٣٣٨٤، أبو داود. نكاح: ٢٠٦٤. ترمزی نكاح: ١٠٨١. نسائی. صیام: ٢٢٣٩}:

ئەم فەرموودەیە لە مەختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:

عەلقەمە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە مینا لە خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوددا دەڕۆیشتم، عوسمانی کوڕی عەففانی پێ گەیشت (ڕەزای خودای لێ بێ) لە گەڵیدا ڕاوەستا، دەستیان کرد بەگفتوگۆ، عوسمان کەبینی، ئیبنو مەسعود پەرپووتە، پێی فەرموو: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان! با کچێکی گەنجت بۆ بهێنم؟ بەشکم سەردەمی لاوی خۆتت بۆ نوێ بکاتەوە!

فەرمووی: ئیبنو مەسعودیش بە ئیمامی عوسمانی فەرموو: ئەمەی تۆ فەرمووت تەواوە، ڕێکی ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئێمەی دەفەرموو: (ئەی دەستەی لاوان! ئەی گەلی جوانان! هەرکەسەتان تەوانایی سەرجێیو ژنداریو هاوسەرگیری هەیە، با ژن بهێنێ، چونکە هاوسەر گرتن چاوی مرۆڤ تێر دەکاو، داوێنی لە تاوان دەپارێزێو، دەبی بەهۆی داوێنپاکی).

(وە ئەو کەسەیشی کە لەکێشیا نییە هاوسەر بگرێو ژن بهێنێ، با بەڕۆژوو بێ، چونکە ڕۆژوو دەیخەسێنێو دڵی دەمرێنێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٤ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە)

١- رشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە: ئیمامی ئەعمەش لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، لە عەلقەمەوە، لە ئیبنو مەسعودەوە، یەکێکە لەڕشتە (سەنەدە) هەرە ساغو تەندروستەکان.

٢- ئەم فەرموودەیە موتتەفەقوعەلەیهییە، واتە: هەم شێخی بوخاریو هەم شێخی موسلیم گێڕاویانەتەوە، لەسەرەتای فەرموودەکەوە ژمارەکەیمان لەبوخاریو موسلیمدا نووسیوە.

٣- پێشەوا ئەعمەش (رەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی سولەیمانی کوڕی میهرانە، کەسناوی (واتە: کونیەی) ئەبو موحەممەدە، پێیان دەگوت: (ئەبو موحەممەد: واتە: باوکی موحەممەد) کونیە (کەسناو) ئەوەیە: کە بەکەسێ

بگوترێ: باوکی فیسار، یان کوڕی فیسار: (أبو فلان = ابن فلان) ئەمە ئەگەر نێرینە بوو، یا پێی بگوترێ: دایکی فیسار، یان کچی فیسار یان خوشکی فیسار: (أمُ فلان وبنت فلان، أخت فلان) ئەگەر لەڕەگەزی مێ بوو.

ئەعمەش (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەبنەڕەتدا خەڵکی (طبرستان)ە، لەگوندێکی ئەوێ لەدایك بووە، کەناوی (دوباوەند)ە، چوار هەزار فەرموودەی هەیە، کتێبی نەبوو، واتە: ئەو چوار هەزار فەرموودەیەی لەپەڕاوا نەنووسی بوو، بەڵکوو هەموویانی لەبەر بوو، زۆر فەصیحو ڕەوانبێژ بوو، هەرگیز لەحنی نەدەکرد، لەحن ئەوەیە کە قسە بەغەیری عەرەبیی فەصیح بکەی، یان هەڵەی زمانەوانی لەگفتوگۆدا بکەی!

ئەعمەش (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئیمامی ئەنەسی دیوە، لە مەککەو لەواسیط، بەڵام ڕاجیایی هەیە لەوەدا کە فەرموودەی ئەوی گێڕابێتەوە، یانا؟ کەواتە: ئەعمەش مادەم هاوەڵی پێغەمبەری بینیوە تابیعییە، تابیعی موسوڵمانێکە لەچینی دووەمی گەلی ئیسلام بێ، پێغەمبەری نەدیبێ، بەڵام هاوەڵی پێغەمبەری دیبێ، بەکوردی بەتابیعی دەگوترێ: شوێنکەوتوان، یان پەیڕەوان.

ئەم زاتانە مامۆستای ئەعمەش بوون، واتە: شێخی بوون، شێخی راوی، یاشێخی موحەدیث، ئەو کەسەیە کە فەرموودەی لێ وەردەگیرێو کەسێ تر لەنێوانی ئەوو شاگردەکەدا نییە، وەك ڕشتەی ئەم فەرموودەیە کە ئاوایە:

١- بوخاری، هەروا موسلیم.

٢- ئەبو وەلید.

٣- شوعبە.

٤- ئەعمەش.

٥- ئیبراهیم.

٦- عەلقەمە.

٧- ئیبنو مەسعوود، لەم ڕشتە حەوتینەیەدا، بوخاری شاگردو فەقێی ئەبو وەلیدە، ئەبو وەلید شێخو مامۆستای بوخارییە، شوعبە مامۆستای مامۆستاکەی بوخارییە، واتە: شێخی شێخەکەیەتی، وەهەروەها پیاوانی تری ڕشتەکە، هەتا سەر ئیبنو مەسعوود.

ئەعمەش فەرموودەی لەم زاتانە وەرگرتووە، ئەبو وائیلو مەعروورو موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعیو تەیمیو شەعبی، ئەم زاتانەو خەڵکێکی زۆری تر شێخی ئەعمەش بوونو مامۆستای ڕاستەوخۆی بوون، کۆمەڵێ مامۆستاو فەرموودەزانی گەورە گەورەیش فەقێو شاگردی ئیمامی ئەعمەش بوون، ڕاستەوخۆ فەرموودەیان لە ئەعمەش وەرگرتووە، وەك سوبەیعیو سوفیانی کوڕی عویەینە.

یەحیای کوڕی قەططان دەفەرموێ: (ئەعمەش سۆفیلکەیەکی وابوو، بەردەوام لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا ئامادە بوو، زانایەکی پایەبەرزی ئیسلام بوو).

وەکیع دەفەرموێ: (ئەعمەش نزیکەی حەفتا ساڵ ئەللاوئەکبەری یەکەمی جەماعەتی نەفەوتاوە).

شوعبە پێی دەگوت: موصحەف، واتە: وەك موصحەف ڕاستو بێگەردە، پێیان دەگوت: (سَيِّدُ المُحَدِّثِينَ) واتە: گەورەی فەرموودەزانەکان، بۆنی شیعەیی لێ دەهات، جاروبار تەدلیسی دەکرد، ئەعمەش موفتی سەردەمی خۆی بوو، پیاوێکی هەژاری کەمدەستی سابیری زاهیدی واریع بوو، گوێی بەدونیا نەدەدا، قەت دەرماڵی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار نەدەچوو، بۆ ئیشی دونیایی، پیاوێکی خاوەن وەرع، زانا بە قورئان، دوورەپارێز لە دەسەڵاتو دەسەڵاتداران بوو، زانایەکی فەرائیززان بوو.

ئیبنولـەدینی دەفـەرموێ: (ئـەم شـەش کەسـە، عـیلمو زانـستیان بـۆ ئومەتی موحەممەد لەفەوتان پاراست:

١- عومەری کوڕی دینار لەمەککە.

٢- ئیمامی زوهری لە مەدینە.

٣و٤ – ئەبو ئیسحاقی سوبەیعیو ئەعمەش لەکووفە.

٥و٦ – قەتادەو یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر لەبەصرە).

ئیمامی ئەعمـەش (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) لەسـاڵی شەسـتی کۆچیدا لـەدایك بـووە، لـە سـەدو چلو هەشـتا مـردووە، هەشـتاو هەشـت سـاڵ ژیـاوە، راجیـایی هەیـە لەسـاڵی لـەدایکبوونیو مردنیـدا، مامۆسـتا فەرمووودەزانـە گـەورەکان کـە ناسـراون بـە (الجماعـة = ئەلجەماعـە) فـەرموودەکانی ئـەویان گێڕاوەتـەوە، لەپـەڕاوی (تهـذِیبُ التهـذِیب)دا، کـە دانـراوی ئیبنولحەجـەری عەسـقەلانییە، هێمـای (ع – سـلێمان)ی بـۆ دانـراوە، واتـە: سـولەیمانی کـوڕی مەهران، کەناسراوە بەئەعمەش لەپیاوانی ئەم شـەش پەڕاوەیـە، کـە ناسـراون بە:

١- صحیح البخاری.

٢- صحیح موسلیم.

٣- سُنَنُ أبی داود.

٤- جامِعُ الترمذی.

٥- المجتبی للنسائیِ.

٦- ئیبنو ماجە.

{بڕوانە: تجریدی بوخاری/ بەرگی یەکەم، ژمـارە: ٣٠ = فـتح البـاری/٣٢ + مختصر صحیح مسلم/٢ لاپەڕە/٢٩٠ ج/١ ژمارە: ٧٩٤ = شیحا ٣٣٧٣}.

٩٩٤ – وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حَمِدَ اَللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: " لَكِنِّي أَنَا أُصَلِّي وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأَتَزَوَّجُ اَلنِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٥، ژماره: ١٧٤٣ = ٥٠٦٣ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٧٩٥ = شيحا ٣٣٨٩ = مسلم ١٤٠١. نسائی. نكاح/٣٢١٧ تحفة الأشراف/٣٣٤}:

ئەم فەرموودەیە لەموختەصەری صەحیحی بوخاریو لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ، لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوون بۆ ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی پەرستشو عیبادەتی پێغەمبەرەوە، کە لەماڵەوە ڕۆژانە دەیکرد، پرسیاریان لێیان کرد، کەپێیان گوترا، پەرستشی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەندەو چۆنە، وەك بڵێی ئەوان بەکەمی بزانن وابوو، جا گوتیان: ئێمە لەکوێو پێغەمبەر لەکوێ، ئەو خودا لەگوناهی بەرودوای خۆش بووە، جا لەئەنجاما هەندێکیان گوتیان: دوور دەکەومەوە لەژنو هەرگیز ژن ناهێنم، هەندێکی تریان گوتیان: منیش گۆشت ناخۆمو دەبم بەزاهیدو خۆشی دونیا تەرك دەکەم، هەندێکی تریشیان گوتی: منیش لەسەر نوێن ناخەومو بەشەو ناخەومو هەر خەریکی شەونوێژ دەبم، هەتا ماوم، گوایە ئەم هاوەڵانە ئەم جۆرە شتەیان بەخودا پەرستی دانا!!

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمەی زانی، هات بۆ لایانو فەرمووی:

(ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێنو ئەم جۆرە قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە من لەئێوە زیاتر لەخودا دەترسمو لەئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەڵام

لەگەڵ ئەوەیشدا، من بەش بەحاڵی خۆم شەونوێژ دەکەمو بەشی خۆیشم دەخەومو ڕۆژویش دەگرمو ڕۆژویش ناگرمو ناوبەناو ڕۆژوی سوننەت دەگرمو ناوبەناو ڕۆژوی سوننەت ناگرم، سەرەڕای ئەمانەیش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە ڕێگەو ڕێبازو رەوشتو رەفتاری منە، ئەوەی پێی ڕازییەو پەسەندی دەکاو کاری پێ دەکا، ئەوە لەمنەو لەسەر ئایینی منە، بەڵام ئەوەی لێی لابداو کاری پێ نەکاو پەیڕەوی نەکا لەمن نییەو بە پەیڕەوی تەواوی ئایینی من دانانرێ. گەرچی بە موسوڵمان دادەنرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٥}.

٩٩٥ – وَعَنْهُ (رضی الله عنه) قَالَ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) يَأْمُرُنا بِالْبَاءَةِ، وَيَنْهَى عَنِ التَّبَتُّلِ نَهْيًا شَدِيدًا، وَيَقُولُ:" تَزَوَّجُوا اَلْوَدُودَ اَلْوَلُودَ . فإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ اَلْأَنْبِيَاءَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ. {هذا اللفظ حَسَّنَهُ الألَبَانِيُّ في مُقَدِمَةِ آدَابِ الزَّفَافِ}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد بەهاوسەر گرتنو ژنهێنانو شووکردن، وە بەهیچ جۆرێ ڕێگەی ڕەبەنیو شوونەکردنو ژن نەهێنانی پێمان نەدەدا. وە دەیفەرموو: (ژنی مێردپەروەری، سکوزاکەر بهێنن، چونکە من لەڕۆژی قیامەتدا، لەناو پێغەمبەرەکاندا شانازیتان پێوە دەکەمو خۆم دەنوێنم پێتانەوە، دەی هەتا ئێوە زۆرترو لەناو خۆتانا ڕێكو پێکتر بن، بۆ من زیاتر مایەی خۆشیو شانازییە!) {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٤٢ چاپی چوارەم}.

٩٩٦– وَلَهُ شَاهِدٌ : عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ، وَابْنِ حِبَّانَ أَيْضًا مِنْ حَدِيثِ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ. {صححه الألبانی فی المشكاة بلفظ (الأمم): ٣٠٩١. الصحيح المسند: ١١٢٦}.

{المشكاة = مشكاة المصابيح للتبريزى – المترجِم}.

لەتاجول ئوصولا، ئەم شاهیدە ئاوایە:

ئیبنو ماجه (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، بەڕشتەی خۆی، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هاوسەریو ژنهێنان ڕەوشتی منەو یاسایەکی دامەزراوی ئایینی منە، ئەوەیشی ڕەفتار بەڕەوشتو یاسای دامەزراوی ئایینی من نەکا لەمن نییە، وە ژن بهێنن، چونکە من لەناو نەتەوەکانی تردا شانازیتان پێوە دەکەم، ئێوە هەتا زۆرتر بن زیاتر خودا دەپەرستنو دەبن بەمایەی ڕوو سووریو سەربەرزی بۆ من لەناو گەلە خوداناسەکانی تردا!

وە ئەوەی هەیەتیو خاوەنی دارایییەو ئامادەیی سامانیو جەستەیی هەیە با ژن بهێنێ!. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٤٣، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

٩٩٧- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ : {تُنْكَحُ اَلْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ : لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ اَلدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ مَعَ بَقِيَّةِ اَلسَّبْعَةِ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٥٠ = ٥٠٩٠ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٧٩٨ = ٣٦٢٠ شیحا = مسلم ١٤٦٦}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (واباوە لەناو خەڵکا، کە ژن لەبەر ئەم چوار شتە مارە دەکرێو دەخوازرێ، لەبەر ئەوە کە ماڵی هەیە، یالەبەر ئەوە کەخانەدانە، یا لەبەر ئەوە کەجوانە، یا لەبەر ئەوە بە ئایینەو بەدینە، جا ئەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئاییندداری بەدین بهێنەو لەکیس خۆتی مەدە، با دەستەشکێن نەبیت!) {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٠}.

٩٩٨- وَعَنْهُ " أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ إِذَا رَفَّأَ إِنْسَانًا إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ : { بَارَكَ اَللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ.

{صحيح أبي داود: ١٨٦٦، من مكتبة الشيخ الألباني. الصحيح المسند: ١٢٧٩}:

**ئەبو هورەيرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە پیرۆزبای لەکەسی دەکرد، کە ژنی هاوردبێ، پێی دەفەرموو: {بَارَكَ اَللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ}.**

**خودا پیرۆزی بکا لێت‌و پیرۆزی بکا بۆت‌و لەسەر خێرو خۆشی یەکتان بخات). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢١١٠ — د/ت/ن- سند صحیح}.**

**٩٩٩- وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {عَلَّمَنَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلتَّشَهُّدَ فِي اَلْحَاجَةِ: " إِنَّ اَلْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اَللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِي له وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَيَقْرَأُ ثَلَاثَ آيَاتٍ". } رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ.**

{صحيح، المِشْكاة: ٣١٤٩، تحقيق الشيخ محمد ناصرالدين الألباني}:

**ئەم فەرموودەیە لە تاجول ئوصولا ئاوایە:**

**عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری پێداویستی (خوطبەتولحاجە)ی فێر دەکردین، کە لەسەرەتای هەموو کارێکی گرنگەوە بیلێیین، وەکوو مەسەلەی ژنخواستن‌و شتی وا ئەمەیش ئەو وتارەیە:**

**{إِنَّ اَلْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اَللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِي لـه، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ}، {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ} (٣/١٠٢ – سورة آل عمران).**

{وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا}. (٤/١ – سورة النساء).

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا}. (٣٣/٧١ – سورة الأحزاب}.

**سوپاس‌و ستایش بۆ خودا، داوای یارمەتی‌و کۆمەك هەر لەو دەكەین، هەروەها داوای لێخۆشبوونی لێ دەكەین، پەنا دەگرین بەخودا كە پەنامان بدا لەوەی‌و وەزەن‌و بەدیی دەروونی خۆمان، كەسێ خودا رێنمایی بكا بەكەسی تر گومڕا ناكرێ، وە كەسێ خودا گومڕای بكا بە كەسێ تر نایەتەوە سەرڕێ، وە شایەتی دەدەم بە زمان‌و باوەڕ دەكەم بەدڵ، كە هەر خودا خودایەو، موحەممەد بەندەو پێغەمبەرو فروستادەی خودایە، ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هێناوە بەخودا! تەقوای خودا بكەن‌و هەمیشە لەخودا بترسن‌و خۆتان بپارێزن لەقاری، ترس‌و پارێزو تەقوایێ كە شایستەی زاتی خودابێ، وە هەمیشە تێكۆشن تا لەسەر ئیسلامەتی دەمرن). (وە تەقوای خودا بكەن‌و لەخودا بترسن، لەو خودا نازدارە كە بەخاتری ئەو داوای شت لەیەكتری دەكەن، وە خۆتان بپارێزن لەبڕینی رشتەی خزمایەتی‌و میهرەبانی، بەڕاستی خودا بەهەموو شتێ ئاگادارەو تەماشاكاری وتارو كردارو رەفتارتانە). (ئەی كەسانێ كە خاوەن باوەڕن شەرم‌و شكۆ لەخودا بكەن‌و لەخودا بترسن‌و قسەی هەق بكەن، تا خودا كردەوە باشەكانتان پەسەند بكاو لە گوناهەكانتان خۆش ببێ، وە هەركەسێ فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەری خودا بەجێ بهێنێ‌و لەقسەیان دەرنەچێ، ئەوە بەڕاستی شاد دەبێ بە بەهرەی گەورەو دەگا بەئاواتی خۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٠٨٩ – د/ت/ن – س/ح}.**

١٠٠٠- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ، فَإِنْ اِسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ مِنْهَا إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا، فَلْيَفْعَلْ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حَسَنٌ، صحيح الجامِعِ: ٥٠٦. تأليف الشيخ الألباني/المكتبة الشاملة الاسلامية}:

**لەتاجا ئاوایە:**

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ یەکێ لەئێوە ویستی ژنێ داوابکاو بیهێنێ، ئەگەر دەتوانێو بۆی دەستی دا باخۆی تەماشای بکا، تەماشای ئەو شوێنانەی بکا کە دەبێ بەهۆی خواستنی، ئەگەر خۆی بۆی نەکرا، با ئافرەتێ بنێرێ لەباتی خۆی تەماشای بکا، وەژنیش ئەم دوو مافەی بۆ هەیە، کەخۆی تەماشای ئەو کەسەبکا کە دەیەوێ شووی پێ بکا، یا پیاوێ بنێرێ کە تەماشای بکا بۆی، جابیر فەرمووی: جا خوازبێنی کچێکم کرد بۆ خۆم، لەپەناوە خۆم مەڵاس دەدا، هەتا تەماشای ئەو شوێنانەیم کرد، کەبوو بەهۆی خواستنی، وە لەدواییدا مارەمکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦٣ – د/شافیعی/حاکم، حاکم بە صەحیحی داناوە}.**

١٠٠١- وَلَهُ شَاهِدٌ: عِنْدَ اَلتِّرْمِذِيِّ، وَالنَّسَائِيِّ " عَنِ الْمُغِيرَةِ} :

**دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە شاهیدێکی هەیە، تەرمەزیو نەسائی لەموغیرەوە گێڕاویانەتەوە {صحیح، مشكاة المصابيح للتبريزي/٣١٠٧. تحقيق الشيخ الألباني}:**

١٠٠٢- وَعِنْدَ اِبْنِ مَاجَهْ، وَابْنِ حِبَّانَ : مِنْ حَدِيثِ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ.

{صحيح ابن ماجة/١٥١٠}:

**ئیبنو ماجەو ئیبنو حیببان شاهیدێکی تری ئەم فەرموودەیان لەموحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە گێڕاویەتەوە.**

١٠٠٣- وَلِمُسْلِمٍ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لِرَجُلٍ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً : أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا ؟ " قَالَ : لَا . قَالَ: " اِذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا}.

{مسلم تەخريجو ترقيم الشيخ خليل مةئمون شيحا ٣٤٧٠ = مسلم ١٤٢٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بووم، پیاوێ هاتە خزمەتی گوتی: ژنێکی ئەنصاریم خواستووە، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایە تەماشایت کردووە؟ گوتی: نەخەیر، تەماشایم نەکردووە. فەرمووی: دەبڕۆ تەماشای بکە، چونکە لەچاوی ئەنصار (واتە: یاریدەران)دا شتێ هەیە، چاویان کەمی بچووکە، یا تۆزێ شینە! {مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠١ = شيحا ٣٤٧١} + {تاج/٢، زنجيرە: ٣٦، ژمارە: ٢٠٦٢}.

١٠٠٤- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَخْطُبْ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَتْرُكَ اَلْخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ اَلْخَاطِبُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدى بوخارى/٥، ژمارە: ١٧٦٥ = ٥١٤٢، ٢١٣٩، ٢١٦٥، ٢١٤٠، ٢١٤٨، ٢١٥٠، ٢١٥١، ٢١٦٠، ٢١٦٢، ٢٧٢٣، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٠ = شيحا ٣٤٤٩ مسلم ١٤٠٨}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەودا لەسەر سەودای برای ئایینی خۆتان مەکەن، هەروەها خوازبێنیش لەسەر خوازبێنی برای ئایینی خۆتان مەکەن، مەگەر بەمەرجێ ئەو برایەتان وازبێنێ لەو سەودایە، یان لەو خوازبێنییە، یان ڕێگەتان پێ بدا). {تاج/٢، زنجيرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٤ + زنجيرە: ٢٧، ژمارە: ٢٠٦٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٠٥- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ اَلسَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَصَعَّدَ اَلنَّظَرَ فِيهَا، وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتْ اَلْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. قَالَ: " فَهَلْ عِنْدكَ مِنْ شَيْءٍ ؟ ". فَقَالَ: لَا، وَاَللَّهِ يَا رَسُولَ اَللَّهِ. فَقَالَ: " اِذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ، فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا ؟ " فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ؟ فَقَالَ: لَا، وَاَللَّهِ، مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ "، فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ. فَقَالَ: لَا وَاَللَّهِ، يَا رَسُولَ اَللَّهِ، وَلَا خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي - قَالَ سَهْلٌ: مَالُهُ رِدَاءٌ - فَلَهَا نِصْفُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنهُ شَيْءٌ " فَجَلَسَ اَلرَّجُلُ، وَحَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ " فَرَآهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ، فَدُعِيَ به، فَلَمَّا جَاءَ. قَالَ: " مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ؟ ". قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا، وَسُورَةُ كَذَا، عَدَّدَهَا. فَقَالَ: " تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ ؟ ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "اِذْهَبْ، فَقَدَ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ. وَفِي رِوَايَةٍ قَالَ لَهُ: {اِنْطَلِقْ، فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا، فَعَلِّمْهَا مِنَ الْقُرْآنِ}. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ: {أَمْلَكْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ}.

{تەجرید/٥، ژمارە: ١٧٦٠ = ٥١٢١، ٢٣١٠، ٥٠٢٩، ٥٠٣٠، ٥٠٨٧، ٥١٢٦، ٥١٣٢، ٥١٣٥، ٥١٤١، ٥١٤٩، ٥١٥٠، ٥٨٧١، ٧٤١٧ فتح البارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٠ = مسلم. شيحا/٣٤٧٢}:

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێك هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پیغەمبەری خودا! هاتووم خۆم ببەخشم بە تۆ، کە بمکەیت بەهاوسەری خۆت، پێغەمبەریش (دروودی

خـوداى لەسـەر بـێ) سـەرتاپا تەماشـاى كـردو، ئـەنجا سـەرى دانەوانـدو هـيچ قـسەى نـەكرد، ژنەكـەيش كـەڕوانى پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) هيـچى نـەگوت لەبارەيـەوە دانيـشت. جـا پيـاوێ كـە لـەيارانى پێغەمبـەر بـوو، هەڵسا گوتى: ئەى پيغەمبەرى خودا! ئەگەر خۆت ناتـەوێ لـەمنى مـارە بكـە؟ پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) فـەرمووى: (ئايـا هيـچت هەيـە كـە بيكەى بەمارەيى بۆى؟. گوتى: نە بەخودا ئەى پيغەمبەرى خودا! هيچم نييە كە بيكەم بەمارەيى. فەرمووى: (دەبڕۆ بۆ ماڵەوەتان بۆلاى كەسـوكارت، بزانـە هيچت دەست دەكەوێ كە بيكەى بەمارەيى؟ پياوەكە ڕۆيشتو هاتـەوە، گـوتى: بەخوا هيچم دەست نەكـەوت، ئـەى پيغەمبـەرى خودا! فـەرمووى: (دە شـتێك پەيدا بكە، با ئەنگوستيلەيەكى ئاسنيش بێ بيكە بەمارەيى).

پياوەكە ديـسان ڕۆيـشتەوەو هاتـەوەو گـوتى: بـەخودا ئـەى پيغەمبـەرى خـودا! ئەنگوسـتيلەى ئاسنيـشم دەسـت نەكـەوت، بـەڵام ئـەم تاقـە بەركۆشـەم هەيە كەوا لەبەرما، نيوەى بۆ منو نيوەى بۆ ئەو لەباتى مارەيى؟

سـەهل فـەرمووى: پياوەكـە يـەك بەركۆشـى هـەبوو ئاڵانـد بـووى بـەلاى خواروى خۆيەوە، پەشتە ماڵى نەبوو، كە دەئاڵێنرێ بـەلاى سـەروى لەشـەوە. پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (ئـەوە بـەو چـى، خـۆ يـەك پارچەيە، هەر بەشى بەرى يەكێكتان دەكا، ئەگەر لەبەر تـۆدا بـێ هيـچى بـەر ئەو ناكەوێ، ئەگـەر لەبـەر ئـەودا بـێ هيـچى بـەر تـۆ ناكـەوێ، كەواتـە: ئـەوە نابێ).

جا پياوەكـە تـاوێكى بـاش دانيـشت، هەڵسا ڕۆيـشت پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) چاوى لێى بوو، ناردى بەشـوێنيدا، بـانگى كـردەوە، كـەهات پێـى فـەرموو: (چـيت لـە قورئـان لەبـەرە؟). گـوتى: ئـەو سـوورەتەو ئـەم سوورەتەم لەبـەرە. وە سـوورەتەكانى ژمـارد، فـەرمووى: (ئايـا ئـەم سـوورەتانە هەموويان بەباشى لەبەر دەخوێنى؟) گوتى: بەڵێ.

فەرمووی: (دە بڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کەوا لەبەرتە ئەم ژنەم کرد بەهی تۆ).

لەگێڕانەوەیەکا فەرمووی: (ئەوا لەسەر ئەوە کە فێری ئەو قورئانەی بکەی کە خۆت ئێستا لەبەرتە، ئەم ژنەم مارە کرد لەتۆ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٢٠٩٩ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٠٧٠}.

١٠٠٦ – وَلِأَبِي دَاوُدَ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: { مَا تَحْفَظُ ؟ ". قَالَ: سُورَةَ اَلْبَقَرَةِ، وَاَلَّتِي تَلِيهَا. قَالَ: " قُمْ . فَعَلِّمْهَا عِشْرِينَ آيَةً}.

{ضعيف أبي داود: ٤٥٧}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی (چیت لە قورئان لەبەرە؟) فەرمووی: (سوورەتی بەقەرەو سوورەتەکەی پاشیم لەبەرە) فەرمووی: (دە هەڵسە لەباتی مارەیی بیست ئایەتی فێربکە).

(ڕوونکردنەوە):

کۆمەڵێ لەو سوودو بەهرانەی لەم فەرموودانە وەردەگیرێ، بەپێی ڕاڤەنامە گەورەکان:

١- کارێکی زۆر باش‌و پەسەندە، کە ژن، یا هەقداری ژن، داوا لەپیاو بکات کە مارەی بکا، بەتایبەتی ئەگەر پیاوێکی باش بێ.

٢- تەماشا کردن لەکاتی خوازبێنیدا، لەهەردوو لاوە سوننەتە.

٣- مارەیی بەشێکی گرنگە لە ژنهێنان.

٤- وا پەسەندە کە مارەیی بەزوویی بدرێ.

٥- دروستە کەمارەیی ماڵ نەبێ، بەڵکوو کەڵك بێ وەك شت فێرکردن‌و ئازادکردن‌و چارەسەرکردن.

٦- مەرج نییە کە لەپێش مارە کردندا، خوازبێنی بووبێ.

مـــارەیی بەشـــتێکی کـــەمیش دادەمـــەزرێ، وەك جووتـــێ ســـۆڵ، یـــا ئەموستیلەیەکی زەرتك.

٨- ئارامو صەبر کلیلی سەرکەوتنە.

١٠٠٧- وَعَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ اَلزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيـهِ (رضـى الله عنـه) " أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَعْلِنُوا اَلنِّكَـاحَ} رَوَاهُ أَحْمَـدُ، وَصَـحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حَسَنٌ صحيح الجامع: ١٠٧٢}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجا لە عائیشەوەیە، ئاوایە:

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کاتـێ ژن مـارە دەبـڕن ئاشـکرای بکـەنو، لەمزگـەوتا مارەی ببڕنو تەپڵو دەفی بۆ لێ بدەن!). لەتاجا دەفەرموێ:

ئەحمەدو تەرمەزی گێڕاویانەتەوە، تەرمەزی بە فەرموودەیـەکی جوان (حەسەن)ی داناوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٢١٠٨، ٢١٠٧}.

(ڕوونکـردنەوە):

ئەم فەرموودەیە هانـدەرێکی باشە بۆ ئـەوەی کـە لەگـەڵ مزگەوتەکانـدا، هۆڵی شاییو شیرینی خواردنەوە بکرێتەوە، بەڵام بەمـەرجێ سەرنەکێـشێ بـۆ بازرگـــانی کـــردن بـــەپیرۆزی مزگەوتـــەوە، وەك هـــۆڵی پرســـەکان ســـەر بەمزگەوتەکە بێو لەژێر چاودێری ئەوقافدا بێ.

١٠٠٨- وَعَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ (رضى الله عنه) قَالَ : قَـالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم): {لَـا نِكَـاحَ إِلَّـا بِـوَلِيّ} رَوَاهُ أَحْمَـدُ وَالْأَرْبَعَـةُ وَصَحَّحَهُ اِبْنُ اَلْمَدِينِيِّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَأُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.

{صحيح الجامع: ٧٥٥٥. الصحيح المسند: ٨١٥}:

ئـەبو بـوردەی کـوڕی ئـەبو مووسـای ئەشـعەری (ڕەزای خـودا لـەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ)

فەرمووی: (بەبێ هەقداری ژن، ژن مارەیی نایێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨٦}.

١٠٠٩- {وروَى الإمام أحمد عن الحسن عن عمران بن الحصين مرفوعاً: {لاَنكاحَ إلاّ بِوَلِي وَشَاهِدَين}.
{صحيح الجامع: ٧٥٥٧}:

ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: لە حەسەنی بەصرییەوە، لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەبێ هەقداری ژنو دوو شایەتی ڕاستو دروستو دادپەروەر ژن مارەیی نایێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨٦ ج/٤ = چاپی چوارەم} لەم جێگەیەدا لە تاجا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سۆزانی (داوێنپیس) ئەو ژنانەن: کە بەبی بەڵگەو شایەت خۆیان مارە دەبڕن لە کەسێ!).

١٠١٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَيُّمَا اِمْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهَا، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَلَهَا اَلْمَهْرُ بِمَا اِسْتَحَلَّ مِنْ فَرْجِهَا، فَإِنِ اشْتَجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ} أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ أَبُو عَوَانَةَ، وَابْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ.
{صحيح الجامع: ٢٧٠٩. الصحيح المسند: ١٦٠٦}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر ژنێ بەبێ مۆڵەتو ڕا لەسەر بوونی هەقدارەکانی شوو بکا، شووەکەی پوچو بەتاڵە) سێ جار پێغەمبەر لەسەر یەك فەرمووی: (شووەکەی پوچو بەتاڵە).

ئینجا فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (جا ئەگەر پیاوەکە بەدەستی بگرێو بچێتە لای، بەهۆی ئەو مارەبڕینە پووچەڵەوە، ئەوە ژنەکە

مارەیی دەکەویٚ، لەباتی ئەوە کە بەدەستی گرتووەو لەگەڵی جووت بووە، وە ژنەکەیش نابیٚ بەژنی.

هەقدارانی ژنیش ئەگەر لەناو خۆیانا ڕیٚك نەکەوتن ئەوا فەرمانڕەوا (سوڵتان: گەورەی موسوڵمانان: قازی (هەقداری ئەو کەسەیە، کە هەقداری بایەخداری نییە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨٥}.

(ڕوونکردنەوە):

وەك لە ڕاڤەنامەکانەوە دەردەکەویٚ، مەبەست لە (سلطان) کەسیٚکە کەویلایەتی عاممەی هەبیٚ، وەك پادشاو سەرۆك کۆمارو فەرمانڕەواکان، یان مەبەست کەسیٚکە کە ویلایەتی تایبەتی هەبیٚ، وەك قازیو کەسیٚ فەرمانڕەوای موسوڵمانان مۆڵەتی دابیٚ کە ژن مارە ببڕیٚ.

١٠١١- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا تُنْكَحُ اَلْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ اَلْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ" قَالُوا : يَا رَسُولَ اَللَّهِ، وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: " أَنْ تَسْكُتَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٦٢ = ٥١٣٧، ٦٩٤٩، ٩٧١. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٢ = مسلم/شیحا ٣٤٥٨ = مسلم ١٤١٩. نسائی. نکاح: ٣٢٦٧. تحفة الأشراف/١٥٤٢٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: (بیٚوەژن مارە ناکریٚت، هەتا گفتی لیٚ وەرنەگیریٚ، کچیش نادریٚ بەشوو هەتا مۆڵەتی لیٚ وەرنەگیریٚ).

گوتیان: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! جا چۆن بزانین کە ڕازییە یان نا؟ چونکە کچ شەرمنە، رووی نایەت کە باسی مۆڵەتو شتی وا بکا.

فەرمووی: (کە قسەی نەکردو ڕەخنەی نەبوو، واتای وایە کە قایلەو ڕازییە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١ = واتە: بڕوانە تاجول ئوصول،

بــــەرگی دووەم، وەرگــــەڕاوە کوردییەکـــەی، زنجـــیرە: ٣١، ژمـــارەی فەرموودەکە/٢٠٨١}.

(ڕوونکردنەوە):

لەکۆتای ژمارە (١٧٦٢)ی (مختصر البخاری بەرگی پێنجەم)دا، لەسەر ئەم فەرموودەیـە، ئـەم ڕوونکردنەوەیـەم نووسـیوە، کـە بـۆ ئێـرە زۆر لـەبارترە، چونکە ئەم پەڕاوە پەڕاوی بڕیارە شەرعییەکانە:

(ئەم فەرموودەیەو کۆمەڵێ فەرموودەی تری ڕاستو دروست، نیشانەو بەڵگەی ئەوەن کە ژن، چی کچ بێ، وەچی بێوەژن بێ، کاتێ دەدرێ بەشوو، دەبی ڕەزای تەواوی لەسەر شووکردنەکەی هەبێ، ئیتر ئەو ڕەزابوونو ڕێگە پێدانە، بەپێی ڕۆژ دەگۆڕێ، لەشەرعی پیرۆزدا، کۆمەڵێك بڕیار هەیە بەپێی کـاتو سـاتو کـەس دەگـۆڕێ، ئـەم بابـەتی وەرگرتنـی ڕای ژنـیش لـەکاتی بەشووداندا لـەم بابەتەیـە، مـن بـەخودی خـۆم، ئامـادەی چـەندین مـارەبڕین بووم، بەشێوەی هەقدار، بەشێوەی شایەت، بەشێوەی مەلای مارەبڕ، بەشێوەی خزمـی ڕیـش سـپی، هـەروا بەشـێوەی تـر، لـەکورد، لـە عـەرەب، لـەتورکمان، لەسلێمانی، لەکەرکوك، لەبەغداد، لەشوێنانی تر، لەکۆمـەڵگای جۆراوجـۆر، لـە لادێو لەگوند، لەشارو شارۆچکە، لەخەڵکی بـەدینو تـەواو دینـدار، لەخـەڵکی مەدەنی، لەپلەی هۆشیاریو زرنگیو ڕۆشنبیریی خەڵکەکەی، بەرزو نزمی یـان پیوە دیار بێ.

جـا لـەپاش ئـەم ڕێ خۆشـکردنە، ئـەوەی کـە ڕەچـاوم کـردووەو لـەلای هــەموو کەســێ کــە ئاگــای لــەم بارودۆخــە ناســکەبێ، جــا لــەپاش ئــەم ڕوونکردنەوەیە، ئەوەی کە ڕەچاوم کردووە ئەم دیاردە بەڵگە نەویـستەیە کـە ئەمە پوختەکەیەتی:

(زۆرینەی کات، پەیوەندیدارانو عەلاقەمەندان، چ هەقدارو وەلی بـن، چ ژنو مێـردبن، چ شـایەت بـن، چ ئامـادەبوانی تـربن، شـەرمو شـکۆ دەیـانگرێ،

سامیان لێ دەنیشێ، گەلێ جار وا دەپەشۆکێن، شپرزەیی‌یان پێوە دیارە، زۆرجار وا دەشەلەژێن قسەکان تێکەڵو پێکەڵ دەکەن، باوکی کچەکە، یا کچەکە، یا مێردەکە، زمانی تەتەڵە دەکا، دەمی دەلەرزێ، شەرمو سام وا دەیگرێ، تفی بۆ قووت نادرێ. جارێ من خۆم مەلای گرێدەری گرێبەندی مارەبڕینەکە بووم، باوکی کچەکە، کە پیاوێکی کامڵ بوو، پزیشك بوو، رۆژێ لەڕۆژان، رەئیسی صیحەی شاری سلێمانی بوو، مێردەکەیش پزیشك بوو، کچەکەیش دەرچووی کۆلێژ بوو، دایکی کچەکە خانمێکی شاژنی هۆشمەندی ژیرو سەلار بوو، خوێنەوارێکی بەرزبوو، شایەتەکان کۆمەڵێ لەپیاو ماقووڵانی شارەکە بوون، کە ناسیاوو دۆستی هەردوولا بوون.

دەی باوکەکە وا شەرم گرتبووی زمانی گۆی نەدەکرد، قسەی بۆ نەدەکرا، هەروا کوڕو کچەکەیش، تەنیا دایکی کچەکە نەشەڵەژا، وەك ناوەندێ، رابەری ئەوانی دەکردو قسەکانی بۆ راست دەکردنەوە، لەبەرئەوە من کە هەستم بەم شلۆقی هەڵوێستەکرد، ناچاربووم کە بەباوکی کچەکە بڵێم: تۆ من بکە بە وەکیل بۆ ئەم کارەو ئیتر هەقت نەبێ، ئەویش وایکرد!!

دەی برا! کە ئەمە حاڵی دکتۆرو رۆشنبیرانی سەدەی بیستەم بێ، لەکاتو ساتو بارودۆخی وادا، ئیتر دەبێ حاڵی کچە دەوار نشینێکی کورد، یا عەرەب، یا هەر نەتەوەیەکی تر، لەگوندێکی لاڕێ، یا لە کوێرە دێیەك، یا لە دوورگەیەکی دوورە دەست، یا لەزۆنگاوێ لە زونگاوەکانی خوارووی عێراق، لەمەوپێشو ئێستایشو لەمەودوایش، چۆن بێو چۆن بتوانێ کەوەك بولبولی خۆشخوان، بە گوساخی، پڕبەدەم هاوار بکاو بڵێ: من وا دەکەمو وا ناکەم!!

ئەوەی کە لەم لایەنەوە پێویستە ئەوەیە: کە رەزابوونی ژنو مێرد، بەیەکتری مسۆگەربێ، ئیتر دەربڕینو ئاشکرا کردنی ئەم مەبەستە بەهەر شێوەیێ بێ دروستەو دەبێ، ئەوەی کە وانالێ دیارە لە حاڵەکە حاڵی نییە، یا نایەوێ حاڵی ببێ.

سەرەڕای هەموو شتێکیش، ئایین بەتێکڕایی، ئیسلام بەتایبەتی، بە پێچەوانەی مادده پەرستەکانەوە، هەوڵ دەدەنو مەبەستیانە:

(کە شەرمو شکۆو گەورەو بچووکیو ڕێزو قەدرو حورمەتو باوکییو فەرزەندەییو هەموو ڕەوشتێکی تری بەرز لە کۆمەڵگادا، مایەدارو بەردەوام بێ، چونکە تەوەرەی ژیانێ، کە مرۆڤ جیابکاتەوە لە ئاژەڵ، تەنیا ڕەوشتی بەرزە، بەبێ گومان کە ڕەفتاری جوانو ڕەوشتی بەرز بەرهەمی ئایینە، ڕەوشتی جوانو ئایینی ڕاستو دروست: گوڵو باخن، کە دەستنێژی خواوەندی گەورەو داناو بەئاگاو زانان).

١٠١٢- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهمَا) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {اَلثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْمَرُ، وَإِذْنُهَا سُكُوتُهَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي لَفْظٍ: {لَيْسَ لِلْوَلِيِّ مَعَ اَلثَّيِّبِ أَمْرٌ، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٣ = شيحا ٣٤٦١. نسائي. نكاح: ٣٢٦٠. أبو داود. نكاح: ٢٠٩٨. ترمذي. نكاح:/ ١١٠٨، تحفة/٦٥١٧}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بێوەژن بۆ مارەبڕینی خۆی، خۆی زیاتر مافی هەیە، تا هەقدارەکەی (واتە: وەلیەکەی). کچیش بۆ مارەبڕینی خۆی لەکەسێ، پرسی پێ دەکرێو ڕای وەردەگیرێ، جا ئەگەر لەبەر شەرمو شتی وا قسەی نەکردو بەشێوەیێ لەشێوەکان، ناڕەزایی دەرنەبڕێو بێ دەنگ بوو، لەکاتی ڕا وەرگرتنەکەدا، ئەوە واتای وایە کە ڕازییە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١}.

لەگوتە (لفظ = بێژە)یەکی ئەبو دداودو نەسائیدا، کە ئیبنو حیببان بە تەندروستی داناوە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (هەقـداری بێـوەژن بـۆی نییـە کـەڕای خـۆی بـسەپێنێ بەسـەریدا، لـەکاتی شـووکردنیدا، هـەتا بێـوەژن خـۆی ڕازی نـەبێ، هەقدار بۆی نییە کەبیدات بەشوو، کچی هەتیویش مۆڵەتی لێ وەردەگیرێ. جا ئەگەر قسەی نەکردو خامۆش بوو، لەکاتی پرس پێکردنو مارەکردنیدا، ئەوە دائەنرێ بە مۆتڵەتو ڕازی بوون!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١}.

١٠١٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا تُزَوِّجُ اَلْمَرْأَةُ اَلْمَرْأَةَ، وَلَا تُزَوِّجُ اَلْمَرْأَةُ نَفْـسَهَا} رَوَاهُ اِبْـنُ مَاجَـهْ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح ماجامع: ٧٢٩٨}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درروودی خودای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (لـەکاتی ژن مارەبڕینـدا، ژن بـۆی نییـە، ڕۆڵو دەوری هەقداربببینێ، وە ژنێ تر بە ئەصالەت، وەك کچی خۆی، یا بەوەکالەت، وەك ژنێکـی بێگانــە، لـەپیاوێ مــارە بـبڕێ، هــەروەها بــۆی نییــە، لــەکاتی شووکردنی خۆیدا، ڕۆڵی هەقدار ببینێو خۆی، خۆی لەپیاوێ مارە ببڕێ).

(ڕوونکردنەوە):

(کورتو پوخت)

ژن بۆی نییە: کە ڕۆڵو دەوری هەقـدار ببینـێو هەقـداریو ویلایـەتی بۆ نییە. کەواتە: لەهەموو ئەم بارودۆخانـەی دواوەدا، لەسـەر ڕای جـەماوەری زانایـان، ژن مـافی گرێـدانی ژن مـارە بڕینـی بـۆ نییـە، وە هـەروەها قـەبوولی نیکاحی بۆ نییە:

١- ناتوانێ خۆی لەکەسێ مارە بـبڕێ، سـەربەخۆ، تەنانـەت هەقدارەکـەی مۆڵەتیشی بدا کەخۆی لەپیاوێ مارە ببڕێ، هەر نابێو ئەگەر شتی وابکا، مارە بڕینەکە دانامەزرێو پووچە.

٢- گریمان هەقدار، وەك باوك، یا برا، یا مام، بیکا بەوەکیلو پێی بڵێ: خۆت وەکیلی من بە، خۆت مارە ببڕە لەو پیاوە، ئەوە نابێو گرێبەندی مارە بڕینەکە دانامەزرێ، هەروا ئەگەر هەقدارێکی بێگانە ژنێ بکا بەوەکیل کە کچەکەی یا خوشکەکەی، مارە ببڕێ لەکەسێ، ئەویش هەرنابێ، هەروەها ئەگەر هەقدار، وەك باوكو براو مامو ئامۆزا کچی خۆیان، یا خوشکی خۆیان، یا برازای خۆیان، یا کچی ئامۆزای خۆیان بکەن بەوەکیل، کە ژنێ، خۆیی بێ، یا بێگانە بێ، بدا بەشوو وە مارە ببڕی لەکەسێ نابێ.

٣- ناتوانێ قەبووڵی نیکاح بکا، چی بە ئەصاڵەت، وە چی بەوەکالەت، وەچی بۆ خۆی، وەچی بۆ کەسێکی تر، ئیتر ئەو کەسە پیاوبێ، یا ژن بێ.

٤- بەڵام ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ژنی ژیری هۆشمەند، کە رەسیدە بووبێ دەتوانێ خۆی بدا بەشوو، وەکچی خۆی کەرەسیدە نەبووبێ بدات بەشوو، رەسیدە واتە: بالغە، وە هەروەها دەتوانێ رۆڵی وەکیلیش ببینێ، وەك ئەوە باوکی ژنێ، ژنێ تر بکا بەوەکیلی خۆی، کە کچەکەیی بۆ مارە ببڕێ لەپیاوێ، ئەمەیش لەلای ئەبو حەنیفە دەبێو مارە بڕینەکە دادەمەزرێ!!

بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر ژن خۆی، خۆی مارەبڕی لەکەسێ کە هاوشانو کوفئی خۆی نەبوو، هەقدارەکانی بۆیان هەیە رەخنە بگرنو رەخنەکەیان بەهەند دەگیرێ.

واتە: لەلای ئەبو حەنیفە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) هەقدار بۆ دامەزرانی مارەبڕین، نە روکنەو نە مەرجە وەکی تریش پێشەوا مالیك (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (هەقدار (واتە: وەلی) سەبارەت بە ئافرەتی خانەدان مەرجە، بۆ دامەزرانی مارەبڕین، ژنی شەریفی خانەدان بۆی نییە کەخۆی خۆی بدا بەشوو، دەبێ هەقدارەکەی بیدات بەشوو، بەڵام

ژنی ناخانەدان (واتە: وەضیعە) دەتوانێ خۆی بدا بەشوو، وەخۆی خۆی مارە ببڕێ لەپیاوێ.

١٠١٤– وَعَنْ نَافِعٍ، عَنْ اِبْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ : { نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنِ الشِّغَارِ " وَالشِّغَارُ: أَنْ يُزَوِّجَ اَلرَّجُلُ اِبْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ اَلْآخَرُ اِبْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَاتَّفَقَا مِنْ وَجْهٍ آخَرَ عَلَى أَنَّ تفسير الشِّغَارِ مِنْ كَلَامِ نافع.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٥٨ = ٥١١٢، ٥١١٣، ٦٩٦٠. مختصر صحيح مسلم/٨٠٨ = شيحا/٣٤٥٢ = ١٤١٥}:

لە نافیعەوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی دەکرد لەژن بەژن، ژن بەژنیش وەك ئەوە کە دوو پیاو بەکچی خۆیان، یان بەخوشکی خۆیان ژن بەژن بکەن، بەبێ مارەیی). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٢٢٠٧، ٢٢٠٨ – ش/د/ت/ن = ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی، ڕەحمەتی خودایان لێ بێ} + {بڕوانە: فیقهی ئاسان/ بەرگی ددووەم، لاپەڕە: ٦٤١ چاپی یەکەم = زنجیرە: ٢٦٧، لاپەڕە: ٧١٤ چاپی دووەم ساڵی/٢٠٠٦}.

**(نافیع)**

١- نافیعی کوڕی سەرجیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعیە، لە پەیڕەوانە، هاوەڵ نییە، بەڵام هاوەڵی زۆری پێغەمبەری دیوە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو لەسەر هەموو پەیڕەوانو شوێنکەوتوانی هەتا ڕۆژی دوا ڕۆژ).

نافیع ئازادکراوی ئیبنو عومەر بوو، فەقێی بوو، فەرموودەی زۆری لەوەوە گێڕاوەتەوە، لەبنەڕەتدا خەڵکی مەغریبە، لە غەزایەکا دیلکراو بەرپشكو بەشی ئیبنو عومەر کەوت، لەخزمەتی ئیبنو عومەردا بوو تا کاتی مەرگی، زانستو فەرموودەیەکی زۆری لەئیبنو عومەر وەرگرتووە. عومەری

کوڕی عەبدولعەزیز، کاتێ جێنشین بوو، ناردی بۆ میصر، هەتا خەڵکەکەی لە یاسانامەی خوداو لەسوننەتی پێغەمبەردا، شارەزابکا، وە لەو مەودایەدا رۆڵێکی جوانی بینی، زۆربەی فەرمووده شوناسه گەورەکان گێڕانەوەیان لێوە ئەنجام داوە، لەکۆی گێڕانەوەکانیدا، ئەوەندە زەینی رۆشنبووە هەڵەی لێ نەبینراوە، ناسراوە بە (نافیعی فەقیە) واتە: مامۆستا نافیعی شەرعزان‌و شارەزا لە ئایین‌دا.

پێشەوا بوخاری سەبارەت بە تەندروستترین رشتە، دەفەرموێ: (دروستترین رشتەی فەرموودە: مالیکە، لە نافیعەوە، لەئیبنو عومەرەوە!).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیفەرموو: (نافیع بەهرەو خەڵاتی خودای گەورەیە بەخشیویەتی بە ئێمەی گەلی ئیسلام).

بەهێزترین راو بۆچوون ئەوەیە کە ساڵی (١١٧) سەدو حەڤدەی کۆچی لەشاری مەدینە کۆچی دوایی کردووەو مەرگی خودایی بووە بەمیوانی. (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لێ بێ). {بڕوانە: مختصر صحيح مسلم، بەرگی/دووەم، ژمارە: ٦٥٤ — روونکردنەوە = ژیان نامەی نافیعی کوڕی سەرجیس}.

٢- دانەر، پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، دانەری ئەم پەڕاوی (بُلُوغُ المَرَامِ مِنْ أَدِلَّةِ الْأَحْكَامِ)یە دەڵێ: هەردوو مامۆستای مەزن: بوخاری‌و موسلیم، لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا، رێکن لەسەر ئەوەو بەکۆی دەنگ گێڕاویانەتەوە: کە روونکردنەوەی واتای (شغار = ژنبەژن) قسەی نافیع خۆیەتی، دانەر ئاماژە بۆ فەرموودەی ژمارە (٦٩٦٠)ی صەحیحی بوخاری‌و ژمارە (٣٤٥١)ی صەحیحی موسلیم تەرقیمی شێخ خەلیل مەئموون شیحا دەکا، کە ئەمە دەقی ئەم گێڕانەوەیە لە بوخاریدا:

عوبەیدوڵڵا فەرمووی: نافیع گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرمووی:پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی

دەکرد لە ژن بەژن. عوبەیدوڵڵا دەڵێ: عەرزی نافیعم کرد: ژن بەژن چییەو چۆنە؟ نافیع فەرمووی: (ژن بەژن ئەوەیە کە دوو پیاو بەکچی خۆیان، یا بەخوشکی خۆیان ژن بەژن بکەن بەبێ مارەیی، یەکێکیان بەوی تریان بڵێ: ئەوا کچەکەی خۆم، یا خوشکەکەی خۆم لەتۆ مارەبڕێ، بەمەرجێ تۆیش کچەکەی خۆت، یا خوشکەکەی خۆت لەمن مارە ببڕی، بەمەرجێ هەردووکیان مارەیی‌یان نەکەوێ، ئەویش بڵێ: ئەوا قەبووڵم کرد).

٣- لە وڵاتانی موسوڵماناندا، ژن بەژن دەکرێ، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕەخنەی ئەم فەرموودانە خۆیان ڕزگار بکەن، مارەیی دادەنێن بۆ هەردوو مارەبڕاوەکان، لەکاتی گرێ بەندەکەدا، وە لەپێشدا لەناو خۆیاندا، لەسەر دیاری کردنی هەردوو زاواو هەردوو بووکەکە ڕێ دەکەون، وە مارەیی یەکێ لەبووکەکان، کەمێ زیاترە لەمارەیی ئەوی تریان، وە لەکاتی گرێ دانی مارەبڕینەکەدا، ئەوە بەمەرج ناگرن: کە ئەوا من کچەکەی خۆم، یا خوشکەکەی خۆم لەتۆ مارەبڕی، بەمەرجێ تۆیش کچەکەی خۆت، یا خوشکەکەی خۆت لەمن مارەببڕی. بەڵکوو لەپێشدا مەلاکە بووکێکیان لەمێردەکەی بەشێوەی ئاسایی مارە دەبڕێ، ئەوسا لەپاش پشوودانێ، بۆ ناوبڕ، ئەوی تریشیان بەشێوەیەکی ئاسایی لەمێردەکەی لەجیگەو کۆڕو مەجلیسێکی تردا مارە دەبڕێ، بەبێ ئەوە ئاماژە بکرێ بۆ مارەبڕینی یەکەم. گەلێ جار ژنی دووەم هەرناوزەد دەکرێو دیاری دەکرێ، لەپاش چەند مانگێ، یان لەپاش چەند ساڵێ مارە دەکرێ جا لەم حاڵانەدا، بەکۆی دەنگ ژن بەژن دروستە، گەرچی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەمیشە ژن بەژن بێ کێشەو بەرە نابێ.

١٠١٥- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَذَكَرَتْ: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَأُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.

{صحيح أبي داود: ١٨٤٥}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوكی) فەرمووی: كەنیشكێكی كچ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! من باوكم داومی بەمێرد، بەڵام من خۆم پێم ناخۆشەو ئەو شووەم بەدڵ نییە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) كچەكە خۆی كرد بە سەرپشك، ئەگەر حەزدەكا، ئەوا بەگوێی باوكی بكاو شووەكەی دابمەزرێنێ، ئەگەر حەزیش ناكا شووەكەی هەڵوەشێنێتەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨٤}.

لە ژمارە: ٢٠٨٣، زنجیرە: ٣١ی تاجدا دەفەرموێ: خەنسای كچی خیدام، كەئافرەتێكی ئەنصاری بوو، گوتی: بێوەژن بووم، باوكم دامی بەشوو، منیش پێم ناخۆش بوو، چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شووەكەمی هەڵوەشاندەوە.

١٠١٦- وَعَنْ اَلْحَسَنِ، عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {أَيُّمَا اِمْرَأَةٍ زَوَّجَهَا وَلِيَّانِ، فَهِيَ لِلْأَوَّلِ مِنْهُمَا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَحَسَّنَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{ضعيف الجامع: ٢٢٢٤. أحمد/١٨/٨/٥. أبوداود/٢٠٨٨. ترمذى/١١١٠. نسائى/٣١٤/٧. ابن ماجة/٢١٩٠. التلخيص٣/١٦٥}:

لە تاجول ئوصولدا ئاوایە:

حەسەنی بەصری لە سەمورەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر ژنێ دوو هەقدار بیدەن بەشوو، وەك خوشكێ دوو برای باوكی‌و دایكی، بیدەن بەدوو كەس، ئەوە مارەی دی لەمێردی یەكەم، واتە: ئەو دوو برایە كامیان لەپێشدا دای بەشوو ئەوەیان تەندروستە. ئەگەر پیاوێكیش چشتێ بفرۆشێ بەدوو كەس، ئەوە بۆ كەسی یەكەم بەیعی دێ‌و دەبی بەهینی ئەو). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨٧ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠١٧- وَعَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم): {أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ أَوْ أَهْلِهِ، فَهُوَ عَاهِرٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ، وَكَذَلِكَ اِبْنُ حِبَّانَ.

{حسن، صحيح أبي داود: ١٨٢٩. أحمد/٣٠٠/٣. أبوداود/٢٠٧٨، ترمذى/١١١٢}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لێ بێو سەرو ماڵو حاڵو مناڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دینی کارانی ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: (هەر کۆیلەیێ بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی) یا پێغەمبەر لەشوێنێ (بەبێ رەزای خاوەنەکەی) فەرمووی: (بەبێ رەزای کەسوکارەکەی، کەبریتین لەخاوەنەکانی، هەر کۆیلەیێ بەبێ رەزامەندیی ئەوان ژن بهێنێ، ئەوە شەرواڵ پیسە، لەگێڕانەوەیەکا (ژن هێنانەکەی پووچو بەتاڵە). {تاج/٢، زنجیره: ٦١، ژماره: ٢٢١٥، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠١٨- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يُجْمَعُ بَيْنَ اَلْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ اَلْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژماره: ١٧٥٧ = ٥١٠٨. مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٨١٧ = شیحا ٣٤٢٣. نسائی. نكاح: ٣٢٨٨}:

لەپوختەی موسلیما ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوە کە ژن، شوو بکا بەسەر خوشکی باوکی، کەپێی دەگوترێ میمك، یا شوو بکا بەسەر خوشکی دایکی، کەپێی دەگوترێ: پوور، وەهەروەها میمكو پووریش نابێ شوو بکەن بەسەر برازاو خوشکەزای خۆیان. {تاج/٢، زنجیره: ٢٩، ژماره: ٢٠٧٣}.

١٠١٩- وَعَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَنْكِحُ اَلْمُحْرِمُ، وَلَا يُنْكَحُ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {وَلَا يَخْطُبُ}. وَزَادَ اِبْنُ حِبَّانَ: {وَلَا يُخْطَبُ عَلَيْهِ}.

{مختصر صحيح مسلم/٨١٤ = شيحا ٣٤٣٢. أبوداود مناسك: ١٨٤١، ١٨٤٢. ترمذى. حج/٤٨٠}:

**له موختهصهری صهحیحی موسلیما ئاوەهایه:**

**نوبەیهی کوڕی وەهب، فەرمووی: عومەری کوڕی عوبەیدوڵلا، لەئیحرامی حەجدا بوو، ویستی کچێکی شەیبەی کوڕی جوبەیری کوڕی عوثمانی حەجەبی، کەناوی ئوممولحەمید بوو، مارە ببڕێ لەطەلحەی کوڕی خۆی، ئەو ساڵە ئەببانی کوڕی عوثمانی کوڕی عەففان، میر حەج بوو، جا عومەری کوڕی عوبەیدوڵلا، منی نارد بەشوێنی ئەبباندا، کە ئامادەی ئەم بۆنەی مارە بڕینە ببێ، کەچووم پێیم گوت: ئەببان فەرمووی: چۆن شتی وا دەبێ؟ لەباوکم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو کەسەی کە لەئیحرامدایە، نابێ نە ژن مارە بکاو نە ژن بەشوو بداتو نە خوازبێنی ژن بکا، چی بۆ خۆی چی بۆ کەسێ تر، هەروەها ئەو ژنەش کەوا لەئیحرامدا نابێ شوو بکاو خوازبێنی بۆ کەسی تریش بکا).**
**{تاج/٢، زنجیره: ٨٥، ژماره: ١٥٠٩}.**

١٠٢٠- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {تَزَوَّجَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری بەرگی دووەم، ژمارە: ٨٤٥ = ١٨٣٧، ٤٢٥٨، ٤٢٥٩، ٥١١٤ بوخاری مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨١٥ = شیحا ٣٤٣٨. ترمذی. حج: ٨٤٤. نسائی. حج: ٢٨٣٧. تحفة الأشراف/٥٣٧٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ مەیمونەی هاوسەری مارە کرد لەئیحرامدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥١٠ – ش/د/ت/ن}.

١٠٢١– وَلِمُسْلِمٍ: عَنْ مَيْمُونَةَ نَفْسِهَا {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) تَزَوَّجَهَا وَهُوَ حَلَالٌ}.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨١٦ = شيحا ٣٤٣٩}:

له پوختەی موسلیما ئاوایە:

یەزیدی کوڕی ئەصەمم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: مەیمونەی کچی حاریث (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆی قسەی بۆم کرد، فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مارەی کردم لەخۆی، لە سەریف بووین، وە هەردووکمان بێ ئیحرام بووین، نە پێغەمبەر لەئیحرامدا بوو نە من.

یەزید فەرمووی: مەیمونەی کچی حاریث هەم پووری من بوو، وەهەم پووری ئیبنو عەبباس بوو، چونکە خوشکی دایکمان بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥١١ چ/٤ = چاپی چوارەم + مختصر صحيح مسلم + مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ١١٧}.

١٠٢٢– وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ أَحَقَّ اَلشُّرُوطِ أَنْ يُوَفَّى بِهِ، مَا اِسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ اَلْفُرُوجَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٣١ = ٢٧٢١، ٥١٥١ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٠٤ = ٣٤٥٧ شيحا. ابوداود. نكاح/٢٠٣٩. ترمذی. نكاح/١١٢٧. نسائی. نكاح/٣٢٨١. تحفة الأشراف/٩٩٥٣}:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕەواترین مەرجێ کە شایانی ئەوە

بـێ كـه جێبـهجێ بكرێ، ئـهو مهرجانـهن كـهژنتان لـهخۆتان پێیـان حـهڵاڵ كـردووه، وهك مـارهیی‌و ژێـوارو گـوزهران‌و ژیـان لهگـهڵیانا بـهپێی یاسانامهی خودا). {تاج/٢، زنجیره: ٣١، ژماره: ٢٠٨٨}.

١٠٢٣- وَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {رَخَّصَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَامَ أَوْطَاسٍ فِي اَلْمُتْعَةِ، ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، ثُمَّ نَهَى عَنْهَا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمـاره: ٨١١ = شـیحا ٣٤٢١ + ژمـاره: ٨١٢ = شیحا ٣٤٠٦}:

سـهلهمهی كـوڕی ئـهكوهع (رهزای خـودای لێ بـێ) فـهرمووی: لهسـاڵی غـهزای ئـهوطاسـدا، پێغهمبـهر (دروودی خـودای لهسـهر بـێ) بۆجـاری سێیهم ڕێگـهی ژن سـیغهكردنی دایـهوه، بـهڵام لهپاشـا بـهئێجگاری یاسـاخی كـردهوه {تاج/٢، زنجیره: ٦٠، ژماره: ٢٢١١}.

لێـره ئاوایـه: لهسـاڵی غـهزای ئـهوطاسـدا، پێغهمبـهر (دروودی خـودای لهسهر بێ) بۆ ماوهی (٣) سێ ڕۆژ، ڕێگـهو مۆڵـهتی ژن سـیغهكردنی دا، بـهڵام لهپاشا بهئێجگاری قهدهغهی كردو حهرامی كرد.

١٠٢٤- وَعَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ اَلْمُتْعَةِ عَامَ خَيْبَرَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{مختصر صحيح البخاری = تجریـدی بوخـاری/٤، ژمـاره: ١٥٧٤ = ٤٢١٦، ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١ بوخـاری. مختـصر صـحيح مـسلم/٢، ژمـاره: ٨١١ = شیحا/٣٤٢١ = مسلم/١٤٠٧. ترمذی. نكاح/١١٢١. نسائی. نكاح: ٣٣٦٥. ابـن ماجة. نكاح: ١٩٦١}:

له موختـهصهری صهحیحی موسلیما ئاوایه:

ئیمـامی عـهلی كـوڕی ئـهبو طالیـب (رهزای خـودای لێ بـێ) دهفـهرموێ: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) لهڕۆژی غـهزای خهیبـهردا، جلـهوگیری

لەم دوو شتە کردو نادروستی کردن: یەکەم ژن سیغە کرد. دووەم: خواردنی گۆشتی کەری ماڵی. واتە: لەو غەزایەدا ئەم دوو شتەی حەرام کرد. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٢١٠}.

١٠٢٥- وعنه (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ، وَعَنْ أَكْلِ الحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ. أَخْرَجَهُ السَّبْعَةُ إلاَّ أَبَا دَاوُدَ):

{بڕوانە: ژمارە: ١٠٢٤ کە ئێستا رابوورد} + {مختصر صحيح مسلم ژمارە: ٨١١}.

١٠٢٦- وَعَنْ رَبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ عن أبيه (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قال: {إني كُنْتَ آذَنْتُ لَكُمْ فِي الإِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِسّاءِ، وإنَّ اللّهَ قَدْ حَرَّمَ ذلِكَ إلى يَوْمِ القِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيءٌ فَلْيُخَلّ سَبِلَهَا، وَلاَ تَأخذوا مِمَا آتَيْتُمُوهُنَّ شيئاً. أخرجه مسلم و أبوداود والنسائي وابن ماجة و احمد وابن حبان،}.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨١٣ = مسلم ترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا: ٣٤٠٥. أبو داود. نكاح: ٢٠٧٢، ٢٠٧٣. نسائي. نكاح: ٣٣٦٨}:

رەبیعی کوڕی سەبرە فەرمووی: باوکم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەنێوانی گۆشەی حەجەرولئەسوەدو، دەرگای کابەدا، پێغەمبەرم بینی، لەوێ ڕاوەستا بوو، لەکاتی حەجی ماڵاوایدا، دەیفەرموو: (درووودی خودای لەسەر بێ) خەڵکینە! ئەی موسوڵمانینە! لەمەو پێش ئەوە بوو خۆم ڕێگەم پێتان دابوو، کە ژن سیغە بکەن. واتە: بۆ ماوەیەکی دیاری کراو مارە بکەن، بەڵام لەم چرکە ساتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت، خودا ژن سیغەکردنی نادروستو ناڕەوا کردووە، ئیتر لەئێستاوە هەرکەسێ، یەکێکی لەم ژنانە لەلا هەیە، کەسیغەی لەگەڵدا کردوون، با بەرەڵایان بکات، وە هەرچیشتان پێیان داوە، هیچیان لێ مەسەندنەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٢١٣}.

(ڕوونکردنەوە)

١- سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەنی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لەذی مەڕە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، ڕەبیعی کوڕی فەرموودەکانی لێوە دەگێڕێتەوە، ئامادەی غەزای خەندەق بووە، لەگەڵ غەزاکانی پاشیدا، بوخاری بەتەعلیق فەرموودەی ئەو ڕاگوێز دەکا، بەڵام موسلیمو خاوەن سونەنەکان بەڕشتەی پەیوەستی خۆیان، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، فروستادەو نوێنەری ئیمامی عەلی بوو، بۆ موعاوییە لەشام، هەتا پەیمان لەخەڵکی شام وەربگرێ بۆ ئیمامی عەلی، کاتێ بوو بەجێنشین.

٢- سیغەکردن: واتە: مارە بڕینی کاتی، یەکێکە لەباوو نەریتو بڕیارەکانی سەردەمی نەزانی، (نەفامی = جاهلیة). لەسەرەتاوە ئیسلام ڕێگەی لێ نەدەگرت، بەڵام لەدواییدا، لەکاتی ئازاد کردنی مەککەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نادروستو قەدەغەی کردن بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە.

جا لەبەر ئەوەی کە ئەم بابەتە، کاریگەرییەکی زۆری هەیە، لەزۆر ڕووەوە، لەسەر ئاستی ئایینیو کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتیو ڕەوشتی، ئەم ڕوونکردنەوەیە لەکۆمەڵێ سەرچاوەی فیقهیو شەرعییەوە تۆمار دەکەین لەسەرچاوەی متمانەداری لای سوننییەکانو شیعەکان، تا ڕووی ڕاستی دەربخات:

یەکەم: لەلای سوننییەکان، بەتایبەتی لەلای هەرچوار مەزهەبەکە، کە حەنەفیو شافیعیو مالیکیو حەنبەلین، هەروا لەلای جەماوەری زانایانی نەتەوەی ئیسلام، سیغەکردنی ژن، ئێستا نادروستەو ئەنجامدانی دادەنرێ بەتاوانی داوێنپیسیو لەشفرۆشیو ئەنجامدەر سزا دەدرێ.

دووەم: لەلای شیعەی ئیمامی، کە گەورەترین کۆمەڵن لەکۆمەڵانی مەزهەبەکانی شیعە، موتعە (واتە: ژن سیغەکردن = مارەکردنی کاتی)

دروسته، بەڵکوو وەك ژن هێنانی ئاسایی لەهەندێ کاتا سونئەتە، یا پێویست‌و واجیبە.

سێیەم: جۆری گرێدانەکەی‌و چۆنێتی ژن سیغەکردن، بەتایبەتی لەلای شیعەی ئیمامی:

(بریتییە لە ڕێککەوتنی ژن‌و پیاوێ لەناو خۆیانا، کەموانعی نیکاح لەنێوانیاندا نەبێ، کە هاوسەری کاتی لەناو خۆیاندا ئەنجام بدەن، بەمەرجێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بێ، وەك مانگێ، یان زیاتر، یا کەمتر، لەسەر ئەندازەیێ ماڵ کە پیاوەکە بیدات بەژنەکە!).

چوارەم: شایەت لە ژن سیغە کردندا مەرج نییە، هەروا وەلێ بۆ ژنی ڕەسیدەی فامیدە مەرج نییە، خۆی دەتوانێ سیغەکردنەکە ئەنجام بداو قەبووڵی گرێ بەندەکە بکات. (ڕەسیدە = البالغة العاقلة).

پێنجەم: کاتێ کاتە دیاریکراوەکە تەواو بوو، یان مێردەکە لەپێش تەواو بوونی کاتەکەدا مرد، ئەوا تەماشا دەکەین:

آ- ئەگەر ژنەکە نائومێد بوو لەسووڕی مانگانە، عوزری شەرعی بەسەر چوو بوو، ئەوە یەکسەر مارەبڕین‌و سیغەکە تەواو دەبێ‌و پێویستی بەحەیەو عیددەو پاکبوونەوەی منداڵدان نییە، واتە: ژنێ کەسیغەی کردبێ‌و لەبێنوێژی‌و سووڕی مانگانەو منداڵبوون نائومێد بووبێ، لەبەر تەمەن، ئەوا بۆی هەیە دەست بەجێ‌سیغەی تر بکات، یا شوو بکا.

ب- ئەگەر ژنەکە هێشتا سەرو عوزری دەشۆردو نائومێد نەبوو لە بێنوێژیی ژنانەو سووڕی مانگانەی هەبوو، ئەوە لەپاش تەواو بوونی کاتی دیاری کراو، (استبراء الرحم) بکا، واتە: تا دوو مانگ، بەمانگی هەیقی (قەمەری) نەشوو بکا، نەسیغە ئەنجام بدا.

ج- ئەگەر لەماوەی دیاری کراودا، مێردەکە مرد، واتە: کابرای سیغەکار مرد، ئەوە دەبێ ژنەکە چوار مانگو دە شەو ماتەم بگرێو نەسیغە بکاو نە شوو.

شەشەم: لەماوەی بەردەوامی سیغەکردنەکەدا ئەم بڕیارانە ڕەچاو دەکرێن:

١- بێجگە لەو ئەندازە پارە بڕیاردراوە، کە ژنەکە لەپیاوەکەی وەرگرتووە:

آ- مارەیی تری ناکەوێ.

ب- ژیوارو نەفەقەی لەسەر خۆیەتی، لەسەر مێردەکەی نییە.

ج- ئەگەر یەکێکیان مردن، میراتو کەلەپوور لەیەکتری ناگرن. تەنها ئەوەندە هەیە کە ژنەکە دەبێ ماتەم بۆ مێردەکەی بگرێ.

حەوتەم: هەندێ بڕیاری هەمیشەیی کە بەهۆی ژن سیغەکردنەوە پەیدا دەبن، لەنێوانیاندا موصاهەرە دروست دەبێو شیر کاریگەری هەیە، لەسەر ئەم شێوەیە:

١- واتە: کچو دایكو نەنكو وەچەی مێینەی ژنەکەو بنەچەی مێینەی ژنەکە لەهەردوو سەرەوە، بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە لەپیاوەکە نادروستو حەرام دەبنو دەبن بەکەسی خۆیو یەکتری، لەبابەتی هاوسەریدا.

٢- هەروا بەپێچەوانەیشەوە، کوڕو کوڕەزاو باوكو باپیرەی پیاوەکەیش لەهەردوو لاوە، دەبن بەخۆییو مەحرەم بۆ ژنە سیغە لەگەڵ کراوەکە.

٣- دوو خوشك، یا دوو ژن کە خوشکی شیری بن، دروست نییە، کە بەسیغە کۆبکرێنەوەو لەیەك کاتدا، هەردووکیان ژنی سیغەکراوی یەك پیاو بن.

٤- دایکی شیریو کچی شیری، لەگەڵ هەرکامێکیانا سیغە کرا، ئەوی تریان بۆ هەمیشە لەو پیاوە حەرام دەبێ.

**هەشتەم: کۆمەڵێ بڕیاری تری ژن سیغەکردن:**

١- ئیستبرائی رەحەم، واتە: لەپاش تەواو بوونی ماوەی سیغەکردنەکە، ژنەکە تا ماوەی دوو مانگ نە شووبکا، نەسیغەی تر بکا، هەتا بزانرێ کە منداڵ هەیە لە منداڵدانیدا، یا نییە، ئەمەیش بۆ ژنێ وایە کە ئەگەری سکوزاکردنی مابێ، دەنا ئیستیبراء پێویست نییە.

٢- تەڵاق‌و ئیلاءو لیعان لەنێوانیانا نییە، هەروەها زیهار، بەڵام لە زیهاردا راجیایی هەیە. پیاوەکە هەزارجار ژنەکە تەڵاق بدا، سیغە کردنەکە پووچەڵ نابێتەوە، هەتا ماوەی دیاری کراوی خۆی تەواو دەبێ.

٣- ئەگەر ژن‌و پیاوێ، لەگەڵ یەکتردا سیغەیان کرد، هەتا ماوەی سیغەکە مابێ بۆیان نییە، کە مارەبڕینی هەمیشەیی ئەنجام بدەن، هەروا بۆیان نییە سیغەکردنێکی تر دابمەزرێنن، بەڵام لەپاش تەواو بوونی ماوەکە هەموو کاتێ بۆیان هەیە کە گرێ بەندێکی هەمیشەیی، یا کاتی ئەنجام بدەنەوە! وە هەروەها!!

٤- بەسیغە نەسەب لەنێوانی منالی سیغەو پیاوەکەدا ناچەسپێ، مەگەر بەمەرجێ کە بەمەرجی بگرن، ئەگەر منداڵیان بوو هی هەردووکیان بێت‌و پیاوەکە دابنرێ بە باوکی.

لەکاتی وادا کە بەمەرجیان نەگرتبێ کە منالەکە هی هەردووکیان بێ، ئەگەر منالەکە کچ بوو، وە گەورە بوو دروست نییە کە باوکەکەی مارەی بکا بۆخۆی‌و سیغەی لەگەڵ بکات!!

٥- سیغە کردن ژمارەی بۆ نییە، لەلای قەولی ئەصەحح!! واتە: لە فەرموودەی هەرە ڕاستدا پیاوێ دەتوانێ، لە یەك کاتا، دە ژن، یا سەد ژن، یا هەزار ژن سیغە بکا، یا زیتر یا کەمتر!

٦- ئەندازەی ئەو ماڵەی کە ژنو پیاوەکە سیغەی لەسەر دەکەن، دیاری نەکراوە، تەنانەت ژن سیغە کردن لەسەر لالوێچێ گەنم دادەمەزرێ، یا لەسەر درەمێ دادەمەزرێ!

٧- ئەندازە دیاری نەکراوە بۆ ماوەکەی، گەرچی هەندێ دەڵێن: نابێ ماوەی سیغە لەماوەی گزنگی خۆرەوە، هەتا نیوەڕۆ کەمتر نەبێ، واتە: ماوەی سیغەکردن کەمو زۆری بۆ نییە، ژنو پیاوەکە لەسەر چەندێ ڕێککەوتن، با سێ خولەکیش بێ، دەبێو دروستە، گرنگ ئەوەیە کە ماوەکە دیاری بکرێو بەس.

٨- پیاوو ژنەکە دەتوانن: کە بەمەرجی بگرن کە لەماوەی دیاری کراودا، یەك جار جووت بوون ئەنجام بدەن، یان چەند جارێکی دیاری کراو، یا پیاوەکە هەر بەکۆم بچێتە لای ژنەکەو بەس!

**( سەرنجێ )**

لێرەدا ئەم ئێستە دەکەین:

١- جێگەی داخە کە هەندێ لەئاخونەکانو پیاوانی سیایەت، ئەم بابەتی سیغەیەیان کردووە بەفێڵەشەرعانەو وەك تۆڕو داوی ڕاوەسوێسکە، ڕاوی پارەو پوولو کڕینی ویژدانو بازرگانی پێوە دەکەن، وە ڕووی جوانی ئیسلامی پێ ناشیرین دەکەن، وەك:

آ- ژنێ کە لەسکوزا وەستابێتەوەو تەمەنی گەیشتبێتە (٥٠) پەنجا ساڵ، یا زیاتر، بۆی هەیە لەڕووی شەرعی شیعەوە، دووکانێکی داوێنپیسی دابنێ، بەناوی بەیتولعەفافەوە (خانەی داوێنپاکی!!). هەر سەعاتەی لەگەڵ کەسێ سیغە بکاو ئەندازەیێ پارەی لێ وەربگرێ، چونکە پێویستی بە ئیستیبرائی ڕەحەم نییە، بۆی هەیە، کە بەناوی سیغەوە هەر ڕۆژەی، یا هەر ساتەی، لەباوەشی زەلامێکا بێ.

٢- بگره كار گەیشتووه بەوه، فێڵە شەرعانە بووه بەدەروازەیێ، بۆ داوێنپیسیو بەرەڵایی نێرو مێ:

بۆ نموونە: ژن ئەگەر لەتەمەنی سکوزادا بوو، واتە: تەمەنی لە (٥٠) پەنجا ساڵ کەمتر بوو، ئەوە دەتوانێ بەم فێڵەی دواوە، هەموو شەوێ لەباخەڵی گانکەرێکا بێ: (بۆ ئەوەی خۆی لە (إسبراء الرحم = عیددەی موتعە) دەرباز بکا، لەگەڵ هەر پیاوێکا کەسیغە دەکات، کاتێ کە کەیفو سەفاکەیان تەواو دەبێ، با ژنەکە لەگەڵ ئەو پیاوەدا سیغەیەکی تر بکا، بۆ ماوەی چەند خولەکێ، وە لەم ماوە کەمەدا جووتبوون ئەنجام نەدەن، هەتا ماوەکە تەواو دەبێ، ئیتر ژنەکە بۆ سیغە کردنی تازە، پێویستی بەعیددە نییە، چونکە گوایە: عیددەو حەیەی ژنانەو ئیستیبرائی رەحەم، بۆ سیغەکردنو نیکاحێکە، کە ژنەکە مدخول بها بێت، دەی لەپاش ئەم گرێبەندی سیغەی دووەمە، جیماعو جووتبوون رووی نەداوە!! کەواتە: پێویست بە (إستبراء الرحم) نییە.

ئێمە قسەمان لەواقیعی حاڵە، دەنا ناو کتێبان پڕە لەقسەی زلی بێ توێکڵو وتی ئەمو ئەو.

بڕوانە: ئەم سەرچاوانە:

١- التبیان للطوسی.

٢- النهایة فی مجرد الفقه والفتاوی – لشیخ الطائفة أبی جعفر الطوسی.

٣- ئەم دەقانە بەعەرەبی لە پەڕاوی (النهایة فی مجرد الفقه والفتاوی – باب المتعة وأحکامها):

١- الإشهاد والإعلام فی المتعة فلیسا من شرائط المتعة.

٢- ولا بأس أن یتمتع بالمجوسیة ولفاجرة!!

٣- لیس علی الرجل أن یَسألَهَا: هَلْ لَهَا زوج أمْ لاَ.

٤- البالغة العاقلة حد البلوغ وهو تسع سنين، جاز له العقد عليها من غير إذن أبيها.

٥- ليس في نكاحِ المتعة توارث.

٦- لا بأسَ أن يتزوّجَ الرجلُ متعةً مَاشاءَ مِن النِّسَاءِ.

٧- إذا انقضى أجل المتعة جاز له أن يعقد عليها عقْداً مُستئنَفاً في الحال.

٨- وَعِدَّةُ الآيسة مِنَ المحيض وَمِثلَهَا لاتحِيضُ فلاَ عِدَّةَ عَلَيهَا عند أكثر أصحابنا (التبيان للطوسى).

٩- حَدُّ الآيسة مِنَ المحيض (٥٠) خمسون سنة (التبيان للطوسى).

١٠- وَلا يشترط الشاهدان في النكاح الدائم مطلقاً وَلاَ الولي في نكاحِ الرشيدةِ.

١٠٢٧ – وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {لَعَنَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) اَلْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالنَّسَائِيُّ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

{صحيح، المشكاة: ٣٢٩٦. الصحيح المسنَدُ: ٨٥٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەعنەتو نەفرینی کردووە لەجاش (موحەللیل)و لەو پیاوەیش کەژنی خۆی بە مارەبەجاش چاك دەکاتەوە!. {تاج/٢، زنجیره: ٦١، ژماره: ٢٢١٤}.

١٠٢٨ – وَفِي اَلْبَابِ: عَنْ عَلِيّ أَخْرَجَهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ.

{صحيح أبى داود: ١٨٢٧}:

لە ئیمامی عەلییەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) هەمان فەرموودە ڕیوایەت کراوە.

١٠٢٩ – وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): { لَا يَنْكِحُ اَلزَّانِي اَلْمَجْلُودُ إِلَّا مِثْلَهُ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح الجامع: ٧٨٠٨. الصحيح المسند: ١٤٣١}:

**ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کەسـێ لەسـەر داوێنپیـسی، داری حـەددی لێ بدرێ، نابـێ ژنـی داوێـن پـاك بهێنـێ، ئەگـەر بیـەوێ ژن بهێنـێ، دەبـێ ژنێکـی داوێن پیسی وەك خۆی بهێنـێ!). ئەحمـەد گێڕاویەتـەوە، هـەروا ئـەبو داوود. پیاوانی رشتەکەی جێگەی متمانەن.**

**(روونکردنەوە):**

**١-واتە: داوێنپیس نابێ ژنـی داوێنپـاك بهێنـێ، دەبـێ ئەگـەر ویـستی ژن بهێنێ ژنێ بهێنێ کە بەپێی یاسانامە چەسپا بێ کە داوێنپیسە.**

**٢- پیاوی داوێنپـیس، ئەگـەر بەشـەرع چەسـپا داوێنپیـسە، مـارەیی ژنـی داوێنپاکی لێ نایەت، هەروا بەپێچەوانەوە، بەڵام هەرکاتێ بەڕاستی تەوبە بکا، دروستە ژنی داوێنپاکی لێ مارە بکرێو پێی بدرێو ژنـی داوێنپـاك شـووی پـێ بکـا، وە بەپێـچەوانەشەوە، هـەرکاتێ ژنـی داوێنپـیس تەوبـەی بەڕاسـتی کـرد، مارەی لەداوێنپاك دێ.**

١٠٣٠- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: {طَلَّقَ رَجُـلٌ اِمْرَأَتَـهُ ثَلَاثًـا، فَتَزَوَّجَهَا رَجُلٌ، ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْـلَ أَنْ يَـدْخُلَ بِهَـا، فَـأَرَادَ زَوْجُهَـا الْأَوَّلُ أَنْ يَتزَوَّجَهَـا، فَسُئِلَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: "لَا. حَتَّـى يَـذُوقَ اَلْـآخَرُ مِنْ عُسَيْلَتِهَا مَا ذَاقَ اَلْأَوَّلُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمـارە: ١٧٨٩ = بوخـاری/٥٢٦٠، ٢٦٣٩، ٥٢٦١، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمـارە: ٨٥٢ = شیحا ٣٥١٢ + ٣٥١٧. ترمذی. نکاح: ١١١٨. تحفة الأشراف/١٦٤٣٦}:

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: پیاوێ سێ تەڵاقەی ژنەکەی خۆی دابـوو، لـەپاش ئـەو پیـاوێ تـر مـارەی کـرد، بەرلەوە پیاوی دووەم بیگوێزەتەوەو بـچێتە لای تـەڵاقی دا، پیـاوی یەکـەم کـە**

مێـردی پێـشینی بـوو، ویـستی مـارەی بکاتـەوە بـۆ خـۆی، جـا سـەبارەت بـەم بابەتـە، لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) پرسـیار کـرا، فـەرمووی: (شتی وا نابێ، هەتا مێردی دووەمیشی وەك مێـردی یەکـەمی، چێژ لەخۆشـی جووتبوون لەگەڵیدا نەچێژێ)).

(ڕوونکردنەوە):

پوختەی بڕیارەکانی ژن هێنانو شووکردن

١- هانـدان لەسـەر ژن هێنـانو شـووکردن، کەشـتی وا لـە سـوننەتی پێغەمبەرانو هاوسەرەکانیانە.

٢- هاوسەری باش، چ ژن بێ، چ پیاو بێ، باشترین بەهرەی جیهانە.

٣- کارێکی پەسەندە، کە ژن، یا هەقداری ژن، داوا لەپیاوی باش بکا، کە کچی خۆی، یا خوشکی خۆی پێ بدا، یان ژن داوای لێ بکا کە شووی پـێ بکـا، وەك پێغەمبەر شوعەیب داوای لە پێغەمبەر مووسا کرد کە کچەکەی بـداتێو ئەویش قەبووڵی کرد.

٤- هاوسەری بەدین زۆر پەسەندە.

٥- هێنانی کچ، یا شووکردن بەکوڕ پەسەندە.

٦- خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە.

٧- تەماشـاکردنی هاوسـەر، بـۆ ژن بـۆ پیـاو، لـەپێش گرێـدانی هاوسـەریدا سوننەتە. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٠٠}.

٨- هاوسەریی دەبێ، بەڕەزامەندیی هەموولایەك بێ.

٩- چۆن چۆنی ژن بەژن دروستە، وە ژن بەژن چییەو چۆنە. {بڕوانـە: ژمارە: ١٠١٤}.

١٠- سـیغە (هاووسـەرێتی کـاتی) دروسـت نییـە،وە چـیـەو چـی نییـە. {بڕوانە ژمارە: ١٠٢٤و ١٠٢٥و ١٠٢٦}.

١١- ژن هێنـــانو ژن بەشـــوودانو شـــووكردن لـــەكاتی ئیحرامـــی حـــەجو عەمرەدا {بڕوانە: ١٠١٩}.

١٢- ئەو ژنانەی كە دروست نییە بەیەكەوە ژنی یەك پیاو بن، وەك دوو خوشك، پوورو خوشكەزا، یا پوورو برازا {بڕوانە: ژمارە: ١٠١٨}.

١٣- بڕیاری مارەیی، چەندە، چی دەبێ، مـارەیی بەشێكی زۆر گرنگە لـە ژن هێنان. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٠٥و ١٠٠٦}.

١٤- لەهـەموو كـاتو سـاتێكا دروسـت كردنـی هاوسـەری دروسـتە، لـەم ڕووەوە، جیـــاوازی لـــەنێوانی ڕۆژو هەفتـــەو مانگەكانـــدا نییـــە، لەگـــەڵ ڕەچاوكردنی خاڵی ژمارە (١١) لەم ڕوونكردنەوەدا.

١٥- شـــایی كـــردنو نـــانی شـــایی، بەبۆنـــەی زەماوەنـــدەوە، ســـوننەتە، قەبوولكردنی خوڵكو دەعوەت بۆسەر شاییو بۆنـەی خـۆشو ڕەوا، سوننەتە، بەڵكوو لەهەندێ كاتدا پێویستە بەمەرجی خۆی، كە بێ شەرعی لێ نەبێ.

١٦- گوتەی تایبەتی كاتی دروست بوونو جووتبوون بۆ هەردوولا.

١٧- سەرپێچی لەداوای مێـرد بـۆ كـاری سـەرجێی كـارێ ناڕەوایـە، هـەروا پـــشتگوێ خـــستنی ئـــارەزووی ژن، لەلایـــەن مێـــرددەوە، لـــەم لایەنـــەوە كـــارێ نابەجایە.

١٨- پۆشینی رازو نهێنی نێوانی ژنو مێرد فەرزو پێویستە.

١٩- هـەوڵی پێـشگیریی لەدروسـتبوونی منـاڵ، بەمـەرجی خـۆی حـەرام نییە، بەمەرجێ لەژێر چاودێری زانایاندا بێ.

٢٠- شـــفتەژێو چـــوونە لای ژنـــی منـــاڵ بـــە بـــەر دروســـتە لەلایـــەن مێردەكەیەوە، بەڵام وا باشە دووربینی بكرێ.

٢١- ژنی مێردپەروەرو سكوزاكەر زۆر پەسەندە.

٢٢- نزای كاتی ژن هێنانو شوو كردن {بڕوانە: ژمارە: ٩٩٨}.

٢٣- وتاری خوازبێنیو شتی وا {بڕوانە: ژمارە: ٩٩٩}.

٢٤- بەبێ هەقداری ژن، ژن مارەی نایەت.

٢٥- بەهیچ شێوەیێ، نە بە ئەصالەت، نە بەوەکالەت، ژن بۆی نییە، کە دەوری گرێدانی هاوسەری ببینێ، یا هاوسەری بۆ خۆی، یا بۆ کەسی تر قەبووڵ بکا. ئەوە یا ئەرکی مێردە، یا ئەرکی وەکیلیەتی، کە نێرینە بێ، یا ئەرکی هەقدارە، یا ئەرکی وەکیلیەتی بەمەرجێ نێرینە بێ.

٢٦- ژن هەتا حەیەی هەڵ نەیێ، لەکەسێ تر مارەیی نایێ، حەیە واتە: عیددە، حەیەیش جۆری زۆرە، هی مردنە، هی تەڵاقە، هی شتی ترە.

٢٧- ئایا گرێبەندی ژن مارە کردن، کەئێستا لە دادگا فەرمییەکان ئەنجام دەدرێ، بۆ حەڵاڵ بوونی ژنو پیاوەکە بەسە یانا؟ وەچی بکرێ باشە؟.

وەڵام: لەلای جەماوەری زانایانو شەرعزانەکان، هەقدار، یا وەکیلی هەقدار، بۆ گرێدانو عەقدی نیکاح روکنو مەرجە، بەبێ ئامادەبوونی ئەو، یا وەکیلی ئەو، گرێدانی هاوسەری عەقدی نیکاح دانامەزرێو پووچە، گەرچی لەلای پێشەوا ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) ژن دەتوانێ خۆی سەربەخۆ گرێبەندو عەقدی نیکاح دابمەزرێنێ.

جا کورتو پوخت: (ئەوە شەرعی ترو ڕەواترە کە مارە بڕینەکە بەسەرپەرشتی مامۆستایەکی ئایینی ئەنجام بدرێ، بۆ ئەوەی لەهەموو ڕوویەکەوە بێ گەردو دامەزراوو بێ کێشەو بەرە بێ!)

ئەوەندە هەیە وەك لەخەڵکی راستو راستاڵو راستگۆ دەبیستین: گرێدانی مارەبڕینی دادگا، لە زۆر ڕووەوە کەموکورتی شەرعی هەیە، تەنانەت زۆر لەقازییەکان، نووسراوی فەرمی دەدەن بەژنو مێردەکە کە بچن لەلای مامۆستایەکی ئایینیو لەلای مەلایێ، گرێبەندێکی شەرعی ئەنجام بدەن، وە ئەمەیش کەقازییە بەڕێزەکان دەیکەن لەدوو سەرەوە باشە:

یەکەم: گەردنی خۆیان ئازاد دەکەن، لەئۆباڵی کەموکوڕی گرێبەندی

دووەم: ژن‌و مێردەکـەیش ئاسـوودەیی دەروونـی‌و ئـایینی دەردەسـت دەکەن‌و لەکاری گوماناوی ڕزگار دەکەن.

## ٦٠- باسی هاوکوفی‌و سەرپشکی
## باب: الكَفَاءَةِ وَالخِيَارِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول بە کوردی، بـەرگی دووەم، لاپـەڕە/٤٧٢ چـاپی چوارەم زنجیرە: ٢٧، لە ژمارە: ٢٠٦٦وە هەتا ژمارە: ٢٠٦٨ + فیقهی ئاسان/بەرگی دووەم. زنجیرە: ٢٢٤}.

١٠٣١- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {اَلْعَرَبُ بَعْضُهُمْ أَكْفَاءُ بَعْضٍ، وَالْمَـوَالِي بَعْـضُهُمْ أَكْفَـاءُ بَعْـضٍ ، إِلَّـا حَائِكاً أَوْ حَجَّاماً} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ ، وَفِي إِسْنَادِهِ رَاوٍ لَمْ يُسَمَّ ، وَاسْتَنْكَرَهُ أَبُو حَاتِمٍ.

{بيهقـي: رقـم: ١٣٥٤٨. الـديلمي٣/٨٩ رقـم/٤٢٤٩. مَوْضُـوعٌ، الإرواء: ٦/٢٦٨. التمهيد لأبن عبدالبر/١٩/١٦٥ وقال: حديث منكر موضوع}:

ئەم فەرمووده گەرچی لەدانراو ودەست هەڵبەست دەچێ، بـەڵام بـەپێی دوو لێکدانەوە بۆ واتاو مەبەست لە (الموالی) واتای دەکەین:

یەکـەم: ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (عـەرەب لـەناو خۆیانـا، هاوتـاو هاوکوف‌و یەکترین‌و نابن بەهاوتاو هاوکوفی کۆیلە ئازاد کراوەکان!

ئەوەنـدە هەیـە کـچی جـۆڵای عـەرەب، یـا کـچی کەڵەشـاخگری عـەرەب، هاوشان‌و هـاوکوفی عەرەبـەکانی تـر نـین، کـە پیـشەو کاروبـاری تریـان هەیـە، هەروا کچی جۆڵای ناعەرەب‌و کچی کەڵەشاخگری ناعەرەب).

دووەم: ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گـەلی عـەرەب لـەناو خۆیانـا، هاوتـاو

هـــاوكوفی‌و هاوشـــانی یـــەکترین‌و بەپلـــەیێ بـــاڵاترن لەگەڵـــە موســـوڵمانە ناعەرەبەکان!)

هەروا گەلە موسوڵمانە ناعەرەبەکانیش، کەبریتین لەگەلە عەجەمە موسوڵمانەکان، لەناو خۆیانا هاوکوف‌و هاوشانی یەکترین‌و بەپلەیێ وان لەخوار گەلی عەرەبەوە!

بەڵام جۆلاو کەڵەشاخگر، هاوشانی غەیری خۆیان نین‌و بەپلەیێ لەخوار چینەکانی تری کۆمەڵگای خۆیانن!

(ڕوونکردنەوە):

١- لەپەڕاوی (شرح الوقایه). دانراوی علی القاری دەڵێ: (...وقَـالَ صَـدْرُ الإسْلاَمِ فِي (مَبْسُوطَهَ): وَالمَولِي وَهُمُ العَجَمُ لَيْسُوا بِأكْفَاءِ لِلْعَرَبِ، وَإِنَّمَا كانُوا: يعنى العَرَبَ – أَفْضَلَ مِنَ العَجَمِ لِمَكانِ رسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلم).

٢- قال فى (فَتْحِ ذِى الجَلاَلِ والإكْرَامِ): (... المَوَلِي مَنْ هُـمْ؟ الَّـذِينَ أُعْتِقُـوا، جَمْعُ مَوْلَى وَهُوَ العَتيقَ، وَالمَوْلَى كُفءٌ لِلْمَوْلَى، ڤَالعَرَبِيُّ كُفءٌ لِلْعَرَبِي...).

٣- گەرچی گومانم نییە لەوەدا، کە ئەم جۆرە بەیت‌و بالۆرانە کەبۆنی ڕەگەزپەرستی‌و شانازی‌و نازکردنی لێ دێ، بەئێسك‌و پروسکی باوباپیرانەوە، دورترین گوتەن لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە، وە ئەوەندە کاڵ‌و کرچن، بۆنی زێرابیان لێ دێ، خوا دەفەرموێ: {إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنـدَ اللَّـهِ أَتْقَـاكُمْ} . واتە: بەڕێزترین کەستان لای خودا، ئەوەتانە کەباشتر لەخوا دەترسێ‌و زیاتر ڕێزی شەریعەتی خودا دەگرێ!

بەڵام لەگەڵ ئەمەیشا ئەمەی دواوە، ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە: (هاوشانی لەنێوانی ژن‌و مێرددا، لە ڕووی کۆمەڵایەتی‌و دەروونییەوە، ئەگەر مەرجی ئاینیش نەبێ، مەرجێکی شارستانییەو، بەبێ ئەوەی کەبنەمایەکی

ئاینی پێ لەکەدار ببێ، سودێکی ئاشکرای بۆ ژنو مێردو منداڵیانو کۆمەڵگایان هەیە، لەم لایەنەوە دەبێ ئەم جۆرە هاوشانییە رەچاوبکرێ!).

بەتایبەتی دەبێ ژنو پیاو لەکاتی هاوسەرگیریدا ئەم خاڵانە بە گرنگ بگرن، هەتا دوو هاوسەری کامەران بن:

١- تەمەن.

٢- پلەی خوێندەواریو بێ سەوادی.

٣- خانەدانیو ناخانەدانی.

٤- دەوڵەمەندیو هەژاری.

٥- پلەوپایەی کۆمەڵایەتی.

٦- ئایین چونکە ئەگەر کچێکی موسوڵمانی لەخوا ترس، شوو بکا بەکوڕێکی موسوڵمانی ئارەقخۆری سەماکار، بێگومان کەژیانیان دەبێ بەدۆزەخ، وە بەپێچەوانەیشەوە هەروا.

پاش ئەمەیش دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: حاکم گێڕاویەتەوە، بەڵام لاوازە، چونکە پیاوێ لەپیاوانی ڕشتەکەی ناو نەبراوەو نەناسراوە، ئەبو حاتەمیش بە فەرموودەیەکی مونکەری داناوە... لەسەرچاوەکانیشدا ئاماژە کراوە بۆ ئەوە: کە ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی ساختەیەو درۆیەو دەست هەڵبەستە.

١٠٣٢ – وَلَهُ شَاهِدٌ عِنْدَ اَلْبَزَّارِ : عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ بِسَنَدٍ مُنْقَطِعٍ.

{قال الألباني – رحمه الله تعالى – وهذا سند ضعيف منقطع، الإرواء: ٦/٢٧٠}:

موعاذی کوڕی جەبەل (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (عەرەب لەناو خۆیانا هاوشانی یەکترینو عەجەمیش لەناو خۆیانا هاوشانی یەکترین).

دانەر دەفەرموێ: ئەم شاهیدەیش هەر لاوازە چونکە إنقطاعو پچڕان وا لەڕشتەکەیدا.

١٠٣٣- وَعَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ " أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لَهَا: {اِنْكِحِي أُسَامَةَ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٢. ژمارە: ٨٦٠و ٨٦١و ٨٦٢ = شیحا ٣٧٠٢و ٣٦٨٦و ٣٦٩٦ = صحيح مسلم ١٤٨٠}:

ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحيح مسلم)دا، ئاوایە:

فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مێردەکەم سێ تەڵاقەی دام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفەقەو ژیوارو نیشتەجێی شەرعی، لەماوەی عیددەدا بۆم دانەنا، وە فەرمووی پێم: (هەرکاتێ حەیەت هەڵهات، واتە: عیددەکەت تەواو بوو ئاگادارم بکەرەوە!).

منیش وامکرد، وەعەرزیمکرد: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (کە قوڕەیشییە)و ئەبو جەهم (کە قوڕەیشییە)و ئوسامەی کوڕی زەید (کە کۆیلەی ئازاد کراوە) خوازبێنیم دەکەن (دیارە کە فاطیمە خۆشی لەخانەدانەکانی قوڕەیشە) جا ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ فەرمانت بەچییە؟

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەرچی موعاوییەیە بۆرە پیاوو بێ ماڵە، هەرچی ئەبو جەهمیشە لێدەرە، لەژن زۆر دەدا، شووبکە بە ئوسامەی کوڕی زەید). منیش بەدەستم ئاوامکردو تێیم گەیاند کە حەزم لە ئوسامە نییە، چونکە هەم ڕەشەو هەم کۆنە نۆکەرەو کۆیلەی ئازاد کراوە.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (بەگوێی خوداو بەگوێی پێغەمبەری خودا بکەی، ئەوە بۆ تۆ باشترە، کەواتە: شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید).

ئیتر لەسەر ڕاوێژو ئاماژەکەی پێغەمبەر، شوومکرد بە ئوسامەو، ئەوەتانێ خودا کردی بەمایەی خۆشیو شادیو سەربەزی بۆمو ژنان خۆزگەم

پێ دەخوازن. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٢ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- بەپێی ئەم فەرموودەیە کە لەصەحیحی موسلیمدایە، هاوشانی بەس لە ئاییندا دەبێ ڕەچاوبکرێ، هەروەك فەرموودەی دواوەیش کە ژمارەکەی (١٠٣٤)ە، هەمان شت دووپات دەکاتەوە، کە سەبارەت بەبابەتی هاوشانیو هاوکوفی، بەس ئایین بایەخدارەو بەس.

٢- فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) لەخانەدانەکانی قوڕەیشە، لەعەرەبە ڕەسەنەکانە، خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیسە کە والی یەزیدی کوڕی موعاویە بوو لەسەر عێراق، فاطیمە لەکۆچکارە پێشینەکانە، ئافرەتێکی هۆشمەندی شۆخو شەنگ بوو، دە ساڵ لە ضەحاکی برای گەورەترە، لەماڵی فاطیمە ئەهلی شوورا، لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عومەر کۆبوونەوە، بۆ هەڵبژاردنی جێنشینی ئایندە، لەپاش تەڵاقدانی شووی کرد بە ئوسامەی کوڕی زەید {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم بەرگی یەکەم، ژمارە: ٧} + {مختصر صحیح مسلم بەرگی دووەم ژمارە: ٨٦٠}.

١٠٣٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {يَا بَنِي بَيَاضَةَ، أَنْكِحُوا أَبَا هِنْدٍ، وَانْكِحُوا إِلَيْهِ" وَكَانَ حَجَّامًا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالْحَاكِمُ بِسَنَدٍ جَيِّدٍ.

{حسن، صحيح الجامع: ٧٨٩٦. الصحيح المسند/١٣٦٨}:

لە تاجا ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو هیند کەناوی یەسار بوو، وەکۆیلەی ئازادکراوی خێڵی بەنی بەیاضە بوو، وە پیشەی کەڵەشاخگرتن بوو، جارێ کەڵەشاخی لەفریشکی پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) گرت، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەی خێڵی بەنی بەیاضە! ژن بدەن بە ئەبو هیند، ئەگەر داخوازی ژنی لێ کردن‌و ژنیشی لێ بخوازن‌و مەڵێن: ئێمە چۆن ببین بە هاوشانی بەندەو کۆنە کۆیلەیەکی کەڵەشاخگر!.)

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: ئەم شتانەی کەئێوە تیمارو دەرمانی نەخۆشیان پێ دەکەن، یەکێ لەباش‌و چاکەکانیان کەڵەشاخگرتنە!.

١٠٣٥- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ : {خُيِّرَتْ بَرِيرَةُ عَلَى زَوْجِهَا حِينَ عَتَقَتْ}. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ. وَلِمُسْلِمٍ عَنْهَا: {أَنَّ زَوْجَهَا كَانَ عَبْدًا}. وَفِي رِوَايَةٍ عَنْهَا: {كَانَ حُرًّا}. وَالْأَوَّلُ أَثْبَتُ. وَصَحَّ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عِنْدَ اَلْبُخَارِيِّ " أَنَّهُ كَانَ عَبْدًا.

{تجريدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠، ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٩٦ = ٣٧٥٨ شيحا = ١٥٠٤ صحيح مسلم. أبو داود. فرائض: ٢٩١٥. نسائی. بيوع: ٤٦٥٨. تحفة الأشراف/٨٣٣٤}:

لە مختصری صحيحی موسليما ئاوایە: (ژمارە: ٨٩٦):

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەریرە هات بۆ لام، گوتی: خاوەنەکانم نامەنووسی (موکاتەبە)یان لەگەڵدا کردووم لەسەر نۆ ئۆقیە، بۆ ماوەی نۆ ساڵ کە هەر ساڵەی ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆلای تۆ کە تۆیش یارمەتیم بدەیت، هەتا زوو ڕزگارم ببێ لەم کۆیلەییە، وە عائیشە فەرمووی: وە ئەوکاتە هیچ پشکێکی لەنامەنووسینەکەی جێبەجێ نەکرد بوو!!

منیش پێیم گوت: بڕۆ بەئاغاکانت بڵێ: ئەگەر ئەوان ئارەزوو دەکەن‌و ڕازی دەبن، ئەوا من ئەم پارەیان هەموو بەسەر یەکەوە بەیەکجار بەنەختی بۆ دەژمێرم‌و یەکسەر ئازادت دەکەم، بەلاّم بەمەرجێ کە سەرداریی (ولآء =

هەقداریی)یەکەت بۆ من بێو من ببم بەهەقدارت، جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاکانی، بەڵام ئاغاکانی بەوە ڕازی نابن‌و دەڵێن: سەرداریی‌و هەقداریی هی خۆمانەو نایدەین بەکەسی تر، جا دیسانەوە بەریرە هاتەوە بۆلام‌و ئەم باس‌و خواسەی بۆم گێڕایەوە، منیش پیاهەڵشاخام، ئەویش گوتی: سوێندم بەخودا هەر ئەوەیە کە عەرزم کردی، عائیشە فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بیست‌و لەمنی پرسی، منیش باسەکەم عەرزی کرد، فەرمووی پێم: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکەو مەرجیش دابنێ کە سەرداری‌و (وەلاء) بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە بایەخی نییە، چونکە لەڕاستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). منیش وامکرد: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرلەئێواری، هەڵسایەوەو وتارێکی دا، سوپاس‌و ستایشێ کەشایستەی خودا بێ کردی‌و ئەوجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە، ئەوە بۆچی هەندێ کەس دەچێ مەرجی وا بەمەرج دەگرێ، کە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، دەی هەرکەسێ مەرجی وا بەمەرج بگرێ، لەکاتی سەوداو مامەڵەو کردنی کارێکا، ئەوە پووچ‌و بەتاڵە، ئەو جۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی).

ئەگەر سەد مەرجیش بێ هەموویان پووچ‌و بێ بایەخن نامەی خودا لەپێشترە، مەرجی خودا پتەوترە، ئەوە بۆ هەندێ پیاو لەئێوە دەڵێن: ئێمە فیسارەکەسی کۆیلە ئازاد دەکەین، بەمەرجێ کە سەرداریيەکەی بۆ خۆمان بێ، بەبی چەندو چوون سەرداری هی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئۆقیەی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل درەمی زیوە.

٢- بەریرە لەپێشا خزمەتی عائیشەی دەکرد، دوای عائیشە کڕیو ئازادی کرد، زۆر دڵسۆزی عائیشە بوو هەتا مرد. عەینی دەفەرموێ: بەریرە بەڕەگەز نەبەطی، یا قیبطی بووە. بەریرە (رەزای خودای لێ بێ) هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو، بەریرە ئەو بەریرەیە کە لە فەرموودەی ئیفکا، ناوی هاتووەو لەسەر ڕاوێژی ئیمامی عەلی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسی پێ دەکاو پێی دەفەرموێ: (ئەی بەریرە! هیچت لە عائیشە دیوە، کە جێگەی گومان بێ؟).

٣- وەلاء، یاسەرداریی، یاهەقداریی، لەزاراوی شەرعو یاسانامەی خودای گەورەدا، باوانییەکە، کە هۆکەی نەمانی خاوەنییە، لەکۆیلەدا، بەهۆی ئازاد بوونەوە.

بەنموونە: ئەگەر کەسێ بەهەر هۆیێ، کەسێ ئازاد بکا، وە ئازاد کراوەکە بمرێ، وە میراتبەری خزمی نەبێ، ئەوە ئازاد کەرەکەی کەلەپوورەکەی دەبا، ئەگەر ئازاد کراوەکەی مێینە بوو، لەکاتی شوو کردنیدا، ئازادکەرەکەی دەبێ بەهەقداریو ئەو مارەی دەبڕێ لەشووەکەی، یا ئەگەر ئازادکراو بمرێ ئازادکەرەکەی نوێژی لەسەر دەکا، وەکۆمەڵێ مافی تر، کە بەپێی شەرع بۆ ئازادکارو ئازادکراو دەچەسپێ.

٤- دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژە بۆ ئەم گێڕانەوەی تر دەکا:

یەکەم: عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ بەریرە ئازادکرا ژنی موغیث بوو، کە کۆیلەی خانەوادەی ئەبو ئەحمەد بوو {مسلم/شیحا: ٣٧٦٤ = تاج/٢، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٢٤٠}.

دووەم: ئەم دووەمەیان لە (مختصر صحیح مسلم)دا ئاوایە:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەهۆی بەریرەوە سێ پرسی شەرعی روونکرانەوە:

١- مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ بەریرە ئازاد بوو، خۆی کرد بە سەرپشك، کەیان وەك جاران کەخۆشی کەنیز (ئەمەتە: کۆیلە) بوو، هێشتا ئازاد نەکرا بوو، بەلای مێردەکەیەوە دانیشێت، یان هەر لەئێستاوە دەستی لێ هەڵبگرێتو لەپاش ئازاد بوون خۆی هەڵبژێرێو شووەکەی هەڵوەشێنێتەوە.

٢- گەلێ جار خەڵك خێریان بۆ دەهێنا، وە ئەویش لەپاش ئەوەی کە وەری دەگرت، بەدیاری دەیهێنا بۆ ئێمە، جا منیش ئەمەم عەرزی پێغەمبەر کرد، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەڵام لەوەوە بۆ ئێوە دەبی بەدیاریی کەواتە: بیخۆن قەیناکا، وەك ئەوە جارێ گۆشتیان بەدیاری هێنابوو بۆ بەریرە، کە ئەوکاتە کارەکەری من بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ لام، دیزەکە بەسەر ئاگرەکەوە بوو، گۆشتەکەی بەریرەی تیادا دەکوڵا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای خواردەمەنی کرد، نانو پێخۆریان لەهی ماڵەوە بۆ هێنا، ئەویش فەرمووی: دیزەیەکم بینی لەسەر ئاگرەکە دەکوڵا گۆشتی تیا بوو، ئەی بۆچی لەوەتان بۆم نەهێنا؟).

عەرزیانکرد: بەڵێ وایە، ئەی پیغەمبەری خودا! ئەو گۆشتە بەخێر دراوە بە بەریرە، لەبەر ئەوە حەزمان نەکرد کە تۆ لێی بخۆیت، چونکە تۆ زەکاتو شتی وا ناخۆیت، فەرمووی: (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەڵام لەوەوە بۆ ئێمە دەبی بەدیاریو لەبەر ئەوە دروستە کەمنیش لێی بخۆمو لەزەکاتی دەرچووە!)

٣- خاوەنەکانی بەریرە ویستیان کە بیفرۆشن، بەڵام بەمەرجێ کە هەقدارییەکەی بۆ خۆیان بێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەقداریی (وەلاء) هینی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەدا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩ ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩ + تاج/٢،

زنجیره: ٦٦، ژماره: ٢٢٣٩ ج/٤ = چاپی چوارەم} + {مختصر صحیح مسلم/٢، ژماره: ٨٩٧ = شیحا ٣٧٦٥}.

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (٣٧٦٥)ە، بەڵام گێڕانەوەیەکی تری موسلیم بۆ ئەم فەرموودەیە کە (شیحا ژمارە: ٣٧٦٢)وە، بڕگەی (١) ئاوایە:

١- مێردەکەی بەریرە ئازاد (حورر) بوو.....

بۆیە دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: گێڕانەوەی یەکەم، کەمێردەکەی کۆیلە بوو، ئەوە خۆگرترو چەسپاوترە.

سێیەم: ئەمەیش دەقی گێڕانەوەی سێیەمە، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا، لە (تجریدی بوخاریدا = مختصر صحیح البخاری، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٧٩٢ = ٥٢٨٢، ٥٢٨٠، ٥٢٨٢ بوخاری) ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، ناوی موغیث بوو، کاتێ بەریرە ئازاد بوو، خۆی هەڵگرتەوەو نیکاحو هاوسەریی خۆیی لەموغیثی مێردی هەڵوەشاندەوە، جا بەم بۆنەیەوە موغیث شوێن بەریرە کەوتبوو، دەگریاو لێی دەپاڕایەوە کە نیکاحەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە، فرمێسکی هۆن هۆن بەسەر ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (ئەی ئیبنو عەبباس! سەرسام نابی لە خۆشەویستی موغیث بۆ بەریرەو لەڕقو تووڕەییو بێزاری بەریرە لە موغیث؟!)

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە بەریرەی فەرموو: (بۆچی ناچیتەوە بۆلای موغیث؟) بەریرە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە فەرمانەو پێم دەکەیت، دیارە کە فەرمانی تۆ دەبێ جێبەجێ بکرێ، یان فەرمان نییەو شتی ترە؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (نا، ئەمە فەرمان نییە، بەڵکوو تکایەو بۆی دەکەم لەلای تۆ، زۆری تیا نییە).

بەریرە گوتی: کەواتە کارم پێی نییەو تازە ژنێتی ئەوم قەبووڵ نییە. {بڕوانە: تجریدی ژمارە: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠ فەتح + تاج/٣، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩}.

١٠٣٦- وَعَنِ اَلضَّحَّاكِ بْنِ فَيْرُوزَ الدَّيْلَمِيِّ ، عَنْ أَبِيهِ (رضی الله عنه) قَالَ: {قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): " طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ ، وَاَلدَّارَقُطْنِيُّ ، وَالْبَيْهَقِيُّ، وَأَعَلَّهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{المسند/٤/٢٣٢. أبوداود/٢٢٤٣. ترمذی/١١٢٤. ابن ماجة/١٩٥١. ابن حبان ٤/٥٥. دارقطنی/٣/٢٧٣. بیهقی/٧/١٨٤. حسن، صحيح ابن ماجة/١٥٨٧}:

لە تاجا ئاوایە: ضەحاکی کوڕی فەیرۆزی دەیلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیمکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! من موسوڵمان بووم‌و دوو ژنم هەن، هەردووکیان خوشکن، هەردووکیانیش لەگەڵما موسوڵمان بوون؟ جا فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبژێرەو ئەوی تریان بەرەڵڵا بکە) (تەرمەزی – سەنەدی حەسەن – ئەبو داوود) گفتەی ئەبو داوود: (خۆت سەرپشك بە یەکێکیان تەڵاق بدە). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٢٢٦٠}.

دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو حەیببان‌و دارەقوطنی‌و بەیهەقی بەتەندروستیان داناوە، بەڵام بوخاری دەڵێ مەعلوولە.

١٠٣٧- وَعَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، {أَنَّ غَيْلَانَ بْنَ سَلَمَةَ أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ ، فَأَسْلَمْنَ مَعَهُ ، فَأَمَرَهُ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ يَتَخَيَّرَ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا} رَوَاهُ

أَحْمَدُ ، وَالتِّرْمِذِيُّ ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ ، وَالْحَاكِمُ ، وَأَعَلَّهُ اَلْبُخَارِيُّ ، وَأَبُو زُرْعَةَ، وَأَبُو حَاتِمٍ.

{أحمد/٢/١٣. ترمذي/١١٢٨. ابن ماجة/١٩٥٣. ابن حبان/٤١٥٧. حاكم/٢/٢٠٩ صحيح، المشكاة: ٣١٧٦. الصحيح المسند/٧٥٣}:

**سالمی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (ڕەزای خودا لە هەرسێكیان بێ) فەرمووی: باوكم عەبدوڵڵای كوڕی عومەر فەرمووی: غەیلانی كوڕی سەلەمەی تەقەفی، لەسەردەمی نەزانیدا، دە ژنی هەبوو، كە خۆشی ئیسلام بوو، ئەوانیش هەردەیان لەگەڵیان ئیسلام بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كرد كە چوار ژنیان لێ هەڵبژێرێو ئەوانی تریان بەرەڵلا بكات. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٢٢٦٢}.**

**(ڕوونكردنەوە):**

**١- ضەحاكی كوڕی فیروزی دەیلەمی، تابیعیيە، لە باوكیەوە گێڕانەوەی زۆرە، جێگەی متمانەی زۆر لە فەرموودە شوناسەكانە.**

**٢- فیروزی ئەل- دەیلەمی، ناسراوە بە (أبو عبدالله) خوشكەزای نەجاشییە، یەكێكە لە بكوژەكانی (ئەسوەدی عەنەسی) كە لەسەردەمی پێغەمبەردا، خۆی كردبوو بە پێغەمبەرە درۆزنە، لەوڵاتی یەمەن، وەخەڵكێكی زۆری شوێن كەوتبوو، لە (الأبناء) بوو، كە سوپایێ بوون لەڕۆڵەكانی فارس، كیسرا ئەنەوشیرەوان، لەگەڵ سەركردە سەیف كوڕی ذی یزن ناردنی بۆ یەمەن، بۆ جەنگین لەگەڵ حەبەشەدا، ئیتر لە یەمەن جێنشین بوونو لەوی مانەوەو ناونران (الأبناء).**

**ئەم سێ كوڕەی، كەضحاكو عەبدوڵڵا و سەعیدو كەسانی تریش، فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە. لەمیصر نیشتەجێ بوو، لە بەیتولەقدیس، لەسنووری ساڵی (٦٠) شەستی كۆچیدا، بەمەرگی خودا مردووە.**

هەندێ دەڵێن لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا مردووە.

٣- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەططاب، تابیعی‌یە، واتە: لەپەیڕەوانە، کەچینی دووەمی گەلی ئیسلامن، چینی یەکەم هاوەڵانی پێغەمبەرن، چینی دووەم شوێنکەوتوانی ئەوانن، کە ناسراون بە (تابیعین = پەیڕەوان).

دایکی سالم کچی یەزدەجورد بوو، کەپاشای ئێران بووە. ناسراوە بە (أبو عبدالله المدني الفقيه). گێڕانەوەی زۆری ئەنجام داوە، لە عەبدوڵڵای باوکیەوە لە ئەبو هورەیرەوە، لەکەسانی ترەوە، قورئانخوێنێکی جوان بوو، ئیمامی مالیك (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی سالمدا، مانەندی سالم، لەپیاوچاکیو خواناسیو زوهدو بەرێزیدا کەم بوو).

ئیبنو موبارەك دەفەرموێ: (سالم یەکێکە لەحەوت شەرعزانەکانی مەدینە، کە پرسیارێکیان بۆ دەهات هەر حەوتیان لێی دەکۆڵینەوە، قازی مەدینە، ئەگەر پرسیارێکی بۆ حەل نەکرایە، دەینارد بۆ ئەوان، هەتا وەڵامەکەی ئەوانی وەرنەگرتایەتەوە، بڕیاری نەدەدا، سالم سەوداو مامەڵەی بازاڕی دەکرد، هەتا مرد، ئەحمەدو اسحاقی کوڕی ڕاهوەی دەفەرموون: (دروستترین ڕشتە (واتە: أصَحُّ الأسَانِيد): زوهری لەسالمەوە، لەباوکیەوە.

ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سالم بیستن (سەماع)ی لە عائیشەوە نییە. واباوە کە لەمانگی قوربانی ساڵی سەدو شەشی کۆچیدا مردووە، دایکی سالمو دایکی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو دایکی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی، هەرسێکیان خوشك بوونو کچی یەزدەجوردی پاشای ئێران بوون، کە ئاخر پاشای ئێران بووە. لە (٦٥١)ی زاینیدا، لەکاتی ئازاد کردنی خۆراساندا لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە کوژراوە. {بڕوانە: ژمارە: ٦٦٧ کە لەپێشەوە ڕابورد}.

١٠٣٨- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {رَدَّ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اِبْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ اَلرَّبِيعِ، بَعْدَ سِتِّ سِنِينَ بِالنِّكَاحِ اَلْأَوَّلِ، وَلَمْ يُحْدِثْ نِكَاحًا} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ أَحْمَدُ، وَالْحَاكِمُ.

{أحمد/١/٢٦١ رقم: ١٨٧٦، أبو داود/٢٢٤٠، ترمذى/١١٤٣، حاكم/٧٤٠، صحيح سنن الترمذى/١١٤٣}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش شەش ساڵ زەینەبی کچی خۆی، دایەوە بەمێردەکەی، کە ئەبولعاصی کوڕی رەبیع بوو، هەر لەسەر مارەبڕینی یەکەم، وە سەرلەنوی مارەی نەبڕییەوە لێی. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٢٢٦٥ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٣٩- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَدَّ اِبْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ} قَالَ اَلتِّرْمِذِيُّ : حَدِيثُ اِبْنِ عَبَّاسٍ أَجْوَدُ إِسْنَادًا ، وَالْعَمَلُ عَلَى حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ.

{ضعيف الترمذى/١٩٤. ترمذى/١١٤٢، إبن ماجة/٢٠١٠. دارقطنى/٣/٢٥٣}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ زەینەبی کچی خۆی دایەوە بە مێردەکەی کە ئەبولعاصی کوڕی رەبیع بوو، سەرلەنوێ لێی مارە بڕیەوە.

(روونکردنەوە):

زەینەبی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەدینە شووی کرد بە پورزایەکی خۆی کە ناوی ئەبولعاصی کوڕی رەبیع بوو، کوڕی هالەی کچی خووەیلید بوو، کەخوشکی خەدیجەی دایکی زەینەب بوو، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەینەبی کچیشی لەگەڵیا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام ئەبولعاص لە مەدینە مایەوەو

موسوڵمان نەبوو، لەپاش شەش ساڵ ئەبولعاصی مێردی زەینەب موسوڵمان بوو.

جا لەبابەت دانەوەی زەینەب بەمێردەکەی، دوو فەرموودە هەیە، کە فەرموودەی ئیبنو عەبباس و فەرموودەکەی عەمری کوڕی شوعەیبە، لەنێوانی ئەم دوو فەرموودەیەدا جۆرە دژایەتییەك هەیە. دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەم بارەیەوە دەڵێ: تەرمەزی سەبارەت بەم کێشەیە کەوا لەنێوانی ئەم دوو فەرموودەیەدا، دەفەرموێ:

١- لەلایەنی ڕشتەی فەرموودەکەوە، فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس نایابترە.

٢- بەڵام لەڕووی کارپێ کردنەوە، کار بە فەرموودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب دەکرێ. {بڕوانە: ژمارە: ٥٦٦و ٥٧٤ کە ڕابورد}.

١٠٤٠ - وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {أَسْلَمَتْ اِمْرَأَةٌ ، فَتَزَوَّجَتْ ، فَجَاءَ زَوْجُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنِّي كُنْتُ أَسْلَمْتُ، وَعَلِمَتْ بِإِسْلَامِي، فَانْتَزَعَهَا رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) مِنْ زَوْجِهَا اَلْآخَرِ ، وَرَدَّهَا إِلَى زَوْجِهَا اَلْأَوَّلِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَأَبُو دَاوُدَ ، وَابْنُ مَاجَهْ . وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ ، وَالْحَاكِمُ.

{ضعيف أبى داود/٤٩٠. أحمد١/٣٢٣، ژمارە: ٢٠٥٩. أبو داود/٢٢٣٩. ابن ماجة/٢٠٠٨. ابن حبان/٤١٥٩. حاكم٢/٢١٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێ ئیسلام بوو، وەشووی کرد بەکابرایێ، جا مێردە پێشووەکەی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە عەرزیکرد: ئەی پیغەمبەری خودا! منیش ئیسلام بوو بووم، وە ژنەکەیشم دەیزانی کە من ئیسلام بووم، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

ژنەکەی لەمێردی دووەمی سەندەوەو دایەوە بەمێردی یەکەمی. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٢٢٦٤. ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٤١- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: {تَزَوَّجَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) اَلْعَالِيَةَ مِنْ بَنِي غِفَارٍ ، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ وَوَضَعَتْ ثِيَابَهَا، رَأَى بِكَشْحِهَا بَيَاضًا فَقَالَ: النبى صلى الله عليه وسلم " اِلْبَسِي ثِيَابَكِ، وَالْحَقِي بِأَهْلِكِ "، وَأَمَرَ لَهَا بِالصَّدَاقِ} رَوَاهُ اَلْحَاكِمُ، وَفِي إِسْنَادِهِ جَمِيلُ بْنُ زَيْدٍ وَهُوَ مَجْهُولٌ، وَاخْتُلِفَ عَلَيْهِ فِي شَيْخِهِ اِخْتِلَافًا كَثِيرًا. وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ اَلْمُسَيَّبِ " أَنَّ عُمَرَ بْنَ اَلْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً ، فَدَخَلَ بِهَا ، فَوَجَدَهَا بَرْصَاءَ ، أَوْ مَجْنُونَةً ، أَوْ مَجْذُومَةً ، فَلَهَا اَلصَّدَاقُ بِمَسِيسِهِ إِيَّاهَا ، وَهُوَ لَهُ عَلَى مَنْ غَرَّهُ مِنْهَا} أَخْرَجَهُ سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ، وَمَالِكٌ ، وَابْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ. وَرَوَى سَعِيدٌ أَيْضًا: عَنْ عَلِيٍّ نَحْوَهُ ، وَزَادَ: {وَبِهَا قَرَنٌ، فَزَوْجُهَا بِالْخِيَارِ، فَإِنْ مَسَّهَا فَلَهَا اَلْمَهْرُ بِمَا اِسْتَحَلَّ مِنْ فَرْجِهَا} . وَمِنْ طَرِيقِ سَعِيدِ بْنِ اَلْمُسَيَّبِ أَيْضًا قَالَ: {قَضَى بِهِ عُمَرُ فِي اَلْعِنِّينِ، أَنْ يُؤَجَّلَ سَنَةً، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ} .

ئەم ژمارەیە لە ئەصڵەکەدا، کە ئێمە بە بنەڕەتمان داناوە بۆ زنجیرەی ژمارەکان، دەبێ بەم چەند فەرموودەیەوە:

یەکەم: زەیدی کوڕی کەعبی کوڕی عوجرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەخێڵی بەنی غیفار ژنێکی هێنا، ناوی ئەلعالییە بوو، کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چووە ناو پەردەوە بۆی و جلەکەی داناو ژنەکەیشی جلەکەیی داناو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر نوێنەکە دانیشت، سەیری کرد کە قەبرغەی ژنەکە تووشی بەڵەکی بووە، کە دەردێکی ڤیزاوییە، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەنوێنەکە دەکشێتەوەو دەفەرموێ: (جلەکانت بدەرەوە بەخۆتاو بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوانت، لەبەر ئەم

نەنگە مـن تـۆم نـاوێ) وە ئـەو مارەییەیـشی کـە دابـووی پێـی هیـچی لێ نەسـەندەوە. {تـاج/٢، زنجـیرە: ٥٥، ژمـارە: ٢١٨٦ — حـاکم/٣٦/٤. ضـعیف جـداً، الإرواء: ٦/٣٢٦}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) سـەبارەت بـەم گێڕانەوەیـە دەفـەرموێ: حاکم گێڕاویەتەوە، لەپیاوانی ڕشتەکەیدا، جـەمیلی کـوڕی زەیـد نـاوێ هەیـە، نەناسـراوە، لـەبارەی مامۆستاکەیـشییەوە، راجیـایی زۆر هەیـە لەسـەر ئـەم شێوانەی خوارەوە:

آ- لە جەمیلی کوڕی زەیدەوە لە زەیدی کوڕی کەعبەوە.

ب- لەجەمیلی کوڕی زەیدەوە لە کەعبی کوڕی زەیدەوە.

ج- لەجەمیلی کوڕی زەیدەوە لە ئیبنو عومەرەوە.

د- لە جەمیلی کوڕی زەیدەوە لەکەعبی کوڕی عوجرەوە!

دووەم: سەعیدی کوڕی موسەییب (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: عومـەری کـوڕی خـەططـاب (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: (هـەر پیـاوێ ژنێکی مارە کردو بەدەسـتی گرتـوو چووە لایو لەگەڵیـدا جـووت بـوو، دوایـی بۆی دەرکەوت کە بەڵەکە، یان شێتە، یان گولە، بـۆی هەیـە کـە هاوسـەرییەکە هەڵوەشێنێتەوە یان بەتەواوی دای بمزرێنێو بەژنەکە بەو دەردەوە رازی بـێ، جا ئەگەر مارەبڕینەکەی هەڵوەشـاندەوە، ئـەوە ژنەکـە تـەواوی مارەییەکـەیی دەکـەوێ، چـونکە پیاوەکـە چـووەتە لایو جـووت بـووە لەگـەڵیا، بـەڵام مـافی ئەوەی هەیە کە ئەو مارەییە بەو کەسەیە ببژێرێ کە دەستەشکێنی کردووەو تەفرەی داوە).

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بـێ) سـەبارەت بـەم گێڕانەوەیـە دەڵـێ: ئـەم زاتانە ئەم فەرموودەیان دەرهێناوە: سەعیدی کوڕی مەنصوورو مالیكو ئیبنو ئـەبی شـەیبە، پیـاوانی ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـە جێگـەی متمانـەن. بـەڵام

گەرچی پیاوانی ڕشتەکەی جێگەی باوەڕپێکردنو متمانەنن، بەڵام پچڕان لەنێوانی سەعیدی کوڕی موسیبو ئیمامی عومەردا هەیە.

سێیەم: سەعیدی کوڕی مەنصوور (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی لەئیمامی عەلیشەوە گێڕاوەتەوە لەسەر ئەم شێوەیە، کە زیادەیەکی وا تیادا:

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێ ژنێکی مارە کرد بۆ خۆی، ژنەکە بەڵەك بوو، یان شێت بوو، یان گول بوو، یان تات بوو، ئەوە لەپێش ئەوەدا کەبچێتە لای، ئەگەر پێی زانی، ئەوا خۆی سەرپشکە مارەبڕینەکە دابمەزرێنێ، یان هەڵیوەشێنێتەوە، بەڵام ئەگەر پاش جووت بوون لەگەڵیا، بەنەخۆشی ژنەکەی زانیو گرێبەستەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوا بەهۆی ئەم جووت بوونەوە، ژنەکە مارەیی دەکەوێ. {البیهقی/الکبری: ١٤٠٠٧/٢١٥/٧} .

چوارەم: سەعیدی کوڕی موسەییب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ جێنشین بوو، ژنێ هات لەلای سکاڵای کرد، کەمێردەکەی شلەپەتەیە، ناتوانی جووت بوون ئەنجام بدا، عومەریش بڕیاری دا، کە بۆماوەی ساڵێ لەڕۆژی سکاڵای ژنەکەوە، مۆڵەتی پیاوەکە بدرێ، ئەگەر لەو ماوەیەدا پیاوەکە ڕۆیشتە لای ژنەکەی ئەوا باشەو کێشەکە تەواو دەبێ، دەنا ژنەکە خۆی سەرپشکە دەتوانێو بۆی هەیە کە شووکردنەکەی هەڵوەشێنێتەوە. {الموطأ – باب الرجل ینکح المرأة ولایصل إلیها لِعلةِ بالمرأة أو الرجل + صحیح الإرواء: ٣٢٢/٦} .

بۆ ئەم گێڕانەوەیش حافظی عەسقەلانی کەدانەری ئەم پەڕاوە پیرۆزەیە دەفەرموێ: (پیاوانی ڕشتەکەی جێگەی متمانەن).

(ړوونكردنهوه):

١- قەرەن لەكوردیدا پێی دەگوترێ: تات، كە جۆرە دوومەڵێكە بەری شەرمی ئافرەت دەگرێ، واتە: ئێسكێ، یا پارچەیێ گۆشت، لەناو زێی ژنەكەدا هەبێ، ڕێگەی جووت بوون لەگەڵیدا بگرێو پیاو نەتوانێ تێبردن (إیلاج) ئەنجام بدا. {بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم زنجیرە: ٢٦٤ — باسی ئەو نەنگانەی كە دەبن بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین}.

٢- شلەپەتە (واتە: عەنین) ئەویش نەنگێكە لەچووكی پیاودا، چووكی وەك پەتك وایە، ڕەقی تیادا نییە، ناتوانێ لەگەڵ ژن دروست ببێ.

## ٦١- باسی كوزەرانی جوان لەگەڵ ژنان
## بابُ: عِشْرَةِ النِّسَاءِ

١٠٤٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى اِمْرَأَةً فِي دُبُرِهَا} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ، وَلَكِنْ أُعِلَّ بِالْإِرْسَالِ.

{أحمد/٢/٤٤٤ رقم/٩٧٣١. أبو داود رقم/٢١٦٢. نسائي/ الكبرى (٩٠١٥). صحيح الجامع: ٥٨٨٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەفرینو لەعنەت لەو پیاوە بێ كە بەكۆم دەڕواتە لای ژن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٥}. دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: پیاوانی ڕشتەكەی متمانەدارن، بەڵام عیللەتی ئیرسالی واتیادا.

١٠٤٣– وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا يَنْظُرُ اَللَّهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلاً أَوْ اِمْرَأَةً فِي دُبُرِهَا} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَأُعِلَّ بِالْوَقْفِ.

{صحيح الترغيب والترهيب: ٢٤٢٤}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشای ئەو پیاوە ناکا کە بەکۆم (واتە: بەپاش) سواری پیاوێ دەبێ، یان بەکۆم سواری ژنێ دەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٥}. دانەر دەفەرموێ: عیللەتی موقوفی واتیادا.

١٠٤٤- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ اَلْآخِرِ فَلَا يُؤْذِي جَارَهُ ، وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي اَلضِّلَعِ أَعْلَاهُ ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمَهُ كَسَرْتَهُ ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَلِمُسْلِمٍ: {فَإِنْ اِسْتَمْتَعْتَ بِهَا اِسْتَمْتَعْتَ وَبِهَا عِوَجٌ ، وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا}.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٧٢ = ٥١٨٥، ٦٠١٨، ٦٣٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥، ٥١٨٦، ٣٣٣١، ٥١٨٤ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٤ = شیحا ٣٦٣٢ = مسلم/١٤٦٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بەڕاستی باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، کە ئامادەی سەرکارێ بوو، با یا قسەی خێر بکا، یا بێ دەنگ بێ، کە گوڵ نیت، دڕکیش مەبە، کە قسەی خێر نازانی، قسەی شەڕیش مەکە — زیادەی پوختەی موسلیم) وە هەرکەسێ بەڕاستی باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێی خۆی نەدا، ئامۆژگاری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان، چونکە ژنان لەبنەڕەتەوە، لەپەراسووی باوە ئادەم (واتە: باوە حەوا) دروست کراون، چونکە دایە حەوا لەبنەڕەتەوە لەپەراسووی چەپی باوە حەوا (واتە: باوە ئادەم) دروست کراوە، لە لارترین شوێنی پەراسوو، کە نووکەکەیەتی دروست کراوە، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە ڕاست

نابێتەوە بەڵکوو دەشکێ ئەگەر دەستیشی لێ نەدەی ئەوا پەراسووەکە بەلاری دەمێنێتەوەو سوودیشی لێ وەردەگیرێ، کەوابوو ڕاسپێری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان!. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ١٥٨ + ریاض/١، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣}.

لەگێڕانەوەیەکی تری صەحیحی موسلیمدا، کەبەپێی ژمارەبۆدانانی ماموستا شێخ خەلیل مەئموون شیحا، ژمارە: (٣٦٣١)ە، ئاوایە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژن لەپەراسوو دروست کراوەو چەوتییەکەی بەشێکە لەسروشتیو تێکڵاوی خوێنو بیرو هۆشی بووە، جا لەبەر ئەوە هەتا سەر لەسەر یەك بار نامێنێو زوو زوو دەگۆڕێو بەسروشت حول حولییەو لەمەدا هەتا ڕادەیێ مەهانەی هەیە، جا لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر دەتەوێ لەگەڵیا ڕابوێرێ، ئەوا دەبێ بەپێی سروشتەکەی بەلاریو خواری ڕابوێرێ لەگەڵیدا، ئەگینا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە، ئەوسا لەگەڵیدا ژابوێری، ئەوە بەتۆ ڕاست نابێتەوە، بەڵکوو لەدەستتا دەشکێ، شکاندەکەیشی بریتییە لەبەرەڵا کردنیو تەڵاق دانی، ئەویش بەپێچەوانەوەی مەبەستە!).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە، تانەو تەشەر نییە لە ڕەگەزی مێو سووکایەتی نییە بەژن لەکۆمەڵگادا، وەك هەندێ مرۆڤی گێلۆکە وا لێی تێ دەگەن، یا هەندی لەپێکوڕەکانی صهیونیەتو صەلیبییەت دەیکەن بەمەهانەو بۆنە بۆهێرش بردنە سەر ئایینی ئیسلام. بەڵکوو بەپێچەوانەوە مەبەست ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی جەستەییو دەروونی ڕەگەزی مێیە، بەپێی سروشتی خودایی، هەتا تەکلیفی مالایطاقو کاری نەکردەنی لێ داوانەکرێو، ئەرکێکی نەخرێتە سەرشان، کە لەتوانایدا نەبێ، کاری خودایش بێ دانایی نییە، دیارە کە ژنانی لەسەر ئەو شێوە کەچو لارو خوارە دروست کردووە،

سوودی خۆیو سوودی پیاویشو سوودی کۆمەڵیشی واتیادا، نابینی کەخودی پەراسوو چەماوەو لارەو، ئەگەر راستو رەوان بوایە وەك دووخ، رۆڵی خۆی نەدەبینیو لەنازو بەهرەوە دەبوو بە ژارو ژەهر، چونکە قەفەزەی سینگ دروست نەدەبوو، کە سەندووقێکی پارێزەرو قەڵایەکی قاییمە بۆ هەموو ئەندامە هەناوییەکانی مرۆڤ، بگرە بۆ زۆر لە ئەندامەکانی تریش، وەك دڵو جەرگو سییو گورچیلەو سپڵو زراوو ریخۆڵە!

وەك راستییەکی لەبەرچاویش، ئیسلام لەڕووی رەوشتی بەرزو رێنماییە باشەکانی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئایینەکانی تر پتر، گرنگی بەڕەگەزی مێ داوە، قەدرو رێزی زۆریان بۆ دادەنێ، پایەو پلەی هەرە بەرزی کۆمەڵایەتی بۆیان داناوە. بەڕادەیێ ئەگەر بێتوو کۆمەڵێ ئافرەتی رۆشنبیری رەوشت بەرزی داوێنپاکی داناو زانای بەویژدان، لەهەموو نەتەوەکان کۆببنەوە، وە مافەکانی ژن دیاری بکەن، هیچ مافێ لەو مافانەی کە لەقورئانو سوننەتی صەحیحدا بۆ ژن چەسپاوە، یا هەر ئەرکێ لە قورئانو سوننەتدا لەسەر ژن دانراوە، هیچ مافێ لەو مافانەو هیچ ئەرکێ لەو ئەرکانە ئایەخو ناپەسەند ناکەن!

وەك راستییەکی ئاشکرای لەبەرچاویش، ئیسلام لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئایینەکانی تر، پتر گرنگی بە رەگەزی مێ داوە، ئەوەی کە ئەمڕۆ لەبەرچاوە لەبەرەڵایی ژنو لەرووتو قووتی ژنو لەدڕینی پەردەی شەرمو شکۆ لەناو ژنانی رۆژئاواداو لەزۆرینەی وڵاتە ناموسوڵمانەکاندا، ئەوە بەپێی رێنماییەکانی ئایینی خۆیان نییە، هیچ ئایینێ ئەگەر بتپەرستیش بێ ئەوە قەبووڵ ناکا، بۆ نموونە هەتا بزانین کە مەسیحییەت چی داوا دەکا لە ئافرەتان، دەڵێین: ئەوەی کە راهیباتە مەسیحییەکان، لە دیرەکانیاندا ئەنجامی دەدەن، باڵا پۆشی تەواو ئەنجام دەدەنو دوورە پارێزدەبن لەپیاوی نامەحرەمو پابەند دەبن بە رەوشتی بەرزو خۆ دەپارێزن لەڕوانینی نادروستو کۆدەکەنەوە لەداوێنپیسیو خەریکی خواپەرستیو بەندەیی

كـردن‌و دووعـاو نـزاو پاڕانـەوەن‌و سـەرقاڵی کـاری چـاکەن، ئـەوە پـەیامی مەسـیحییەتە بـۆ رەگـەزی مـێ، بەتایبـەتی ئـەوە فـەرمان‌و پـەیامی نامـەی پیرۆزی جوولەکەو گاورەکانە، بۆ ژنانی ئەم دوو ئایینە!

چونکە بەپێی تەورات‌و ئینجیلیش داوێنپیس دەکوژرێ، رووتوقووتی‌و بەرەڵڵایی رەگەزی قەدەغەیە.

بـەڵام ئێـستا لایەنـە دژە ئیـسلامەکان، واپیـشانی خـەڵکی دەدەن‌و، وا دەیخەنە مێشکی لاوەکانی ئێمەوە، کە ئەمەی ناویان ناوە سەربەسـتی ئافرەت لەڕۆژئاوا، لەپیت‌و فەڕی ئایینەکەیانەوەیە، وەهۆی دواکەوتنی ژنانی ئێمەیش ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

جـا کـورت‌و پوخـت‌و بـەکوردی پـەتی، ئەمـە راسـتییەکی حاشـا هەڵنەگرە، لەئایینی پیرۆزی ئیسلاما:

ژن گوڵـە بـۆ دڵ، نـەك تـۆپی پێیـە

تـارێزی بگـری، پـتر بەجێیـە

مـەردی‌و سەربەسـتی‌و حـەیا، ئـەم سێیە

تـاجی سەرسـەری رەگـەزی مێیـە

پیـاوی خـراپیش رشـك‌و ئەسـپێیە

کـەی ئـەوە مێـردە؟ لـەجێی هەوێیـە

١٠٤٥- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: { كُنَّا مَعَ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي غَزْوَةٍ ، فَلَمَّا قَدِمْنَا اَلْمَدِينَةَ ، ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ . فَقَالَ: " أَمْهِلُوا حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلًا - يَعْنِي : عِشَاءً - لِكَيْ تَمْتَشِطَ اَلشَّعِثَةُ ، وَتَسْتَحِدَّ اَلْمَغِيبَةُ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي رِوَايَةٍ لِلْبُخَارِيِّ : { إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ ، فَلَا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلاً} .

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمـارە: ١٧٨٥ = ٥٢٤٦، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧، مختصر صحيح مسلم/٢، ژمـارە: ٨٤٧ = شیحا ٣٦٢٥. أبو داود. جهاد: ٢٧٧٨}:

**ئەم فەرموودەیە لە پوختەی موسلیمدا ئاوایە:**

**جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵا (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەخزمەتی پێغەمبـەردا چووین بـۆ غـەزایێ، کاتـێ گەڕاینـەوە، مـن وشـترێکی سستم لەژێردا بوو، پەلەم لێی دەکرد، لەپشتمەوە وشتر سوارێکم پـێ گەیـشت، بە نەقیزەکەی ژەندی لە وشترەکەی ژێرمن، ئیتر وشترەکەم خێرایـەکی وای لێ دەرچـوو چـۆنت دەوێ ئـاوا، کـە ئـاوڕم دایــەوە سـوارەکە پێغەمبــەر بــوو، فەرمووی: (ئەوە بۆوا پەلە پەل دەکەی ئەی جابیر!). گوتم: ئـەی پیغەمبـەری خودا! تازە زاوامو تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: (ئایا کچت هێناوە یـا بێـوەژن؟) گوتم: بێوەژنێکم هێناوە. فەرمووی: (ئەی بۆچـی کـچێکت نـەهێناوە، پێکـەوە گەمەو دەستبازی بکەن؟).**

**جابیر فەرمووی: کاتێ گەیـشتینە نـاو مەدینـە، وێـستمان بـچینەوە بـۆ ماڵـەوەمان، بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (کاتـێ لەسـەفەر دەگەڕێنــەوە، ئەگــەر بەشــەو دەگەیـشتنە جـێ، وابکـەن لەپێـشدا ئاگاداریـان بکەنـەوە، هـەتا ژن قـژە ئاڵۆسکاوەکەی خـۆی شـانە بکـاو دەرمـانی گـەرماو بـەکاربهێنێ بـۆ لابردنـی مـووی زیـادەی لەشـی، کـە لەبـەر دووری لەمێرد، پشتگوێی خستووە).**

**جابیر فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووشـی: (ئەی جابیر! کە گەیشتیتە ماڵەوە ژیرو وریابەو مەبەستت پێکەوەنانی مـاڵو منداڵو خێزانی ڕەحمـەت بـێ، نـەوەك مەبەسـتت خۆشـی کـاتی نیوەچڵ بـێو**

بــەس!). {تــاج/٢، زنجــیرە: ٤٧، ژمــارە: ٢١٦٢، ٢١٦٣، ٢١٦٤، ٢١٦٥ + ژمــارە: ٧٩٩ لەپوختەی موسلیم}.

گێڕانەوەی دووەم کە دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئاماژەی بـۆ دەکـا، ژمـارە: ١٧٨٤ی تەجریـدی بوخـاریـیـە، کـە ژمـارە: ٥٢٤٤ و ٥٢٤٦ی صـەحیحی بوخاریـیە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (کاتـێ کەسـێکتان سـەفەرەکەی درێـژەی کێـشا یـا بـۆ ماوەیـەکی زۆر، لەبـەر هەرهۆیـەك بـێ، لەخێزانی دابـڕا، بـا بەشـەو، لـەناکاوا نـەکا بـەماڵاو، لـەبارودۆخی ئـاوادا نـەدا بەسەر خێزانیدا). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٦٢، ٢١٦٤}.

١٠٤٦- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِنَّ شَرَّ اَلنَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اَللَّهِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ " اَلرَّجُـلُ يُفْـضِي إِلَى اِمْرَأَتِهِ وَتُفْضِي إِلَيْهِ ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٣١ = شيحا ٣٥٢٧}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (لـەڕۆژی دوا رۆژدا، لـەلای خـودا، کەس وەك ئەو پیـاوە جێگـەی خـراپ نییـە، کـە لەگـەڵ ژنەکەیـدا سـەردەکەن بەیەکـداو، لەسـەرجێ باسـی سـەرجێی‌و شـتی وا دەکـەن، کەچـی دەچـێ ئـەو باس‌و خواسە، بۆ خەڵکی تـر دەگێڕێتەوەو رازو نهێنی ژنەکەی پەخش‌و بـڵاو دەکاتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٤٢}.

١٠٤٧- وَعَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: {قُلْتُ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! مَـا حَقُّ زَوْجِ أَحَدِنَا عَلَيْهِ ؟ قَالَ: " تُطْعِمُهَا إِذَا أَكَلْتَ ، وَتَكْـسُوهَا إِذَا اِكْتَـسَيْتَ ، وَلَـا

تَضْرِبِ الْوَجْهَ ، وَلَا تُقَبِّحْ ، وَلَا تَهْجُرْ إِلَّا فِي اَلْبَيْتِ} رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَأَبُو دَاوُدَ ، وَالنَّسَائِيُّ ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَعَلَّقَ اَلْبُخَارِيُّ بَعْضَهُ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ.

{أبو داود./ رقم: ٢١٤٢. ابن ماجة رقم: ١٨٥٠. أحمد رقم: ٢٠٠٢٧. بيهقى رقم: ١٤٥٥٦. نسائى في الكبرى/٩١٦٠. حاكم/٢٧٦٤}:

حەكیمی كوڕی موعاوییەی ئەل‌قوشەیری (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم كرد: قوربان! ئەی پیغەمبەری خودا! مافی ژن لەسەر مێرد چییە؟ فەرمووی: (وەك خۆت نان‌و بەرگی بۆ بكەو نان‌و ئاوی لێ جیامەكەرەوەو لێی مەدەو وەك ئاژەڵ داركاری مەكە، ئەگەر دنیابوو لەسەر حەق لێیشتدا، لە دەموچاوی مەدەو قسەی تاڵ‌و ترش‌و ناشیرینی پێ مەڵێ، ئەگەر جێگەیشت لێ جیاكردەوە، لەبەر هۆیەكی ڕەوا، ئەوا لە هۆدەیەكا بەتەنیا دایمەنێ‌و خۆت لەهۆدەیەكی تردا بخەوی).

{تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٦١ ج/٤}.

(ڕوونكردنەوە):

١- موعاوییەی كوڕی حەیدەی ئەل - قوشەیری، هاوەڵی پێغەمبەرە، باپیرەی بەهزی كوڕی حەكیمی كوڕی معاویەیە، بەخەڵكی بەصرە دەژمێررێ، غەزای خوراسانی كردو لەوێ مرد.

٢- سەبارەت بەم فەرموودەیە، دانەر حافظی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەحمەدو ئەبو داوودو نەسائی‌و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە، ئیبنو حیببان بە فەرموودەیەكی تەندروستی داناوە، هەروا حاكمیش بە تەندروستی داناوە. {صحیح أبی داود: ١٨٧٥، الصّحیح المسند/١١١٣}.

دیـاره ئـەم فەرمووده‌یـە راڤـەو روونكردنەوەیـە بـۆ ئـەو ئایەتـە كـە دەفـەرمویّ: {وَاللاَّتِـي تَخَـافُونَ نُـشُوزَهُنَّ فَعِظُـوهُنَّ وَاهْجُـرُوهُنَّ فِـي الْمَـضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً – ٤/النساء. الآية/٣٤}.

واتە: ئەی گەلی موسـوڵمان! ئـەی پـەیڕەوانی یاسـا نامـەی قورئـان! ئـەو ژنانەتان كە سەرپێچی لە فەرمانو تاعەتی ئێوە دەكـەنو ئـەو مـافو هەقـەی كـە خـودای گـەورە داینـاوە بـۆ ئێـوە لەسـەر ئـەوان، جێبـەجێی ناكـەن، ئـەوا لەسەرەتاوە بە پەندو ئامۆژگاری جوان بە نـەرمو نیـانی ئامۆژگارییـان بكـەن، ئەگەر بەپەندو ئامۆژگاری نەهاتنە سـەر ڕێگـەی راسـتی شـەرعی خـودا، ئـەوا لـەكاتی نووسـتندا، لەگـەڵیان مەخـەونو جێگـەیان لێ جیابكەنـەوە، ئەگـەر ئەمەیش سوودی نەبوو، ئەوا بە ئاسپایی بۆ تەمێ لێیـان بـدەن، جا هـەركاتێ ژنەكانتان بەپێی یاسانامەی ئیسلام فەرمانی ئێوەیان بـەجێ هێنـاو لەگـەڵتانا ئاشتو تەباو سازاو بـوون، ئیـتر ناهـەقیـان لێ مەكـەنو بەمەهانـەی نـاڕەوا شەڕیان پێ مەفرۆشنو لەخودا بترسنو لەگەڵیانا بسازێن بەخێرو خۆشی).

٣- ئەمەیش دەقی تەعلیقەكەی پێشەوا بوخارییە، بوخاری لەپاش ئەوە كە فەرموودەیێ لـە ئیمـامی ئەنەسـی كوڕی مالیكـەوە دەگێڕێتـەوە، كـە ئـەوە دەچەسـپێنێ، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ). لەهۆدەیـەكی تـردا جێگەی لەژنەكانی جیاكردۆتەوە، نەك لـەناو یـەك هۆدەدا. {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجیرە: ٢٩، لاپەڕە: ٨٦، ژمارە: ١٢١٥ + تـاج/٢، لاپـەڕە: ٥٧٢، زنجـیرە: ٦٨، ژمـارە: ٢٢٤٦، چ/٤}.

پێشەوا بوخاری لەم تەعلیقەدا دەفەرمویّ:

(بَابُ هِجْرَةِ النَّبِيِّ، عليه السَّلام، نِسَاءَهُ فِي غَيْرِ بُيُوتِهِنَّ).

وَيُذْكَرْ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حَيْدَةَ رَفْعُهُ:

(غَيْرَ أَنْ لاَ تُهْجَرَ إِلاَّ فِي البَيْتِ). والأَوَّلُ (يَعْنِي حَدِيثَ أَنَسٍ أَصَحُّ).

بوخاری لەم تەعلیقەدا دەفەرموێ: دەگێڕنەوە لە موعاوییەی کوڕی حەیدەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەڵام ئەگەر جێگەیشت لێ جیاکردنەوە، لەناویەك هۆدەدا جێگەیان لێ جیابکەرەوە نەوەك خۆت لەهۆدەیەکا بخەویت‌و ئەو لەهۆدەیەکی تردا).

ئەنجا بوخاری دەفەرموێ: (فەرموودەی یەکەم کە فەرموودەکەی ئەنەسە، کە ئەوە دەچەسپێنێ، مێرد بۆی هەیە لەکاتی هەجرو جێ جیاکردنەوەدا لەژنی خۆی بۆ تەمێکردنی، لەهۆدەیەکی تردا بەتەنها بخەوێ، ئەم فەرموودەی ئەنەسە، لەم فەرموودەی موعاوییەی کوڕی حەیدەیە تەندروستترە).

١٠٤٨- وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: {كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ : إِذَا أَتَى اَلرَّجُلُ اِمْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا، كَانَ اَلْوَلَدُ أَحْوَلَ. فَنَزَلَتْ: "نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ" اَلْبَقَرَة : ٢٢٣} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{بوخاری. ژمارە: ٤٥٢٧، ٤٥٢٨ تەفسیر. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٩ = شیحا ٣٥٢١ = مسلم ١٤٣٥}:

ئیبنولونکەدیر دەفەرموێ: بیستم لەجابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) دەیفەرموو: جوولەکەکان دەیانگوت: ئەگەر پیاو لەلای پشتەوە بچێتە لای ژنی خۆی، بەپێشی، ئەوە منداڵەکەی خێل دەبێ، جا بۆ بەتاڵکردن‌و پووچکردنەوەی ئەم بیرو باوەڕە چەوتە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ – البقرة/٢/٢٢٣}.

واتە: ژنەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، وەکوو زەوییەکی لەبار بۆ تۆم تیاوەشاندن، دەی کێڵگەی خۆتان بکێڵن، هەرچۆن دەتانەوێ، لەلاوە، یا

لەپێشەوە، یا لەلای پشتەوە، بەمەرجێ بەپێش، نەوەك بەكۆم). {تاج/٢، لاپەڕە: ٥٠٩زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٢ – چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٤٩– وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اَللَّهِ . اَللَّهُمَّ جَنِّبْنَا اَلشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا " فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ ، لَمْ يَضُرَّهُ اَلشَّيْطَانُ أَبَدًا".} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٦٨ = ٥١٦٥، ١٤١، ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٢٨ = ٣٥١٩ = صحیح مسلم/١٤٣٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (كاتێ یەكێ لەئێوە دەیەوێ بڕواتە لای خێزانی خۆی، ئەگەر لەوكاتەدا بڵێ:

{ بِسْمِ اَللَّهِ. اَللَّهُمَّ جَنِّبْنَا اَلشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا} : بەناوی خودا، ئەی خودایە! شەیتانمان لەكۆڵ بكەرەوەو شەیتان دوور بخەرەوە لەم رزق و رۆزیی خۆتە كە داوتە پێمان) ئەوجا فەرمووی (درووودی خودای لەسەر بێ): (هەركەسەتان لەوكاتەدا لەكاتی دەسپێكردنیدا ئاوا بڵێ و ئەم نزایە بخوێنێ، ئەگەر لەوجارەیاندا، منداڵ لەچارەیان نووسرابێ، هەرگیز شەیتان زیانی بۆ ئەو منداڵە نابێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٠}.

١٠٥٠– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا دَعَا اَلرَّجُلُ اِمْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ فبات غَضْبَانَ لَعَنَتْهَا اَلْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ. وَلِمُسْلِمٍ: {كَانَ اَلَّذِي فِي اَلسَّمَاءِ سَاخِطًا عَلَيْهَا حَتَّى يَرْضَى عَنْهَا}.

{تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٣٠٧ = ٣٢٣٧ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٣٠ = شیحا ٣٥٢٤ = ١٧٣٦}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیـاو داوای سـەرجێیی لـە ژنەکەی بکـا، وەژنەکەی بەبێ مەهانەیەکی ڕەوا، ملی پێ نەدا، وە پیاوەکە لەسەر ئەوە، ئەو شەوە لێـی عـاجزو نیگـەران بـوو، ئـەوە ئـەو شـەوە هـەتا بـەیانی فریـشتەکان لەعنەتو نەفرەت لەو ژنە دەکـەن!). {تـاج/٢، زنجیرە: ٤٥، ژمـارە: ٢١٥٢ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

لەگێڕانەوەی (صـحیح مـسلم تـرقیم الـشیخ خلیـل مـأمون شـیحا)دا، کـە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا، ئاوایە:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (بـەو کەسـەی کـە گیـانی منـی بەدەسـتە، کـە یەزدانی پاکە، هەر پیاوێ داوا لەژنەکەی بکا، کە لەگەڵیدا بچێتە سـەر نـوێنی سـەرجێیی، ئـەویش سەرپێـچی لەفەرمانەکـەی بکـا، بـەناڕەوا بـەگوێی نـەکا، مسۆگەر خودای گەورە لەو ژنە دەڕەنجێ، هەتا دڵی مێردەکەی ڕازی دەکـات!). (صحیح مسلم/شیحا: ٣٥٢٥).

١٠٥١- وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَـا): {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) لَعَنَ اَلْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریـدی بوخـاری/٣، ژمـارە: ٩٤٧ = ٢٠٨٦، ٢٢٣٨، ٥٣٤٧، ٥٩٤٥، ٥٩٦١. مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٨٣ = شیحا ٥٥٣٠ = ٢١٢٤. نسائی. زینة: ٥٢٥٠، ٥١٠٩، ابن ماجة. نکاح: ١٩٨٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٤٧}:

ئیبنو عومـەر (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەعنەتو نەفرینی خودا لەو ژنە بێت: کە قـژ دەداتە دەم قژی تر بۆ ژنێکی تـرو لەو ژنـەیش بێ، کە دەیەوێ قژی تـر بداتـە دەم قژی خۆی، وە لەو ژنەیش بێ کـەخاڵ دەکوتـێو خاڵکوتـەو خـاڵ دەکوتـێ بۆ کەسێکی تـرو، لەو ژنەیش بێ کە خاڵی بۆ دەکـوتن!). {تـاج/٣، زنجیرە: ٤٥،

ژمارە: ٢٨٨١ + رياض الصالحين/٤، زنجيرە: ٢٩٦، ژمارە: ١٦٤٢ + مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٨٤و ١٣٨٥}.

(ڕوونکردنەوە):

(چەند بابەتێکی بەسوود سەبارەت بەموو)

١- سەبارەت بە ڕیش بۆ پیاو، لە (المَوْسُوعَةُ الفِقْهِيَةُ الكُوَيتِيَةُ)دا، دەفەرموێ:

یەکەم: جەماوەری شەرعزانەکان: لەزانایانی مەزهەبی حەنەفیو زانایانی مەزهەبی مالیکیو زانایانی مەزهەبی حەنبەلی، دەفەرموون: (ڕیش تاشین نادروستو حەرامە). قەولێکیش لەشافیعیەکان هەروا دەفەرموون.

دووەم: (وَالأَصَحُّ عِنْدَ الشَّافِعِيَّةِ: أَنَّ حَلْقَ اللِحيَةِ مَكْرُوهٌ). واتە: دروستترین فەتوا، لەلای مەزهەبی شافیعی ئەوەیە: کەڕیش تاشین ناباشو ناپەسەندە، واتە: مەکرووهە، بەڵام حەرام نییە، ئیبنو حەجەری هەیتەمیش لەتوحفەدا ئاماژە بۆ ئەم بۆچوونە دەکاو دەڵێ: (فائِدَةٌ): قَالَ الشَّيْخَانِ: يُكْرَهُ حَلْقُ اللِحْيَةِ).

سێیەم: ڕیش هێشتنەوە، ئەگەر فەرز نەبێ، بەکۆی دەنگ سوننەتە، لەسەر یەکی لەم سی شێوەیە:

آ- بەهیچ شێوەیێ دەستی لێ نەدرێ، نە لەدرێژی، نە لە پانی، نەلێی بتاشرێ، نە لێی ببڕێو کورت نەکرێتەوە.

ب- ئەوەی کەلەمشت زیاترە، دروستە لاببرێ.

ج- حەنەفیەکان دەفەرموون: (ئەوەی لەپڕ مشت زیاترە، پێویستە کورت بکرێتەوەو ڕیش ڕێکوپێك بکرێو نەبێ بەهۆی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی بۆ خاوەنەکەی).

چوارەم: سمێڵ تەواو کورت بکرێتەوە.

پێنجەم: خزمەتی ڕیش بکرێ، پشتگوێ نەخرێ.

شەشەم: ڕیش بۆیە کردن، بەغەیری ڕەش سوننەتە. {بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٤٧}.

٢- قژدانە دەم قژ لەم کاتانەدا نادروستەو قەدەغەو حەرامە:

آ- قژە لکاوەکە هی ئادەمیزاد بێ، چ هی پیاو بێ، چ هی ژن بێ، چ هی زیندوو بێ، چ هی مردوو بێ.

ب- مووە، یا خورییە لکاوەکە، هی ئاژەڵێکی مردارەوە بوو بێو سەرنەبڕاو بێو، لەپاش مردارەوە بوون لێی بکرێتەوە.

ج- مووو خوریو تووکی گیانداری بێ، کە گۆشتی نەخوری، وەك یاڵی کەر، ئیتر چی لەپێش مردارەوە بوونیدا، یا لەپاش مردارەوە بوونی، ئەو کوڵكو تووكو مووەی لێ کرابێتەوە، جیاوازی نییە، چونکە پیسەو حەرامە، شتی پیسو حەرامیش بەکارهێنانی نادروستە، بەتایبەتی لەکاتی دەسنوێژو نوێژدا.

٣- مووی پاك، کەهی مرۆڤ نەبێ، وەك یاڵی مایین، یا ڕیشی سابرینو بزن، یا مووی کلکی گاو مانگا، لەکاتی زیندوویدا لێی کرابێتەوە، یا لەپاش سەربڕین، قسەی دروست ئەوەیە کە دروستە بدرێتە دەم قژی تر، بەتایبەتی ئەگەر مێرد ڕەزای لەسەر بێ، هەروا خوری.

٤- شت دانە دەم قژ، بەهەموو شتێکی تری پاك دروستە، وەك خەیاتەی ئاوریشمو هەندێ گیای تایبەت، کە بۆ جوانیو ڕازاندنەوە بێو بۆ تەفرەو هەڵخەڵەتاندن نەبێ، تەنانەت لەهەندێ کاتا کارێکی باشە، کەببێ بەهۆی شاردنەوەی نەنگ، وەك کەچەڵیو صەلعو سەر ڕوتاوەیی، کە دادەنرێن بەدوو نەنگی کۆمەڵایەتیو مرۆڤ بەسورشت حەزناکا کە خەڵك بەو نەنگە بزانێو دروستە کەبیانشارێتەوە. لەتاجول ئوصول دا، بەرگی سێ لاپەڕە (٢٩٦) زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٦، دەفەرموێ: (بارۆکەی قەرمەلو شتی تری وا، وەك خوریو ئاوریشمو کەتان قەیدی نییە. کەواتە: کەزیو پرچو پەلکە، لەم

جۆره شتانه فەیدی نییەو هیچی تیا مەبەست نییە، چونكه كەس بەوە تەفره ناخواتو دەستەشكێن نابێ).

لە (الفقـه الإسـلامِيُ وَأَدِلَّتُـهُ) سەرباسی (وصل الشعر) دوكتۆر وەهبە زوحەلی دەفەرموێ: (لەبەر كردنو لەسەر كردنی بارۆكە بۆ پیاوو بۆ ژن، بەرەزای مێردەكەی دروستە).

٥- بێگومـان ئـەوەی كەلـەم سـەردەمەدا، نـاودەبرێ بـە (زَرْع الـشَّعر: چاندنی موو) بۆسەر، یا بۆ ڕیش، یا بۆ برۆ، كارێ ڕەوایەو دروستەو بەشێكە لە (عملیه التجمیل = نەشتەرگەری جوانكاری، وە ئەمە لەم بابەتە نییە.

٦- بەكۆی دەنگی زانایان، لەهەموو بارودۆخێكا، دروست نییە بۆ ژن، كە مووی (خۆیی) مەحرەمی خۆی، بۆ پەیوەنـدكردن بـەمووی خۆیـەوە، یـان بـۆ چاندن بەكاربهێنێ، چی هی دایكی چی هی خوشكیو چی هی خـۆیی تـر بـێ، وەچی هی بـاوكیو كوڕو بـراو بـرازاو كوڕەزاو كچەزای بـێ. چونكه خۆشی وەرگـرتن لەلایـەنی مێـردەوە لەشـتی وا، كـارێ زۆر ناڕەوایـەو ئەوپـەڕی نامەردیو بەرەڵاییە.

٧- دروستە بۆ ژنو پیاوو بۆ كوڕو كچ، بۆ گەورەو بۆ بچوك، مووی سەرو ڕیشو سمێڵو ئەبرۆو بنباڵو بەر، بەپێی شەرع ڕێك بخا، ئایا بەتاشین بێ، یان بەكورتكردنەوە بێ، یان بـەلابردنو هەڵكەنـدن بـێ، وەهـەروەها هـەر موویـێ، بـۆ ژن، یـان بـۆ پیـاو كێـشەیەكی جەسـتەیی، یـان كۆمەڵایـەتی، یـان ئازارێ دروست بكا، چارەسەر كردنی دروستە، وەك مووی لووتو مووی گوێو مـووی پـووزو لاقو بـاڵو باسـكو سـینگ، بەتایبـەتی بـۆ ژنـی مێـردار، وەك مووی بەرو مووی دەوری كۆمو مووی پێـشی ئـافرەت، ئـیتر بەتاشـین بـێ، یـان بەدەرمان بێ، یان بەهەڵكەندن بێ، یان بەهەڵپاچین بێ، بەڵام سەرتاشـین بـۆ ژن كەراهـەتی هەیـە، مەگـەر لەبـەر نەخۆشـیو كـاری پێویـست بـێ، (مغنـی

محتاج/٤.ص٢٩٧. خاتمەی باسی عقیقە). (بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٤٧).

مووی ئەو شوێنانە کە دروستە کەسانی تریش تەماشایان بکەن، وەك مووی سەرو ڕیش‌و سمێڵ‌و بڕۆو گوێچکەو لووت بۆ پیاو، دروستە خۆی لایبەرێ، یان کەسێ تر لایبەرێ، یان هاوسەری، یان کەسێکی خۆیی (مەحرەم) کە بۆی دروست بێ تەماشای ئەو شوێنە بکا، وا باشە ئەگەر خۆی کردی لەپێشا بەدەستی ڕاستی مووی ئەو شوێنە لابەرێ کە بەدەستی ڕاست دەکرێ، ئەوجا دەستی چەپی بەکار بهێنێ بۆ شوێنەکانی تری. (بڕوانە: فتح الباری. فەرموودەی ژمارە: ٥٨٨٩ = لباس. باب قص الشارب + تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢٨٨٦ ج/٤ = چاپی چوارەم).

٨- هەندێ لە زانایانی پایەبەرز، بەپێچەوانەی جەماوەری زانایانەوە دەڵێن: (قژدانە دەم قژو لکانی قژ بەسەرو بەقژەوە، لەسەر شێوەی بارۆکەو هەر شێوەیەکی تریش بێ، بەبێ قەیدو مەرج دروستە، بەقژی مرۆڤ بەهی گیانداری تر، بەئاوریشم‌و بەگیا، بۆ هەموو کەسێ دروستە، ئەم زاتانەیش وەك ئیبنو عەبباس‌و ئوم سەلەمەو عائیشە، کەهەردووکیان هاوسەری پێغەمبەرن!!.

١٠٥٢- وَعَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: {حَضَرْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فِي أُنَاسٍ ، وَهُوَ يَقُولُ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ ، فَنَظَرْتُ فِي اَلرُّومِ وَفَارِسَ، فَإِذَا هُمْ يُغِيلُونَ أَوْلَادَهُمْ فَلَا يَضُرُّ ذَلِكَ أَوْلَادَهُمْ شَيْئًا". ثُمَّ سَأَلُوهُ عَنِ الْعَزْلِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "ذَلِكَ اَلْوَأْدُ اَلْخَفِيُّ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{پوختەی صەحیحی موسلیم = مختصر صحیح مسلیم/٢، بەرگی دووەم، ژمارە: ٨٣٥ = شیحا ٣٥٤٩ = صحیح مسلم/١٤٤٢}:

جودامـەی كـچی وەهـب (رەزای خـودای لێ بـێ) كـە خوشـكی وەكاشـەی كـوڕی میحصەنی نـاودارە، فـەرمووی: (بـەدیارەوە بـووم، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو كۆمەڵێكا بوو، دەیفەرموو: (نیازم هەبوو كـە ڕێگـەی شفتەژێ نەدەم، واتە: ڕێگە نەدەم كەئێوە بچنە لای ژنی منداڵ بـە بـەر، بـەڵام كە تەماشا دەكەم ڕۆمـەكانو فارسـەكان شـتی وەهـا دەكـەنو لەگـەڵ ئەوەیشا، زیـان بەسـاوە شـیرەخۆرەكانیان ناگـات، لەبـەر ئـەوە منـیش ئەمـەم قەدەغـە نەكرد).

لەپاشـا لـەبارەی عەزلـەوە پرسـیاریان لێ كـرد (واتـە: پێـشگیری كـردن لەدروست بوونی كۆرپەلە، لەكاتی جووتبووندا).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئـەوە زیندەبەچاڵ كردنی پەنامەكییە). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢١٤٨}.

(ڕوونكردنەوە):

١- بڕوانـە: ژیاننامـەی وەكاشـە، لەبـەرگی پێنجـەمی تجریـدی بوخـاری ژمارە: ١٨٧٦.

٢- جودامـەی خوشـكی وەكاشـە، هـاوەڵی پێغەمبـەرە، لەمەككـە ئیـسلام بـووە، یـەكێ بـوو لـەو ژنانـە كـە پـەیمانیان بەسـت لەگـەڵ پێغەمبـەردا، ژنـی ئونەیـسی كـوڕی قـەتادە بـوو، لەگـەڵ خزمـانی خۆیـدا، لـەپێناوی ئیـسلاما، لەمەككەوە كۆچی كرد بۆ مەدینـە، عائیـشە فـەرموودەی لێیـەوە گێڕاوەتـەوە، عەكاشـەی كـوڕی میحـصەن، كـە لـەهۆزی ئەسـەدە، لەدایكـەوە بـرای ئـەم جودامەی كچی وەهبەیە.

١٠٥٣- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ اَلْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! إِنَّ لِي جَارِيَةً ، وَأَنَا أَعْزِلُ عَنْهَا ، وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ ، وَأَنَا أُرِيدُ مَا يُرِيدُ اَلرِّجَالُ ، وَإِنَّ اَلْيَهُودَ تُحَدِّثُ: أَنَّ اَلْعَزْلَ اَلْمَوْؤُدَةُ اَلصُّغْرَى . قَالَ: " كَذَبَتْ

يَهُودُ ، لَوْ أَرَادَ اَللَّهُ أَنْ يَخْلُقَهُ مَا اِسْتَطَعْتَ أَنْ تَصْرِفَهُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ ، وَالنَّسَائِيُّ ، وَالطَّحَاوِيُّ ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح أبي داود: ١٩٠٣ = مكتبة الشيخ الألباني في المكتبة الشاملة الإسلامية الأكترونية. أحمد رقم/ ١١٥٢٠}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پیاویّ عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پیغەمبەری خودا! کەنیزەکێکم هەیە کە دەڕۆمە لای، خۆم دەکێشمەوە، تا تۆماوەکە نەگاتە جێی خۆیو نەبی بەمناڵ، لەم بارەیەشەوە جوولەکەکان دەڵێن: لەکاتی دروستبووندا لەگەڵ هاوسەرو حەلاڵی خۆتا، ئەگەر ڕێگە لەدروستبوونی مناڵ بگری، ئەوە چەپی کەمە لەمناڵ زیندەبەچاڵ کردنو وەك ئەوە وایە کە مناڵی خۆت زیندەبەچاڵ بکەیت، جا تۆ لەم بارەیەوە فەرمانت بەچییە پێمان ئەی پیغەمبەری خودا!؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (جوولەکەکان درۆ دەکەن، شتی وا زیندەبەچاڵ کردن نییە، چونکە ئەگەر خودا خواستی لەسەر ئەوە بیّ کە ببیّ بەمناڵ، بەتۆ بەری خواستی خودا ناگیریّ!). (تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٩).

١٠٥٤- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ، وَلَوْ كَانَ شَيْئًا يُنْهَى عَنْهُ لَنَهَانَا عَنْهُ اَلْقُرْآنُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {فَبَلَغَ ذَلِكَ نَبِيَّ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَلَمْ يَنْهَنَا}.

{بوخاری/٥٢٠٩. صحيح مسلم شيحا/٣٥٤٥، ٣٥٤٦ = مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٤٤٠}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بیّ) ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) کاتیّ دەڕۆشتینە لای هاوسەرو حەلاڵی خۆمان، خۆمان دەکێشایەوە هەتا نەبیّ بەمناڵ، پەیتا پەیتا قورئانیش دەهاتە

خوارەوە، دەی ئەگەر خۆکشانەوەو قەدەغەکردنی مناڵو پێشگیری لەمناڵبوون کاری قەدەغە بوایە، قورئان قەدەغەی دەکرد لێمان!.

لەگێڕانەوەی (مسلم/شیحادا/٣٥٤٦)دا، جابیر دەفەرموێ: ئەوەی کە ئێمە دەمانکرد، لەبارەی نەهێشتنی مناڵبوونەوە، گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵام ئەوەی لێمان قەدەغە نەکرد. {بڕوانە: مختصر صحيح ممسلم/٢، ژمارە: ٨٣٣، ٨٣٤}.

١٠٥٥- وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ } أَخْرَجَاهُ ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجريدی بوخاری/١، ژمارە: ١٨٨ = ٢٦٨، ٢٨٤، ٥٠٦٨، ٥٢١٥ بوخاری. مسلم. طهارة/٧٠٦ شيحا = ٣٠٩}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نۆ ژنی هەبوو، وادەبوو لەیەك شەودا دەڕۆیشتە لای هەر نۆیانو، یەکەیەکە لەگەڵیاندا دروست دەبوو، لەدوایدا یەکجار خۆی دەشۆردو لەشپیسی خۆی دەردەکرد. {تاج/١، زنجیرە: ٣٢، ژمارە: ٢٨٦ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: (پرسیارکراوە لە ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەگەر کەسێ عەرەبی بەجوانی نەزانێ، دەتوانێ ئەم نزایە، کەوا لە ژمارە: (١٠٤٩)ی ئەم پەڕاوەدا، بەفارسی بڵێو بخوێنێ؟ دەفەرموێ: (بەڵێ دەتوانێ بیخوێنێ بەفارسی).

منیش کەوەرگێڕم دەڵێم: (ئەمە بۆ هەموو نزاو دۆعایێ هەر وایە، مرۆڤ دەتوانێ بەعەرەبی بیخوێنێ، یا بەزمانی خۆی بیخوێنێ. ئەوەندە هەیە دۆعای مەئثوور، کەئەو نزاو پاڕانەوەیە کە گوتراوەکەیان، یا وا لەقورئانا، وەك {رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ} یاوا لە

فەرموودەی پێغەمبەرو هاوەڵانیدا، وەك نزای ژمارە: (١٠٤٩)ی ئەم پەڕاوە، ئەوەندە هەیە ئەم جۆرە نزا مەئثوورە بیستراوانە واباشترو پەسەندترە کە بەدەقە عەرەبییەکە بخوێنرێن، یا پاش خوێندنیان بەعەرەبی، خوێنەر بەکوڵی دڵ بەزمانی خۆشی واتاکەیان دووبارە بکاتەوە (وەرگێڕ).

٢- وەکاتێ گوتنی ئەم نزایە سوننەتە، کە دروستبوونەکە ڕەوا بێ‌و، لەنێوانی پیاوو حەڵاڵ‌و هاوسەری خۆیدا بێ‌و لەڕێگەی شەرعییەوە ئەنجام بدرێ‌و نەهێڵی شەرعی نەبێ، وەك ڕۆژووی ڕەمەزان‌و بێنوێژی ژنانە. تەنانەت ئەگەر نائومێدیش بن لەمناڵبوون ئەم نزایە هەر سوننەتە، چونکە ڕزق‌و ڕۆژیی گشتی ترە لەمناڵبوون‌و خودی مناڵبوون بەشێکە لەو ڕزق‌و ڕۆژییە.

٣- گوتنی ئەم نزایە بۆ ژنەکەیش لەهەمان کاتا سوننەتە.

٤- لە (غایة المأمول – شرح التاج الجامع للأصول)دا، لەسەر باسی دەستووری سەرجێی (آدَابُ الوقاع)دا، دەفەرموێ: ئەمانە دەستووری شەرعی سەرجێیین.

آ- أعوذُ بِاللهِ کردن‌و پەناگرتن بەخودا لەشەڕی شەیتان.

ب- بیسمیللا کردن لەپێش دروستبووندا.

ج- خۆ داپۆشین‌و لەجێگەی دوور لەبەرچاوی خەڵك.

د- نزاکردن واباشە بەنیازی داوێنپاکی‌و مناڵی باش بێ‌و باشترین کات بۆی، کاتی تێڕۆکردنی ئەندامی نێرینەی پیاوە، بەزێی ژنەکەدا.

٥- نەزاکەت لەگەڵ ژنەکەداو مۆڵەتدانی، تا ئەویش کاری خۆی ئەنجام دەداو ڕەحەت دەبێ، بەتایبەتی ئەگەر پیاوەکە زووتر ڕەحەت ببێ.

٦- یاری‌و دەستبازی‌و سازان‌و گونجان لەگەڵ دۆخەکەدا بۆ بەردەوامی خۆشەویستی لەنێوانیاندا.

٧- پارێزو دووركەوتنەوە لەچوونەلا بەكۆم، یا خۆپاراستن لەچوونەلای لەكاتی بێنوێژیدا، بەڵام پیاوو ژنەكە دەتوانن، لەماوەی سووڕی مانگانەدا، بەیاریو دەستبازیو خۆنووساندن بەیەكەوە، خۆیان ڕەحەت بكەن.

٨- قسەكردن لەكاتی جووتبووندا، ناپەسەندە، مەگەر پەیوەندی بەدروستبوونەكەوە هەبێ، وەك ئەوە ئەو جۆرە قسەیە، زیاتر ئارەزوویان بورووژێنێ، یا لەبەر ناچاری بێ.

٩- دەست كردنە ملو ماچكردنو مەمك گوشینو دەرپێ داكەندنو شتی تری وا، هەمووی كاری پەسەندو داواكراوە، بە تایبەتی خۆڕازاندنەوە لەهەردوولاوەو خۆ بۆنخۆشكردن.

١٠- هەموو كاروكردەوەیێ، یا قسەوگوتەیێ، كە لەم كاتەدا ببێ بەهۆی بەردەوامی خۆشەویستیو دڵی یەكتری ڕاگرتنو خۆشیو لەززەتی حەڵاڵ، كردنو گوتنی پەسەندە، چ لەلایەنی پیاوەكەوە، چ لەلایەنی ژنەكەوە، بەتایبەتی پاكو خاوێنی دەسگای زاوزێ.

١١- گەلێ جار ژنەكە قسەی خۆشو كاری ئارەزووو بزوێن، لەگەڵ مێردەكەی دەكا، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە نهێنی نێوانی خۆیانە، بڵاوكردنەوەی ئەو ڕازو نهێنییە دووبە دوویە، نادروستو ناڕەوایە. قسەی (غاية المأمول) بەكەمێ دەستكارییەوە تەواو بوو.

١٢- سوننەتە ژنو مێرد، بۆ كرداری جووتبوون، سوود لەداودەرمانو هەموو هۆیەكی ڕەوا بۆ ئەو مەبەستە بەكاربهێنن، وەك حەبو دەرزیو شتی تری وا، بەتایبەتی ئەگەر لایەكیان، لەبەر هەر هۆیێ، لەو لایەنەوە لاواز بووبێ وەك دەفەرموێ: {وَيَنْدُبُ التَّقْوِى لِلْجِمَاعِ بِأَدْوِيَةٍ مُبَاحَةٍ}.

١٣- هەردوولایان پێكەوە لەیەك نوێندا بخەون.

١٤- نادروستە بۆ ژن كە نەهێڵێ پیاوەكەی لەززەتی ڕەوای لێ وەربگرێ، هەروا بۆ پیاوەكە نادروستە شتی وا بكا.

١٥- كرداری جووتبوون لەشەوی هەینیدا، هەروا لەڕۆژی هەینیدا، لەپێش نوێژی هەینیدا سوننەتە.

١٦- ئەوەندەی دەکرێ چاوپۆشی لەهەڵەی ژن بکرێ، بەهیچ جۆرێ توندوتیژی لەگەڵدا ئەنجام نەدرێو ڕێزی تەواو لەخۆیو لەکەسوکاری بگیرێ. هەروا ئەمە بۆ ژنیش سوننەتە.

١٧- ئەگەر مەهانەی ڕەوا نەبوو، سوننەتە پیاو کچ بهێنێ، وە ژن شوو بکا بەکوڕ، بەڵام کوڕ بێوەژن بهێنێ، یا بێوەژن شووبکا بەکوڕ، هیچ ناباشییەکی تیادا نییە.

١٨- کورتو پوختت ئەمە لەبارەی (منع الحمل = پێشگیریی لە دروستبوونی سك)ەوە دەنووسین.

(جەماوەری زانایانی نەتەوەی ئیسلام دەفەرموون: دروستە پیاو، بۆ ئەوەی ژنەکەی، لەو جووتبوونەدا، سك نەکاو ئاوەکەی نەگاتە ناو منداڵدان، عەزل بکاو ئاوەکەی لەدەرەوەی شەرمی ژنەکە بڕێژێ، چونکە شتی وا لەسەردەمی پێغەمبەردا بووەو پێغەمبەر ڕێگەی لێ نەگرتووە، کەواتە بەم پێوەرە ژنو پیاو بۆیان هەیە، پێشگیری لە سك بکەنو نەهێڵن منداڵیان ببێ، ئیتر بەدەرمانو حەب بێ، بە لوولەو لەولەب بێ، بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ ژنو پیاو هەردووکیان ڕەزایان لەسەر ئەوە هەبێ. ئەمە لەبارەی سەرەتاوە لەمناڵبوون، بەڵام سك لەباربردن، ئەگەر بەر لەوە بێ، کە سکەکە ڕۆحی بکرێ بە بەردا، ئەگەر هۆی تر نەبێ، زۆر لەزانایانی مەزهەبەکان ڕێگەی پێ دەدەن — بڕوانە: تاج الأصول/ بەرگی دووەم زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٤٤ چ/٤ = چاپی چوارەم هەتا کۆتایی.

## ٦٢- باسی مارەیی
## بابُ: الصداق

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٢٦٥ + تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، لە ژمارە: ٢٠٩٢وە هەتا ٢١٠٣ + مختصر صحیح مسلم/٢، لە ژمارە: ٨١٩وە هەتا ژمارە: ٨٢٠}.

١٠٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) {أَنَّهُ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ ، وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٢٣٥ = ٣٧١، ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٥٦٨، ٥١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣. مسلم/شیحا: ٣٤٨٣. نسائی. نکاح: ٣٣٤٢. ابن ماجة. نکاح: ١٩٥٧}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازادکرد، وەئازاد کردنەکەی دانا بەمارەیی بۆی‌و مارەی کرد لەخۆی. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٢١٠٠}.

١٠٥٧- وَعَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ (رضی الله عنه) " أَنَّهُ قَالَ: {سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رضی الله عنها) كَمْ كَانَ صَدَاقُ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَتْ: كَانَ صَدَاقُهُ لِأَزْوَاجِهِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشًّا . قَالَتْ : أَتَدْرِي مَا اَلنَّشُّ ؟ قَالَ: قُلْتُ: لَا. قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ . فَتِلْكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِأَزْوَاجِهِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحیح مسلم/٨١٨ = شیحا ٣٤٧٤ = مسلم ١٤٢٦. أبوداود. نکاح. ٢١٠٥. نسائی. نکاح: ٣٣٤٧}:

ئـەبو سـەلەمەی کـوڕی عەبـدورەحمان (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفەرموێ: لەعائیشەم پرسی: مارەیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەیدا بەهەر یەکێ لەژنەکانی، چەند بووە؟ فەرمووی: مارەیی هەریەکێ لەژنەکانی دوازدە ئۆقیەو نیم بوو.

عائیشە فەرمووی پێم: ئایا دەزانیت نیم چەندە؟ گوتم: نەء، نازانم. فەرمووی: نیم نیو ئۆقیەیە، کەهەمووی دەکاتە پێنج سەد درەمی زیوینی ئەو سەردەمە، کە دەکاتە پەنجا لیرە (دینار)ی زێڕی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٢}.

١٠٥٨- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)قَالَ: { لَمَّا تَزَوَّجَ عَلِيٌّ فَاطِمَةَ -عَلَيْهِمَا اَلسَّلَامُ- . قَالَ لَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " أَعْطِهَا شَيْئًا " ، قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ . قَالَ:" فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ ؟ } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَالنَّسَائِيُّ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح أبى داود: ١٨٦٥ = مكتبة الشيخ الألبانى فى المكتبة الشاملة الإسلامية الألكترونية}:

له تاجا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عەلی کوڕی ئەبو طالیب (رەزای خودای لێ بێ) فاطیمەی کچی پێغەمبەری مارە کرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی بەعەلی: (شتێکی لەجیاتی مارەیی پێ بدە). عەلی فەرمووی: هیچم نییە! فەرمووی: (ئەی کوا زریە حوطەمییەکەت؟). فەرمووی: لەلای خۆمە. فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) دەی ئەوەی پێ بدە لەجیاتی مارەیی. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٨}.

١٠٥٩- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { أَيُّمَا اِمْرَأَةٍ نُكِحَتْ عَلَى صَدَاقٍ ، أَوْ حِبَاءٍ ، أَوْ عِدَةٍ ، قَبْلَ عِصْمَةِ اَلنِّكَاحِ ، فَهُوَ لَهَا، وَمَا كَانَ بَعْدَ عِصْمَةِ اَلنِّكَاحِ ، فَهُوَ لِمَنْ أُعْطِيَهُ، وَأَحَقُّ مَا أُكْرِمَ اَلرَّجُلُ عَلَيْهِ اِبْنَتُهُ ، أَوْ أُخْتُهُ } رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ.

{ضعيف الجامع ٢٢٢٩ = صحيح وضعيف الجامع للشيخ الألباني فى مكتبة الشاملة الإسلامية الألكترونية. DVD.2009}:

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیریەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر ژنێ مارە ببڕێ لەسەر بڕێ مارەیی، یا لەسەر خەڵاتێ، کە بۆخۆی بێ، یا بۆ باوك‌و براکەی‌و کەسوکارەکەی بێ، یا بەڵێنی پێدانی شتێکی پێ بدرێ کە بۆ ژنەکە خۆی بێ، یا بۆ کەسوکاری بێ، هەرشتێ لەم شتانە لە گرێبەندی مارە بڕینەکەدا بێ، ئەوە هی ژنەکەیە، با بەناو درابێ بەکەسێکی تر، بەڵام ئەگەر لەپاش مارەبڕین، ئەگەر بەم بۆنەیەوە، شتێ درا بەژنە مارەبڕاوەکە، یا درا بەباوکی، یا درا بەکەسێکی تری، ئەوە هی ئەو کەسەیە کە دراوە پێی، ئەگەر درا بەژنەکە دەبێ بەهی ژنەکە خۆی، ئەگەر درا بەبراکەی ئەوا دەبێ بەهینی براکەی! لەڕاستیدا جێگەی خۆیەتی‌و کارێ تەواو شایانە، کەپیاو بەهۆی کچی خۆیەوە ڕێزی لێ بگیرێ‌و خەڵاتێ بکرێ، هەروا ئەگەر بەهۆی خوشکی خۆیەوە ڕێزی لێ بنرێ‌و خەڵاتی پێ ببەخشرێ!).

(ڕوونکردنەوە):

١- بەکۆی دەنگ شیربایی نادروست‌و پیسە، لەبەر ئەوە پێویستە کە موسوڵمان خۆی لەشتی وا بپارێزێ، تەنانەت ئەگەر لەژیانیدا هەڵەی وای کردبوو، با تەوبەی لێ بکاو، ئەوەی کە وەری گرتووە لە پەیوەندیدار، با بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنی، یا لەبەر ڕەزای خودا، بەدڵ ئەوەی کەشیربایییەکەی داوەپێی، گەردنی ئازاد بکا.

٢- مێردو کەسوکاری مێردیش، ئەگەر شیربایی بدەن بەکەسوکاری ژن، ئەوانیش تاوانبارن‌و پێویستە تەوبەی لێ بکەن.

٣- گەرچی ئەم فەرموودەیە لاوازو بێ هێزە، بەڵام بۆنی ئەوەی لێ دێ، هەرمارەیی‌و خەڵات‌و شاباش‌و شیربایی‌و شتی تری لەم بابەتە، کە دراوە بەژنەکە، یا بەکەسوکاری ژنەکە دەبێ بەهی ژنەکەو بۆ ژنەکە حەڵاڵە مادەم پێش مارەبڕین بووە.

بەوێنە: پیاوێ کچەکەی دەدا بەپیاوێ تر، مەرج دەگرێ، کە (٢٠) بیست مسقاڵ زێڕ مارەیی پێشخراو بدرێ بەکچەکەی‌و (٣٠) سیی مسقاڵ زێڕیش بەشیربایی بدرێ بەخۆی، وە زاوا هەردوو مەرجەکە جێبەجێ دەکا، ئەوسا کچەکەی لێ مارەدەبڕن، ئەوە بەپێی ئەم فەرموودەیە (٣٠) سیی مسقاڵەکەیش کە باوکی لەپێش مارەبڕیندا، لەزاوای وەرگرتووە، دەبێ بەهی کچەکەی، جا ئەگەر باوکەکە ئەو (٣٠) سیی مسقاڵە خۆی بیخوات ئەوا پێی حەرامە، بەڵام ئەگەر بیدات بەکچەکەی ئەوە بەپێی ئەم فەرموودەیە، لەشیربایی دەردەچێ‌و دەبێ بەماڵی حەڵاڵی کچەکەی.

خوشکێکم هەبوو، ناوی عائیشە فارس حەمەخان بوو، زۆر حەڵاڵخۆر بوو، کچێکی دابوو بەشوو، دەوری (٢٠) بیست مسقاڵ ئاڵتوونی خشڵی شیربایی لەزاواکەی سەند بەخەیاڵی ئەوە هەر کاتێ کوڕەکەی ژن بهێنێ، بۆی بکا بەخەرجی شایی.

کوڕ ژنی هێنا، پاش (٢٠) بیست ساڵ، خوشکەکەم بەو پارەیە کە لەباتی شیربایی وەری گرتبوو، ویستی بچێت بۆ حەج، لەمەلایەکی زاناو دانا دەپرسێ، مەلاکە پێی دەڵێ: ئاڵتوونەکە ماوە؟ دەڵێ: بەڵێ، لەناو تورەکەیەکایە، ئەوەتی وەرمگرتووە دەستم لێی نەداوە، وەك خۆی ماوە. مامۆستای مەلا دەفەرمووێ: (ئاڵتوونەکە بدەرەوە بەزاواکەت، ئەوەت خێرترە

لـه حەجەکـەت!!). ئـەویش بەقـسەی مامۆسـتاکەی کـردو وایکـرد!! هـەزار ڕەحمەت لەهەموویان!.

١٠٦٠- وَعَنْ عَلْقَمَةَ ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) { أَنَّـهُ سُئِلَ عَـنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ اِمْرَأَةً ، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا ، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا حَتَّى مَاتَ ، فَقَـالَ اِبْـنُ مَسْعُودٍ : لَهَا مِثْلُ صَدَاقِ نِسَائِهَا ، لَا وَكْسَ ، وَلَـا شَـطَطَ ، وَعَلَيْهَـا اَلْعِـدَّةُ ، وَلَهَـا اَلْمِيرَاثُ، فَقَامَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الْأَشْجَعِيُّ فَقَالَ: قَضَى رَسُـولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم) فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِـقٍ - اِمْـرَأَةٍ مِنَّـا - مِثْـلَ مَـا قَـضَيْتَ ، فَفَـرِحَ بِهَـا اِبْـنُ مَسْعُودٍ} رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَالْأَرْبَعَةُ ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وحسَّنَهُ جَماعَةُ.

{أحمـد ١/٤٤٧. أبـو داود: ٢١١٤، ٢١١٥، ٢١١٦. ترمـذى: ١١٤٥. نـسائى. نكـاح/٦/١٢١. ابـن ماجـة. نكـاح/١٨٩١. صـحيح أبـى داود: ١٨٥٨ = صحيح أبى داود فى مكتبة الشيخ الألبـانى الألكترونيـة فـى المكتبـة الـشاملة الإسـلامية الألكترونية. DVD ٢٠٠٩}:

عەلقەمـە (ڕەحمــەتی خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: پرسـیار کـرا لــە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەگەر پیاوێ ژنێ مارە بکاو مارەیی بۆ دیاری نەکاو بەدەستیشی نەگرێ، تاخۆی دەمرێ، مـارەیی ئـەم ژنـە چـییەو چـی نییـە؟ ئیبنـو مەسـعوود فـەرمووی: مانەنـدی مـارەیی ژنـانی کەسوکاری خـۆی مـارەیی بـۆ دادەنـرێ، وەك دایکـی، یـان خوشـکی، یـا پـووری، بەبێ کەم‌و زۆر، بەشە کەلەپووریش لەمێردە مردووەکەی دەگرێ، وەعیـددەی مـردن (وەفات)یشی لەسەرە.

مـەعقیلی کـوڕی سـینانی ئەشـجەعیش هەڵـسا گـوتی: پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەبارەی بەروعـەی کچی واشـیقەوە، کـەژنێ بـوو لەخۆمان، لەبارودۆخێکی ئاوادا، مێردەکەی مردبـوو، ڕێـك وەك ئـەم بڕیـارەی تـۆ بڕیـاری بـۆدا، کـەمارەیی تـەواوی دەکـەوێ، بەقـەد مانەنـدی مـارەیی کەسـوکاری خـۆی، بەشــە کەلــەپووریش لــەمێردە مردووەکـەی دەگـرێ‌و

چوارمانگو ده شەویش ماتەمی بۆ دەگرێ. ئیبنو مەسعوودیش ئەم شایەتییەی گەلێ پێ خۆش بوو. {تاج/٢، زنجیره: ٣٥، ژماره: ٢١٠٢ – د/ت/ن – سند صحيح} + {تاج/٢، زنجیره: ٧٩، ژماره: ٢٢٧٥}.

ئەلبانی لەپەڕاوی (صحيح أبی داود)دا، ژمارە: ١٨٥٨ی بۆ داناوەو بە فەرموودەیەکی (صحيح)ی داناوە.

١٠٦١– وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللَّهِ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: " مَنْ أَعْطَى فِي صَدَاقِ اِمْرَأَةٍ سَوِيقًا ، أَوْ تَمْرًا ، فَقَدْ اِسْتَحَلَّ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَأَشَارَ إِلَى تَرْجِيحِ وَقْفِهِ.

{ضعيف الجامع: = صحيح وضعيف الجامع للشيخ الألباني: ٥٤٥٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ بڕێ قاوت، یا هەندێ خورما، بکا بەمارەیی ژنێو لەسەر ئەو بڕە قاوتە، یان خورمایە، کە هەردوولا ڕێبکەون لەسەری، مارەی ببڕێ، ئەوا مارەی دێو گرێبەستی هاوسەری دادەمەزرێو ژنو پیاوەکە دەبن بەحەلاڵو هاوسەری یەکتری!).

دانەر دەفەرمووێ: ئەبو داوود ئەم فەرموودەیەی دەرهێناوەو ئاماژە دەکا بۆ ئەوە کە موقوف بێ لەسەر جابیرو مەرفووع نەبێ بۆ پێغەمبەر. شێخی ئەلبانی لەکتێبی (صحيح وضعيف الجامع للشيخ الألبانی)دا لە (باب ضعيف الجامع)دا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، کە ژمارەکەی (٥٤٥٣)یە.

١٠٦٢– وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ، عَنْ أَبِيهِ {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَجَازَ نِكَاحَ اِمْرَأَةٍ عَلَى نَعْلَيْنِ} أَخْرَجَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ ، وَخُولِفَ فِي ذَلِكَ.

{ضعيف الترمذی/١٩٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: ژنێکی بەنی فەرازەیی، لەسەر جووتێ سۆل

(نـەعل) شـووی کردبـوو، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی پێـی: (لـەجیاتی خـۆتو ماڵـت بـەجووتێ سـۆڵ رازی بوویـت؟). گـوتی: بـەڵێ رازیم. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) مارەبڕینەکەی دامەزرانـد. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣ن ژمارە: ٢٠٩٦ — ت:ص}.

١٠٦٣– وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {زَوَّجَ اَلنَّبِيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَجُلاً اِمْرَأَةً بِخَاتَمٍ مِنْ حَدِيدٍ} أَخْرَجَـهُ اَلْحَـاكِمُ. وَهُـوَ طَـرَفٌ مِـنَ الْحَدِيثِ اَلطَّوِيلِ اَلْمُتَقَدِّمِ فِي أَوَائِلِ اَلنِّكَاحِ. وَعَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: {لَـا يَكُونُ اَلْمَهْرُ أَقَلَّ مِنْ عَشَرَةِ دَرَاهِمَ} . أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ مَوْقُوفًا ، وَفِي سَنَدِهِ مَقَالٌ.

{بڕوانە: ژمارە: ١٠٠٥ کە لەپێشەوە رابورد}:

سـەهلی کـوڕی سـەعد (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) جـارێ مۆڵـەتی دا، کـە ژنـێ مـارە بـبڕێ لەسـەر ئەموستیلەیەکی ئاسن.

لە فەرموودەیەکی تردا، کە دارەقوطنی بەمەوقووفی لەسەر عەلی کوڕی ئـەبو طالیـب دەری هێنـاوە، عـەلی (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرمووێ: (نابـێ مارەیی لە دە درەم کەمتر بێ، کە دە درەمی ئەوکاتە، دەکاتـە دینـارێکی زێـڕی ئەو سەردەمە).

دانەر حافظی عەسقەلانی (رەحمەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرمووێ: ئـەم فەرموودەیەی کـە ئیمـامی عـەلی دەیگێڕێتـەوە، لەڕشـتەکەیدا، وتـی وتـی‌یـەك هەیە، کە ئـەویش ئەوەیـە: کـە مبـشری کـوڕی عوبەیـد، وا لەڕشـتەکەیدا، کـە بەدرۆ فەرموودەی بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵدەبەست.

١٠٦٤– وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {خَيْرُ اَلصَّدَاقِ أَيْسَرُهُ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ٥٥٩٠}:

عوقبـەی کـوڕی عـامیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرمووێ: (باشـترین مـارەیی ئەوەیـە کـە لەتوانادا بێو نەبێ بەئەرك بۆ زاوا).

١٠٦٥- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها): {أَنَّ عَمْرَةَ بِنْتَ اَلْجَوْنِ تَعَوَّذَتْ مِنْ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) حِينَ أُدْخِلَتْ عَلَيْهِ - تَعْنِي: لَمَّا تَزَوَّجَهَا - فَقَالَ: " لَقَدْ عُذْتِ بِمَعَاذٍ " ، فَطَلَّقَهَا ، وَأَمَرَ أُسَامَةَ فَمَتَّعَهَا بِثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ} أَخْرَجَهُ اِبْنُ مَاجَهْ ، وَفِي إِسْنَادِهِ رَاوٍ مَتْرُوكٌ.

{ضعيف ابن ماجة: ٤٤٢}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: عەمرەی کچی جەون، مارە بـڕا لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) کاتـێ گواسـتیانەوە بـۆیو پێغەمبەر چووە ناو پەردەوە لەگەڵیدا، ژنەکە ناڕەزای خۆی دەربـڕیو گـوتی: (أَعُوذُ باللهِ مِنْكَ) واتە: (پەنا دەگـرم بـەخودا لـەتۆ) پێغەمبـەریش تـەڵاقی داو، فەرمانی کرد بەئوسامە، کە سێ پارچە جلی پی خەڵات بکات.

دانەر حافظی عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: ئیبنو ماجە گێڕاویەتەوە، لەڕشتەکەیدا کەسێکی پشتگوێ خراوی وا تیادا. {بڕوانە: ژمارە: ١١١٦ لە دوواوە}.

١٠٦٦- وَأَصْلُ اَلْقِصَّةِ فِي " اَلصَّحِيحِ " مِنْ حَدِيثِ أَبِي أُسَيْدٍ اَلسَّاعِدِيِّ.

{مختصر صحيح البخاری/٥، ژمـارە: ١٧٨٧ = ٥٢٥٤ بوخـاری + تجریـد/٥، ژمارە: ١٧٨٨ = ٥٢٥٥، ٥٢٥٧ بوخاری}:

ئەمەیش دەقی ئەم فەرموودەیە، کە دانەر ئاماژەی بۆ دەکا:

ئـەبو ئوسـەید ئـەل - سـاعیدی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێکی خواست نـاوی عـەمرەی کچی جەون بوو، من چووم بـۆ وڵاتـی ژنەکـەو گواسـتمەوە بـۆ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

جا كاتێ هەواڵم بە پێغەمبەر دا کەوا بینتو لجەونمان هێناوە بەبووکێ بۆت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو ڕۆیشت بۆلای، ئێمەیش لەخزمەتیدا چووین، ڕۆیشتین لەخزمەتیدا هەتا گەیشتینە رەزە خورمایەکی شوورادار، کەپێی دەگوترێ: رەزی شەوطە، کەناوی باخێکی ناسراوە لەمەدینە، ڕۆیشتین هەتا گەیشتین بەدوو رەزە خورما، لە بەینیانا دانیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێوە لێرە دانیشن).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشتە ناو هۆدەیێ، لەناو رەزە خورمایەکا بوو، کەهۆدەی بووکەکە بوو، کە بینتولجەونی لەناو دابوو، کەناوی ئومەیمەی کچی نوعمان بوو، نازناوی بینتولجەون بوو، دایەنەکەیشی کە لەلەی بوو، لەگەڵیدا هاتبوو، جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەچووە ژوورەوە بۆناو پەردە بۆلای پێی دەفەرمووێ: (خۆتم پێ ببەخشە).

بینتولجەون گوتی: من شازادەمو تۆ مسکێنی، چۆن شازادە خۆی دەبەخشێ بەکابرایەکی بازاڕی مسکێنی وەك تۆ؟ فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەست دەبا، کە دەست بخاتە سەرشانی هەتا هێمنی بکاتەوە، بەڵام ژنەکە دەڵێ: (پەنا دەگرم بەخودا لەتۆ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ پێی: (بەڕاستی پەنات گرت بەکەسێ کە شایانی پەنا بۆ بردنە).

ئەوجا تەشریفی دێتە دەرەوەو واز لەژنەکەی دێنێو هات بۆلای ئێمەو فەرمووی: (ئەی ئەبو ئوسەید! دوو کراسی ئاودامانی بلوورینی سپی لەجۆری رازیقیەی بۆ بکەو، بیبەرەوە بۆ خاوەنی، ئەمە بۆ هاوسەرێتی من دەست نادات!). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی پێنجەم ژمارە: ١٧٨٨ - روونکردنەوە}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مارەیی مەرج نییە کە هەر پارەو سامان بێ، بەڵکوو هەموو شتێکی حەلاڵی بایەخدار، دروستە بکرێ بەمارەیی، وەك: ئازادکردنو فێرکردنی قورئانو فێرکردنی زانست یا فێرکردنی پیشەیەکی باش، یا مەڕێ، با کەمیش بێ.

٢- زۆرترین کات مارەیی ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (٥٠٠) پێنج سەد درەمی سەردەمی پێغەمبەر بووە، کە کردوویەتی: (٥٠٠ ÷ ١٠ = ٥٠) پەنجا لیرەی زێڕی سەردەمی پێغەمبەر. یا ئەگەر یەك دیناری زێڕی ئەو سەردەمە بەهەشت درەم دابنێین، دەکاتە:

(٥٠٠ ÷ ٨ = ٦٢/٥) شەستو دوو دینارو نیوی زێڕی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

٣- خێڵی زاوا، لەپاش مارەبڕین، هەر خەڵاتێکی کەسوکاری ژنەکە بکەن، دانانرێ بەشیربایی، بەڵکوو کارێ پەسەندە.

٤- ژن لەپاش مارەبڕین، ئەگەر بەر لەوە مێردەکەی بیگوێزێتەوە، مێردەکەی مرد، ئەوە ئەم بڕیارانە جێبەجێ دەکرێن:

آ- ژنەکە تەواوی مارەیی ناوبراوی خۆی دەکەوێ، خۆ ئەگەر مارەیی بۆ دیاری نەکرا بوو، ئەوا مانەندی مارەیی کەسوکاری خۆیی، بەتەواوی لە بەجێماوی مێردەکەی دەکەوێ، وەپشکە کەلەپووری خۆشی لێ دەگرێ، کە هەشت یەکە، ئەگەر پیاوەکەی ژنی تری نەبوو، بەلاّم منالّی هەبوو لەژنێکی تری، بەلاّم ئەگەر ژنی تری هەبوو، ئەوە لەچوار یەکی مالّی پیاوەکەدا، دەبێ بەهاوبەشی ژنەکانی تری، ئەگەر پیاوەکە منالّی نەبوو، یا دەبێ بەهاوبەشی هەشت یەك ئەگەر مێردەکە منالّی هەبوو لەژنێکی تری.

ب- دەبێ چوار مانگو دە شەویش حەیەی مەرگ (عِـدَّةُ الوَفَـاةِ) بۆ مێردەکەی بگرێ.

٥- هەموو شتێکی حەڵاڵی بایەخدار، با زۆر کەمیش بێ، وەك جووتێ سۆل، دروستە بکرێ بەمارەیی‌و ژنی لەسەر مارە ببڕێ، یا وەك قەڵەمێ، یا مەنێ گەنم.

٦- بەشێوەی گشتی: واباشە مارەیی بۆ زاوا نەبێ بەبارو شتێکی لەباری وابێ، کە بگونجێ لەگەڵ حاڵ‌و بۆ ژنەکەیش نەبێ، بەهۆی تانەو توانج‌و هاوسەر کەمی.

٧- لەهەموو بارێکا، کە ژن‌و مێرد لەیەك جیا دەبنەوە، با پیاوەتی‌و چاکە فەرامۆش نەکەن‌و بەشێوەیەکی شیاوو جوان لەیەکتر جیا ببنەوەو ڕێزی هەستی یەکتری بگرن، چونکە هەر هیچ نەبێ: ئەوان ڕۆژێ لە ڕۆژان دۆست‌و خۆشەویستی یەکتری بوون‌و گەلێ جار لەپاش لەیەکتری جیابوونەوە، منداڵ لەنێوانیاندا هەیە.

## ٦٣- باسی نانی شایی‌و شیرینی خواردنەوەو شتی تری لەم بابەتە
## باب: الوَلِمَةِ

{بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٢، زنجیرە: ٦٤٢ لە ژمارە: ٨٢٣وە هەتا ژمارە: ٨٢٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٤٠ لە ژمارە: (٢١٢٢)وەوە هەتا ژمارە: ٢١٢٩ + مختصر صحیح البخاری/٥، ژمارە: ١٧٦٩ — ١٧٧١}.

١٠٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) رَأَى عَلَى عَبْدِ اَلرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ، قَالَ: " مَا هَذَا ؟ "، قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! إِنِّي تَزَوَّجْتُ اِمْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ: " بَارَكَ اَللَّهُ لَكَ ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ٩٣٣ = ٢٠٤٨، ٣٧٨٠، ٣٠٤٩، ٢٢٩٣، ٣٧٨١، ٣٩٣٧، ٥٠٧٢، ٥١٤٨، ٥١٥٣، ٥١٥٥، ٥١٦٧، ٦٠٨٢، ٦٣٨٦ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨١٩ = شیحا ٣٤٦٥ = ١٤٢٧ مسلم.

ترمذی. نکاح: ١٠٩٤. نسائی. نکاح: ٣٣٧٢. ابن ماجة. نکاح: ١٩٠٧. تحفة الأشراف: ٢٨٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوێنەواری گیای زەعفەرانی بینی بە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە، کە زەعفەران گیایەکە لەیەمەن زۆرە، بۆنی خۆشەو شتی پێ زەرد دەکرێ، فەرمووی پێی: (ئەی عەبدوڕەحمان! ئەمە چی‌یە، خێرە؟) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ژنم هێناوە، بەم بۆنە خۆشەوە، ئەم بۆنە خۆشەو ئەم بۆیە جوانەم بەکارهێناوە، مارەییەکەی ناوکەیێ زێڕە، کەبایی پێنج درەمی زیوینە. فەرمووی: (دەی خودا پیرۆزی بکا لێت، ئەگەر مەڕێکت سەربڕیوە، نانی شایی دروست بکە). {فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ١٨٥} + {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٣} + {مختصر صحیح مسلم ژمارە: ١٣٤٤} + {مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٣٤٧}.

١٠٦٨- وَعَنْ اِبْنِ عُمَرَ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى اَلْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَلِمُسْلِمٍ: {إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ ، فَلْيُجِبْ" عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ}.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٧١ = ٥١٧٣، ٥١٧٩ بوخاری. مسلم/شیحا: ٣٤٩٥ – ٣٤٩٩ = مسلم ١٤٢٩. أبوداود. أطعمە: ٣٧٣٨. تحفة الباری: ٧٥٣٧}:

ئەم فەرموودەیە لەپوختەی موسلیما ئاوایە، داگر ترە، لەبەر ئەوە دەینووسین‌و ئیکتیفای پێ دەکەین:

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار، ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (کاتێ کەسێکتان موسوڵمانێ، کەبرای ئایینی‌یەتی، یا خوشکی

ئایینی‌یەتی، بانگی کرد بۆسەر بۆنەیێ، وەك شایی‌و زەماوەندو ئاهەنگی ڕەواو شتی تری لەم بابەتە، ئەوا بابچێت بەدەنگیەوەو خوڵکەکەی قەبووڵ بکات).

١٠٦٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {شَرُّ اَلطَّعَامِ طَعَامُ اَلْوَلِيمَةِ: يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا، وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ اَلدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اَللَّهَ وَرَسُولَهُ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{بوخاری. نکاح: ٥١٧٦ (٥١٧٧). أبوداود: أطعمه: ٣٧٤٢. مختصر صحيح مسلم/٢، زنجيره: ٦٤٢ ژماره: ٨٢٧ = شيحا: ٣٥١١ = مسلم ١٤٣٢}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (بەدترین نان نانی شایی‌و شیرینیە، کەبووە بە باوێکی خراپ، ئەوەی کەخۆی دەیەوێ بچێ بۆی ڕێگەی پێ نادەن، وەك هەژاران، وە ئەوەی کەخۆی دەعیەی نایبا، خوڵکی دەکەن بۆسەری، ئەو کەسەیشی خوڵك بکرێ‌و نەچێ ئەوە لەخوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٢١١٦}.

١٠٧٠- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ " فَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيُطْعَمْ} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ أَيْضًا.

{مختصر صحيح مسلم/٢، زنجيره: ٦٤٢، ژماره: ٨٢٦ = شيحا ٣٥١١ = مسلم/١٤٣٢}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (ئەگەر یەکێکتان خوڵك کران بۆسەر نانخواردن‌و شتی وا بابچێ، جا ئەگەر بەڕۆژوو بوو، مەرج نییە کەڕۆژووەکەی بشکێنێ، بەڵکوو نزای باشیان بۆ بکا بەسە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو ئەوا با خۆراك بخوا، یان خواردنەوەی حەڵاڵ بخواتەوە!).

١٠٧١- وَلَهُ مِنْ حَدِيثِ جَابِرٍ (رضى الله عنه) نَحْوُهُ. وَقَالَ: {فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ}.

{صحيح مسلم تخريج وتحقيق وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا رقم/٣٥٠٤}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان بانگ کران بۆ نانی شایی‌و شیرینی‌و بۆنەی خۆشی تری وا، با بچێ، جا کەچوو ئیتر خۆی لەوێ سەرپشکە ئەگەر حەزی هەبوو با بخوات، ئەگەر حەزیش دەکات با نەخوات).

١٠٧٢- وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { طَعَامُ الْوَلِيمَةِ أَوَّلَ يَوْمٍ حَقٌّ ، وَطَعَامُ يَوْمِ اَلثَّانِي سُنَّةٌ، وَطَعَامُ يَوْمِ اَلثَّالِثِ سُمْعَةٌ ، وِمَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللهُ بِهِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ وَاسْتَغْرَبَهُ ، وَرِجَالُهُ رِجَالُ اَلصَّحِيحِ.

{ضعيف الترمذى: ١٨٦}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (نان دروستکردنی ڕۆژی یەکەمی زەماوەندو شایی کارێ پێویستە، نان دروستکردنی ڕۆژی دووەم سوننەتە، نان دروستکردنی ڕۆژی سێیەم بۆ ڕواڵەتبازی‌و شانازییە، کەسێکیش شتێ بکا بۆ ڕواڵەتبازی خودا دەیکا بەپەند!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٢١٢٠}.

١٠٧٣- {وَلَهُ شَاهِدٌ : عَنْ أَنَسٍ عِنْدَ اِبْنِ مَاجَهْ}.

ئەم شاهیدەی کە دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئاوایە، لە ئەبوهورەیرەوە، نەك ئەنەسەوە:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (نانی شایی یەکەم ڕۆژی هەقە، دووەم ڕۆژی

باوێکی کۆمەڵایەتی جوانە، سێیەم ڕۆژی بۆ ڕەواڵەتبازییە!). {ضعيف الجامع: ١٩٥٠، ضعيف الإرواء: ٦١٦٧}.

(ڕوونکردنەوە):

١- وەك دەردەکەوێ فەرموودەی ژمارە: (١٠٧٢) لەگەڵ شاهیدەکەی، کە ژمارە: (١٠٧٣) هەردووکیان لاوازن، شاهیدەکەیش لە ئەبوهورەیرەوەیە، نەوەك لە ئەنەسەوە.

١٠٧٤- وَعَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: {أَوْلَمَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ بِمُدَّيْنِ مِنْ شَعِيرٍ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری = مختصر صحیحی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٧٠ = ٥١٧٢ بوخاری}:

صەفییەی کچی شەیبە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ یەکێ لەژنەکانی خۆی، کاتێ گواستیەوە، دوو موود جۆی کرد بەشایی. دوو موود واتە: نیو صاع.

(ڕوونکردنەوە):

صەفییەی کچی شەیبەی کوڕی عوسمان، لەهۆزی بەنی عەبدی دارە، ڕاجیایی هەیە لەوەدا، کە ئایا هاوەڵی پێغەمبەرە یان نا، ئیبنو حیببان دەفەرمووێ: لە بتمانەدارانی شوێنکەوتوانە، واتە: لە (ثقات التابعين)ە.

گێڕانەوەی لەعائیشەو ئوم حەبیبەو کەسانی تریشەوە هەیە. ئەم فەرموودەی مورسەلە، لەتەعلیقەکانی صەحیحی بوخارییە.

١٠٧٥- وَعَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: {أَقَامَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بَيْنَ خَيْبَرَ وَالْمَدِينَةِ ثَلَاثَ لَيَالٍ ، يُبْنَى عَلَيْهِ بِصَفِيَّةَ ، فَدَعَوْتُ اَلْمُسْلِمِينَ إِلَى وَلِيمَتِهِ ، فَمَا كَانَ فِيهَا مِنْ خُبْزٍ وَلَا لَحْمٍ ، وَمَا كَانَ فِيهَا إِلَّا أَنْ أَمَرَ بِالْأَنْطَاعِ ، فَبُسِطَتْ ، فَأُلْقِيَ عَلَيْهَا اَلتَّمْرُ ، وَالْأَقِطُ، وَالسَّمْنُ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدی بوخاری/٢ = مختصر صحيح البخاری بەرگی یەکەم ژمارە: ٢٣٥ = ٣٧١، ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٥٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣ بوخاری. مسلم/شیحا ٣٤٨٢ = مسلم/١٣٦٥}:

**ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحیح البخاری)دا ئاوایە:**

**ئیمامی ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپای ئامادە کردو بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ، تاریکولێڵەکە، لەپاڵ قەڵای خەیبەردا، نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وڵاخەکەی بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی خۆی بەناو کوچەو کۆڵانەکانی خەیبەردا غاردەدا، منو ئەبو طەلحە لەنزیکی پێغەمبەرەوە بووین، تەنانەت کەشکەژنۆم کە لەپاشکۆی ئەبو طەلحەی زڕبابمەوە بووم، دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) جا لەئەنجامی وڵاخ تاودانو جەنجاڵیو پاڵەپەستۆدا، ڕانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپیدەی ڕانی پێغەمبەرم بینی.**

**کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی هەڵڕژانە ناو گوندەکەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:**

{اللهُ أَكْبَر، خَرِبَتْ خَيْبَرْ لإنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ}.

**واتە: (ئەڵڵاهو ئەکبەر، وێران بوو خەیبەر، لەڕاستیدا ئێمە هەرکاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەو تۆقیوانە بەرایی بەیانی ڕۆژی ڕەشیانە).**

**وە ئەم فەرمایشتەی سێجار دووبارە کردەوە، کە ئەم نزایە وەرگیراوەو ئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ —**

١٧٧/٣٧ .الـصافات} . واتـه: كاتـێ تۆڵـەی سـەختی خـودا بـەردەرگا بـەهۆزی بێـبڕوا دەگـرێو، لەهـەموو لاوە گـەمارۆیان دەدا، ئـیتر ئـەو گەلـە تۆقیوانـە، سەرلە بەیانی رۆژی رەشیانە.

فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان، ئاگایان لـەم هەڵمەتـەی لەشـکرەی ئیسلام نەبوو، سەرلە بەیانی وەك رۆژانی تـر، وەدەرکـەوتن، بـۆ سـەر مـەزراو ئیش‌وکاری رۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی سوپای ئیسلاما، جا هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! خۆ ئەمە موحەممەدو سوپاکەیەتی هاتوون بۆسەرمان!.

ئەنەس فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بـەزەبری بـازوو لەچـنگی دوژمـن رزگـار کـرد، کاتـێ ژنـە دیلـەکان کۆکرانـەوە، دەحیـەی کـەلبی هاتـە خزمـەتی حەزرەت عەرزی کرد: ئەی پێغەمبـەری خـودا! لـەم ژنـە دیلانـە کـەنیزەکێکم پێ بدە. فـەرمووی: (بـڕۆ کـەنیزەکێ ببـە بـۆ خـۆت). دەحیـە پیاوێکی قـۆزی شـۆخ بـوو، زۆرجـاران جوبرائیـل لەشـێوەی ئـەودا دەهـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەرو نیگـاو سروشـی بـۆی دەهێنـا، دەحیـە رۆیـشت لەژنـە دیلـەکان صـەفییەی کـچی حویـەی بـرد بۆخـۆی، بـەڵام پیـاوێ هـات گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حویـەی، کـە گـەورە خـانمی ژنـانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەضیرە، داوتە بە دەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەو خاتوونـە خانەدانـە بـۆ کەسـی تـر دەسـت نـادات، مەگـەر هـەر بۆخـۆت، ئـەی پێغەمبەری خودا! ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئادەی دەحیە بانگ بکەن بۆم، با ئەو ژنە بهێنێ بۆم!).

دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بەدەحیەی فـەرموو: (بـڕۆ لـەو ژنگـە لـە بەتاڵانگیراوانە، کەنیزەکێکی تر بۆخۆت بـەرە). فـەرمووی: ئـەوجا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) صـەفییەی ئـازاد کـردو مـارەی کـرد بۆخـۆی.

ثابيتى بەنانى (رەحمەتى خوداى لێ بێ) بەپێشەوا ئەنەسى فەرموو: (ئەى باوكى حەمزە! چى كرد بەمارەيى بۆى؟). فەرمووى: خودى خۆى كرد بەمارەيى بۆى، لەپێشا لەباتى مارەيى ئازادى كردو ئەوسا مارەى كرد لەخۆى. جا كاتێ گەڕانەوە بەرەو مەدينە، لەڕێگە شەوێ، ئومموسولەيمى دايكم، كەخێزانى ئەبو طەلحەى زڕبابى ئيمامى ئەنەس بوو، تەدارەكى بۆ صەفييە خستو جيازيى بوكێنى بۆيكردو كردى بە بووكو پێشكەشى كرد بە پێغەمبەر، بۆ بەيانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) زاوا بوو، ئەوسا فەرمووى: (هەركەسێ خۆراكى هەيە، با بچێ بيهێنێ!).

ئەنەس فەرمووى: نانى شاييەكەى بريتى بوو لەوە كە حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمانى كرد: سفرەيەكيان ڕاخست، ئيتر هەركەس لەلاى خۆيەوە هەنێ خورما، يا ڕۆن، يا قاوت، يا كەشكى هێناو هەڵيان ڕشتە سەر ئەو سفرەو كرديان بەخورماو ڕۆنو، دەستيان كرد بەنۆش كردنى، ئيتر هەر ئەوە نانى شاييەكەى خاتوو صەفييە بوو. {تاج/٣/٩٣/٣ = تاج/٣، زنجيرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٤ ج/٤ = چاپى چوارەم + تاج/٤، ص٣٦٨، ص٤٢٢}.
بۆ ژياننامەى ئەبو طەلحە بڕوانە: (مختصر صحيح مسلم بەرگى دووەم ژمارە: ٨٠٦ + ژمارە: ٢٣٥ تجريدى بوخارى).

١٠٧٦- وَعَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم) قَـالَ: {إِذَا اِجْتَمَعَ دَاعِيَانِ ، فَأَجِبْ أَقْرَبَهُمَا بَابًا ، فَإِنْ سَبَقَ أَحَدُهُمَا فَأَجِـبِ اَلَّـذِي سَبَقَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَسَنَدُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف الجامع للشيخ الألباني رقم/٢٩٠}:

لەتاجول ئوصول دا ئاوايە:

پياوێ لەيارانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (ئەگەر دووكەس بەيەكەوە

بانگێشتنیان لێ کردیت، بچۆ بۆسەر خوڵکی ئەوەیان کە دەرگاکەی نزیکترە، چونکە کامەیان دەرگاکەی نزیکتر بێ، ئەوەیان دراوسێی نزیکە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان لەپێش ئەوی تریانا خوڵکی کردیت ئەوە بچۆ بۆسەر دەعوەتی ئەوەیان). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٢١٢١}.

١٠٧٧- وَعَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا آكُلُ مُتَّكِئًا} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٠٦ = ٥٣٩٩، ٥٣٩٨}:

ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی لەلا بوو، فەرمووی پێی: (من بەپاڵەوە شت ناخۆم). {تاج/٤، لاپەڕە/٥١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١٢ + ریاض صالحین/٢، لاپەڕە/٢٥٨، زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ٧٤٦ + تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٧ چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

پەیوەندی ئەم ژمارەیەو ژمارەکانی دوایەوە، هەتا باسەکە تەواو دەبێ، بەبابەتی نانی شایەوە، لەو ڕووەوەیە، کەدەستووری نانخواردن چۆنەو چۆن نییە، وە ئەم دەستوورانە لەهەموو بۆنەیەکا هەمان شتە.

١٠٧٨- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {يَا غُلَامُ ! سَمِّ اَللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٨٠١ = ٥٣٧٦، ٥٣٧٧، ٥٣٧٨ بوخاری. مختصر صحیح مسلم = پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٣٠٠ = شیحا ٥٣٣٧ = مسلم/٢٠٢٢}:

له پوختەی موسلیم دا ئاوایە:

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: منداڵ بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخێوی دەکردم، چونکە زڕ

کوڕی بووم، کوڕی ئوممو سەلەمە بووم، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی بێ). کە نانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو لەگەنەکەدا، بە ئارەزووی خۆم. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمێی کردمو فەرمووی پێم: (رۆڵە! کە نان دەخۆی لەسەرەتاوە ناوی خودا بهێنەو بیسمیلا بکەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست مەگێڕە بەملاولادا، مەگەر لەبەر مەهانەی ڕەوا).

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر لەوساوە کە ئەمەم لە پێغەمبەر بیستووە، هەتا ئێستا هەر بەم شێوەیە نان دەخۆم، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فێری کردووم! {ریاض/١/٢٥٠. زنجیرە: ٣٨، ژمارە: ٢٩٩ + ریاض/٢/٢٤٨، ژمارە: ٧٢٨، زنجیرە: ١٠٠ + تاج/٣، لاپەڕە/١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٧}.

(ڕوونکردنەوە):

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (رەزای خودا لەخۆیو لە ئەبو سەلەمەو ئوم سەلەمەی باوكو دایکی) خۆیو باوكو دایکی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، زڕ کوڕی پێغەمبەرە، چونکە کوڕی ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەرە، لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، کە ئەوکاتە باوكو دایکی لەپێناوی ئایینی ئیسلامدا، لە مەککەوە لەتاو زوڵمو زۆرو ئازاردانی ناموسوڵمانەکان، ڕەوو کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە، کە ئەوسەردەمە پادشایەکی دادپەروەری لێ بووە، کە پەنای موسوڵمانەکانی داوە، عومەر چەند فەرموودەیەکی لەصەحیحەیندا هەیە، تەنها دوو فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، کە یەکێکیان ئەم فەرموودەیەی ئێرەیە، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا، لەشاری مەدینە، لەهەشتاو سێی کۆچیدا، بەمردنی خودا مردووە، نزیکەی هەشتا ساڵێ ژیاوە، لەلایەنگرانی ئیمامی عەلی بوو، لەشەڕگەی ئەل - جەمەلدا

لەگەڵ عەلی بوو، لەدژی لەشکری عائیشە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ).

هەندێ بەهەڵە دەڵێن: عومەر لەم جەنگەدا کوژراوە. عومەر لەدوو سەرەوە خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەردا هەیە.

یەکەم: ئەبو سەلەمەی باوکی، پوورزای پێغەمبەرە کوڕی بەڕرەی کچی عوەبدولموطەلیبە کە بەڕرە لەباوکەوە پووری پێغەمبەرە، خوشکی عەبدوڵڵای باوکیەتی، کەواتە: عومەر پورزای پێغەمبەرە.

دووەم: ئەبو سەلەمە برای شیری پێغەمبەرو حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیبە، ثوەیبەی دایەنی پێغەمبەر شیری داوە بەهەرسێکیان.

ئەبو سەلەمە ئامادەی شەڕگاکانی بەدرو ئوحود بووە، کاتێ لەشەڕی ئوحود گەڕایەوە، ئەبو سەلەمە مرد، یازدەهەم کەس بووە کە موسوڵمان بووە. ئیبنو ئیسحاق دەفەرمووێ: یەکەم کەس بووە کە کۆچو ڕەوی کردووە بۆ حەبەشە کاتێ پێغەمبەر ڕۆیشت بۆ غەزای (العشیرة) لەساڵی دووی کۆچیدا، ئەبو سەلەمەی کرد بەمیری سەرشاری مەدینە، هەتا خۆی دەگەڕێتەوە لەپاش گەڕانەوە لەغەزای ئوحود، لەساڵی چواری کۆچیدا کۆچی دوایی کرد، هەندێ دەڵێن: لەپاش نەبەردی بەدر مردووە. {بڕوانە: ژمارە: ١٩ لەم پەڕاوە بۆ ژیاننامەی ئوم سەلەمەی دایکی عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە}.

١٠٧٩- وَعَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) " {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أُتِيَ بِقَصْعَةٍ مِنْ ثَرِيدٍ، فَقَالَ: "كُلُوا مِنْ جَوَانِبِهَا، وَلَا تَأْكُلُوا مِنْ وَسَطِهَا، فَإِنَّ اَلْبَرَكَةَ تَنْزِلُ فِي وَسَطِهَا} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ، وَهَذَا لَفْظُ النَّسَائِيِّ، وَسَنَدُهُ صَحِيحٌ.

{صحيح الجامع: ٤٥٠١} لەکتێبی {صحيح وضعيف الجامع للشيخ الألباني}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) دەفەرمووێ: قەرەوانەیێ تریتیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری دەست پێکردن

بەنانخواردنی روونکردەوە بۆیان و لەم سونگەیەوە فەرمووی: (کە نان دەخۆن لەتەوقە سەری دەفرەکە مەخۆن، بەڵکوو لەتەنیشتیەوە بخۆن، چونکە پیتو فەڕو پیرۆزی لەتەوقە سەرەکەیەوە دێتە خوارەوە). لەگێڕانەوەی ئێرەدا:

(پیتو فەڕو پیرۆزی لەناوەڕاستی خۆراکەوە دێتە خوارەوە، جا لەبەر ئەوە لەملاو لاکەیەوە بخۆن و لەناوەڕاستەکەیەوە مەخۆن!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥١}.

دانەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: ئەم زاتانە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە: ئەبو داوود (٣٧٧٢) لە (الأطعمە)داو، تەرمەزی (١٨٠٥) لە (الأطعمە)داو، نەسائی (٦٧٦٢) لە (الکبری)داو، ئیبنو ماجە (٣٢٧٧) لە (الأطعمە)دا، وە ئەمە دەقی فەرموودەکەی نەسائی‌یە لە (السُّنَنُ الکُبری)دا، وە رشتەی فەرموودەکە دروستەو تەندروستە.

١٠٨٠– وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَا عَابَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) طَعَامًا قَطُّ ، كَانَ إِذَا اِشْتَهَى شَيْئًا أَكَلَهُ ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٤٢٦ = ٣٥٦٣، ٥٤٠٩ بوخاری مختصر صحیح مسلم/٣، ژمارە: ١٣٣٤ = شیحا ٥٣٥١ = ٢٠٦٤ مسلم}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خراپەو نەنگ لەخواردن و نان و ئاو بگرێ، دەستووری وابوو، ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە وازی لێ دەهێناو بەس، وە نەنگو رەخنەی لێ نەدەگرت. {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٥٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٧٣٦ + تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٦}.

١٠٨١– وَعَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) ، عَنْ رَسُولِ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا تَأْكُلُوا بِالشِّمَالِ " فَإِنَّ اَلشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِالشِّمَالِ} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٩٨ = شيحا ٥٢٣٣ = ٢٠١٩ صحيح مسلم}:

**لەموختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوا گشتگیرترە:**

**ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێ لەئێوە نان دەخوا، یا شت دەخواتەوە، سوننەتە کە بەدەستی ڕاستی شتەکە بخوات، یا شتەکە بخواتەوە، بەبێ مەهانەی ڕەوا شت بەدەستی چەپی نەخوات، یا نەخواتەوە، هەتا نەبی بەلاسکایی شەیتان، چونکە شەیتان بەدەستی چەپی شت دەخواو شت دەخواتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٦ان ژمارە: ٢٦٤٤}.**

١٠٨٢- وَعَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ ، فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي اَلْإِنَاءِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/١، ژمارە: ١٢١ = ١٥٣، ١٥٤، ٥٦٣٠ بخارى. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٩٢ = شيحا ٥٢٥٣ = ٢٦٧ صحيح مسلم. ترمذى. أَسْرِبة: ١٨٨٩. نسائى. طهارة/٤٧، ٤٨. ابن ماجة. طهارة/٣١٣}:

**ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ شت دەخۆنەوە لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن!). {تاج/١، زنجیرە: ٤، ژمارە: ١٩٤ ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

١٠٨٣- وَلِأَبِي دَاوُدَ: عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنها) نَحْوُهُ ، وَزَادَ: {أَوْ يَنْفُخْ فِيهِ} وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح الجامع: ٦٨٢٠}:

**لە تاجا ئاوایە:**

**ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیدەهێشت کە لەکاتی شت خواردنەوەدا فووی**

لێ بکرێ، پیاوێ گوتی: ئەی ئەگەر پوشکەیەکم بەسەر ئاوەکەوە لەناو جامەکەدا دی چۆن بکەم؟

فەرمووی: (بەلێوی جامەکە بیڕێژە). گوتی: باشە ئەی ئەگەر بەیەك بێین تێرم نەخواردەوە چی بکەم؟ فەرمووی: (جامەکە لەدەمت دوور بکەرەوەو ئەوسا هەناسە بدەو دیسانەوە تێ هەڵچۆرەوە تا تێر دەخۆیتەوە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٧٠}.

(ڕوونکردنەوە):

١- جلو بەرگی باشو تازەو خۆجوانکردنو بەکارهێنانی بۆنی خۆشو بەکارهێنانی بۆیەو ڕەنگ وەك خەنەو بۆنی میسكو ڕەنگو بۆنی زەعفەران، بەبۆنەی ژن هێنانو شووکردنەوە، ئەمانە هەموو باشو پەسەندو سوننەتن.

٢- شایی کردنو نانی شایی کردنو دەربڕینی خۆشی بەم بۆنەیەوە کارێ پەسەندو زۆر زۆر باشە.

٣- چوون بۆسەر خوانی ئاهەنگی ڕەوا، ئەگەر پێویست (واجب) نەبێ کارێ زۆر سوننەتە.

٤- نانی شایی دەبێ بەنیازی سوننەتی پێغەمبەر بێ، نەوەك بۆ فیزو شانازی.

٥- دەستووری شت خواردنو شت خواردنەوە وا پەسەندە، کە بەشێوەیێ بەڕێزو پەسەند بێ، لەرووی کۆمەڵایەتییەوە، هەروا لەرووی پزیشکییەوە.

٦- وا سوننەتە، لەکاتی نانخواردندا، لەلاوە لێی بخورێ، نەك لەناوەڕاستیەوە.

٧- ناوناتۆرە لەخواردنو خواردنەوە نەنرێ، مەگەر مەبەست لێی قسەی خێر بێ، وەك کەسێ بڵێ: من شەکرەمە خورماو ڕۆن بۆ من خراپە، کەمێ نانو دۆم بۆ بهێنن، خورما ناخۆم.

٨- بەکارهێنانی دەستی ڕاست لەکاتی نانخواردنو خواردنەوەدان بۆ کەسێ مەهانەی ڕەوای نەبێ، سوننەتە، بگرە پێویستە، ئەوەندەی دەتوانێ بەدەستی چەپ نە شت بخواتو نەشت بخواتەوە، ئەگەر لەبەر ناچاری بەدەستی چەپی شتی خوارد، یا خواردەوە با (بسم الله) بکا، ئیتر شەیتان تڕۆ دەبێو نابی بەلاسکایی ئەوو هاوبەشی لەگەڵیدا ناکا، لەو کارەدا، چەپەوانەیی دادەنرێ بەمەهانەی ڕەوا.

٩- مەبەست لەوە کە لەناو جامەکەدا هەناسە نەدا، ئەوەیە: کەپاکیو خاوێنیو تەندروستی رەچاو بکرێو ئێمە لەهیچ کاتێکا نەبین بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەتاو میکرۆبو گواستنەوەی ماکی نەخۆشی لەناو کۆمەڵگادا.

## ٦٤- نۆرە کاریی (قەسم) لەنێوانی هاوسەراندا
## باب: القَسْمِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دوو، زنجیرە: ٥٠، لە ژمارە: ٢١٧٢ هەتا/٢١٨٣ + فیقهی ئاسان بەرگی دوو، زنجیرە: ٢٧٠}.

١٠٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْسِمُ ، فَيَعْدِلُ ، وَيَقُولُ : "اَللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ ، فَلَا تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلَا أَمْلِكُ } رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ وَالْحَاكِمُ ، وَلَكِنْ رَجَّحَ اَلتِّرْمِذِيُّ إِرْسَالَه.

{ضعيف الجامع: ٤٥٩٣. أبوداود: ٢١٣٤. نسائی٦٣/٧. ترمذی: ١١٤٠. ابن ماجة: ١٩٧١. ابن حبان: ٤٢٠٥. حاكم٢٠٤/٢}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نۆرەکاریو نۆرەشەوانەی لەناو ژنەکانیا رادەگرتو لەنگەری دادی

لەنێوانیانا ڕەچاو دەکردو وەك یەك بەشەو بەسەرە لەلایان دەمایەوە، ئینجا دەیفەرموو: (خودایە! ئەمە نۆرەشەوو نۆرەکاری منەو، من هەر ئەم دابەشکردنەم لەدەست دێ، ئیتر لەسەر ئەوەی کە بەدەستی تۆیەو دەسەڵاتی منی تیادا نییە، کە حەزو مەیلی دڵە، سەرکۆنەو سەرزەنشتم لەسەر ئەوە مەکە کە لەدڵەوە یەکێ لەژنەکانم زۆرتر خۆش دەوێ لەیەکێکی تریان).
{تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٢}.

١٠٨٥- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {مَنْ كَانَتْ لَهُ اِمْرَأَتَانِ ، فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا ، جَاءَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ ، وَسَنَدُهُ صَحِيحٌ.

{صحيح أبي داود: ١٨٦٧ – أحمد٢/٢٩٥. أبوداود: ٢١٣٣. ترمذى: ١١٤١. نسائى٧/٦٣. ابن ماجة: ١٩٦٩. ابن حبان٢/٢٠٣ + ٤٢٠٧}:

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر کەسێ دوو ژنی هەبێ، بەڵام یەکێکیانی زیاتر بوێ‌و لایەنی ئەو زیاتر بگرێ‌و دادپەروەر نەبێ لەنێوانیادا، ئەوە لەڕۆژی قیامەتا ئەو کابرایە کەدێت بۆ دیوانی خودا، لایەکی لەشی لەنگە، وەك پیاوی ئیفلیج). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧١}.

١٠٨٦- وَعَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: {مِنَ اَلسُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ اَلرَّجُلُ اَلْبِكْرَ عَلَى اَلثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا ، ثُمَّ قَسَمَ ، وَإِذَا تَزَوَّجَ اَلثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا ، ثُمَّ قَسَمَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ.

{تجريدى بوخارى/٥، ژمارە: ١٧٧٧ = ٥٢١٣، ٥٢١٤ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٠ = ٣٦١١ شيحا = صحيح مسلم: ١٤٦١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: سوننەت وایە، ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بیوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرەشەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ، سێ

شـەو لـەلای بـێ، ئینجا بـەنۆرە وەك یـەك نۆرەشـەویان بـۆ دابنـێ. خالیـد فەرمووی: ئەگەر بمەوێ رستەی (ئەنـەس فـەرمووی: سوننەت وایـە: ئەگـەر پیـاو کـچی هێنـا بەسـەر بێـوەژن، حـەوت شـەو لـەلای بـێ، ئەوسـا بەسـەرە نۆرەشەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنـا بەسـەر کـچ، سـێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرەشەویان بۆ دابنـێ) ئەگـەر بمـەوێ ئەم دەقە بەمەعناو واتا ریوایەت بکەم، لەباتی ئەوەی بڵێم ئەنەس فەرمووی: (سوننەت وایە ئەگەر ..... تاد) دەڵێم: ئەنەس فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسـەر بێـوەژن، حـەوت شەو ........ تادوایی).

چـونکە ئـەم دوو ڕسـتەیە یـەك واتایـان هەیـە، چ بڵێـی پێغەمبـەر فەرمووی: چ بڵێی سـوننەت وەهایـە، یـەك شـتە. گـوتنی یـەکێکیان لەجێگـەی ئەوی تریان گێڕانەوەیە بە واتایە!!. {تاج/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٢١٧٧}.

١٠٨٧– وَعَنْ أُمِّ سَـلَمَةَ (رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهـا): {أَنَّ اَلنَّبِـيَّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) لَمَّا تَزَوَّجَهَا أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا، وَقَالَ: " إِنَّهُ لَيْسَ بِكِ عَلَـى أَهْلِـكِ هَـوَانٌ ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي} رَوَاهُ مُسْلِم.

{مختصر صحيح مـسلم/٢، زنجـيرە: ٦٥٣، ژمـارە: ٨٣٩ = ٣٦٠٦ شـيحا = ١٤٦٠}:

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی گواستەوە، سێ شەو لەسەر یەك لـەلام مایـەوە، ئـەنجا فەرمووی: (وامەزانە کە لەبەر ئەوەی کەسێ شەو دەمێنمەوە لەلات، کەتۆ بـێ قـەدری لـەلام، نـەء، لەبـەر ئـەوە نییـە، بـەڵکوو تـۆ ڕێـزداری لـەلام، بـەڵکوو سوننەت وایە: کەمێرد لەلای بووك ئەگەر بێـوەژن بـوو، سـێ شـەو بمێنێتـەوە خۆ ئەگەر حەزیش دەکەی بۆتی دەکەم بە حەوت شەو، بەڵام ئەوەنـدە هەیـە

ئەگەر بۆ تۆ بیکەم، بە حەوت شەو، دەبێ بۆ ژنەکانی تریشم بیکەم بە حەوت شەو). {تاج/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٢١٧٨}.

١٠٨٨- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ ، وَكَانَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريدى بوخارى/٣، ژمارە: ١١٠٧ = ٢٥٩٣، ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥ بوخارى. مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٦٥٤، ژمارە: ٨٤١ = مسلم/شيحا/٣٦١٤ = صحيح مسلم/١٤٦٣}:

**لە پوختەی موسلیما ئاوایە:**

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێت) فەرمووی: خۆزگەم بەهیچ ژنێ نەخواستووە، کە من لەجێگەی ئەو بم بە سەودەی کچی زەمعە نەبێ، کە یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بوو، لەپاش مەرگی خەدیجەی یەکەم هاوسەری پێغەمبەر، گەرچی سەودە کەمێ زوو تورە دەبوو، بەڵام زووش هێمن دەبۆوە، لەبەر ئەوەیش خۆزگەی پێ دەبەم، چونکە بەڕاستی ئافرەتێکی رەوشت بەرز بوو، هەتا بڵێی مەرد بوو، زۆر خواپەرست بوو، پەرستشی زۆری دەکرد، سەودە (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ پیر بوو، عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! نۆرە ڕۆژی خۆم، کە تۆ بەشەو دەمێنیتەوە لەلام دەیبەخشم بەعائیشە، چونکە من پیر بووم، نەبادا دڵت گەرد بگرێ لەمن، ئاواتی گەورەی من، دڵ ڕاگیرکردنی تۆیەو ئەوەیە کە لە هەردوو جیهاندا هاوسەری تۆ بم!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو رۆژی سەرە دادەنا بۆ عائیشە، رۆژەکەی عائیشە خۆیو رۆژەکەی سەودە. {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

١- سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیس (رەزای خودای لێ بێ) قورەیشییە لەبەرەی عامرییە، دووەم هاوسەری پێغەمبەرە، لەپاش خەدیجە سەودەی هێنا، لە مەککە گواستیەوە، لەپێشا ژنی سەکرانی کوڕی عەمر بوو کە ئامۆزای خۆی بوو، ئیسلام بوو، کاتێ سەکران مرد، شووی کرد بە پێغەمبەر، لە پێغەمبەر منالی نەبوو، یەکێکە لەدایکانی بڕواداران (أُمَّهَاتُ الْمُؤْمِنِينَ). خۆیو مێردەکەی سەکرانی کوڕی عەمر لەکۆچی دووەما بۆ حەبەشە، کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، ئەوجا گەڕانەوە بۆ مەککە، لەوێ لە مەککە سەکرانی مێردی مرد، پێغەمبەر مارەی کرد، وە هەر لەمەککە گواستیەوە، لەسالی دەی پێغەمبەرایەتیدا، واتە: سیازدە سال زیاتر هاوسەری پێغەمبەر بووە، لەئاخرو ئۆخری سەردەمی پێشەوا عومەردا مردووە، لەسالی (٥٤) پەنجاو چواری کۆچی. جارێ ئیمامی عومەر خەرارێ درەمی نارد بۆی، سەودە پرسی: ئەمە چی‌یە؟ گوتیان: درەمە، پارەی زیوینە لەجۆری درەم، عومەر بۆی ناردووی، بۆ خەرجی بۆ خۆت! گوتی: پارە وای لێ هات کە لەخەرارا، وەك خورما دابنرێ، ئیتر هەمووی دابەش کرد بەسەر هەژاراندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی رەمەزانا سەودەی مارە کردو کۆچی پێ کرد بۆ مەدینە سەودە زۆر خێرکەر بوو.

١٠٨٩- وَعَنْ عُرْوَةَ قَالَ: {قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا اِبْنَ أُخْتِي ! كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لَا يُفَضِّلُ بَعْضَنَا عَلَى بَعْضٍ فِي اَلْقَسْمِ مِنْ مُكْثِهِ عِنْدَنَا ، وَكَانَ قَلَّ يَوْمٌ إِلَّا وَهُوَ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعًا ، فَيَدْنُو مِنْ كُلِّ اِمْرَأَةٍ مِنْ غَيْرِ مَسِيسٍ ،

حَتَّى يَبْلُغَ اَلَّتِي هُوَ يَوْمُهَا ، فَيَبِيتَ عِنْدَهَا } رَوَاهُ أَحْمَدُ ، وَأَبُو دَاوُدَ وَاللَّفْظُ لَهُ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حسن صحيح، صحيح أبي داود: ١٨٦٨. حاكم٢/١٨٦}:

**عوروەی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکیو لە ئەسمای دایکی، کە کچی ئەبوبەکری صەدیق بوو خوشکی باوکی حەزرەتی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو) فەرمووی: عائیشەی پوورم فەرمووی پێم: ئەی خوشکەزای شیرینم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نۆرەشەوداو لە بەشدان پێمان، بەئێمەی هاوسەرانی خۆی، جیاوازی لەنێوانماندا نەدەکرد، وەك یەك دەمایەوە لەلای هەمووومان، مەگەر چۆنەهایش دەنا هەموو ڕۆژێ، یەکە یەکە سەری لێمان دەداو بەسەری دەکردینەوەو دەهات بە لامانەوە، بەڵام بەبێ چوونەلاو جووتبوون، تا دەگەیشتە لای ئەو ژنەی کە ئەو ڕۆژە سەرەی خۆی بوو، ئیتر شەو لەلای دەمایەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٣}.**

**(ڕوونکردنەوە):**

**عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام، کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بوو، زانایەکی گەورە بوو، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشەی پووری دەبوون، کە عائیشە لەماڵی خۆیدا، لەمەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو ڕاگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە بۆ ڕوونکردنەوەو ڕاڤەو تەفسیری ئایەتەکانی قورئان.**

**عوروە یەکێکە لەپێشەوا هەرە ناودارە ڕێزدارە مەزنەکانی پەیڕەوان، کەپێیان دەگوترێ: (تابیعین، واتە: چینی دووەمی موسوڵمانان، کەفریای پێغەمبەر نەکەوتوون، بەڵام فریای صەحابەکانی کەوتوون).**

عوروه یەكێكه له حەوت مەلا ناوداره گەورەكانی جیهانی ئیسلامی، كه لـەزاراوەی شـەرعدا نـاودارو ناسـراون بـە (فوقـەهای سـەبعه = حـەوت شەرعزانەكان) كه ئەم زاتانەن:

١- عوروەی كوڕی زوبەیری كوڕی عەوام.

٢- سەعیدی كوڕی موسەییب.

٣- عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عوتبه.

٤- قاسمی كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكری صەدیق.

٥- سلێمانی كوڕی یەسار.

٦- خاریجەی كوڕی زەیدی كوڕی ثابیت.

٧- سالمی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر.

دایكـی عـوروه نـاوی ئـەسمائی كـچی ئەبوبـەكری صـەدیقه، كەخوشـكی باوكی عائیشەیه، خاوەنی ئەم بەهرەو شانازییانەیه:

١- پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، مێردی پووریەتی.

٢- ئەبوبەكری صەدیق باپیریەتی باوكی دایكیەتی.

٣- زوبەیری كوڕی عەوام باوكیەتی.

٤- ئەسمائی كچی ئەبوبەكری صەدیق دایكیەتی.

٥- عائیشەی كـچی ئەبوبـەكری صـەدیق پووریـەتی، خوشـكی دایكیـەتی، عوروه ساڵی (٢٠) بیستی كۆچی لەدایك بووه، له (٩٤) نەوەدو چواری كۆچیدا مردووه، واته: (٩٤ — ٢٠ = ٧٤) حەفتاو چوار سـاڵ ژیـاوه. كۆمەڵەی فـەرمووده شوناسەكان فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوه، واته: جێگەی متمانەی ئەوانه، كەواته: لەپیاوانی صەحیحی بوخاریو صـەحیحی موسـلیمه، لـەناو پـەیڕەوان (تابعین)دا، عوروەی كوڕی زوبەیر ناوی تریـان تیـادا نییـه، بـۆ زێـده بـەهرەو شارەزابوون بڕوانه: ئەم ژمارانه، لەم پەڕاوه:

١- ژماره/٣٤ ئەسمائی كچی ئەبوبەكری صەدیق.

٢- ژماره/٣٣٨ ئەبوبەكری صەدیق.

٣- ژماره/٩٢١ عوروة بن زبیر + ژماره/٩٤١.

هەروا بڕوانە: (تاج/٣، زنجیره: ١٠، ژماره: ٣٣١٢، ٣٣١٩ — مەزناهی زوبەیری كوڕی عەوام + ژماره: ٣، لە تجریدی بوخاری، بەرگی یەكەم + ژماره: ٣٤٩ = ٦٠٢ بوخاری + ژماره: ٧٥ تجرید + تاج/٣، زنجیره: ٣٧ ژیاننامەی خاتوو عائیشە + ریاض/١، زنجیره: ٢٥، ژماره: ٢٠٢ + تاج/٥، زنجیره: ٩٧، ژماره: ٥٥٣٩).

١٠٩٠- وَلِمُسْلِمٍ : عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا صَلَّى اَلْعَصْرَ دَارَ عَلَى نِسَائِهِ ، ثُمَّ يَدْنُو مِنْهُنَّ } اَلْحَدِيثَ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٨٥٤ = مسلم ترقيم شيحا/٣٦٦٤ = صحيح مسلم/١٤٧٤}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیەیە لە (مختصر صحیح مسلم)دا:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درووودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرە پاكیزەكانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەحەڵواو هەنگوین بوو، گەلێ جار لەپاش كردنی نوێژی عەصر، دەچوو بۆ لای هاوسەرەكانی، یەكە یەكە هەواڵی دەپرسین‌و سڵاوی لێ دەكردن، ئەوجا دەچوو بۆلای یەكێكیان‌و لەلای وچانێكی دەگرت‌و خۆی لێ نزیك دەكردەوە، ماچ‌و مۆچ‌و شتی وای لەگەڵدا دەكرد، بەڵام بەبێ دروست بوون‌و جووتبوون لەگەڵیدا، جارجارێ دەچووە هۆدەكەی حەفصەی هاوسەری، كە كچی عومەر بوو، زیاتر لەوەی كەچاوەڕوان دەكرا، لەلای حەفصە گلی دەخواردەوە، منیش دەماری هەوێباری گرتمی، كەپرسیم هۆی ئەم زیادە مانەوەی پێغەمبەر لەلای حەفصە چییە، پێیان گوتم: ژنێكی خزمی، دووبەرەیی هەنگوێنی بەدیاری بۆ هێناوە، ئەویش شەربەتی

هەنگوینی لێ دروست دەکاو دەیدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوهۆیەوە پێغەمبەر کەمێ زیاتر لەئاسایی لەلای حەفصە دەمێنێتەوە، منیش گوتم: بەخودا دەبی فێڵێکی وای لێ بکەین کەوازی لێ بهێنێ لەم مانەوەی لای حەفصە.

جا بەسەودەی کچی زەمعەم گوت: شتێکی وا هەیە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ لات پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆنی مەغافیرت لێ دێ، دەڵێی مەغافیرت خواردووە؟ ئەویش پێت دەفەرمووێ: (نا، مەغافیرم نەخواردووە!) تۆیش پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆری پێ زەحمەتە کەبۆنی ناخۆشی لێ بێت، لەبەر ئەوە پێت دەڵێ: (ئەوە حەپسە شەربەتی هەنگوینی پێم داوە). تۆیش پێی بڵێ: ئای ئەوە هەنگەکەی جەویی درەختی عورفوتی هەڵمژیوە، کەپێی دەگوترێ: مەغافیر، کاتێ هاتیش بۆلای من، منیش هەمان شتی پێ دەڵێم، وەتۆیش ئەی صەفییە! کاتێ لەسەرەی خۆتا پێغەمبەر هات بۆلات، هەمان قسەو پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵدا بکە.

سەودە (کە یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو، لەپاش مردنی خەدیجەی یەکەم هاوسەری) فەرمووی: بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە، لەترسی تۆ ئەی عائیشە! هەرکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، ویستم یەکسەر قسەکەی تۆ پێت گوتم پێی بڵێم، بەلام کەهاتە ژوورەوەو هاتە پێشەوەو لێم نزیکبۆوە گوتم پێی: ئەی پێغەمبەری خودا! مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟ فەرمووی: (حەفصەی خێزانم شەربەتی هەنگوینی دەرخوارد داوم). گوتم: دیارە کە هەنگەکەی مەغافیری هەڵمژیوەو کردوویەتی بەهەنگوین، کەشیلەی دارێکی دڕکاوییە، حوشتر دەیخوات، بە

عەرەبی پێی دەگوترێ عورفوط (ڕەنگە بەکوردی بەو درەختە بگوترێ مارگیرە).

عائیشە فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەی خۆما هات بۆلام، منیش هەروام پێی گوت، کاتێ لەسەرەی حەفصەیشدا دەچێ بۆلای، حەفصەیش هەروای پێ دەڵێ، کاتێ لەسەرەی حەفصەدا دەچی بۆلای، حەفصە پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! با شەربەتێکی هەنگوینت بۆ بکەم، دەفەرمووێ: (کارم پێی نییە).

عائیشە فەرمووی: جا سەودە بەمنی گوت: سبحان الله! کارێکی باشمان نەکرد، هەنگوینمان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغە کردو لێمان حەرام کرد. منیش پێیم گوت: دە وسبە، با فێڵەکەمان ئاشکرا نەبێ!. {تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٧٠٩ = ٤٩١٢، ٥٢١٦، ٥٢٦٧، ٥٢٦٨، ٥٤٣١، ٥٥٩٢، ٥٦١٤، ٥٦٨٢، ٦٦٩١، ٦٩٧٢ بوخاری + تجرید/٥، ژمارە: ١٧٩٠ = ٥٢٦٨ + تاج/٤، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤١٧٨ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٩١- وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا): {أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) كَانَ يَسْأَلُ فِي مَرَضِهِ اَلَّذِي مَاتَ فِيهِ : " أَيْنَ أَنَا غَدًا ؟ " ، يُرِيدُ : يَوْمَ عَائِشَةَ ، فَأَذِنَ لَهُ أَزْوَاجُهُ يَكُونُ حَيْثُ شَاءَ ، فَكَانَ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{مختصر صحيح البخاری/٢، ژمارە: ٦٦٣ = ١٣٨٩، ٤٤٥٠ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٦٦٣ = مسلم ترقيم شيحا ٦٢٤١ = مسلم/٢٤٤٣}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودی خودای لەسەر بێو سەروماڵو منداڵو دایکو باوکو هەستو نەست، گشتی بەقوربانی گەردی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ) لەنەخۆشی سەرەمەرگیدا، بەسەرەو نۆرە هەر ڕۆژەی لەماڵی یەکێ لەژنەکانی دەبوو، ئەڵهای نۆرە ڕۆژی منی بوو،

دەیفەرموو: (ئەمڕۆ لەکوێم، شسبەینێ لەلای کێم لەهاوسەرەکانم، دووسبەی لەلای کامیانم؟) بۆیە وای دەفەرموو: چونکە حەزی لەوە بوو کە لەو نەخۆشیەیدا لەماڵی من بمێنێتەوە، هەتا ژنەکانی ڕێگەیان پێی دا، کە حەزی لەماڵی کامیانە لەوێ بمێنێتەوە جا کەسەرەی ڕۆژی من هات، ئیتر لەلای من گلی خواردەوەو لەنێوانی ماڵی هاوسەرەکانیدا، ماڵەو ماڵی نەکرد، بەپێی نۆرە ڕۆژی ئاسایی هاوسەرەکانی، کە لەشەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ: (قەسم).

ئیتر لەو ماوەیەدا، خۆم خزمەتیم دەکرد، هەتا گیانی پاکی سپاردو شادبوو بەدیداری پەروەردگاری. جا وارِێکەوت، لەڕۆژی نۆرەسەرەی خۆما، لەڕۆژانی دەورو قەسمە ئەصڵییەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباوەشمدا بوو، پشتی پیرۆزی دابوو بەسینگو بەرۆکمەوە، کەخودای مەزن گیانی کێشاو ڕۆحی موبارەکی وەرگرتەوە!. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٦}.

١٠٩٢- وَعَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا، خَرَجَ بِهَا} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١١٠٧ = ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٧٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٩٠، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥ + تجريد/٣، ژمارە: ١١٢١ = ٢٦٦١ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٥، ژمارە: ٢١٥٣ = شیحا: ٦٩٥١ = صحيح مسلم: ٢٤٤٥}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کاتێ دەڕۆیشت بۆ سەفەرێ، لەنێوانی خێزانەکانیدا، تیروپشکی دەکرد، ئیتر بەناوی هەرکامیانەوە پشك دەربچوایە ئەو ژنەیی لەگەڵ خۆیدا، دەبرد بۆ ئەو سەفەرە، وە لەسەر ئەم

یاسایه، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پشکی خست لەنێوانمانا، دەیویست بچێ بۆ غەزای بەنی موصطەلەق، وا ڕێکەوت پشك بەناوی منەوە دەرچوو، وەمن لەخزمەتیدا چووم بۆ ئەو غەزایە... تاکۆتایی فەرموودەکە، کە فەرموودەیەکی زۆر دوورو درێژە لە {مختصر صحیح مسلم}دا، بەدوورو درێژی کراوە بەکوردی. {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٨ – سوورەتی نوور}.

١٠٩٣– وَعَنْ عَبْدِ اَللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَجْلِدُ أَحَدُكُمْ اِمْرَأَتَهُ جَلْدَ اَلْعَبْدِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{مختصر صحیح البخاری = تجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٧١٧ = ٤٩٤٢، ٢٠٠٥ بوخاری. صحیح مسلم تخریج وترقیم وتحقیق الشیخ خلیل مأمون شیحا رقم: ٧١٢٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتاری دەدا، لەو کاتەدا باسی وشترەکەی ثەموودی کردو، نیشانەی ئەو پیاوە نەگبەتەی باس کرد، کە وشترەکەی پەیکردو، لەروونکردنەوەی ئەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێ: {إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا} فەرمووی: ئەم پیاوە چارە ڕەشە بەدبەختەی کەخودا لەم ئایەتەدا، ناوی ناوە بەدترینو خراپترین پیاوی ئەو هۆزە لەخودا یاخییە، پیاوێکی بەدەسەڵاتی بەهێز بوو، خاوەن دەسەڵاتو کەسوکارو خزمێکی زۆری بوو کەپشتیان دەگرت، وەکوو ئەبو زەمعە چۆن لەناو هۆزی قورەیشا، خاوەن دەسەڵاتو کەسوکارە، ئەویش ئاوابوو، بەڵام هەتا بڵێی بێ ڕەزاو شەڕانی بوو، بۆیە ڕۆیشتە گیانی وشترەکەی صاڵح پێغەمبەر، کە خوا رەوانەی کردبوو بۆ سەر هۆزی ثەموود، وشترەکەی پەیکردو کوشتی.

وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ژنانیشی فەرموو، فەرمووی: (ئەوە چۆن کارێکە، پیاوی واتان تیادا هەیە، خود سەرهەڵ دەکوتێتە سەر ژنەکەیو وەك کۆیلەیێ فەلاقەو دارکاری بکا، ئاوا ئەو ژنە

بەستەزمانە فەلاقە دەکا، دوور نییە، کە هەر لەکۆتایی ئەو ڕۆژەیدا دەست بکاتە ملیو لەگەڵیدا دروست ببیٚ! ئەوجا لەبارەی ئەوەوە کە بەترپوتسی یەکتری پیٚ دەکەنن، تەمیٚو ئامۆژگاری کردو فەرمووی: (ئەمە چۆن حاڵێکە شتیٚ کەخۆشتان دەیکەن، ئەگەر لەیەکێکی ترتان روو بدات، بۆچی پێی پیٚ دەکەنن، کاری وا مەکەن!). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٤، سوورەتی شەمس ژمارە: ٤٢١٤}.

## ٦٥- باسی خولعکردنی ژن (الخلع)
## بَابُ: الخلع

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٦٧ ج/٤ = چاپی چوارەم + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٢٧٣ + تجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٩١ + بڕوانە: مختصر صحیح مسلم بەکوردی بەرگی دووەم لاپەڕە/٤٥١ ج/١ روونکردنەوە/٢ — حیلە شەرع ژمارە: ٩٢٩، زنجیرە: ٧٢٢}.

١٠٩٤- عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): { أَنَّ اِمْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتْ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ مَا أَعِيبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلَا دِينٍ ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ اَلْكُفْرَ فِي اَلْإِسْلَامِ ، فقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): " أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ ؟ " ، قَالَتْ : نَعَمْ . فقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): " اِقْبَلِ اَلْحَدِيقَةَ ، وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ . وَفِي رِوَايَةٍ لَهُ: {وَأَمَرَهُ بِطَلَاقِهَا}.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٩١ = ٥٢٧٣، ٥٢٧٤، ٥٢٧٥، ٥٢٧٦، ٥٢٧٧ بوخاری}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: ژنەکەی ثابیتی کوڕی قەیس، هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! گلەییم لەڕەوشتو بەدینی ثابیت نییە، لەم رووەوە کەموکوڕی نییە، بەڵام زۆر ناشیرینە، لەبەر ئەوە مەترسی ئەوەم هەیە:

ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەوا دەستم لەدەستی نەبێتەوە خۆم کافر بکەم، بەو شێوەیەنیکاحی خۆم لێی هەڵ بوەشێنمەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو باخەی کە لەباتی مارەیی داوێتی پێت دەیدەیتەوە پێی؟).

گوتی: بەڵێ، فەرمووی: بەثابیت (باخەکەی لێ وەربگرەوەو تاقەیەك تەلاقی بدە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٢٢٤٣ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٩٥– وَلِأَبِي دَاوُدَ ، وَالتِّرْمِذِيِّ وَحَسَّنَهُ: {أَنَّ اِمْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اِخْتَلَعَتْ مِنْهُ ، فَجَعَلَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عِدَّتَهَا حَيْضَةً}.

{صحيح أبى داود للشيخ الألبانى/١٩٥٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی بێ) فەرمووی: ژنەکەی ثابیتی کوڕی قەیس، خولعی کرد لەگەڵ مێردەکەی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) یەك بێنوێژی بۆ دانا، بۆ حەیە هەڵهاتنی، واتە: بۆ پاکبوونەوە لەعیددەی تەلاق. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ٢٢٤٤، ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١٠٩٦– وَفِي رِوَايَةِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ عِنْدَ اِبْنِ مَاجَهْ : {أَنَّ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ كَانَ دَمِيمًا وَأَنَّ اِمْرَأَتَهُ قَالَتْ : لَوْلَا مَخَافَةُ اَللَّهِ إِذَا دَخَلَ عَلَيَّ لَبَسَقْتُ فِي وَجْهِهِ}.

{ضعيف ابن ماجة للشيخ الألبانى/٤٤٦}:

عەمری کوڕی شوعەیب، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لەباوکی‌و لەباپیری بێ) فەرمووی: حەبیبەی کچی سەهل، هاوسەری ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس بوو، ثابیت پیاوێکی ناشیرین بوو، حەبیبە عەرزی پێغەمبەری (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد: ئەی پێغەمبەری خودا!

بەخودا، ئەگەر لەبەر ترسی خودا نەبێ، دەنا کاتێ دەهات بۆلام تفم دەکردە ناوچەوانی!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (ئایا ئەو باخەی کە لەجیاتی مارەیی لێت وەرگرتووە، دەیدەیتەوە پێی؟) ژنەکە گوتی: بەڵێ. جا پێغەمبەر لە یەکی جیاکردنەوە، وەك لە ژمارە: ١٠٩٤دا، رابورد.

١٠٩٧- وَلِأَحْمَدَ: مِنْ حَدِيثِ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: {وَكَانَ ذَلِكَ أَوَّلَ خُلْعٍ فِي اَلْإِسْلَامِ}.

{مسند أحمد/١٦١٣٩، وقال الأرنؤوط: حسن لغيره}:

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەبیبەی کچی سەهل، خێزانی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسی ئەنصاری بوو، حەزی لێی نەبوو، ثابت پیاوێکی ناشیرین بوو، شەکڵی جوان نەبوو، ژنەکەی چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆشم ناوێ، لەبەر ترسی خودا نەبێ، کەمافی بۆ مێرد داناوە لەسەر ژن، هەموو جارێ تف دەکەمە رووی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا ئەو باخەی کە لەباتی مارەیی وەرتگرتووە لێی، ئەگەر دەستت لەدەستی ببێتەوە، دەیدەیتەوە پێی؟) ژنەکە گوتی: بەڵێ، دەیدەمەوە پێی، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جیای کردنەوە لەیەکتری، وە ئەم رووداوەی نێوانی ثابیتی کوڕی قەیس و ژنەکەی، یەکەم ژنحولعکردن بوو، کە لەسەردەمی ئیسلامەتیدا رووی‌دا.

## ٦٦- باسی ژن تەڵاقدان
## بابُ: الطَّلَاقِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دوو، لاپەڕە/٥٦٠ چاپی چوارەم زنجیرە: ٦٣ لە ژمارە: ٢٢٢٧ هەتا ژمارە: ٢٢٤٢ + تەجریدی بوخاری = مختصر

صحيح البخاری بەکوردی، بەرگی پێنجەم لاپەڕە/٥٧، زنجیرە: ٧١ لە ژمارە: ١٧٨٦وە هەتا ١٧٩٠ + مختصر صحیحی موسلیم، بەرگی دووەم لە ژمارە: ٨٤٨وە هەتا ٨٥٦ + فیقهی ئاسان بەرگی دووەم زنجیرە: ٢٧٤ — باسی ژن تەڵاقدان هەتا زنجیرە: ٢٨٥}.

١٠٩٨- عَنِ اِبْنِ عُمَرَ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {أَبْغَضُ اَلْحَلَالِ عِنْدَ اَللَّهِ اَلطَّلَاقُ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ، وَابْنُ مَاجَهْ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ ، وَرَجَّحَ أَبُو حَاتِمٍ إِرْسَالَهُ.

{أبوداود: ٢١٧٨ في الطلاق. ابن ماجة. طلاق/٢٠١٨. ضعيف الجامع: ٤٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دزێوترین حەڵاڵ لەلای خودای گەورەو سەرومر تەڵاقە). لەتاجول ئوصولا، لەگێڕانەوەی شەرحەکەیدا دەفەرمووێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هیچ حەڵاڵێك نییە، کە وەك تەڵاق لەگەڵ ئەوەیشا کە خودا حەڵاڵی کردووە، کەچی گەلی ڕقی لێیەتی!).

١٠٩٩- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا): {أَنَّهُ طَلَّقَ اِمْرَأَتَهُ – وَهِيَ حَائِضٌ – فِي عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَأَلَ عُمَرُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ ؟ فَقَالَ: " مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ، ثُمَّ تَحِيضَ ، ثُمَّ تَطْهُرَ ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ ، فَتِلْكَ اَلْعِدَّةُ اَلَّتِي أَمَرَ اَللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا اَلنِّسَاءُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٨٦ = ٥٢٥١، ٥٢٥٢، ٤٩٠٨، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٥٣٣٣، ٧١٦٠ بخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٤٨ = شیحا ٣٦٤١، ٣٦٣٧، أبوداود. طلاق: ٢١٧٩. نسائی. طلاق: ٣٣٩٠. صحيح مسلم: ١٤٧١}:

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەموختەصەری صەحیحی موسلیمدا:

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: ژنێکم لە بێنوێژیدا بوو، یەك تەڵاقیم دا، ئەمەیش لە سەردەمی پێغەمبەردا بوو، جا عومەری باوکم (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ ئەم پرسە، لە پێغەمبەری خۆشەویستی پرسی، ئەویش پێی دەفەرمووێ: بە عەبدوڵڵا بڵێ: با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆیو بیکاتەوە بەژنی خۆی، ئەوسا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی، هەتا لەو بێنوێژییەی پاك دەبێتەوە کەتیادا تەڵاق درابوو، وەجارێکی تر دەکەوێتەوە سەر بێنوێژیو دیسان لەبێنوێژی دووەمیش پاك دەبێتەوە، ئیتر ئەگەر ئارەزوو دەکا، با بەجوانی ڕای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتیو بیانووی پێ نەگرێو گەڕی پێ نەکا، ئەگەر ئارەزوویش دەکا، با لەپێش ئەوەدا بچێتە لایو لەگەڵیدا دروست ببێ، لەپاکی دووما تەڵاقی بدا، ئەمە ئەو دەستوورەیە کە ژن لە پاکییەکا تەڵاق بدرێ کە مێردەکەی لەو پاکییەدا نەچووبێتە لای، واتە: ئەو حەیەو عیددەیەیە کە خودا لەقورئانا فەرمانی کردووە، کەژنی تیادا تەڵاق بدرێ، کە دەفەرمووێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ – سورة الطلاق/١/٦٥}:

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بەموسوڵمانان بفەرموو: هەرکاتێ ویستتان، ژن تەڵاق بدەن، با لەکاتێکا تەڵاقیان بدەن، کە کاتو ماوەی شەرعی حەیەو عیددەیە، کە کاتی پاکیو خاوێنی ژنانە لەخوێنی بێنوێژیو زەیستانی، وە ژمارەی ڕۆژو کاتی حەیەو عیددەکەیان ڕابگرن، وەهەمیشە لەخودای خۆتان بترسنو خۆپاراس بنو پارێزو کۆ لەسەرپێچی لە فەرمانەکانی خودا بکەن.

دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، کاتێ پرسیاری لێ دەکرا، سەبارەت بەپیاوێ کە ژنەکەی خۆی لەبێنوێژیدا تەڵاق دابێ، دەیفەرموو: (ئەگەر تۆ

ژنەکەت یەکجار، یا دووجار تەڵاق داوە، ئەوە من خۆم شتی وام بەسەر هاتووەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێم کردووە: کە ئەو ژنەی لەکاتی بێنوێژیدا، یەك تەڵاق، یان دوو تەڵاقم داوە، کە بیگێڕمەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆم‌و بیکەمەوە بەژنی خۆم، وە ئەوسا مۆڵەتی بدەم هەتا لەو بێنوێژییەی کەتیایدا تەلاقم داوە پاك دەبێتەوەو دیسان دەکەوێتەوە بێنوێژییەکی ترەوەو دیسان بێنوێژی دووەمیش پاك دەبێتەوە، پاش ئەم ماوەیە، پێش ئەوەی کە لەم ماوەیەدا، کەبچمەلای‌و لەگەڵیدا جووت بم، پێش شتی وا ئەگەر بمەوێ ئەوا تەلاقی بدەم)

جا ئەگەر تۆیش یەك تەڵاق، یان دوو تەڵاقی ژنەکەتت لەبێنوێژیدا داوە، ئەوە ئەم فەرمانەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجێ بهێنە، وەك من بکە. بەڵام ئەگەر لەکاتی بێنوێژیدا، ژنەکەتت سێ بەسێ تەڵاق داوە، ئەوە بەڕاستی بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆتت کردووە، سەبارەت بەچۆنێتی تەڵاقدانی ژنەکەت‌و خودات لەخۆت ڕەنجاندووە، وە لە هەمان کاتدا، ژنەکەیشت سێ بەسێ تەڵاقی کەوتووەو فڕت بەسەریەوە نەماوە!. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ٢٢٣٢ ج،/٤ = چاپی چوارەم}.

١١٠٠- وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لْيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلًا}.

{مسلم ترقيم: شيحا ٣٦٤٤ = صحيح مسلم/١٤٧١}:

سالم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لەکاتی بێنوێژیدا ژنەکەی خۆی تەڵاق دا، عومەر ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ بە عومەر: (پێی بڵێ با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی‌و بیکاتەوە بەژنی خۆی، جا پاش ئەوە با یا لەکاتی پاکیدا تەڵاقی بدا، یا لەکاتی سکپڕی‌و دووگیانیدا، یا تەڵاقی نەداو قەبووڵی بکاتەوە بەژنی خۆی).

١١٠١- وَفِي رِوَايَةٍ أُخْرَى لِلْبُخَارِيِّ: {وَحُسِبَتْ عَلَيْهِ تَطْلِيقَةً}.

{تجريدی بوخاری/٥، ژماره: ١٧٨٦م = ٥٢٥٣. شيحا: ٣٦٤٣}:

**لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا، ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەو تەلاقەی کە لەکاتی بێنوێژیدا دام، دانرا بەیەك تەلاق لەسەرم، وە بەوە ژنەکەم یەك تەلاقی کەوت!. {صحيح مسلم ترقيم شيحا: ٣٦٤٢}.**

١١٠٢- {وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ : قَالَ اِبْنُ عُمَرَ: {أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا وَاحِدَةً أَوْ اِثْنَتَيْنِ " فَإِنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَنِي أَنْ أُرَاجِعَهَا ، ثُمَّ أُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى ، ثم أَمْهِلْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ أُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ أَمَسَّهَا وَأَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلَاثًا ، فَقَدْ عَصَيْتَ رَبَّكَ فِيمَا أَمَرَكَ مِنْ طَلَاقِ اِمْرَأَتِكَ}:

**لە ژمارە: ١٠٩٩دا بەتەواوی ڕۆیشت.**

١١٠٣- وَفِي رِوَايَةٍ أُخْرَى : قَالَ عَبْدُ اَللَّهِ بْنُ عُمَرَ : { فَرَدَّهَا عَلَيَّ ، وَلَمْ يَرَهَا شَيْئًا ، وَقَالَ: " إِذَا طَهُرَتْ فَلْيُطَلِّقْ أَوْ لِيُمْسِكْ}.

{صحيح أبی داود للشيخ الألبانی: ١٩١٤}:

**لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێکی خۆمم لەکاتی بێنوێژیدا تەڵاقدا، کاتێ پێغەمبەر بەحاڵەکەی زانی، ژنەکەی پێم دایەوە، وە ئەو تەلاقەی منی بەهیچ دانەنا. وە فەرمووی پێم: (کاتێ ژنەکەت پاکەوە بوو لە بێنوێژییەکەی، ئەوجا خۆت سەرپشك بە، یا تەڵاقی بدە یا وەك ئاسایی ڕایبگرەو تەلاقی مەدە).**

١١٠٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {كَانَ اَلطَّلَاقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَأَبِي بَكْرٍ، وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ ، طَلَاقُ

اَلثَّلَاثِ وَاحِدَةٌ ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ اَلْخَطَّابِ : إِنَّ اَلنَّاسَ قَدْ اِسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ ، فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ ؟ فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژماره: ٨٥٠ = مسلم ترقيم شيحا/٣٦٥٨ = صحيح مسلم/١٤٧٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆیو لەباوكی بێ) فەرمووی: جاران بەسەرینی پێغەمبەر خۆیو لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەكری صەدیقدا، تەلاقی سێ تەلاقە، یەك تەلاق بوو، هەتا دوو ساڵیش لەسەردەمی جێنشینی عومەر ڕۆیشت، ئەم حاڵە هەر وابوو، لەپاشا عومەری كوڕی خەطاب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەم خەڵكە لەپێشدا لەم كارەدا، بەشێنەیی بوونو پشوو درێژ بوون، بەلاّم ئێستا سەریان تێ كردووەو زۆر لێی بەپەلەن، كەوابوو: با بڕیار بدەین بەكەوتنی سێ تەلاقە، جا لەپاش تەگبیرو ڕاوێژكردن لەگەڵ یارانیدا بۆ ئەم پرسە، حوكمی كرد بەكەوتنی سێ تەلاقە.

{تاج/٢، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٢٢٢٩}.

١١٠٥- وَعَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ (رضى الله عنه) قَالَ: { أُخْبِرَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ اِمْرَأَتَهُ ثَلَاثَ تَطْلِيقَاتٍ جَمِيعًا ، فَقَامَ غَضْبَانَ ثُمَّ قَالَ: " أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اَللَّهِ تَعَالَى ، وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ" . حَتَّى قَامَ رَجُلٌ ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ ! أَلَا أَقْتُلُهُ ؟} رَوَاهُ النَّسَائِيُّ وَرُوَاتُهُ مُوَثَّقُونَ.

{ضعيف، سنن النسائي: ٣٤٠١}:

مەحموودی كوڕی لەبید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەت كرا (درוودی خودای لەسەر بێ) كە ئەو پیاوە ژنەكەی سێبەسێ بەسەریەكەوە تەلاق داوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتووڕەیی هەڵساو فەرمووی: (ئەمە چۆن حاڵێكە، من خۆم كەهێشتاكە ماومو شەوو ڕۆژ لەناوتانام، كەچی گاڵتە بەنامەی خودا دەكرێو بەپێی ڕێساو یاسای ئایەتی {الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ} ڕەفتار ناكرێ، جا دەبێ لەپاش من چی

ئاشووبو فەرتەنەیەك بەرپا بكرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٢٢٣٥ — نەسائی/سند جید}.

دانەر حافظی عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمووێ: پێشەوا نەسائی گێڕاویەتەوە، پیاوانی ڕشتەكەی متمانەدارن.

١١٠٦– وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: {طَلَّقَ أَبُو رُكَانَةَ أُمَّ رُكَانَةَ . فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) " رَاجِعِ امْرَأَتَكَ " ، فَقَالَ: إِنِّي طَلَّقْتُهَا ثَلَاثًا. قَالَ: " قَدْ عَلِمْتُ ، رَاجِعْهَا } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

{حسن، صحيح أبي داود للشيخ الألباني/١٩٢٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوكی بێ) فەرمووی: ئەبو روكانە، ئوم روكانەی ژنی تەلاق دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: (ژنەكەت بگێڕەوە ژێر ركێفی خۆتو بیكەرەوە بەژنی خۆت) ئەبو روكانە عەرزیكرد: (قوربان! چۆن بیگێڕمەوە ژێر ركێفی خۆم، من سێ بەسێ تەلاقیم داوە، دیارە كەفرم بەسەریەوە نەماوە!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەزانم كەوات كردووەو سێ تەلاقەت كۆكردۆتەوەو بەیەكجار سێ تەلاقەت داوە، لەیەك كۆڕی دانیشتندا، بەڵام ئەوە بەیەك تەلاق دادەنرێ، كەواتە بیگێڕەوە بۆ ژێر ڕكێفی خۆت).

١١٠٧– وَفِي لَفْظٍ لِأَحْمَدَ: {طَلَّقَ رُكَانَةُ اِمْرَأَتَهُ فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ ثَلَاثًا، فَحَزِنَ عَلَيْهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)" فَإِنَّهَا وَاحِدَةٌ} وَفِي سَنَدِهَا اِبْنُ إِسْحَاقَ، وَفِيهِ مَقَالٌ.

{حسن، بمجموع طريقين، الإرواء: ٧/١٤٥}:

لەدەقێكی ئیمامی ئەحمەددا (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەیەك كۆڕی دانیشتندا، كە لە زاراوی شەرعا پێی دەگوترێ (مَجلِس واحِد) روكانە ژنەكەی خۆی سێ تەلاقە دا، جا

دوایی پەشیمان بۆوەو خەمی بۆ خوارد، جا لەم بارەیەوە پرسیاری لە پێغەمبەر کردو پرسەکەی بۆی روونکردەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەوە بەیەك تەڵاق دادەنرێ، کەواتە بۆت هەیە کە بیکەیتەوە بەژنو حەڵاڵو هاوسەری خۆت).

١١٠٨- وَقَدْ رَوَى أَبُو دَاوُدَ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ أَحْسَنَ مِنْهُ : {أَنَّ رُكَانَةَ طَلَّقَ اِمْرَأَتَهُ سُهَيْمَةَ اَلْبَتَّةَ ، فَقَالَ: "وَاَللَّهِ مَا أَرَدْتُ بِهَا إِلَّا وَاحِدَةً، فَرَدَّهَا إِلَيْهِ اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)} .

{ضعيف أبي داود للشيخ الألباني: ٤٧٩}:

ئەم فەرموودەیە لە (تاجول الأصول)دا ئاوایە:

روکانەی کوڕی عەبدویەزید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەمم بەئێجگاری تەڵاق داوە. فەرمووی: مەبەستت لە ئێجگاری (ئەلبەتتەتە) چی بوو؟).

گوتم: مەبەستم یەك تەڵاق بوو. فەرمووی: (بڵێ بەخودا) گوتم بەخودا.

فەرمووی: (مەبەستت چی بوو بێ هەر ئەوە مەبەستەو بەس ئەوە حلێبە). {تاج/٢، زنجيرە: ٦٣، ژمارە: ٢٢٣١}.

لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئاوایە:

دانەر حافظی عەسقەلانی دەفەرمووێ: ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەبوداوود لەڕوویەکی ترەوە دەیگێڕێتەوە، کە جوانترە، کە ئاوایە:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: روکانە ژنەکەی، کەناوی سوهەیمە بوو، بەئێجگاری بە (البتـة) تەڵاق دا، وە سوێندی خوارد کە مەبەستم لە وشەی ئێجگاری (ئەلبەتتەتە) یەك تەڵاق بوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەی دایەوە پێی.

١١٠٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {ثَلَاثٌ جِدُّهنَّ جِدٌّ ، وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: اَلنِّكَـاحُ ، وَالطَّلَـاقُ ، وَالرَّجْعَـةُ} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{حسن، صحيح الجامع: ٣٠٢٧}:

ئـەبوهورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرمووێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (ئەم سێ شتە چ بەگاڵتەوە بێو چ بەڕاستەوە بێ، هەر بە ڕاست حلێبن:

یەکەم: ژن مارە بڕین.

دووەم: ژن تەڵاق دان.

سێیەم: ژن گێڕانەوە بۆ ژێر ڕکێفی ژنێتـی خـۆی. واتـە: ریجعـەتی ژنـی یەك تەڵاقدراو، یان دوو تەڵاقدراو.

(ڕوونکردنەوە):

ئەم فەرموودەیە، شێخی ئەلبانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بەحەسـەنی داناوە، وە بەڵگەیە لەسەر ئەم بڕیارانە:

١- هەقـداری ژن، بەڕاسـتەوە، یـان بەسـوعبەتەوە، بەکەسـێ بڵـێ، کـە نەهێڵێ لەنێوانا نەبێ، پێی بڵێ: ئەوا ئەو کچەی خۆم، یا ئەو خوشکەی خـۆم، یا ئەو هەقدارەی خۆم مارەکرد لەتۆ، یا لـەکوڕە بـچکۆلەکەت، وە دوو شـایەتی پیاو یا زیاتر، بەدیارەوە بێو گوێیان لەم گفتوگۆیەبێ، ئیتر مارەی دێو دەبـێ بەژنی ئەو کەسە کەناوی هێنراوە.

جا بەبۆنەی ئەم فەرموودەیەوە، مـن ئـەم (ئاگاداری)یـە تۆمـار دەکـەم: (من زۆرجار بەچاوی خۆم دیومەو بەگوێی خۆم بیـستوومە، کـە بـاوکی کچی منداڵو باوکی کوڕی منـاڵ، بەگاڵتەوە گرێبەنـدی هاوسەرییان لەنێوانی ئەو دوو منداڵـەدا ئـەنجام داوە، وە کۆمـەڵێ پیـاویش ئاگایـان لـەم گەمـەو سـوعبەتەیە بـووە، وەك لەبۆنەیـەکا: بـاوکی کـچێکی منـاڵ، بەگاڵتـەو سـوعبەتەوە بـۆ

دەربڕینی خۆشەویستی، بەکوڕێکی منـاڵ دەڵێ: ئافەریم زاوای خـۆم، مێـردە بچکۆلەکەی جوانەی کچم، باوکی کوڕەکەیش دەڵێ: کوڕە! ماڵت ئاوابێ، بـرا قەبووڵمانە!!

بگرە زۆرجار، ئەم جۆرە مارە بڕینە، کە بۆ خۆشـیو گاڵتـەو سـوعبەت ئـەنجام دراوە، بـراوە بـۆلای مامۆسـتای مـەلاو مەلاکـەیش کـە بەتـەواوی لـە حاڵەکـە حـاڵی بـووە، بڕیـاری داوە کـە ئـەو دوو منـاڵـە، بـەپێی یاسـانامە ژنو مێردن!!).

٢- تەڵاقدانیش بەڕاستو بەگاڵتە، تەڵاقی پێ دەکەوێ، موسـوڵمان خـۆی لەهەڵەی وابپارێزێ.

٣- ژنگێڕانـــەوەیش هەروەهایـــە، بەگاڵتـــەوە، یـــا بەڕاســـتەوە بـــەژنی تەڵاقدراوی خۆی بڵێ: (ئەوا تۆم گێڕایەوە بۆ ژێر رکێفی ژنێتی خۆم). ژنەکە دەبێتـەوە بـەژنی، بەمـەرجێ یـەك تـەڵاقی دابـێ، یـا دوو تـەڵاق، وە لـەماوەی حەیەو عیددەدا بێ، دەنا نابێتەوە بەژنی.

بەڵام بەخەوو وڕێنەی ناو خەو ئەم جۆرە شتانە دانامەزرێ.

١١١٠- وَفِي رِوَايَةٍ لِابْنِ عَدِيٍّ مِنْ وَجْهٍ آخَرَ ضَعِيفٍ : {اَلطَّلَاقُ ، وَالْعِتَـاقُ ، وَالنِّكَاحُ} .

{ضـعيفٌ، الإرْواء: ٢٢٥/٦ = (٢٩٤/٣ – إرْواء الغليـل للألبـاني – تـرقيم المكتبة الشاملة الإسلامية ٢٠٠٩} :

لە گێڕانەوەیەکا کە ئیبنو عەدی لە ئـەبو هورەیرەوە دەیگێڕێتـەوە، لـە ڕێگەیەکی لاوازەوە، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (ژن تەڵاقـدانو بەنـدە ئـازادکردنو ژن مـارە کـردن، ئـەم سـێ جـۆرە شـتە، گاڵتـە هەڵناگرن، بەگاڵتەشەوەبن هەر دادەمەزرێنو دەبێ جێبەجێ بکرێن).

١١١١- وَلِلْحَارِثِ اِبْنِ أَبِي أُسَامَةَ : مِنْ حَدِيثِ عُبَادَةَ بْنِ اَلصَّامِتِ (رضى الله عنه) رَفَعَهُ : {لَا يَجُوزُ اَللَّعِبُ فِي ثَلَاثٍ : اَلطَّلَاقُ ، وَالنِّكَاحُ ، وَالْعِتَاقُ ، فَمَنْ قَالَهُنَّ فَقَدَ وَجَبْنَ} وَسَنَدُهُ ضَعِيفٌ.

{ضعيف، الإِرْوَاء: ٢٢٦/٦ = ٢٩٤/٣ من/إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل للألباني} :

حاریثی کوڕی ئەبو ئوسامە، لە موسنەدی خۆیدا، دەگێڕێتەوە:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم سێ جۆرە شتە گاڵتە هەڵناگرن و بەگاڵتەشەوە بگوترێن، هەر بەڕاست حسێب دەکرێن:

یەکەم: ژن تەڵاقدان.

دووەم: ژن مارەبڕین.

سێیەم: کۆیلە ئازادکردن.

هەرکەسێ بەڕاست، یا بەگاڵتە یەکێ لەم سیانە بڵێ، ئەوە دادەمەزرێ و پێویستە جێبەجێ بکرێ).

١١١٢- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {إِنَّ اَللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا ، مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/١٠٨٦ = ٢٥٢٨، ٢٥٢٩، ٦٦٦٤ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/١، ژمارە: ٦٨ = شیحا/٣٢٧ = مسلم/١٢٧} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای پاک و پیرۆز و گەورە، لەبەر خاتری من، چاوپۆشی دەکاو خۆش دەبێ لەو خوتورات و وەسوەسەیەی کەدێت بەدڵی نەتەوەی ئیسلامی مندا، بە مەرجێ بەکردەوە پیادەی نەکەن، یا بەزمان نەیڵێن!). {تاج/١، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٢، چ/٤}.

١١١٣- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { إِنَّ اَللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي اَلْخَطَأَ ، وَالنِّسْيَانَ ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ} رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ ، وَالْحَاكِمُ ، وَقَالَ أَبُو حَاتِمٍ : لَا يَثْبُتُ.

{صحيح لِطُرُقِهِ، مِشْكَاةُ الْمَصَابِيحِ لِلتَّبْرِيزِى تحقيق الشيخ الألبانى، رقم: ٦٢٨٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە تۆڵەو سزای ئەم سێ جۆرە گوناهانەی لەسەر گەلی ئیسلامی من هەلگرتووە:

یەکەم: گوناهێ کە خاوەنەکەی بەهەڵە بیکا.

دووەم: گوناهێ خاوەنەکەی لەبیری نەبێ.

سێیەم: گوناهی ئەو شتانەی کەبەزۆر پێیان بکرێ). {تاج/١، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٤، چ/٤}.

(ڕوونکردنەوە):

کەسێ لەیەکێ لەم سێ بارودۆخەدا، ژنی خۆی تەڵاق بدات تەڵاقی ناکەوێ، وەك ئەوە بەژنەکەی بڵێ: ئەی تەڵاقدراو، ئەو ئاوەم بدەرێ، یا وەك ئەوە ژنەکە ناوی طەلیعە بێ، ئەم زمانی هەڵبکەوێ بڵێ: طالق!

یا کەسێ بەزۆر ژنەکەیی پێ تەڵاق بدا، ئەویش تەڵاقی ناکەوێ، یا کەسێ لەبیری نەبێ، یا نەزانێ، کە خاوەنی ژنە، بەبێ ئاگاداری خۆی وەکیل ژنی لێ مارە بڕی بێ، ئەگەر تەڵاق بخوات تەڵاقی ناکەوێ.

١١١٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ ( رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلَ اِمْرَأَتَهُ لَيْسَ بِشَيْءٍ } . وَقَالَ: لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اَللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ اَلْأَحْزَاب: ٢١. رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بخارى. تفسير: ٤٩١١، ٥٢٦٦، ٥٢٦٨، تجريد/١٧٠٩. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٢ = شيحا ٣٦٦٢}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: ئەگـەر پیـاو ژنـی خۆی لـەخۆی نادروستو حـەرام بکـا، وەك ئـەوە بـە ژنەکـەی بڵـێ: تـۆ لـەمن نادروستو حەرامیت: أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ: تۆ لەمن حەرامیت). ئەوە لەلای ئیبنـو عەبباس، نە دائەنرێ بەتەڵاق، نـە دائـەنرێ بـەزیهار، نـە دائـەنرێ بـە ئـیلاء، بەڵکوو دائەنرێ بە سوێندی ئاسایی‌و کەفارەتی سوێندی لەسەرەو بەس.

دیـارە کـە ئیبنـو عـەبباس، بەڵگـەی لەسـەر ئـەم ڕاو بۆچـوونەی خـۆی کرداری پێغەمبەرە، کە لەئایـەتی: {لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللّٰهُ لَـكَ}ەدا دیـاریکراوە، بۆیە فەرمووی:

{لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللّٰهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – الأحزاب/٣٣ ئایەتی: ٢١}.

واتـە: لەڕاسـتیدا، پێغەمبـەری خـودا، ڕابـەرو پێـشەواو سەرمەشـقێکی جوانە، بۆ ئێوەی گـەلی موسـوڵمان، شـایەنی ئەوەیـە کـە لەهـەموو کارێکـا، کـە مـەودای پـەیڕەوی واتیـادا، ئێـوە بیکـەن بەسـەر مەشـق‌و چـاوی لێ بکـەن‌و، هەنگاو بەهەنگاوو بست بە بست شوێنی بکەون!). {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٢٢٤٩ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١١١٥– وَلِمُسْلِمٍ عن ابن عباس (رضـي الله عنهمـا) : { إِذَا حَـرَّمَ اَلرَّجُـلُ عَلَيْهِ اِمْرَأَتَهُ ، فَهِيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا} .

لەژمارە (١١١٤)دا، بەتەواوی ڕۆیشت.

١١١٦– وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْها): {أَنَّ اِبْنَةَ اَلْجَوْنِ لَمَّا أُدْخِلَتْ عَلَـى رَسُولِ اَللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَدَنَا مِنْهَا . قَالَتْ : أَعُوذُ بِاَللّٰـهِ مِنْـكَ، فقَـالَ: " لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ ، اِلْحَقِي بِأَهْلِكِ} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{لـە ژمارە: ١٠٦٥ و ١٠٦٦}دا ڕابورد.

لێرەدا ئاوایە:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەمرەی کچی جەون، مارەکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گواستیەوەو چووە ناو پەردەوە لەگەڵیدا، ویستی بەدەستی بگرێ، بینتولجەون نارەزایی دەربڕی‌و گوتی: (أعُوذُ باللهِ مِنكَ). واتە: پەنا دەگرم بەخودا لەتۆ کەدەستم بۆ بهێنی!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم گوتەیە تەڵاقیدا، پێی فەرموو: (بەڕاستی پەنات گرت بەکەسێ کە شایستەی پەنا بۆ بردنە، بڕۆرەوە بۆسەر کەسوکارت!).

(ڕوونکردنەوە):

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە: کە گوتەی (إلْحَقِي بِأَهْلِكِ) دائەنرێ بە تەڵاق، ئەم وشەیە واتای وایە: کە بڕۆرەوە بۆسەر کەسوکارت.

١١١٧- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا طَلَاقَ إِلَّا بَعْدَ نِكَاحٍ ، وَلَا عِتْقَ إِلَّا بَعْدَ مِلْكٍ} رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ ، وَهُوَ مَعْلُولٌ.

{صحيح إِرْوَاءِ الغليل ١٥١/٧}:

لەتاجول ئوصولدا ئاوایە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە (ڕەحمەت‌و ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تەڵاق کاتێ دەکەوێ کەتۆ خاوەنی ئەو ژنە بێ، لەکاتی تەڵاقدانەکەدا، وە کۆیلەیش کاتێ ئازاد دەبێ کەتۆ لەکاتی ئازادکردنەکەدا خاوەنی بی، وەشت کاتێ فرۆشتنی دادەمەزرێ کە لەکاتی گرێبەندیی فرۆشتنەکەدا، شتەکە هی تۆبێ، وەهەر شتێ کەماڵی تۆ نەبێ، هەزار جار بیکەی بە نەزر، نەزری دانامەزرێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٢٢٢١ ج/٤}.

١١١٨- وَأَخْرَجَ اِبْنُ مَاجَهْ: عَنِ اَلْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ مِثْلَهُ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ، لَكِنَّهُ مَعْلُولٌ أَيْضًا.

{صحيح الجامع تأليف الشيخ محمد ناصر الألبانى/٧٥٢٤}:

واتاكەی لە فەرموودەی پێشەوە رۆیشت.

١١١٩- وَعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا نَذْرَ لِابْنِ آدَمَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ ، وَلَا عِتْقَ لَهُ فِيمَا لَا يَمْلِكُ ، وَلَا طَلَاقَ لَهُ فِيمَا لَا يَمْلِكُ} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَاَلتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ، وَنُقِلَ عَنْ اَلْبُخَارِيِّ أَنَّهُ أَصَحُّ مَا وَرَدَ فِيهِ.

{حسن، صحيح أبي داود/٢٨٠٢}:

(لەژمارە/١١١٧)دا رابورد.

١١٢٠- وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {رُفِعَ اَلْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ اَلنَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ اَلصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ، وَعَنِ اَلْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يَفِيقَ} رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا اَلتِّرْمِذِيَّ وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع للألبانى رقم: ٣٥١٢}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم سێ جۆرە کەسە نووسینو گلەییو ئەرکی ئاپینییان لەسەر نییە.

یەکەم: خەوتوو هەتا لەخەو خەبەری دەبێتەوە.

دووەم: منداڵ هەتا رەسیدە دەبێ، بەهۆی شەیتانی بوونەوە، یا بەهۆی ساڵەوە، باڵغ دەبێ.

سێیەم: شێت هەتا هۆشیار دەبێتەوە، یا بارودۆخی شێتی بەری دەداو دێتەوە سەر هۆش). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٢٢٢٤}.

(ڕوونکردنەوە):

١- مێرد، یا ژن لەلای خودا بەرپرسن لەهەر تەڵاقێ کە لەنێوانیانا روو دەدا، براوە کەسێکە کە لەکاری وا ناشایستەدا کاریگەری نەبێ.

٢- مێردو ژن چەندە دەتوانن لەکاتی لە یەکتری جیابوونەوەدا، بەشێوەیەکی رەوا، کە نەبێ بە بارگرانی بۆ ژنەکە، یا بۆ مێردەکە، لەیەك دەستبەردار ببن.

٣- تکای تایبەتم بۆ هەموو موسوڵمانێ ئەوەیە، کە لەژێر چاودێری مامۆستایەکی ئاییندا، ژن مارە ببڕێ، یا ژن تەڵاق بدات.

ژیــن چــەن ســاڵێکە بــێ تــاڵی نابــێ
لــە ئــێش و ئــازار قــەت خــاڵی نابــێ
ســـڕی بێبـــاکی خواوەنـــدی بـــاڵا
بەدەگمـــەن نـــەبێ، کـــەس حـــاڵی نابـــێ!!

## ٦٧- باسی گێڕانەوەی ژنی تەڵاقدراو بۆ ژێر رکێفی ژن و مێردیی پیاو
## بابُ: الرَّجْعَةِ

١١٢١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" {أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ اَلرَّجُلِ يُطَلِّقُ، ثُمَّ يُرَاجِعُ، وَلَا يُشْهِدُ؟ فَقَالَ: أَشْهِدْ عَلَى طَلَاقِهَا، وَعَلَى رَجْعَتِهَا}. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ هَكَذَا مَوْقُوفًا، وَسَنَدُهُ صَحِيحٌ.

{صَحِيح أبي داود/١٩١٥}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودایان لێ بێ) پیاوێ لێی پرسی: بەبێ شایەت ژنەکەمم تەڵاق دا، وە بەبێ شایەت گێڕامەوە بۆ ژێر رکێفی خۆم و لەگەڵیدا جووتبووم، ئایا ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (رەزای خودای لێ بێ) نە بەپێی یاسانامەی پێغەمبەری خودا ژنەکەتت تەڵاق داوە، وە نە بەپێی

یاسانامەی پێغەمبەری خودا ژنەکەتت گێڕاوەتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆت، لەسەر تەڵاق دانەکەی شایەت رابگرە، هەروا لەسەر گێڕانەوەکەی بۆ ژێر رکێفی ژنێتی خۆت شایەت ڕابگرە، وەجارێکی تر شتی وا مەکەرەوە بەبێ شایەت نەژن تەڵاق بدە، وە نەژن بگێڕەرەوە بۆ ژێر رکێفی هاوسەریی خۆت.

١١٢٢- وَأَخْرَجَهُ البيهقي بلفظ: (أَنَّ عِمْرَان بْنَ حُصَيْنٍ (رضى الله عنهما) {سُئِلَ عَمَّنْ راجَعَ امْرَأَتَهُ، فَقَالَ: في غَيْرِ سُنَّةٍ؟ فَلْيُشْهِدِ الآنَ} وَزادَ الطَبَرانيِ فيِ رِوايةٍ: {وَيَسْتَغْفِرُاللّٰهِ}:

بەیهەقی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی ئاوا گێڕاوەتەوە:

لەعیمرانی کوڕی حوصەین پرسیار دەکرێ: پیاوێ بەبێ شایەت ژنەکەی تەڵاق داوەو بەبێ شایەتیش گێڕاویەتەوە ژێر رکێفی خۆی، ئایا ئەمە چۆنە؟

عیمران دەفەرموێ: بەشێوەیەکی دوور لەسوننەت ژنەکەی تەلاق داوە، هەروا بەشێوەیەکی دوور لە سوننەت ژنەکەی گێڕاوەتەوە بۆ ژێر رکێفی خۆی، با ئێستا شایەت راست بکاتەوە هەم لەسەر تەلاقەکەی، هەم لەسەر گێڕانەوە (ریجعە)کەی، وە با داوای لێ خۆشبوونو لێبووردنیش لەخودا بکا،کە لەو سەرپێچییە لێی خۆش بێ.

١١٢٣- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) {أَنَّهُ لَمَّا طَلَّقَ اِمْرَأَتَهُ، قَالَ اَلنَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لِعُمَرَ: "مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ:

ئەم فەرموودەیە لە ژمارە: (١٠٩٩)دا بەتەواوی رۆیشت.

## ٦٨- باسی ئیلاء (سوێندکاری)و ژن لەخۆ حەرامکردنو ظیهارو کەفارەت

## بَابُ: الإِيلاَءِ وَالظِّهَارِ وَالكَفَّارَةِ

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٦٨ لە ژمارە: ٢٢٤٦/وە هەتا ژمارە: ٢٢٤٩ + زنجیرە: ٧٣ لە ژمارە: ٢٢٥٨وە هەتا ژمارە: ٢٢٥٩ + مختصر

صحيح مسلم/٢، ژماره: ٨٥٧ + فيقهى ئاسان/٢، لاپەڕە: ٧٧١، زنجيره: ٢٨٦و زنجيره: ٢٨٧ لەلاپەڕە: ٧٨٣-دا}.

-١١٢٤

آ- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {آلَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) مِنْ نِسَائِهِ وَحَرَّمَ، فَجَعَلَ الحَلاَلَ حَرَاماً، وَجَعَلَ لِلْيَمِينِ كَفَّارَةً} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَرُوَاتُهُ ثِقَاتٌ.

{ضعيف سُنَنُ الترمذي: ١٢٠١}:

ب- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: { إِذَا مَضَتْ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَقَفَ اَلْمُؤْلِي حَتَّى يُطَلِّقَ، وَلَا يَقَعُ عَلَيْهِ اَلطَّلَاقُ حَتَّى يُطَلِّقَ}. أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيّ.

{بخارى/٥٢٩١}:

ج- وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: {أَدْرَكْتُ بِضْعَةَ عَشَرَ مِنْ أَصْحَابِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كُلُّهُمْ يَقِفُونَ اَلْمُؤْلِي}. رَوَاهُ اَلشَّافِعِيّ.

{صحيح، الإرواء/٢٠٨٦}:

د- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {كَانَ إِيلَاءُ اَلْجَاهِلِيَّةِ اَلسَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَوَقَّتَ اَللَّهُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، فَلَيْسَ بِإِيلَاءٍ} أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ.

{مَجْمَعُ الزوائد/٧٨٣٣، وَقَالَ: رِجَالُهُ رِجَالُ الصحيح}:

آ- عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لەژنەکانی، کەدروست نەبێ لەگەڵیان، وەهەندێ شتی حەڵاڵیشی لەخۆی حەرام کرد، بەڵام لەپاشا ئەو شتەی کەحەرامی کردبوو لەخۆی، دیسان حەڵاڵی کردەوە بۆ خۆیو لەجیاتی سوێندەکەیشی برێتی (کەفارەت)ی دا. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٢٢٤٨}.

ب- ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: کاتێ مێردێ ئیلائی کرد لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا، وە بەردەوام بوو لەسەری، هەتا چوار مانگ تێپەڕی، ئەوا داوای لێ دەکرێ کەژنەکەی تەلاق بدا، بەلام بەتێپەڕ بوونی چوار مانگەکە تەلاقی ئیلاکارەکە ناکەوێ، لەو کاتەوە تەلاقەکە دەکەوێ، کە مێردە ئیلاکارەکە ژنەکە تەلاق دەدا.

ج- سولەیمانی کوڕی یەسار (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرموی: دەوروبەری سیازدە کەسم، لەیارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیوە، کە لەپاش تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر کرداری ئیلائدا، هەموویان بەجەخت داوایان لە ئیلاکار دەکرد: کە یا کۆتایی بەسوێندەکەی بهێنێو لەگەڵ ژنەکەی دروست ببێ، یان تەلاقی بدا.

د- ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: لەسەردەمی نەزانیو نەفامی پێش هاتنی ئیسلامدا، مێرد ساڵو دووساڵ، سوێندی لەژنەکەی دەخوارد کە لەگەڵی دروست نەبێ. هەتا خودای گەورە لە قورئاندا، ماوەی ئیلائی دیاری کرد بە چوار مانگ وەك دەفەرموێ:

{لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ – البقرة/٢٢٦ – ٢٢٧}؛

واتە: ئەو مێردانەی کەسوێند دەخۆن کە نەڕۆنە لای ژنەکانیانو لەگەڵیان دروست نەبن، هەقیان هەیە کەهەتا چوار مانگ نەڕۆنە لایانو چاوەڕوانی بکەن، جا ئەگەر پیاوە سوێندخۆرەکان گەڕانەوە بۆ سەر یاسای ژنو مێردیو لەو ماوەیەدا چوونە لایان، ئەوە خودای گەورە لێخۆشبووەو میهرەبانە، وە ئەگەر بڕیاری تەلاقیان دا، ئەوا خودا هەموو شتێ دەبیستیو ئاگای لەخشەی مارو مێرووەو هیچی لێ ون نابێ.

ئیبنو عەبباس فەرموی: ئەگەر ماوەکە لەچوار مانگ کەمتر بوو، بەئیلای شەرعی دانانرێ.

١١٢٥- وَعَنْهُ رَضِيَ اَللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا" { أَنَّ رَجُلًا ظَاهَرَ مِن اِمْرَأَتِهِ، ثُمَّ وَقَعَ عَلَيْهَا، فَأَتَى اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: إِنِّي وَقَعْتُ عَلَيْهَا قَبْلَ أَنْ أُكَفِّرَ، قَالَ: "فَلَا تَقْرَبْهَا حَتَّى تَفْعَلَ مَا أَمَرَكَ اَللَّهُ تَعَالى بِهِ} رَوَاهُ اَلْأَرْبَعَةُ وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَرَجَّحَ النَّسَائِيُّ إِرْسَالَهُ. وَرَوَاهُ اَلْبَزَّارُ: مِنْ وَجْهٍ آخَرَ، عَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ وَزَادَ فِيهِ: {كَفِّرْ وَلَا تَعُدْ}.

{حسن، صحيح ابن ماجة: ١٦٨٠}:

**دیسان ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ظیهارم کرد لەگەڵ ژنەکەمداو لەپێش ئەوەیشدا کەفارەتی زیهارەکە بدەم، چوومەوە لایو جووت بووم لەگەڵیدا؟ فەرمووی: (بەر ڕەحمەتی خودا بکەویت، چی ئەمەی پێ کردیت؟)**

**گوتی: لەبەر تریفەی مانگە شەوەکە خڕخاڵەکەیم بینی، ئیتر ئارەزووم جووڵاو خۆمم پێ زەوت نەکرا. فەرمووی: (ئیتر توخنی مەکەرەوە، هەتا ئەو کەفارەتەی خودا دایناوە لەسەرت، لەکاتی وادا، جێبەجێی دەکەیت!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٢٢٥٨} + {ژمارە: ١١٢٦ لەم پەڕاوە}.**

**لەڕێگەیەکی ترەوە بەززار (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە هەر لەئیبنو عەبباسەوە، ئەم پترییەی هەیە. (کەفارەتەکەی بدە، وەجارێکی تر هەڵەی وا نەکەیتەوە: بچی ظیهار لەگەڵ ژنەکەت بکەیتو لەپێش ئەوەدا کە کەفارەتەکەی جێبەجێ بکەی دروست ببی لەگەڵیدا).**

١١٢٦- وَعَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: { دَخَلَ رَمَضَانُ، فَخِفْتُ أَنْ أُصِيبَ اِمْرَأَتِي، فَظَاهَرْتُ مِنْهَا، فَانْكَشَفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ لَيْلَةً، فَوَقَعْتُ عَلَيْهَا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) "حَرِّرْ رَقَبَةً" قُلْتُ: مَا أَمْلِكُ إِلَّا رَقَبَتِي. قَالَ: "فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ"، قُلْتُ: وَهَلْ أَصَبْتُ اَلَّذِي أَصَبْتُ إِلَّا مِنْ

اَلصِّيَامِ؟ قَالَ: "أَطْعِمْ فَرَقاً مِنْ تَمْرٍ بَيْنَ سِتِّينَ مِسْكِينًا"} أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ إِلَّا النَّسَائِيَّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ خُزَيْمَةَ، وَابْنُ اَلْجَارُودِ.

{صحيح الترمذي: ٢٦٢٨}:

**ئـەم فەرموودەیـە لـەتاجول ئوصـول‌و فیقهـی ئاسـانا، ئاوایـە، وە جـۆری کەفارەتی ظیهاریشی تیادا دیاری کراوە.**

**سەلەمەی کوڕی صەخر (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ بـووم زۆرم حـەز لـە ژن بـوو، جـا کـە رەمـەزان هـات نـەبادا لەرەمـەزانا، لـەکاتی نادروستا بچمە لای ژنەکەم‌و لەگەڵیدا دروست ببم، هاتم ظیهارم لەگەڵدا کرد هەتا رەمەزان دەڕوا، بە باوەڕی خۆم بەم ظیهارە ئاگربڕ دەکەم‌و لەسەراسەری مـانگی رەمـەزانا توشـی هەڵـەی سـەرجێی‌و دروسـت بـوون لەگـەڵ ژنـدا نـابم، شـەوێ ژنەکـەم خـەریك بـوو خزمـەتی دەکـردم لـەو کاتـەدا، لـەپڕ چـاوم بەشوێنێکی کەوت‌و ئیتر خـۆم بـۆ ڕانـەگیراو هەڵپەڕیمـە سـەر کۆڵی‌و چوومە لای‌و جووتبووم لەگەڵیدا، جا بۆ سبەینێ قسەم بۆ خزمەکانم کردو گوتم: من هەڵەیـەکی ئـاوام کـردووە، وەرن لەگـەڵما دەچـین بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا چاری ئـەم هەڵەیـەم بـۆ دەکا. گوتیـان: نـە بەخودا نایەین، جا خۆم چووم بۆ خزمەتی‌و عەرزیمکرد، حاڵەکە ئاوایە:**

**فەرمووی: (ئەمەیشت کرد، ئەی سەلەمە! گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵێ ئەمەیشم کرد، بەڵام ئەمەتام ڕاوەستاوم لەخزمەتتا، لەبەر باری خـودای گەورەو شکۆمەندا، خودای گـەورە فـەرمانی بەچییە بـەوە حـوکمم بـدە، مـن ملـم کەچـە بـۆ ئـەوە. فـەرمووی: (بەنـدەیێ ئـازاد بکـە) منـیش دەسـتم مـاڵی بەلاملماو گوتم: بەو کەسـە کـەتۆی کـردووە بـە پێغەمبـەری راسـت‌و دروسـت، جگە لەخۆم کە بەندەی خودام بەندەی تر گومـان نابـەم. فـەرمووی: (دە دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بە). گوتم: ئاخر من بەهۆی رۆژووەوە تووشی ئـەم کێشەو بەرەیە بووم!**

فەرمووی: (دە شەست مەن خورما دەرخواردی شەست هەژار بدە).

گوتم: بەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راستو دروست، خۆمو ژنەکەم بەبێ شێو سەرمان ناوەتەوە، وە ئەوەی کەپێی بگوترێ خۆراك نەمان بوو.

فەرمووی: (دە بڕۆ بۆلای سەرکاری سەرزەکاتی بەنی زورەیق، زەکاتەکەی لێ وەربگرە، شەست مەن خورمای لێ بدە بە شەست هەژارو باقی مەندەکەیشی بۆ خۆتو خێزانت بیخۆن بۆ خۆتان).

جا منیش گەڕامەوە بۆلای خزمانم پێیانم گوت: ئێوە سەری دنیاتان لەمن هێنایەوە یەكو ڕاتان خراپ بوو، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵ فراوانو بە حەوسەڵەیەو ڕای فرە خاسە. وە فەرمووشی پێم کەپێتان ڕابگەیەنم (کە زەکاتەکەتان بۆ من بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٢٢٥٩ + فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٢٨٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئیلاء، لەزمانی عەرەبیدا، واتە: سوێنخواردن، لە یاسانامەی خودادا، برێتییە لەسوێندخواردنی مێردێکی وا کە دروست بی ژن تەڵاق بدا، وە لەسەر ئەوە سوێندبخوات کە هەرگیز نەچێتە لای ژنەکەی، یا زیاتر لەچوار مانگ نەچێتە لای.

بەر لەهەموو شتێ دەبێ ئەوە بزانین کە ئیلاء دروست نییەو ناهەقییەو مێرد دەیکا لەژنی خۆی، مەگەر کاتێ کە مێردەکە مەهانەیەکی ڕەوای هەبێ. چونکە هەروەك بۆ ژن حەرامەو تاوانە: کەنەهێڵێ مێردەکەی خۆشیو لەززەتی جەستەیی ڕەوای لێ وەربگرێ، بەبێ مەهانەی ڕەوا، هەروا بۆ پیاویش نادروستو تاوانە: کەنەهێڵێ ژنەکەی خۆشیو لەززەتی جەستەیی ڕەوای لێ وەربگرێ، تەنانەت ئەگەر ژنێ لەشەوا داوای سەرجێی لەمێردەکەی بکا، وەمێردەکەی بەبی مەهانەی ڕەوا، داواکەی جێبەجێ نەکا، بەپێی

فـەرموودەی ژمـارە: (١٠٥٠) کـە لەپێـشەوە ڕۆیـشت، فریـشتە هـەتا بـەیانی نەفرەت لەو مێردە دەکا، چونکە قورئان بەدەق دەفـەرموێ: {وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّـذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ – البقرة/٢/٢٢٨}:

واتە: یـەزدانی پـاك دەفـەرموێ: (پیـاوو ژن، بـەپێی یاسانامەی خـوایی، بەیەکسانی، مافی چوون یەکیان لەسەر یەکتری هەیـە، وە ئـەو مافـە ڕەوایـەی کە لەکۆمەڵگادا بۆ پیاوان هەیە، بۆ ژنانیش هەمان ماف هەیە!).

**جا کورت و پوخت:**

آ- ئیلاءو سوێندخواردن لە ژن کـەمێرد نەچێتە لای، کـارێ بـاش نییـە، هەرکاتێ شتی وا ڕوویدا، مێرد تا زوو پەشیمان ببێتەوە باشترە.

ب- ئەگەر پیاوەکە ئاوا ئیلائی کردبوو، گوتبـووی بەژنەکـەی: (بـەخودا تا چوار مانگ لەگەڵت دروست نابم) ئەگـەر بـەر لەچوار مـانگ ئاشـت بـۆوەو لەگـەڵ ژنەکـەی دروسـت بـوو، ئـەوە بـەس کـەفارەتی سـەیندەکەی لەسـەرەو بەس.

ج- یا گوتبووی: (بەخودا هەرگیز لەگەڵتا دروست نـابم) ئـەوە هـەرکاتێ چووەلای ژنەکەی دەبێ کـەفارەتی سـوێند بـدا، وە لـەپاش چـوار مـانگ، قـازی ناچاری دەکا، یا ژیانێکی ئاسـایی لەگـەڵ ژنەکەیـدا بباتـە سـەرو دڵـی ژنەکـەی ڕازی بکات، یان ژنەکەی تەڵاق بدات، تا لەوە زیاتر ناهەقی لێ نەکرێ.

٢- ظیهارکردن لەیاسانامەی پیرۆزی خودادا: بریتییە لەوە. کەمێرد ژنی خۆی بچوێنێ بەژنێکی خۆیی (مەحرەم)ی خۆی، لەحەرامیدا، واتە: لەبابەتی لەززەت وەرگرتنی ژنو مێـردی لەیـەکتری، نـەوەك: لەشـێوەو ڕەوشـت و قـەدو باڵاو شتی تری وادا.

واتە: هەرکاتێ مێرد بەنیازی ظیهـاری شـەرعی، بـەژنی خـۆی گـوت: تـۆ وەك دایکم لەمن حەرامیت، یا تۆ دایك و خوشکمی و جیاوازیـت نییـە لـەوان،

ئەوە دەبی بەر لەجووتبوون لەگەڵ ئەو ژنەیدا، لەسەر ئەم شێوەیە کەفارەت بدا:

آ- کۆیلەیەك ئازاد بکا.

ب- ئەگەر بۆی نەکرا دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ.

ج- ئەگەر یەکەمو دووەمی بۆ نەدەکرا، خۆراکی شەست هەژار بدات.

٣- سەلەمەی کوڕی صەخری ئەلبەیاچی، ئەنصارییە، خەزرەجییە، یەکێ بوو لەوانەی کە لەترسی خودای گەورە زۆر دەگریاو ناسراون بە (البَكَّاؤون)

ئامادەی جەنگی حونەین بووە، هەروا ئامادەی ئازادکردنی مەدائین بووە، بە بەصرەیی دەژمێردرێ، سولەیمانی کوڕی یەسارو سەعیدی کوڕی موسەییەب شاگردی ئەو بوون، فەرمووودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە، هەتا سەردەمی موعاوییە ژیاوە.

## ٦٩- باسی شەڕەنەفرین
## بَابُ: اللِّعَانِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٧٧٧، زنجیرە: ٢٨٨ + تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٥٧٤، چاپی چوارەم، ژمارە: ٢٢٥٠ + تەجریدی بوخاری بەرگی چوارەم، ژمارە: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥ بوخاری + تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ٦٩، ژمارە: ١٧٩٥ = ٥٣١٢، ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠ بوخاری + مختصر صحيح مسلم، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ٦٧٣ لە ژمارە: ٨٦٥ هەتا ژمارە: ٨٧٢}.

١١٢٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: { سَأَلَ فُلَانٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! أَرَأَيْتَ أَنْ لَوْ وَجَدَ أَحَدُنَا اِمْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ، كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ تَكَلَّمَ تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ! فَلَمْ يُجِبْهُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ

أَتَاهُ، فَقَالَ: إِنَّ اَلَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدِ ابْتُلِيتُ بِهِ، فَأَنْزَلَ اَللَّهُ اَلْآيَاتِ فِي سُورَةِ اَلنُّورِ، فَتَلَاهُنَّ عَلَيْهِ وَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ اَلدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ اَلْآخِرَةِ. قَالَ: لَا، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ دَعَاهَا اَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَوَعَظَهَا كَذَلِكَ، قَالَتْ: لَا، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ، فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ، فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ، ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ، ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٧ = شيحا ٣٧٢٦ مسلم ترقيم محمد فؤاد: ١٤٩٣}:

**ئەم فەرموودەیە لە موختەصەری صەحیحی موسلمدا ئاوەهایە:**

**سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی ئەمیری (فەرمانڕەوایی) موصعەبی کوڕی زوبەیردا، پرسیارم لێ کرا، لەبارەی ئەو ژنو مێردەوە، کە لەنێوانی خۆیاندا، شەڕەنەفرین دەکەن، ئایا لەیەکتری جیا دەکرێنەوە؟ منیش نەمزانی بڵێم چی، جا ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) لەمەککە، بە نۆکەرەکەیم گوت: مۆڵەتم بۆ وەربگرە دەچم بۆ خزمەتی، خوڵامەکە گوتی: نوستووە، بەڵام ئیبنو عومەر گوێی لەدەنگم بوو، فەرمووی: ئەوە سەعیدی کوڕی جوبەیرە؟ گوتم: بەڵێ، ئەوم، فەرمووی: وەرە ژوورەوە، بەخودا وادیارە، لەم کاتی وچانەدا، بە بەلاش نەهاتووی، کارێکی گرنگ تۆی هێناوە.**

**سەعید فەرمووی: کاتێ چوومە ژوورەوە، دەڕوانم والەسەر جلە وشترێ دانیشتووە لەسەر پشتییەك شانی دادابوو، کەناواخنەکەی ڕیشووی دارخورما بوو، عەرزیمکرد: ئایا ئەو ژنو مێردەی کە شەڕەنەفرینو مولاعەنە لەگەڵ یەکتری دەکەن، جیا دەکرێنەوە یان نا؟**

**ئیبنو عومەر فەرمووی: سوبحانەڵڵا! ئەی چۆن لەیەکتری جیاناکرێنەوە!**

یەکەم کەس کەلەم شتەی پرسی، فیسارەکەسی کوڕی فیسارەکەس بوو، هەتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو گریمان کەسێ بچێ بەسەر ژنەکەیدا، دەروانێ خەریکی داوێن پیسییە، چاری چییە؟ ئەگەر قسە دەکات هەر وەی، ئەگەر قسە ناکات هەروەی، یەك لەیەك دژوارترو سەخت ترە. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خامۆش بوو، وەڵامی نەدایەوە، جا دوای ئەم جارە، پیاوەکە جارێ تریش هاتەوە، عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پرسیارەی کەجاری پێشوو عەرزم کردی بەسەر خۆم هاتووە، کەچوومەوە زەلامی بەسەر ژنەکەمەوە بوو، جا خودای گەوورەو سەروەر، ئەم چوار ئایەتەی ناردە خوارەوە کەوان لەسورەتی نووردا:

{وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ – ٢٤/النور/الآيات –٦/٩}:

واتە: ئەو مێردانەی کەبەدەمی خۆیان، تۆمەتی حیزێتی دەدەن لەژنەکانیانو، جگە لەخۆیان شایەتو بەڵگەی تریان نییە، ئەوە بۆ چەسپاندنی ئەم داوایە، دەبێ خۆی لەلای قازی، لەناو کۆمەڵێکا، چوار جار شایەتی بدات، بڵێ: شایەتی دەدەم بەخودا کەمن ڕاست دەڵێم لەوەدا کە دەیڵێم بەژنەکەم، وەکوو داوێنپیسی بێ، وە ئەگەر مێردەکە ویستیشی حاشا لەهاوپشتیو باوکێتی منداڵەکەیشی بکا، ئەوا لەهەمموو شایەتییەکانیدا، بڵێ: وە ئەو منالەیش کە لەلای ژنەکەیە لەمن نییە. وە بۆ جاری پێنجەم بڵێ: لەعنەتو نەفرەتو نەفرینی خودام لەسەر بێ ئەگەر درۆ بکەم لەم وەپالدان (نیسبەت)ی داوێنپیسییەدا کە دەیدەم لەم ژنە.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتەکانی بەسەر پیاوەکەدا خوێندەوەو سەبارەت بە بوختانی وا گەورە پەندو ئامۆژگاری کردو زۆر شتی یاد خستەوەو هەواڵی ئەوەیشی پێدا، کەسزای دونیا هەرچۆن بێ زۆر ئاسانو

كەمترە، لەسزای سەختی ڕۆژی دوایی، قەبووڵی داری حەددی بوختیان زۆر ئاسانترە لەتۆڵەی سەختی دۆزەخ، پیاوەکەیش گوتی: سوێندم بەو کەسەی کە خودای گەورەیە، کەتۆی بەم شەریعەتە پیرۆزەوە ڕەوانە کردووە، بۆسەر بەرەی ئادەمیو جنۆکە بوختیانم بۆ ئەو ژنەی خۆم نەکردووە، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەیشی بانگ کردو هەمان پەندو ئامۆژگاری ئەویشی کردو پێشی فەرموو کە قەبووڵی حەددی داوێنپیسی گەلێ ئاسانترە لەچەشتنی سزای ئاگری سووری دۆزەخ، بەڵام ژنەکەیش نەچووە ژێریو گوتی: نا ڕاست ناکا، بەو کەسەی کەتۆی ڕەوانە کردووەو کردوویتی بە پێغەمبەری خودا، ئەو مێردەی من درۆ دەکاو شەڵتاخو بوختیانم پیا دەکات.

ئەوسا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرداری شەڕە نەفرینەکەی جێبەجێ کرد لەنێوانیانا، لەپێشا بەپیاوەکە دەستی پێ کردو چوارجار خودای کرد بەشایەت کە لەم تۆمەتەدا ڕاست دەکا، لەجاری پێنجەما گوتی: لەعنەتی خودام لێ بێ ئەگەر لەم شایەتییەمدا بوختیانی درۆ بۆ ئەم ژنەی خۆم بکەم، ئەوجا دووەم کەس بەژنەکە دەستی پێ کرد، چوارجار گوتی: خودا دەکەم بەشایەت کە ئەم مێردەی من درۆ دەکاو شەڵتاخم پیادەکا، لەشایەتی پێنجەما گوتی: خەشمو قارو غەزەبی خودام لێ بێ ئەگەر ئەو مێردەی من ڕاست بکا، لەم شایەتییەی کە لەسەر منی دا، ئیتر پاش ئەم شەڕەنەفرینە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەیەکتری جیاکردنەوەو بڕیاری دا، کەپیاوو ژنەکە فڕیان بەسەر یەکتریەوە نەماوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٧}.

١١٢٨- وَعَنِ اِبْنِ عُمَرَ (رضى الله عنه) أَيْضًا { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ لِلْمُتَلَاعِنَيْنِ: "حِسَابُكُمَا عَلَى اَللَّهِ تَعَالَى، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لَا سَبِيلَ

لَكَ عَلَيْهَا" قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! مَالِي؟ قَالَ: "إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهُوَ بِمَا اِسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٩٥ = ٥٣١٢، ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٨ = شیحا ٣٧٢٤ = مسلم ١٤٩٣. أبو داود. طلاق: ٢٢٥٧. نسائی. طلاق: ٣٤٧٦. تحفة الأشراف: ٧٠٥١}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو ژنو مێردەی فەرموو، کە لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا، شەرەنەفرینیان کرد، فەرمووی پێیان: (حیسابو لێپرسینەوەتان لەو جیهاندا لەسەر خودایە، لەم جیهانەدا، خوا نەبی کەس نازانێ کە کامتان راست دەکاو کامتان درۆ دەکا، دیارە کەئێوە یەکێکتان درۆ دەکەنو یەکێکتان راست دەکەن، ئەی مێرد! ئیتر ئەم ژنە لەژنی تۆ دەرچوو، وە مافت نەما بەسەریەوەو فرت پێیەوە نەما!) .

پیاوەکەی مێردی ژنەکەیش گوتی: ئەی ماڵەکەم، ئەی ئەو ماڵەی کە لەجیاتی مارەیی داومە پێی، ئەوەم ناکەوێتەوە؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ماڵت ناکەوێ، ئەو مارەییە کە داوتە پێی بووە بەهی خۆی، چونکە ئەگەر قسەکەت راست بێ، کە ژنەکەت ئەو ناپاکییەی لەتۆ کردووە، ئەوە لەم بارەدا ماڵەکەی دەکەوێو ئەو مارەییە دەبی بەهی خۆی، لەباتی ئەوە کە لەمەوپێش ژنت بووەو وە لەباخەڵت گرتووەو بەحەلاڵی لەگەڵی دروست بووی، خۆ ئەگەر بوختانیشت کردبێ بۆی، ئەمەیانت خراپترو زیاتر بیانووت دەبڕێو ڕێگەی تەشقەڵەت نامێنێ!)٠

١١٢٩- وَعَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه)، أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَبْيَضَ سَبِطًا فَهُوَ لِزَوْجِهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ جَعْدًا، فَهُوَلِلذِي رَمَاهَا بِهِ} . مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمـارە: ١٦٧٦ = ٤٧٤٧، ٣٦٧١، ٥٣٠٧ بخـاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٠ = شيحا ٣٧٣٦ = صحيح مسلم/١٤٩٦}:

**لەموختەصەری صەحیحی موسلیما ئاوایە:**

**موحەممەدی کوڕی شیرین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ پرسی شەڕەنەفرین لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، چونکە لەو بڕوایەدا بووم کە ئەو لەم بارەیەوە ئاگاداریی هەیە.**

**فەرمووی: هیلالی کوڕی ئومەییە، کەدایك برای شیریی بەرائی کوڕی مالیك بوو، کە بەڕاء برای هەقی منە. فەرمووی: هیلال شەریکی کوڕی سەحمائی نا بەقنگی ژنەکەی خۆیەوەو گوتی: شەریکم بەسەر ژنەکەمەوە گرتووە.**

**ئەم هیلالە یەکەم کەس بوو کە لەسەردەمی ئیسلامەتیدا شەڕەنەفرین‌و لیعان لەگەڵ ژنەکەیدا بکا جا کە شەڕەنەفرینەکەی لەگەڵ ژنەکەی ئەنجامدا، لەمزگەوتا، لەخزمەتی پێغەمبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەرەنج بدەن ئەم ژنە سکی پڕە، جا ئەگەر منالێکی سپیکەلەی قژخاوی، دووچاو شەڵەقاوی بوو، ئەوە لەهیلالی کوڕی ئومەیەیە، چونکە هیلال خۆی وایە، منالیش شێوەی وەك شێوەی باوکی وایە، بەڵام ئەگەر ئەم ژنە منالێکی ڕەشکەلەی چاوڕەشی قژلوولی، دوولاق باریکی بوو، ئەوە لەشەریکی کوڕی سەحمایەو زۆڵە).**

**فەرمووی: هەواڵم زانیوە، کە کوڕێکی ڕەشکەلەی موو لوولی، دوولاق باریکی بووە.** {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠، ٢٢٥١}.

**(ڕوونکردنەوە):**

**١- عەینی دەفەرموێ: ئەم منالە گەورە بوو، بوو بەمیرو سەرۆکی سەرشارێ، ناوی باوکی نەدەزانرا.**

بۆ ژیاننامەی ئیبنو سیرین بڕوانە: (مختصر صحيح مسلم/٥، لاپەڕە: ٢٤٤، ژمارە: ١٩٥٧).

١١٣٠- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا" { أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَمَرَ رَجُلاً أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عِنْدَ اَلْخَامِسَةِ عَلَى فِيهِ، وَقَالَ: "إِنَّهَا مُوجِبَةٌ" } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{صحيح أبي داود: ١٩٧٥ من كتاب: صحيح وضعيف سنن أبي داود} للشيخ الألباني – مصدر الكتاب: برامج منظمة التحقيقات الحديثه – المجاني – من إنتاج مركز نور الإسلام لأبحاث القرآن والسنة بالإسكندرية}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەو کاتەدا، کە ئەم ژنو مێردە، خەریکی شەڕەنەفرینەکە بوون، کەپیاوەکە گەیشتە سەر شایەتی پێنجەم، بۆ ئەوەی کە شەڕەنەفرینەکە نەگاتە ئەنجامو مێردەکە وازبهێنێ لێی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەپیاوێ، کە دەستی دابنێ لەسەر دەمی مێردەکە، هەتا شایەتی پێنجەم نەڵێ، وە فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (ئەم شایەتی پێنجەمە دوو شت پێویست دەکا:

یەکەم: جیابوونەوەی ژنو مێرد لەیەکتری مسۆگەر دەکا.

دووەم: سزای سەختی خودایش بۆ درۆزنەکەیان دابین دەکا.

١١٣١- وَعَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنه) – فِي قِصَّةِ اَلْمُتَلَاعِنَيْنِ- قَالَ: { فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ تَلَاعُنِهِمَا قَالَ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلَاثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجرید/٤، ژمارە: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥، ٤٧٤٦، ٥٢٥٩، ٥٣٠٨، ٦٨٥٤، ٧١٦٥، ٧١٦٦، ٧٣٠٤ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٥ = ٣٧٢٣ = مسلم: ١٤٩٢. أبوداود: طلاق: ٢٢٤٥. نسائی. طلاق: ٣٤٠٢. ابن ماجة. طلاق: ٢٠٦٦ تحفة الأشراف/٤٨٠٥}:

له (مختصر صحيح مسلم)دا ئاوایه:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوومەیری عەجلانی هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدی ئەنصاری کە سەرۆك خێڵی عەجلان بوو (ڕەزای خودای لێ بێ) پێی گوت: ئەی عاصیم! پێم بفەرموو: پیاوێك زەلامێك بەسەر ژنەکەیەوە بگرێت، ئەگەر دەیکوژێ، ئێوە دەیکوژنەوە، ئەگەر نایکوژێ ئەی چی فوڕێ بەسەر خۆیدا بکا؟ ئەی عاصیم ئەم پرسیارەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ بکە، عاصیم چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارەکەی لێ کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە پرسیارانەی پێ ناخۆش بوو، بەڵکوو بەشوورەیی دانا، تەنانەت ئەو وەڵامەی کە عاصیم لەم بارەیەوە لە پێغەمبەری بیست، کارێکی ئەستەمو قورسو گران بوو لەسەرشانی عاصیم!

کاتێ عاصیم گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، عوومەیر چوو بۆلای‌و پێی گوت: ئەی عاصیم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چی فەرموو بۆ پرسەکەی من؟ عاصیم پێی گوت: خێرم نەدی لەتۆ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدامەوە، حەزی لەم جۆرە پرسیارە نەبوو کەمن لێیم کرد، سەبارەت بەژنەکەی تۆ، عوومەیر فەرمووی: بەخودا کۆڵ نادەم، هەتا لەم بارەیەوە بۆ خۆم لە پێغەمبەر نەپرسم، جا عوومەیر بۆ خۆی ڕۆیشت، کەچووە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو کۆمەڵێ خەڵکا بوو، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێ زەلامێ بەسەر ژنەکەیەوە بگرێ چی بکا؟ ئەگەر دەیکوژێ ئێوە لەتۆڵەیدا دەیکوژنەوە، گوایە پیاوێکی کوشتووە دەبێ بکوژرێتەوە لەجیاتی ئەو، ئەگەر نەشی کوژێ ئەی چی بکا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:

(خودای گەورەو سەروەر، سەبارەت بەبابەتی تۆو ژنەکەت ئایەتی ناردۆتە خوارەوە برۆ ژنەکەت بهێنە!).

سەهل فەرمووی: من لەناو خەڵکەکەدا بووم، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، کەفەرمانی بەهەردووکیان کرد، بەژن‌و بەمێردەکەی لەناو مزگەوتا شەڕە نەفرینیان کرد بەپێی ئەو دەستوورەی کە خودای گەورە لە قورئانا دیاری کردووە، لەئایەتی شەشەما لەسوورەتی (نوور) کە لەپێشەوە ئایەتەکان‌و واتاکەیان لە ژمارە: (١١٢٧)ی ئەم پەڕاوە پیرۆزەدا رابورد.

جا کاتێ عووەیمیر و ژنەکەی، لەشەڕە نەفرینەکە لێ بوونەوە، عووەیمیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەم ژنە لەپاش ئەم رووداوو کەین‌و بەینەو ئابڕوو چوونە قەبووڵ بکەمەوە، ئەوە واتای وایە کەمن بوختیانم بۆی کردووە، ئیتر سێ تەڵاقەی دا، بەرلەوەی کە پێغەمبەر، فەرمانی پێ بکاو پێی بڵێ کە تەڵاقی بدا.

ئیبنو شەهاب – واتە: ئیمامی زوهری – دەفەرموێ: ئیتر لەپاش ئەو ژن‌و مێردە، جیابوونەوەو تەڵاق بوو بەباوو دەستوور، لەنێوانی ئەو ژن‌و مێردانەدا کە شەڕەنەفرین دەکەن. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠، ٢٢٥١ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١١٣٢– وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا { أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: إِنَّ اِمْرَأَتِي لَا تَرُدُّ يَدَ لَامِسٍ. قَالَ: "غَرِّبْهَا". قَالَ: أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: "فَاسْتَمْتِعْ بِهَا". } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالْبَزَّارُ، وَرِجَالُهُ ثِقَاتٌ.

{أبو داود. نكاح: ٢٠٤٩. نسائي ١٧٦/١. ابن ماجة: ٢٧٤٣. صحيح أبي داود: ١٨٠٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧١ = شیحا = ٣٧٤٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە باوکی بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەم دەست بەرووی کەسەوە نانێ، بەنەخوێنی شلە؟!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (بەرەڵایکە) واتە: تەڵاقی بدە. گوتی: دەترسم دوایی دڵم بۆی لێ بدا! فەرمووی: (کەواتە ڕابوێرە لەگەڵیا، هەتا دڵت لێی هەڵدەکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٨}.

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەم فەرموودەیە تەندروستە، ڕوونکردنەوەیەکی باشی دەوێ، گەلی ئیسلام وەك دەریای ئۆقیانووس وەهایە، لەهەموو جۆرە کەسێکی جیاجیای واتیادا، بمانەوێو نەمانەوێ، ئەم جۆرە حاڵەتانەیش ڕوودەدا

جا لەم سۆنگەیەوە، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە،ئیمامی رافیعی، کە دائەنرێ بە گەورە زانای شافیعیو لەگەڵ ئیمامی نەوەویدا پێیان دەگوترێ: (الشیخان) ئیمامی رافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر دەرکەوتو بە بەڵگە چەسپا، کە ژن داوێنپیسی ئەنجام دەدا، وەمێردەکەی نەیدەتوانی کەلێی جیا ببێتەوە، ئەوا پێویست نییە، لەسەری کە تەڵاقی بدا). واتە: دەتوانێ گوزەرانی لەگەل بکا هەتا لێی بیزار دەبێ، وەبەپێی توانا ڕێگەی ئەوەی لێ بگرێ.

٢- هەندێ لە سەروەرییەکانی ئیمامی رافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ).

ناوی عەبدولکەریمی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی فەضلی کوڕی ئەلحەسەنی ئەل – قەزوێنییە، ناسراو بە (الإمام الجليل أبو القاسم الرافعي).

رافیعی زانایەکی گەورەی مەوسووعی بوو، لەهەموو زانستەکانا مەلەوان بوو، لەتەفسیرو زانستەکانی قورئانا، لەحەدیثو زانستی فەرموودەشوناسیدا، لەشەرعو فیقهدا، ئۆقیانووسێ بوو بۆخۆی، بگرە زانستە فیقهیەکانی فەوتا بوون، ئەو زیندووی کردنەوە، زانایەکی پایەبەرزی خاوەنی وەرعو تەقواو زوهد بوو، وەرعی لەئاوی شەوی دەکرد، کەراماتی شەرعی زۆری لێ بینراوە. یەکێ لەشاگردەکانی فەرموودەیان لێیەوە وەرگێڕاوەتەوە (الحافظ عبدالعظيم

ألمُنذِرى/ مصنِف مختصر صحيح مسلم للمنـذرى) بـوو. ئيبنـو صـەلاح دەڵـێ: (لـەباوەڕی منـا، زانـای وا، لەهـەموو وڵاتـی عەجەمـدا، نموونـەی نییـە). سوبوکیش دەڵێ: (بەبێ گومان کەخۆی هەروایە!) ئیمامی نـەوەی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: (رافیعـی یەکێکـە لـەو پیاوچـاکانەی نەتـەوەی ئیسلام، کەشاد بوون بەپلـەی دامـەزراوانو یـەقینی تـەواو، کـەراماتی شـەرعی زۆری لێ بینراوە!).

لەقەزوین کۆڕی پەخشی تەفسیری قورئانو بڵاوکردنـەوەی فـەرموودەی هەبوو، هەمیشە کۆڕی پەخشی زانستی دەتگوت پوورەی هەنگە.

ئیبنو خەلەکان دەفەرموێ: (پێشەوا رافیعی (رەحمـەتی خـودای لێ بـێ) لـەمانگی نـاو جـەژنانی سـاڵی (٦٢٣)ی کۆچـی لـە قـەزوین، مـەرگ بـووە بەمیوانیو مردووە، هەر لەم ساڵەدا، سوڵتان خوارەزم شاه جەلالـەدین، کـەرج لـە (تلفـیس) غـەزا دەکـا، لەشەڕەشمـشێری زۆردا خـوێن بەدەسـتیەوە وشـك دەبێتـەوە، کاتـێ جەلالـەدین شـاه لەقەزوینـەوە رەت دەبـێ، پێـشەوا رافیعـی دەچـێ بەپیریـەوە، سـوڵتان ڕێزێکـی شـایانی لێ دەگـرێ، رافیعـی پێـی دەڵـێ: بیـستوومە کـە ئەوەنـدە جـەنگت لەگـەڵ دوژمنـانی ئیـسلام کـردووە، خـوێن بەدەستەوە وشك بۆتەوە، ئـەو دەسـتەتم بـدەرێ هـەتا ماچی بکـەم، خـوارەزم شاه پێی دەڵێ: بـەڵکوو تـۆ دەسـتی خـۆتم بـدەرێ هـەتا مـن ماچـی بکـەم، جـا سوڵتان جەلالـەدین دەسـتی ڕافیعـی مـاچ دەکـا، وەماوەیـێ بەیەکـەوە گوفتوگـۆ دەکەنو ئـەوجا رافیعی سواری وڵاخـەکـەی دەبـێو دەڕوا، وڵاخـەکـەی سـەرسمێ دەداو ڕافیعـی دەگلێنـێو ئـەو دەسـتەی کەسـوڵتان ماچـی دەکـا، تووشـی ئـازار دەبێ.

رافیعـی دەفـەرموێ: سـوبحانەڵڵا، پـاکیو بـێ گـەردی هـەر بـۆ خودایـەو بەس! کاتێ سوڵتان ئەم دەستەی مـاچ کـردم، کـەمێ هەسـتم بەمـەزنایی کـرد، بەڵام خودا بەبێ وچان پێی نواندمو تۆڵەی ئەوەی لێ سەندم!!.

پێشەوا ڕافیعی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) شەوێ خەریکی نووسین دەبێ، چرا نابێ ڕۆشنایی بۆ بکا، لەو کاتەدا بەفەرمانی خودا، لقی درەختێ دەبێ بەچرا بۆی‌و لەبەری دەست دەکا بەنووسین!

لەم بابەتە: جارێ مەلایێ، شەوێ خەریکی نووسین دەبێ، بەژنەکەی خۆی دەڵێ: ئەو چرایەم بۆ بگرە هەتا ئەم نووسینە تەواو دەکەم، ژنەکەی دەڵێ: ئەم نووسینە نەبڕایەوە، چراکە ناگرم!! پشیلەیێ لەوێ دەبێ مەلاکە بەپشیلەکە دەڵێ: ئادەی پشیلەکە تۆ ئەو چرایە بگرە! پشیلەکە چراکەی بۆ دەگرێ. مەلاکە بەژنەکەی دەڵێ: من مەبەستم ئەوەیە کەتۆش خێرت بگا، دەنا چراگر زۆرە!!!

**کۆمەڵێ لەبەرهەمە قەڵەمیەکانی پێشەوا ڕافیعی:**

١- الشرح الكبير، كەناسراوە بە (الفتح العزيز في شرح الوجيز).

٢- الشرح الصغير.

٣- المحرّر.

٤- شرح مسند الشافعي.

٥- التذنيب.

٦- الأمالي.

٧- الإيجاز في اخطار الحجاز.

٨- المحمود في الفقه (٨ مجلدات). (بڕوانە: طبقات الشافعية الكبرى للإمام عبدالوهاب السبكي).

٣- ئەم فەرموودەیە، نەسائی لەڕێگەیێ ترەوە لەئیبنو عەبباسەوە دەیگێڕێتەوە:

دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی پێـی: (کەواتە تەڵاقی بدە) کابرا گوتی: بەبێ ئەو نـاتوانم ئۆقرە بگـرم! فـەرمووی: (دەی بیهێڵەرەوە!). {صحيح سُنَنَ أبى دَوُد: ٣٤٦٥}.

-١١٣٣

آ- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) يَقُولُ -حِينَ نَزَلَتْ آيَةُ اَلْمُتَلَاعِنَيْنِ-: "أَيُّمَا اِمْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ مَنْ لَـيْسَ مِنْهُمْ، فَلَيْسَتْ مِنْ اَللَّهِ فِي شَيْءٍ، وَلَنْ يُدْخِلَهَا اَللَّهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَـدَهُ - وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ- اِحْتَجَـبَ اَللَّـهُ عَنْـهُ، وَفَـضَحَهُ اَللَّـهُ عَلَـى رُءُوسِ اَلْخَلَـائِقِ اَلْـأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ.

{صحيح الجامع: ٢٢٢١}:

ب- وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {مَنْ أَقَرَّ بِوَلَدٍ طَرْفَةَ عَيْنٍ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَنْفِيَهُ}. أَخْرَجَهُ اَلْبَيْهَقِيُّ، وَهُوَ حَسَنٌ مَوْقُوفٌ.

{حَسَّنَهُ الحافِظُ أَيضاً فِي التَّلْخِيصِ ٣/٢٣١}:

آ- ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: کاتـێ ئایەتـەکانی شەڕەنەفرین، کە لە ژمارە: (١١٢٧)دا ڕابوردن، هاتنـە خـوارەوە، لـە پێغەمبـەرم بیست دەیفەرموو: (دروودی خودای لەسەر بێ) (هەر ژنـێ منـاڵێ، بـەدرۆ بکـا بەهی خێڵێ، کە ئـەو منـاڵە لـەوان نـەبێ‌و هـی لایـەنێکی تـر بـێ، وەك منـاڵی کـاتی شـەرەنەفرین، ئـەوە ئـەو ژنـە فـڕی بەسـەر ئـایینی پـیرۆزی ئـیسلامەوە نامێنێ، وەخودا نایخاتە بەهەشتی خۆی، هەروا هەر پیـاوێ، کەبەچـاوی سـەر، زەق زەق تەماشای مناڵەکەی خۆی بکاو سوور بزانـێ کە ئەوە منـاڵی خۆیەتـی‌و لەخۆیـەتی، کەچـی لەگـەڵ ئەوەیـشا، لەبـەر ئـەوەی کێشەیەکی هەیـە لەگـەل دایکی مناڵەکەی، وەك ئەوە لێـی خانەگومانـەو دڵـی لێـی پیـسە، دەچـێ حاشـا

لەمناڵەکەی خۆشی دەکا، هەر باوکێ ناڕەوایی وا لەمناڵی خۆی بکا، لەڕۆژی دوارۆژا خودا ئەم دوو تۆڵەی لێ دەستێنێ:

یەکەم: بەچاوی سۆزو میهرەبانی تەماشای ناکاو لەبەش و بارەی باشی خۆی نائومێدی دەکا.

دووەم: لەبەرچاوی پێشینانو پاشینان، بەدرۆی دەخاتەوەو ریسوای دەکا، کە بەناحەقی حاشای لەمناڵی خۆی کردووە.

ب- پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ یەك چاو تروکان، دان بنێ بەوەدا کە ئەو منالە منالی ئەوە، ئیتر بۆی نییە کە لەوەدوا لەوە پەشیمان ببێتەوەو حاشا لەو منالە بکات.

-١١٣٤

آ- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ اِمْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ؟ قَالَ: "هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟" قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَمَا أَلْوَانُهَا؟" قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: "هَلْ فِيهَا مَنْ أَوْرَقَ؟"، قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: "فَأَنَّى ذَلِكَ؟"، قَالَ: لَعَلَّهُ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَالَ: "فَلَعَلَّ اِبْنَكَ هَذَا نَزَعَهُ عِرْقٌ".} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجرید/٥، ژمارە: ١٧٩٤ = ٥٣٠٥، ٦٨٤٧، ٧٣١٤. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧١ = ٣٧٤٧. أبوداود. طلاق: ٢٢٦٢. تحفة الأشراف/١٥٣١١. صحيح مسلم/١٥٠٠}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە عەرەبی دەشتەکی، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم سپیم، کەچی ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووەو من ئەو منالە بەمنالی خۆم نازانمو حاشام لێ کردووە، جا تۆ چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەر پێی فەرموو: (هیچ وشترت هەیە؟). گوتی: بەڵێ هەمە، فەرمووی: (ڕەنگیان چۆنە؟). گوتی: سوورن، فەرمووی: (ئایا وشتری تاڵەیان تیادا هەیە؟). گوتی: وشتری تاڵەی زۆریان واتیادا، فەرمووی: (ئەو

وشتره تالانـەیان لـەکوێوه تـی کـەوتووه؟). گـوتی: ڕەنگبـێ، ڕەگـێ لەڕەگـەزیان ڕەنگی وابووبێو ئەمانەی ئێستا چووبنەتەوه سەر ڕەگی ئـەو ڕەگـەزه کۆنـەی خۆیـان! فـەرمووی: (دەی کوڕەکـەی تـۆیش هـەروەها!!). {تـاج/٢، زنجـیره: ٧١، ژماره: ٢٢٥٤ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

ب- وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِمٍ: {وَهُوَ يُعَرِّضُ بِأَنْ يَنْفِيَهُ}، وَقَالَ فِـي آخِـرِهِ: {وَلَـمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي اَلِانْتِفَاءِ مِنْهُ}.

{صحيح مسلم، ترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا/٣٧٤٦}:

لەگێڕانــەوەی ژمــاره: (٣٧٤٦)ی شــیحادا، دەفــەرموێ: ئەمــەی پــتره: کەپیاوەکـه بـه واتـاو بەمـەعنا دای بـەگوێی پێغەمبـەردا: کـه دەیـەوێ حاشـا لەکوڕەکـەی بکـا، هـەتا ئـەوێ کـه لـەکۆتایی فەرموودەکـەدا دەفـەرموێ: بـەڵام پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئـەو مۆڵەتـەی پێـی نـەدا، کەحاشـا لەکوڕەکەی بکا. چونکه مەهانەکەی زۆر لاواز بوو.

(ڕوونکردنەوه):

**پوختەی بڕیارەکانی بابەتی شەڕەنەفرین**

١- شــەڕەنەفرین، کــه لــه زاراوی شــەرعی پــیرۆزی خــوادا ناســراوه بــه (لیعان). ئەم کۆمەڵه بڕیارانەی لەسەر دروست دەبێ:

آ- ئەو پیاوو ژنـه، کـه لـەنێوانیانا، شـەڕەنەفرین ڕوو دەدا، هـەتا هەتایـه لەیـەکتری حـەرام دەبـن، بـەهیچ شـێوەیێ حـەڵاڵ نابنـەوه بـۆ یـەکتریو هـەتا مـردن ئـەو ژنــه مـارەی نایەتـەوه لـەو مێـردەی کـه شـەڕەنەفرینی لەگـەڵدا کردووه.

ب- داری حەددی بوختیان لەکۆڵ پیاوەکه دەخا.

ج- داری حەددی داوێنپیسی لەکۆڵ ژنەکه دەخا، ئەگەرنا موحصەن بـێ، هەروا حەددی ڕەجمو بەردەبارانی لەکۆڵ دەخا، ئەگەر ژنەکه موحصەن بـێ، ژنی موحصەن ئەوەیه، شـووی کردبـێو مێـردی چووبێته لایو کردبێتـی بـه

ژن‌و کچێتی نەمابێ. چونکە مێرد وەك قەڵا (حصن) وایە بۆ ژنی خۆی، ژنی مێرددار وەك لەناو قەڵا (واتە: حصن) دابێ وەهایە!

د- ئەگەر مێرد، لەکاتی شەڕەنەفریندا، حاشا لەو منداڵە بکا، کە لەنێوانی مێردو ژنەکەیدا هەیە، ئیتر ئەو منالە، لەمنالی ئەو دەردەچێ‌و دەبێ بەمنالی دایکی‌و پەیوەندی بە بنەماڵەی مێردەوە نامێنێ.

٢- بۆ دووربینی‌و وەرع‌و تەقوا، واباشە موسوڵمان خۆی لەشتی گوماناوی بپارێزێ، وەك هەبوونی گومان‌و شوبهەی بەهێز لە بابەتێکا، وەك هەبوونی داوای شیرخواردن، لەنێوانی دوو منالا، با بەڵگەی رۆشنی حاشاهەڵگریش نەبێ لەئارادا.

٣- منالی حاشا لێکراو گووناهی لەسەر نییە، مرۆڤێکی بێ تاوانی بەرییە، بەهیچ شێوەیێ دروست نییە، هەستی برووکێنرێ، تانەی ناڕەوای لێ بدرێ.

٤- ئەو ماڵەی کە خەرج کراوە بۆ ژنەکە، وەك مارەیی‌و دیاری‌و خەڵات‌و شتی تری وا، هەمووی بووە بەهی ژنەکە خۆی، مافی مێردی پێوە نەماوە، ئەوەی ژنەکە وەری گرتووە ئەوە بووە بەهی خۆی، ئەوەی کە وەرنەگیراوە، وەك مارەیی قەرزی دواخراو، مێرد دەبێ ڕادەستی ژنەکەی بکات.

٥- لەکاتی ڕوودانی کارەساتی وادا، کەمێرد زەلامێ بەسەر ژنی خۆیەوە بگرێ:

آ- بۆی هەیە کارەکە نەووروژێنێ‌و لەگەڵیدا ڕابوێرێ‌و بەهۆکاری ڕەوا، کارێکی وا بکا، کەڕێگەی ئەوەی لێ بگرێ، ئەگەر بۆی کرا.

ب- بەهێمی، بەبێ هاتوو هاوار، تەڵاقی بداو خۆی ڕزگار بکا لەدەستی‌و لەشەڕی بەدوور بێ، وە ئەمە لەهەمووی باشترە. {بڕوانە: ژمارە: ١١٣٢}.

ج- شەڕەنەفرینی لەگەڵدا بکا، لەپاش شەڕەنەفرین مێرد هیچ مافێکی لەسەر ژن نامێنێ، گریمان بیکوژێ، دەکوژرێتەوە لەباتی ئەو.

٦- ئەو پیاوەی دەگیرێ بەسەر ژنی کەسێکی ترەوە:

آ- ئەگەر دانی نا بەتاوانەکەیدا، حەددی داوێنپیسی لێ دەدرێو بەس، ئەگەر موحصەن بوو بەردەباران دەکرێ، ئەگەر ناموحصەن بوو سەد داری حەددی لێ دەدرێ.

ب- ئەگەر چوار شایەتیش هەبوو هەروەها.

ج- ئەگەر نەپێڵینان هەبوو، نەشایەت لەئارادا بوو، ئەوا ئەو کابرایە هیچی لەسەر نییە بەپێی رووکار (ظاهر)ی حاڵ، بەڵام لای خودا تاواننبارە.

٧- مێردو کەسوکاری ژن، مافی ئەوەیان نییە، کەژنەکە یا پیاوەکە بکوژن، یاسزای بدەن، ئەوە کاری قازییە، ئیشی ئەوان نییە، ئەوەی کە لەناو رەشەخەڵکا باوە پێی دەڵێن: (غُسْلُ العَار: شۆرینەوەی شوورەیی) بنەمایەکی شەرعی نییە، لەیاسانامە (شەریعەت)ی خودادا، بەڵام جەماوەری زانایان دەفەرموون: (ئەگەر مێرد یا خاوەنی ژنی مێرددار، کابرای تۆمەتبار، یا ژنەکەیان کوشت، ئەگەر چوارشایەتیان هەبوو، ناکوژێتەوە، دەنا دەکوژێتەوە!)

٨- خانەگومانیو دڵ پیسکردن لەژن، بەبیانووی پڕوپووچ، کارێ بێ بایەخە، بەڵام لەهەمان کاتا، نامووس پارێزیو بەتەنگەوە بوونی ناموسو ئابروو، کارێ زۆر باشە، دروشمی پیاوچاکانو پێغەمبەرانە (دروودی خودایان لەسەر بێ).

٩- بڕیاری شێوەناس (قائیف = رەگەزناس) بۆ سەلماندنی نەسەبو نژادو بنەچەو رەچەڵەك کارێ پەسەندە، بەتایبەتی لەکاتێکا ئەگەر هەمهەمەو قاوەیێ لەنێوانا هەبێ. هەروەها لەم رۆژگارەدا پشکنینی پزیشکی، بەتایبەتی ئەو جۆرانەی کە گەیشتوونەتە پلەی دڵنیایی، یا نیمچە دڵنیایی، دروستە کاری پێ بکرێو نژادو نەسەبی پێ بڕیار بدرێ.

## ٧٠- باسی حەیە (عیددە)ی ژنانو ماتەم
## بابُ: العِدَّةِ وَالإِحْدَادِ

{بڕوانــە: فیقهــی ئاســان/٢، لاپــەڕە: ٧٨٣، زنجــیرە: ٢٨٩ + لاپــەڕە: ٧٩٤، زنجیرە: ٢٩٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٧٩ لە ژمـارە: ٢٢٧٤ هـەتا ژمـارە: ٢٢٧٨ + مختـصر صحیح مسلم/٢، زنجیرە: ٦٧١ لە ژمارە: ٨٦٢ وەوە هەتا ژمارە: ٨٦٤ + تەجریـدی بوخاری = مختـصر صـحیح البخـاری/٥، ژمـارە: ١٧٩٦ = ٥٣٣٨، ٥٧٠٦ + تجریـد/٢، ژمارە: ٦١٤ = ١٢٨١، ١٢٨٠، ١٢٨٢، ٥٣٣٥ بوخاری}.

**١١٣٥- آ- عَنْ اَلْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) { أَنَّ سُبَيْعَةَ الْأَسْلَمِيَّةَ (رَضِيَ اَللَّهُ عَنْها) نُفِسَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَجَاءَتْ إِلى اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَاسْتَأْذَنَتْهُ أَنْ تَنْكِحَ، فَأَذِنَ لَهَا، فَنَكَحَتْ.} رَوَاهُ اَلْبُخَارِيُّ وَأَصْلُهُ فِي " اَلصَّحِيحَيْنِ ".**

{بوخاری/٥٣٢٠ + مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٨ = شیحا ٣٧٠٦}:

ئــەم فەرموودەیــە لــە (مختــصر صــحیح مــسلم)دا ئاوایــە: دەیکــەین بەروونکردنەوە بۆ ئەم بابەتە:

عوبەیـدوڵڵای کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی عوتبـە فـەرمووی: عەبـدوڵڵای باوکم، نامەی نووسیی بـۆ عومـەری کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەرقـەمی ئـەل زوهـری، فـەرمانی پـی کـرد: کەبـچێ بـۆلای سـوبەیعەی کـچی حـاریثی ئـەل ئەسلەمییە، کەپرسیاری لێ بکـا، لـەبارەی دانـانی سکەکەیەوە، لـەپاش مردنـی مێردەکەی، کەپرسیاری لە پێغەمبەر کردبوو، کە پێغەمبەر (درووودی خـودای لەسەر بێ) چی پێ گوتووە لەوەڵاما؟

عومەری کوڕی عەبدوڵڵا، وەڵامی نووسییەوە بۆ باوکم ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاند، کەسوبەیعە پێی گوتم: ژنی سەعدی کوڕی خەولە بووم، کە لەخێڵی بەنی عامیری کوڕی لوئەی دەژمێررا، کەیەکێ بوو لەوانەی کەئامادەی جەنگی بەدر بوو بوون، لەحەجی ماڵاواییدا، سەعدی مێردم مرد، لەکاتی مردنیدا من

دووگیان بووم، سکم پڕ بوو، چەند شەوێ لەپاش مەرگی سەعد منداڵەکەم بوو، سکەکەم دانا، جا کاتێ سوبەیعە لەزەیستانی پاك دەبێتەوە، خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ خوازبێنیکاران، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك، کەپیاوێ بوو، لەخێڵی بەنی عەبدودار، دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: سوبەیعە! چییە، دەتبینم خۆت ڕازاندۆتەوەو بەرگی ماتەم‌و ڕەشپۆشی (حیداد)ت داناوە، دەڵێی بەتەمای شووکردنی؟ بەخودا شتی وانابێ، تۆ ناتوانی شووبکەیتەوە، هەتا حەیەی مێرد مردن تەواونەکەیت، کەبەپێی ئایەتی قورئان چوار مانگ‌و دە شەوە، قورئان دەفەرموێ: {وَالَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنكُمْ وَيَـذَرُونَ أَزْوَاجًـا يَتَرَبَّـصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا – البقرة/٢/٢٣٤}:

واتە: ئەو پیاوە موسوڵمانانە کە دەمرن‌و ژنەکانیان لەپاش خۆیان بەجێ دەهێڵن، دەبێ ئەو ژنانە تا ماوەی چوار مانگ‌و دە شەو تازێباربن‌و چاوەڕوانی بکەن‌و لەو ماوەیەدا شوو نەکەنەوە.

سوبەیعە فەرمووی: کاتێ ئەبو سەنابیل ئاوای پێم گوت: ئێواری خۆمم بەجلەکانم کۆکردەوەو چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەم بابەتەی خۆم پرسیارم لێی کرد، فەتوای بۆم دا، کە لەدوای دانانی سکەکەم حەیەم هەڵهاتووەو عیددەم تەواو بووەو، هەرچی بۆ ژنی بێ مێرد دروست بێ بۆ منیش دروستە. وە فەرمانیشی کرد پێم: ئەگەر دەتەوێ شووبکەیتەوە، دەتوانی شوو بکەیتەوە. ئیبنو شەهاب کەناسراوە بەئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە یەکێکە لەپیاوانی ڕشتەی (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە، کە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا، لەم فەرموودەیەدا، مامۆستایەتی، ئیبنو شەهاب دەفەرموێ: (بەلامەوە قەیدی نییە کەژنی زەیستان، ئایا تەڵاقدراو بێ، یا مێرد مردوو بێ، کەشووبکاتەوە، با لەخوێنی زەیستانیش پاك نەبووبێتەوە، بەڵام ئەگەر لەپاش دانانی سکەکەی شووی کردەوە، نابێ مێردە تازەکەی دروست ببێ لەگەڵیدا، هەتا

لەخوێنی زەیستانییەکەی پاك دەبێتـەوە). {تـاج/٢، زنجـیرە: ٧٩، ژمـارە: ٢٢٧٤، ٢٢٧٨ – ج/٤ = چاپی چوارەم}.

(ڕوونکردنەوە):

سـوبەیعەی کـچی حاریـث لـەبوخاریو مووسـلیمدا، فـەرموودەی هەیـەو ناویشی هەیە. ئیبنو عەبدولبەر لە ئیستیعابا دەفەرموێ: فوقـەهای مـەدینـەو فوقەهای کووفە، ئەم فەرموودەی ئێرەی ئەویان گێڕاوەتەوە.

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبـەر (درودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) دەفەرموێ: سـوبەیعە، لـەپاش مـەرگی مێردەکـەی بـەنیو مـانگ منـداڵی بـوو، سـکەکەی دانـا، دوو پیـاو کـە یـەکێکیان گـەنجو ئـەوی تریـان پـیر بـوو، خـوازبێنی ئـەویان کـرد، سـوبەیعە ویـستی شـووبکاتەوە بـە لاوەکـەیان، پیرەکەشـیان - کـە ئـەبو سـەنابیل بـوو – ویـستی نـەیهێڵێ، بـەبیانوی ئـەوەی کـە حەیـەی هەڵنـەهاتووە، لەهـەمان کاتـا مەبەسـتی ئـەوەیش بـوو، کەسـوکارەکەی کەلـەوێ نـەبوون، کەهاتنـەوە ئـەو هەڵبژێرنو گەنجەکە ئایەخ بکەن، بەڵام سوبەیعە کارەکـەی عـەرزی حـەزرەت کرد، ئەویش ڕێگـەی پێـدا: کـە لـەم چـرکە سـاتەوە بـەکێ ئـارەزوو دەکـا شـوو بکاتەوە!

کۆمــەڵێ لــە پــەیڕەوان (تــابیعین) فــەرموودەکانی ســوبەیعەیان گێڕاوەتـەوە. {بڕوانـە: تـاج الأصـول فـی أحادیـث الرسـول}. بـەکوردی بـەرگی دووەم، چاپی چوارەم، زنجیرە: (٧٩) حەفتاو نۆ، لاپـەڕە: ٥٨٩ هـەتا لاپـەڕە: ٥٩٥ لە ژمارە: ٢٢٧٤وە هەتا ژمارە: ٢٢٧٨}.

١١٣٦– وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {أُمِرَتْ بَرِيرَةُ أَنْ تَعْتَـدَّ بِثَلَـاثِ حِيَضٍ}. رَوَاهُ اِبْنُ مَاجَهْ، وَرُوَاتُهُ ثِقَاتٌ، لَكِنَّهُ مَعْلُولٌ.

{صحيح ابن ماجة للشيخ الألبانی/١٦٩٠}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەریرە کە کەنیزێکێ کۆیلە بوو، کاتێ ئازاد بوو، ژنی موغیث بوو کە ئەویش کۆیلە بوو، لەبەر ئەوە بەریرە بەپێی شەرعی خودا، بۆی هەبوو کەشووەکەی هەڵوەشێنێتەوە، جا شووەکەی خۆی هەڵوەشاندەوە، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە بەریرە کرد، کەسێ بێنوێژی بژمێرێ لەپاش ئازاد بوونەکەی، ئەوسا بۆی هەیە کەشووی تر بکاتەوە!. {بڕوانە: ژمارە: ١٠٣٥ کە لەپێشەوە رابورد}.

١١٣٧- وَعَنْ اَلشَّعْبِيِّ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رضى الله عنها) {عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) -فِي اَلْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا-: "لَيْسَ لَهَا سُكْنَى وَلَا نَفَقَةٌ"} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مسلم ترقيم وتحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا/٣٦٨٩}:

شەعبی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: فاطیمەی کچی قەیس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مێردەکەم سێ تەلاقەی دام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماوەی عیددەدا، نەهەقی نشیمەنی پێیم دا، وە نە خەرجی (نەفەقە)یشی بڕییەوە بۆم، تا عیددەم بەسەر دەچێ. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، لاپەڕە: ٥٩٥، ژمارە: ٢٢٧٩و، ٢٢٨٠و، ٢٢٨١ بەتایبەتی بڕوانە: (ژمارە: ٢٢٨٢)}.

(ڕوونکردنەوە):

شەعبی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ناسراوە بە (ئەبو عەمر، عامیری کوڕی شەراحیلی کوڕی عەبدوڵلای شەعبی هەمەدانی کووفی، تابیعییەکی مەزنە، مامۆستایەکە گەورەی شەریعەتزان بوو. خۆی دەیفەرموو: بەخزمەتی زیاتر لە پێنج سەد کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر گەیشتووم. بەخزمەتی ئیبنو عەبباس گەیشتووە، هەروا ئەوریش لە ڕۆژگاری ئەودا بووە، لەجێنشینی عوسمان شەش سال ڕۆیشتبوو کە شەعبی لەدایك بووە، لەتەمەنی هەشتاو

چەند ساڵیدا، لەساڵی سەدو چواری کۆچیدا مردووە، جارێ ئیبنو عومەر گوێی لێ بوو، شەعبی داستانەکانی غەزەواتەکانی دەگێڕایەوە، ئیبنو عومەر گوتی: من خۆم لەزۆر لەم نەبەردو غەزایانەدا بەشداریم کردوە، بەلام شەعبی لەمن باشتر دەیزانێ!!

زوهری دەیفەرموو: لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، زاناکان بڕیتین لەم چوار کەسە:

یەکەم: ئیبنولموسەییەب لەمەدینە.

دووەم: شەعبی لەکووفە.

سێیەم: حەسەنی بەصری لە بەصرە.

چوارەم: مەکحول لە شام.

١١٣٨- وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها)" أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا تَحِدُّ اِمْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا تَلْبَسْ ثَوْبًا مَصْبُوغًا، إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلْ، وَلَا تَمَسَّ طِيبًا، إِلَّا إِذَا طَهُرَتْ نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ أَوْ أَظْفَارٍ. } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ. وَلِأَبِي دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيِّ مِنْ اَلزِّيَادَةِ: { وَلَا تَخْتَضِبْ}. وَلِلنَّسَائِيِّ: "وَلَا تَمْتَشِطْ".

{تەجریدی بوخاری/٢، ژمارە: ٦١٤ = ١٢٨١، ١٢٨٠، ١٢٨٢، ٥٣٣٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٣ = مسلم/شيحا: ٣٧٠٩ = مسلم/٩٣٨}:

ئوم عەتێ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ ژن کە لەسێ ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کەدەبێ چوار مانگو دە شەو تازێبار بێ!)وە هەروەها خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وەژن لەو ماوەیەدا کە تازێ دەگرێ، نابێ چاو بڕێژێ، یاخۆی بۆن خۆش بکا، یا جلو

بەرگی ڕەنگین لەبەر بکا، مەگەر بەرگێ لەپێشا تانوپۆکەی ڕەنگ کرابێو لەپاشا چنرابێ )

ئوم عەتێ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمەی ژنان، کاتێکیش کە پاك بووینەوە لەبێنوێژی، کەویستمان خۆمان بشۆرین ڕێگەی ئەوەمان دراوە کە بەقەد پێویست، عوودو گوڵاو نەختێ بۆوانێك بەکاربهێنین. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٨}.

لەگێڕانەوەی ئەبو داوودو نەسائیدا، ئەم فەرموودەیە ئەم زیادەی هەیە: (هەروەها، نابێ ژنی تازێبار نابێ خەنەو وسمەو بۆیەو سوورو سپیاو، لەو ماوەیەدا بەکاربهێنێ!). لەگێڕانەوەی نەسائیدا، ئەمەیشی پترە: (نابێ سەریشی شانە بکا).

١١٣٩- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: { جَعَلْتُ عَلَى عَيْنِي صَبْرًا، بَعْدَ أَنْ تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): "إِنَّهُ يَشِبُ اَلْوَجْهَ، فَلَا تَجْعَلِيهِ إِلَّا بِاللَّيْلِ، وَانْزِعِيهِ بِالنَّهَارِ، وَلَا تَمْتَشِطِي بِالطِّيبِ، وَلَا بِالْحِنَّاءِ، فَإِنَّهُ خِضَابٌ". قُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ أَمْتَشِطُ؟ قَالَ: "بِالسِّدْرِ". } رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، وَالنَّسَائِيُّ، وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

{ضعيف أبی داود/٥٠٢}:

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش مەرگی ئەبو سەلەمەی مێردم، جۆرە سورمەیەك هەیە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (صەبر = کوحلولجەلاء = الأثمد) دام لەچاوم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم جۆرە سورمەیە ڕەنگو ڕووکەش دەکا، بەشەوا نەبێ بەکاری مەهێنە، بەڕۆژ لایبەرە، کاتێکیش قژەکەت شانە دەکەی بۆنی خۆشی لێ مەدە، هەروەها خەنەیش بەکار مەهێنە، چونکە خەنەیش هەر بۆیەیەو قژو دەستو پێی پێ ڕەنگ دەکرێ!).

عەرزیمکرد: ئەی بەچی قژەکەم شانە بکەم؟

**فەرمووی: (بە مۆرد).**

**١١٤٠– وَعَنْهَا" { أَنَّ اِمْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ اِبْنَتِي مَاتَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَقَدْ اِشْتَكَتْ عَيْنَهَا، أَفَنَكْحُلُهَا؟ قَالَ: "لَا". } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.**

{تەجریدی بوخاری/٥. ژمارە: ١٧٩٦ = ٥٣٣٨، ٥٣٣٧، ٥٧٠٦ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٦٣ = ٣٧٠٩ شيحا = مسلم: ١٤٨٩. أبوداود. طلاق: ٢٢٩٩. ترمذی. طلاق: ١١٩٥. نسائی. طلاق: ٣٥٠٠. تحفة الأشراف/١٥٨٧٤}:

**ئەم فەرموودەیە لەموختەصەری صەحیحی موسلیمدا، سێ بەشە، ئاوایە:**

**حەمیدی کوڕی نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەم سێ فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆم، فەرمووی:**

**١- کاتێ ئەبو سوفیان مرد، کەباوکی ئوم حەبیبە بوو، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) بەم بۆنەیەوە چووم بۆلای ئوم حەبیبە، ڕوانیم وا ئوم حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تیابوو، جا هەردوو دەستی کرد بەناویداو ئینجا دەستی سووی بەهەر دوولای ڕومەتی خۆیداو بۆنی دا لەخۆیو تازێی شکاندو فەرمووی: بەو خودایەی کە هەر خۆی خودایە، هیچ کارێکم بە بۆنی خۆش نییە، بەڵام لەبەر ئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە لە پێغەمبەرم بیست لەسەر دوانگە (مینبەر) دەیفەرموو: (ئەو ژنەی کەباوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ زیاتر ماتەمو تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دە شەو تازێبار بێت!).**

٢- زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای زەینەبی کچی جەحشیش، کەهاوسەری پێغەمبەر بوو (درووودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) بەبۆنەی مردنی براکەیەوە، دیم کە ئەویش داوای گوڵاوی کردو دای لەخۆیو فەرمووی: بەخودا هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەڵام لەبەر ئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست، لەسەر دوانگە دەیفەرموو: (درووودی خودای لەسەر بێ) (هەر ژنێ کەئیمانو باوەڕی بەخوداو بەحسێبو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی، کە لەسی ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دە شەو تازێ بار بێ).

٣- لەئوم سەلەمەی دایکیشمم بیست دەیفەرموو: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کچەکەم مێردەکەی مردووەو چاویشی دێشێ، ئێستا وا لەماتەمی مەرگی مێرددا، ئایا چاوی بڕێژێ یان نا؟ فەرمووی: (درووودی خودای لەسەر بێ) (نەء، نابێ چاو بڕێژێ). دووجار، یاسێ جار لەسەر یەك، هەموو جارێ حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (نەء، نابێ چاوی بڕێژێ!)

ئەنجا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ماتەمی ژن بەبۆنەی مەرگی هاوسەرەکەیەوە، لەئیسلاما، خۆی تەنیا چوار مانگو دەشەوە، کەچی ئێوە هێشتا پەلە پەلی لێ دەکەنو دەتانەوێ لێی بدزنەوە، بەڵام جاران لەسەردەمی نەزانیدا، لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ، ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا).

حومەید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێ: لەزەینەبم پرسی: ڕستەی ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا واتای چییە؟ فەرمووی: جاران کەژن مێردەکەی دەمرد، دەڕۆیشتە ناو کولبەیەکەوەو جلکێکی زۆر خراپی لەبەر دەکرد، وەبۆنی خۆشو گوڵاوو شتی وای لەخۆی نەدەدا، جا تا ساڵێ دەڕۆیشت ئەو

ژنه تازێباره ئەمه حاڵی بوو، ئەوجا دەعبایەکیان دەهێنا بۆی، خۆی پێ پاك دەکردەوە، بەڵام بە دەگمەن ڕێ دەکەوت کە ئەو ژنە خۆی بەئاژەڵێ، یا گیانلەبەرێ پاك بکاتەوەو ئەوشتە لەبەر ئەو پیسیو پۆخڵییەی نەمرێ یان مردار نەبێتەوە!

ئینجا ژنەکە لەقوڵخەکەی دەهاتە دەرەوەو پشقڵێکیان دەدایە دەستی، ئەویش پشقلەکەی تووڕ دەدا، ئیتر عیددەی تەواو دەبوو، وەتازێی دەشکاندو ئەوسا ئەگەر ئارەزووی ببوایە وەك جارانی بۆنو گوڵاوو شتی وای بەکاردەهێنایەوە!. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٧}.

١١٤١- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {طُلِّقَتْ خَالَتِي، فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ، فَأَتَتْ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَالَ: بَلْ جُدِّي نَخْلَكِ، فَإِنَّكَ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي، أَوْ تَفْعَلِي مَعْرُوفًا} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٥٩ = ٣٥٠٧ شيحا = مسلم ١٤٨٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پووریکم هەبوو، سێ تەڵاقە درا بوو، جارێ دەچێتە دەرەوە، هەتا خورماکەی بڕنێ، پیاوێکی پێ دەگا، مۆڵەتی پێ ناداو پێی دەڵێ: تۆ هێشتا حەیەت هەڵنەهاتووە، هێشتا عیددەت تەواو نەبووە، چۆن لەماڵ دەردەچیت؟ پووریشم دەچی بۆلای حەزرەتو ئەمەی عەرز دەکا، پێی دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەر بێ) (بەڵێ، دەرچۆو بچۆ خورماکەت بڕنە، سابەشکو خێرێکی لێ بکەی، یا چاکەیێ بکەی، خۆ تۆ زیندانی نیت، کە لە کونی ژوورەوە نەیەیتە دەرەوە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٣}.

١١٤٢- وَعَنْ فُرَيْعَةَ بِنْتِ مَالِكٍ (رضى الله عنه)" { أَنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ فَقَتَلُوهُ. قَالَتْ: فَسَأَلْتُ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي" فَإِنَّ زَوْجِي لَمْ يَتْرُكْ لِي مَسْكَنًا يَمْلِكُهُ وَلَا نَفَقَةً، فَقَالَ: "نَعَمْ". فَلَمَّا كُنْتُ فِي اَلْحُجْرَةِ نَادَانِي، فَقَالَ: " اُمْكُثِي فِي بَيْتِكَ حَتَّى يَبْلُغَ اَلْكِتَابُ أَجَلَهُ". قَالَتْ:

فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، قَالَتْ: فَقَضَى بِهِ بَعْدَ ذَلِكَ عُثْمَانُ } أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ، وَالْأَرْبَعَةُ، وَصَحَّحَهُ التِّرْمِذِيُّ، والذُّهْلِيُّ، وَابْنُ حِبَّانَ، وَالْحَاكِمُ وَغَيْرُهُمْ.

{أبو داود: ٢٣٠٠. ترمذی: ١٢٠٤. نسائی فی الكبری: ٥٧٢٦. ابن ماجة: ٢٠٣١. ابن حبان: ٤٢٩٢. حاكم٢/٢٢٦. صحيح، سنن أبی داود: ٢٣٠٠}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوەهایە:

فورەیعەی کچی مالیکی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتم: دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ ماڵی باوانم، لەبەنی خودرە، چونکە مێردەکەم چەند بەندەیەکی هەبوو، هەڵهاتبوون، ئەویش ڕۆریشت بەدوایانا، هەتا لەدەوروبەری قەدووم پێیان دەگا، وەلەوێ کۆیلەکان گەلەکۆمەی لێ دەکەنو دەیکوژن، جا لەبەر ئەوەی نەخانوویەکی بۆ بەجێهێشتووم، کەهی خۆی بێ تا ستاری تیا بکەم، وە نەژیوارو خەرجی، لەبەر ئەوە دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵی باوانم.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ باشە) جا کەلەخزمەتی هەڵسام، ڕۆیشتم تا گەیشتمە هۆدەکەی خۆی، یا گوتی: ڕۆیشتم تا گەیشتمە ناو مزگەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردمەوە بۆلای خۆی، یا گوتی: فەرمانی کرد بانگیان کردمەوە بۆلای خۆی. جا کەچوومەوە خزمەتی، فەرمووی: چۆنت گوت؟ منیش سەرلەنوێ، کارەساتی مێردەکەمم بۆی گێڕایەوە. جا فەرمووی: (لە ماڵەکەتا بمێنەرەوەو ماڵی مێردەکەت بەجێ مەهێڵە، هەتا حەیەت هەڵدێو عیددەت بەسەر دەچێ! ئیتر منیش لەوێ چوار مانگو دە شەو عیددەم گرت، وە لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عوسماندا، ئەم داستانەم عەرزی عوسمان کرد، عوسمانیش پەیڕەوی ئەم فەرموودەیەی کردو کردی بەسەر مەشقو لەکاتی ڕوودانی بارودۆخی وادا حوکمی پێ دەکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٧٩}.

**(ڕوونکردنەوە):**

**فورەیعەی کچی مالیك، خوشکی ئەبو سەعیدی خودرییە، هاوەڵی پێغەمبەرە، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودی (بیعة الرضوان) بووە، دایکی ناوی (حەبیبەی کچی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوولە، هەندێ پێی دەڵێن: (الفارعة).**

١١٤٣– وَعَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رضى الله عنهما) قَالَتْ: {يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ زَوْجِي طَلَّقَنِي ثَلَاثًا، وَأَخَافُ أَنْ يُقْتَحَمَ عَلَيَّ، قَالَ: فَأَمَرَهَا، فَتَحَوَّلَتْ.} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٨ = شيحا ٣٦٩٢ = مسلم/١٤٨٢}:

**فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مێردەکەم سێ تەڵاقەی داوم و ئێستا لەماڵەکەی جارانی خۆمم، بەڵام مەترسی ئەوەم هەیە کە کەسێ پەلامارم بداو، خۆی بکا بەماڵاو کێشەیەکم بۆ دروست بکا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کرد کە بگوێزێتەوە بۆ جێگەیەکی بێ مەترسی، ئەویش وەهای کرد. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨١ + ٨٦١، ٨٦٢ لە موختەصەری صحیحی موسلیم}.**

١١٤٤– وَعَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنه) قَالَ: {لَا تُلْبِسُوا عَلَيْنَا سُنَّةَ نَبِيِّنَا، عِدَّةُ أُمِّ اَلْوَلَدِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا سَيِّدُهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا}. رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَأَبُو دَاوُدَ، وَابْنُ مَاجَهْ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَأَعَلَّهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِالِانْقِطَاعِ. وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: {إِنَّمَا اَلْأَقْرَاءُ" اَلْأَطْهَارُ}. أَخْرَجَهُ مَالِكٌ فِي قِصَّةٍ بِسَنَدٍ صَحِيحٍ.

{أبو داود: ٢٣٠٨ فى الطلاق ابن ماجة. طلاق: ٢٠٨٣. ابن حبان: ٤٣٠٠. صححة الألبانى فى صحيح وضعيف سنن أبى داود + صحيح، آداب الزفاف للألبانى ١٩١/١}:

١- عـەمری کـوڕی عـاص (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: (شـاڕێگەی ئـایینی پـیرۆزی پێغەمبـەری خۆمانمـان لێ مەشـێوێنن، حەیـەی دایکـی منـاڵ، واتە: ئوممول وەلەدێ ئاغا مردووبێ، چوار مانگ‌و دە شەوە).

٢- عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) (خەڵکانێ لەگەڵیدا مقۆ مقۆو بگرەو بەردەیان بـوو لەسـەر واتـای (قـەرء) کـە ئایا بـەواتای بێنوێـژی ژنانـەیـە، یـان بـەواتا مـاوەی پـاکی ژنانـە لـەنێوانی دوو بێنوێژیـدا، وە بـۆ پـشتگیری قـسەی خۆیان گوتیان: (ئەی ئەوە نییە کە خودا لە قورئانا دەفەرموێ: {وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ – البقرة/٢/٢٢٨}. واتە:

(ژنـی تەلاقـدراو دەبـێ سـێ (قـەرء) چـاوەڕوان بکـاو لـەو ماوەیـەدا شوونەکاتەوە هەتا حەیەی هەڵدێ‌و عیددەی تەواو دەبێ).

عائیـشەیش فـەرمووی: ڕاسـت دەکـەن خـودای گـەورە لـەقورئانا وا دەفەرموێ: بەڵام با پێتان بڵێم واتای (قەرء) چییە؟ قەرء لەم ئایەتەدا بەواتا پاکییـە، چـونکە ئـەقراء کـە کـۆی قورئـە، بـەواتا ئـەطهارە کـە کـۆی طوهـرە (قُرُوء)یش لەم ئایەتەدا بەواتا (أَقْرَاء)ە، دیارە کە (طُهر)یش بەواتا پاکی‌یە.

ئەمە ئەو چیرۆکە بـوو، کـە دانـەر ئامـاژەی بـۆ کـردو فـەرمووی مالیـك بەرشتەیەکی تەندروست دەریهێناوە.

١١٤٥– وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {طَلَاقُ اَلْأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ، وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ. وَأَخْرَجَهُ مَرْفُوعًا وَضَعَّفَهُ.

{ضعيف الجامع للشيخ الألباني/٣٦٥٠}:

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تەلاقی کەنیزەك (ئەمەتە) دوو تەلاقـە، نـەك سێ تەلاق، وەعیددەیشی دوو بێنوێژییە نەك سێ بێنوێژی). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٦}.

١١٤٦- وَأَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَابْنُ مَاجَهْ: مِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ، وَخَالَفُوهُ، فَاتَّفَقُوا عَلَى ضَعْفِهِ.

{ضعيف سنن الترمذي للشيخ الألباني/٢٠٦}:

**قاسم لەعائیشەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (تەڵاقی كەنیزەك ....... تادوایی. بەبێ كەمو زیاد).**

١١٤٧- وَعَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاَللَّهِ وَالْيَوْمِ اَلْآخِرِ أَنْ يَسْقِيَ مَاءَهُ زَرْعَ غَيْرِهِ .} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَاَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ اِبْنُ حِبَّانَ، وَحَسَّنَهُ اَلْبَزَّارُ. وَعَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) - {فِي اِمْرَأَةِ اَلْمَفْقُودِ- تَرَبَّصُ أَرْبَعَ سِنِينَ، ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا } . أَخْرَجَهُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ.

{أبو داود: ٢١٥٨. ترمذي: ١١٣١. ابن حبان: ١٤٨٥٠. حسن، صحيح أبي داود}:

**ڕووەیفیعی كوڕی ثابیتی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرپیاوی بەڕاستی ئیمانو باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی كە بەئاوی خۆی نەمامی كەسێكی تر ئاو بدا، هەروەها ئەو پیاوەیشی كە بەتەواوی ئیمانو باوەڕی بەخوداو بەرۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی كەبڕواتە لای ژنی تالانی جەنگی ناموسوڵمانان (كە لەزاراوەی شەرعا پێیان دەگوترێ: سەبایا) هەتا ئەو ژنە منداڵدانی پاك دەبێتەوەو دەردەكەوێ كە منداڵدانی لەخاوەنی پێشووی، یا لەمێردی پێشووی منداڵی تیادا نییە، لەسەر ئەم شێوەیە: ئەگەر دەركەوت سكی هەیە بەدانانی سكەكەی، ئەگەر لەبەر پیری، یا لەبەر گچكەیی نەدەكەوتە سەر بێنوێژی، دەبێ خاوەنە تازەكەی تا مانگێ چاوەڕوان بكاو نەچێتە لای، ئەگەر سەرو عوزر شۆر بوو، هەتا ئەو ژنە**

دەکەوێتە سەربێنوێژیو لەو بێنوێژییە پاك دەبێتەوە!. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٥ن ژمارە: ٢١٥٠}.

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەر ئافرەتێ مێردەکەی دیار نەبێو بێ سەرو شوێن بێو نەزانرێ لەکوێیە، ئەوە دەبێ چوار ساڵ چاوەڕوانی پەیدا بوونی مێردە ونبووەکەی بکات، ئینجا چوار مانگو دە شەو عیددە دەگرێ، ئیتر دروستە شوو بکاتەوە. ئیمامی مالیك (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر ژنەکە لەپاش تەواو بوونی عیددەکەی، شووی کردەوە، ئیتر مێردی پێشووی فڕی بەسەریەوە نامێنێ، خوای مێردی دووەمی چووبێتەلای، یان نەچووبێتە لای. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٢٢٧١}.

١١٤٨- وَعَنْ اَلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اِمْرَأَةُ اَلْمَفْقُودِ اِمْرَأَتُهُ حَتَّى يَأْتِيَهَا اَلْبَيَانُ.} أَخْرَجَهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ بِإِسْنَادٍ ضَعِيفٍ.

{ضعيف جداً، ضعيف الجامع للشيخ الألباني ١٢٥٣}:

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ژنی مێرد گومبووی بێ سەرو شوێن، ژنی ئەو مێردە ونبووەیە تا بە بەڵگەی روونو ئاشکرا بۆی دەردەکەوی کەمێردەکەی چی بەسەر هاتووە!).

١١٤٩- وَعَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عِنْدَ اِمْرَأَةٍ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ نَاكِحًا، أَوْ ذَا مَحْرَمٍ.} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٤، ژمارە: ١٤٣٨ = ٥٦٣٧ مسلم ترقيم شيحا = صحيح مسلم ٢١٧١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بێداربن، پیاو بەشەو

لەلای ژن نەمێنێتەوە، مەگەر مێردی بێ، یا خۆیی (مەحرەم) بێ، وەك باوكو كوڕو براو مامو خاڵو باپیرە، ئەوە قەیدی نییە). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٥، ژمارە: ٢١٩٥ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

١١٥٠- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ، إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ.} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.

{بخاری/٥٢٣٣}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوكی بێ) فەرمووی: (نابێ پیاوو ژنی بیانی دوو بەدوو پێكەوە بن مەگەر خۆییو مەحرەمیان لەگەڵدا بێ).

١١٥١- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ فِي سَبَايَا أَوْطَاسٍ: { لَا تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ، وَلَا غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً } أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع للألبانى/٧٤٧٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەبارەت بە ژنە دیلەكانی غەزای ئەوطاس، كە لەو غەزایەدا بوون بە كەنیزەك بۆ موسوڵمانان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەیانەوە فەرمووی: (هەر ژنێ لەمانە دوو گیان بێو سكی پڕ بێ، نابێ خاوەنی نوێی بچێتە لای هەتا سكەكەی كە لە مێردی پێشوویەتی دادەنێ، وە هەرژنێكیش لەمانە كەسكی نییە، نابێ ئاغا (سیِّد)ەكەی، بچێتە لای هەتا دەكەوێتە سەر بێنوێژیو لەو بێنوێژییە پاك دەبێتەوە).

١١٥٢- وَلَهُ شَاهِدٌ: عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ فِي اَلدَّارَقُطْنِيِّ.

{حسن، إرواء الغليل للألبانى/١/٢٠٠}:

١١٥٣- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: { اَلْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ اَلْحَجَرُ. } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ مِنْ حَدِيثِهِ.

{بوخاری ٢٢١٨، ٦٧٦٥، ٦٨١٧. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٢ = مسلم شيحا: ٣٥٩٨ = صحيح مسلم/١٤٥٨. نسائى. طلاق: ٣٤٨٤. تحفة الأشراف/١٦٥٨٤}:

**لە (مختصر صحيحى مسليم)دا ئاوايە:**

**عائيشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص‌و عەبدی کوڕی زەمعە (رەزای خودا لەهەموویان بێ) لەسەر خولامێ، واتە: کوڕێ، بووبە هەرایان. سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم خولامە برازای منەو کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاصی برامەو کاتی خۆی بەپێی باوی سەردەمی نەفامی، داوێنپیسی لەگەڵ دایکیدا کردووە، کەنیزەکی زەمعەی کوڕی قەیس بوو، کە زەمعە بەپارە لەشفرۆشی بەدایکی ئەم خولامە دەکرد، وەعوتبەی برام کاتێ خۆی لەپێش مەرگیدا منی راسپاردووە کە ئەمە کوڕی ئەوە، فەرمووی تەماشای شێوەیشی بکە، ئەوەتانێ لەعوتبەی برام دەچی‌و کوتومت لەو دەکا!!**

**عەبدی کوڕی زەمعەیش، کەبرای باوکی سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە باوك برای منەو لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووەو لەکەنیزەکی خۆیەتی، منالی ئوممول وەلەدی باوکمە.**

**پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ سەرەنجی شێوەی کوڕەکەی دا، ڕوانی شێوەی تەواو لە عوتبە دەچێ، بەڵام بۆ پووچکردنەوەی بڕیاری سەردەمی نەفامی، فەرمووی: (ئەی عەبد! ئەمە هی تۆیەو ئەم کوڕە شەرع دەیدا بەتۆ، چونکە منال هی مێردە، یان هی خاوەنی کەنیزەکە، کەخۆی چووبێتە لای، بەپێی یاسای منال هی خاوەنی نوێنە، هەناسەساردیش بۆ داوێنپیس دەمێنێتەوە!).**

ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە سەودەی هاوسەری خۆی: (ئەی سەودەی کچی زەمعە! پەردە پۆشی لەم خولامە بگرەوە). عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئیتر ئەو کوڕە جارێ تر سەودەی خوشکی نەبینی). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٢٢٥٢}.

١١٥٤، ١١٥٥، ١١٥٦– وَمِنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ فِي قِصَّةٍ. وَعَنْ اِبْنِ مَسْعُودٍ، عِنْدَ النَّسَائِيِّ. وَعَنْ عُثْمَانَ. عِنْدَ أَبِي دَاوُدَ.

{تجريد البخاری/٣، ژمارە: ٩٣٥ = ٢٠٥٣، ٢٢١٨، ٢٤٢١، ٢٥٢٣، ٤٣٠٣، ٢٧٤٥، ٦٧٤٩، ٦٧٦٥، ٦٨١٧، ٧١٨٢}:

لە ژمارە: (١١٥٣)دا رابورد، گێڕانەوەی عائیشە.

## ٧١- باسی مەمکخواردن و شیرخواردن
## بابُ: الرِّضاع

{بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، لە ژمارە: ٢٠٧٢ وەوە هەتا/٢٠٨٠ + تەجریدی بوخاری/٥، لە ژمارە: ١٧٥٣وە هەتا/١٧٥٦ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٧٩٦، زنجیرە: ٢٩٣ + مختصر صحيح مسلم/٢، زنجیرە: ٦٧٧ نامەی ژمارە/١٥، لە ژمارە: ٨٧٤وە هەتا ژمارە: ٨٨٢}.

١١٥٧– عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): { لَا تُحَرِّمُ اَلْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ.} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٨ = مسلم ترقيم شيحا/٣٥٧٦}:

لە (مختصر صحيح مسلم)دا، ئاوایە:

ئوم فەزڵ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی من بوو، عارەبێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی، عەرزیکرد ئەی پێغەمبەری خودا! من ژنێکم هەیە، ژنێکی ترم بەسەر هێناوە، ئێستا ژنی یەکەمم دەڵێ: من ژەمێ یا دوو ژەم شیرم داوە بە ژنە تازەکەم.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بە مژێ یان دوو مژ مەمکخواردن کچ‌و کوڕ لەیەکتری حەرام نابن). یا فەرمووی: (بەژەمێ، یان بەدوو ژەم، شیرخواردن ناچەسپێ‌و ژن‌و پیاو لەیەکتری حەرام نابن). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٧٦} + {ژمارە: ١١٣٤ – پوختەکە بڕگەی/٢}.

(ڕوونکردنەوە):

ئوم فەزڵ ناوی لوبابەی کچی حاریثە، ئامۆژنی پێغەمبەرە، ژنی ئیمامی عەبباسی کوڕی عەبدول موطەلیبە، کە حەق مامەی پێغەمبەرە لەپێش کۆچا ئیسلام بووە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پەسنی ئوم فەزڵ‌و خوشکەکانی ئوم فەزڵدا، دەفەرموێ: (چوار خوشکە موسوڵمانەکە: مەیموونەی کچی حاریث‌و ئوم فەزڵ‌و سەلماو ئەسما).

مەیموونەیان هاوسەری پێغەمبەر بوو، کەخوشکی هەقی ئەم ئوم فەزڵەیە وەجارێ خەوێ دەبینێ، دەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر، عەرزی دەکا: قوربان! لەخەونمدا بینیم ئەندامێ لەئەندامەکانی تۆ وا لەماڵی مندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (فاطیمەی کچم کوڕی دەبێ تۆ شیری پێ دەدەی!).

زۆری پێ نەچوو حوسەین لەدایك بوو. گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕێزلێنانی ئوم فەضل دەچوو بۆ ماڵی ئوم فەضل، کەفەضلی کوڕی ئامۆزای پێغەمبەر بوو، ئوم فەضل لەپێش مەرگی ئیمامی عەبباسی مێردیدا، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عوسماندا مردووە. (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەو مەزن لەهەموویان بێ).

١١٥٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {اُنْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا اَلرَّضَاعَةُ مِنْ اَلْمَجَاعَةِ.} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تجريد البخاري/٥، رقم: ١٧٥٦ = ٥١٠٢، ٢٦٤٧ صحيح البخاري. مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا/٣٥٩١ = صحيح مسلم/١٤٥٥. أبو داود. نكاح: ٢٠٥٨. نسائي. نكاح: ٣٣١٢}:

**له موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:**

**(مختصر صحيح مسلم بەرگی دووەم ژمارە: ٨٨٢):**

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لەلام دانیشتبوو، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو کاتەدا هات بۆ لام، کە ئەمەی دی، لەبەری گران بوو، تەماشای دەموچاویم کرد تووڕەیی پێوە دیار بوو، جا عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە برای شیریمە، بێگانە نییە، خۆیی‌یە، مەحرەمە، پێت ناخۆش نەبێ.**

**فەرمووی: (باش سەرەنج بدەنو بچنە بنجو بنەوانی بڕیارەکەتان، سەبارەت بە بابەتی براو خوشکی شیریتان چونکە مەمك خواردن کاتێ دادەمەزرێو کاریگەری دەبێ، کە لەکاتی ساوایی‌دا بێو منالەکە لەبەر برسێتی ئەو شیرەبخوات!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٧٨، ج/٤ = چاپی چوارەم}.**

**١١٥٩- وَعَنْهَا قَالَتْ: {جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ. فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اَللَّهِ! إِنَّ سَالِمًا مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ مَعَنَا فِي بَيْتِنَا، وَقَدْ بَلَغَ مَا يَبْلُغُ اَلرِّجَالُ. قَالَ: "أَرْضِعِيهِ. تَحْرُمِي عَلَيْهِ".} رَوَاهُ مُسْلِمٌ.**

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٨٠ = صحيح مسلم ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا ٣٥٨٦ = صحيح مسلم/١٤٥٣}:

**ئەم فەرموودەیە لە (مختصر صحيح مسلم)دا ئاوایە:**

**عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرو هاوەڵەکانی بێ) فەرمووی: ئەبو حوزەیفەی کوڕی**

عوتبـه (ڕەزای خـودای لێ بـێ) سـالمی کـوڕی مـەعقلی، لەسـەردەمی نەزانیـدا کردبوو بەکوڕی خۆی، کـە بـەم کـرداره لـەزاراوی شـەرعی پـیرۆزدا دەگـوترێ: (تەبەننی).

بەرەبەرە سالم گـەوره بـوو، وەتەبـەنیش نـەماو بـەپێی ئایـەتی قورئـان پـووچ کرایـەوە، بـەڵام سـالم هاموشـۆی مـاڵی حوزیفـەی دەکـرد، هـەتا ڕۆژێ سەهلی کچی سوهەیل کەژنی حوزەیفه بوو، هاته خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: (ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت ئـەزانی کەئێمـه جاران لەسەر دەستووری کۆنی سـەردەمی نـەزانی، سـالمان کـرد بـوو بـەکوڕی خۆمان، وه وەك کوڕی خۆمان ڕەفتارمان لەگەڵ دەکردو مەحرەمو خۆیی بوو لەناومانا، بەڵام ئێستا ئەوەتا وەك دەزانیـت خـودای گـەوره بەئایـەتی قورئـان ئەو دەستوورو باوو نەریته کۆنەی پووچ کردۆتـەوەو هـەڵی وەشـاندۆتەوە، وه ئەوەتا سالمیش گەوره بـووەو بـووه بـەپیاو، وه ئـەوەی کـەپیاوان هەسـتی پـێ دەکەن، ئەویش هەستی پێ دەکا، لەهـەمان کاتـا سـالم وەك جـارانی بەگـەرمی هاموشۆمان دەکا، وەمن واهەست دەکەم که حوزەیفـەی مێـردم لـه دڵەوه لـەم بارودۆخه دڵگرانەو پێی ناخۆشه، جا ئەی پێغەمبـەری خـودا! تـۆ ئێـستا چـی دەفەرمووی لەم بارەیەوە، بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە؟

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو:

(تۆ مەمك بده بەسـالم هـەتا تـۆ ببـی بـەدایکی شـیریی ئـەو، وه تـۆ لـەو حەرام ببی، وه حوزەیفەی مێردیشت هیچی لەدڵا نامێنێ!).

جا سوهەیله پێنج جار لەشیری خۆی سالی تێـر کـرد، ئـیتر سـالم بـوو بـەکوڕی شـیریی سـوهەیلەو کێـشەکەیان کرایـەوە، وەسـوهەیله هاتـەوه بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) وه عـەرزیکرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! وەك تـۆ فـەرمووت وەهـامکرد: مـەمکم دا بەسـالم، وه

حوزەیفەی مێردم هیچی لەدڵدا نەما). (فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٠٠، زنجیرە: ٢٩٣).

(ڕوونکردنەوە):

١- ئەبو حوزەیفە کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، یەکێکە لەموسوڵمانە هەرە پێشینەکان، لەگەڵ سەهلی کچی سوهەیلی کوڕی عەمر، کەژنی بوو، کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لەپاشا کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەر بۆ مەدینە، ئامادەی جەنگی بەدرو جەنگی ئوحودو خەندەق‌و حودەیبییەو هەموو نەبەردەکانی تر بووە، لەڕۆژی (الیمامة)دا شەهید بوو، لەتەمەنی پەنجاو سێ، یا چوار ساڵیدا شەهید بووە، پیاوێکی کەڵەگەتی چاوڕەشی خێل بوو.

٢- بۆ ژیاننامەی سالم بڕوانە: مختصر صحیح مسلم/٤، ژمارە: ١٦٩٦، لاپەڕە: ٤٠٨.

١١٦٠- وَعَنْهَا: { أَنْ أَفْلَحَ -أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ- جَاءَ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهَا بَعْدَ اَلْحِجَابِ. قَالَتْ: فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي صَنَعْتُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آذَنَ لَهُ عَلَيَّ. وَقَالَ: "إِنَّهُ عَمُّكِ". } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٦٨٣ = ٤٧٩٦، ٢٦٤٤، ٥١٠٣، ٥١١١، ٥٢٢٩، ٦١٥٦ بوخاری. مختصر صحیح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٥ = شیحا ٣٥٦٠}:

لە (مختصر صحیحی مسلم)دا ئاوایە:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هەموو هاوەڵان‌و هاوسەرانی بێ) فەرمووی: ئەفلەحی برای ئەبول قوعەیس، کە مامی شیری عائیشە بوو، چونکە عائیشە شیری ژنەکەی ئەبولقوعەیسی خوارد بوو، ئەبولقوعەیس باوکی شیری عائیشە بوو، دیارە کە ئەفلەحی براشی مامی شیری عائیشەیە، ئەم ئەفلەحە مامی شیریم بوو، لەپاش هاتنی ئایەتی حیجاب هات بۆ سەردانم، منیش ڕێگەم پێ نەدا، گوتم:

هەتا پرس بە پێغەمبەر نەکەم شتی وا ناکەم. جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مامە شیرییەکەم هاتبوو، دەیویست بێ بۆ دێنیم، منیش ڕێگەم پێ نەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕێگەی پێ بدە، با مامەت بێت بۆ سەردانت). منیش عەرزیمکرد: ئاخر خۆ من شیری براکەی ئەوم نەخواردووە، بەڵکوو من شیری ژنی براکەی ئەوم خواردووە؟

فەرمووی: (ئەوە مامی شیریتە ڕێگەی پێ بدە کە سەردانت بکا).

١١٦١- وَعَنْهَا قَالَتْ: {كَانَ فِيمَا أُنْزِلُ فِي اَلْقُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) وَهِيَ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ اَلْقُرْآنِ}. رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

{مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٩ = ٣٥٨٢ شيحا}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشدا ئەمە ئایەتی قورئان بوو: {عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِمْنَ} واتە: (دە ژەم مەمکخواردنی دیاریکراو، ژن و پیاو لەیەکتری حەرام دەکەن). لەپاشا ئەم دەیە هەڵوەشایەوەو بووبە {خَمْسُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِمْنَ}. واتە: پێنج ژەم شیرخواردنی دیاریکراو، ژن و پیاو، لەدەستەی شیردەرو دەستەی شیرخوار، لەیەکتری حەرام دەکەن. لەدواییدا ئەمەیش نەسخ بۆوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، هێشتا هەندێ کەس بەم نەسخ بوونەوەیان نەزانیبوو، وە لەبەر ئەوە هەتا ماوەیەکیش ئەمەیان بەقورئان دەزانی و لەکاتی دەورکردنەوەی قورئانا دەوریان دەکردەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٠٧٧}.

١١٦٢- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أُرِيدُ عَلَى اِبْنَةِ حَمْزَةَ. فَقَالَ: "إِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِي" إِنَّهَا اِبْنَةُ أَخِي مِنْ اَلرَّضَاعَةِ} وَيَحْرُمُ مِنْ اَلرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنْ اَلنَّسَبِ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

{تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ١٧٥٣ = ٥١٠٠، ٢٦٤٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ٨٧٦ = شيحا ٣٥٦٦ = مسلم: ١٤٤٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عەلی عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا: (ئەوە بۆچی کچەکەی حەمزەی مامەت، کەئامۆزای خۆتە، مارەناکەی بۆ خۆت، بەڕاستی کچێکی شۆخ و شەنگە؟) فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (پێم ناشێ، چونکە برازای شیریمەو کچی حەمزەیە، حەمزەیش هەم مامی هەقمە، برای دایکیو باوکی باوکمەو هەم برای شیریمە، چونکە ثوویبە هەم شیری دابوو بەئیمامی حەمزەو هەم شیری دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەواتە ئەو کچە برازای شیریمە، وەهەرچی بەهۆی سکوزاو کەسایەتی‌یەوە قەدەغە ببێ بەهۆی شیرخواردنیشەوە قەدەغە دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٢}.

**(ڕوونکردنەوە):**

١- ثوویبە (ڕەزای خودای لێ بێ) دایکی شیری پێغەمبەرە، یەکەم کەس بووە کە مەمك بدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشیری کوڕێکی کەناوی مەسرووح بوو، بەرلەوەی کە پێغەمبەر، حەلیمەی سەعدی‌یەی دایەنی بیبات بۆلای خۆی، چەند ڕۆژێ ثووەیبە مەمکی دەدا پێی، ثووەیبە کارەکەری ئازادکراوی ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەر بوو، ئیبنو مەندە دەفەرموێ: ثووەیبە ئیسلام بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر بۆی باش بوو، هەتا لەمەککە بوو سیلەی ڕەحمی ئەوی بەجێ

دەهێنا، خەدیجەیش زۆر ڕێزی لێ دەگرت، چونکە ثوەیبە خەسووی شیری خەدیجە بوو، لەساڵی حەوتی کۆچیدا، لەپاش ئازاد کردنی خەیبەر، کۆچی دوایی کردووە، ئەم چوار ژنە مەمکیان بە پێغەمبەر داوە: ئامینەی دایکیو ثووەیبەو حەلیمەی سەعدییەو ئوم ئەیمەن.

ثووەیبە دایکی شیری ئیمامی حەمزەو پێغەمبەرو ئەبو سەلەمەیە. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٤}.

٢- بۆ ژیاننامەی ئوم ئەیمەن، بڕوانە: (مختصر صحیح مسلم/٣، لاپەڕە: ٢٠٥، ژمارە: ١١٨١، زنجیرە: ٩٤٠).

١١٦٣- وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): {لَا يُحَرِّمُ مِنْ اَلرَّضَاعَةِ إِلَّا مَا فَتَقَ اَلْأَمْعَاءَ، وَكَانَ قَبْلَ اَلْفِطَامِ} رَوَاهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ هُوَ وَالْحَاكِمُ.

{صحيح الجامع: ٧٦٣٣}:

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەمکخواردن کاتێ دەبێ بەهۆی حەرام بوون، کە لە مەمکەوە بڕواتە ناو ڕیخۆڵەوەو ڕیخۆڵەکان کش بهێنێو گەشە بەلەش بکا، ئەمەیش کاتێ ڕوودەدا کەهێشتا منداڵ لەشیر نەبڕابێتەوە). (فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٢٩٢، لاپەڕە: ٧٩٨).

١١٦٤- وَعَنِ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: {لَا رَضَاعَ إِلَّا فِي اَلْحَوْلَيْنِ} رَوَاهُ اَلدَّارَقُطْنِيُّ وَابْنُ عَدِيٍّ مَرْفُوعًا وَمَوْقُوفًا، وَرَجَّحَا اَلْمَوْقُوفَ.

{الدارقطني/٤/١٧٣و ١٧٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی لەباوکی بێ) دەفەرموێ: (شیرخواردن کاتێ کاریگەری دەبێو دەبێ بەهۆی حەرام بوون، کەتەمەنی منداڵ لەدوو ساڵی تێ نەپەڕێ). (فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٧٩٨، زنجیرە: ٢٩٢).

١١٦٥- وَعَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {لَا رَضَاعَ إِلَّا مَا أَنْشَزَ اَلْعَظْمَ، وَأَنْبَتَ اَللَّحْمَ} رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.
{ضعيف أبي داود للألباني/٤٤٤}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (شیرخواردن کاتێ کاریگەری دەبێ کەئێسك بتەوبکاو دایبمەزرێنێو گۆشت بڕوێنێ!).

١١٦٦- وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ اَلْحَارِثِ" {أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ يَحْيَى بِنْتَ أَبِي إِهَابٍ، فَجَاءَتْ اِمْرَأَةٌ. فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُكُمَا، فَسَأَلَ اَلنَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: "كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ؟ " فَفَارَقَهَا عُقْبَةُ. وَنَكَحَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ} أَخْرَجَهُ اَلْبُخَارِيُّ.
{تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٧٦ = ٨٨، ٢٠٥٢، ٢٦٤٠، ٢٦٥٩، ٢٦٦٠، ٥١٠٤ صحيح بوخاری}:

عوقبەی کوڕی حاریث (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێکم مارەکرد، ناوی ئوم یەحیای کچی ئەبوئیهابی کوڕی عەزیز بوو، ژنێکی ڕەشمان لێ پەیدا بوو، دەیگوت: مەمکم داوە بەهەردووکتان. منیش پێم گوت: من ئاگام لەشتی وا نییە، کە تۆ مەمکت دابێ بەمن، هەتا ئێستایش قسەی وات بۆمن نەکردووە، ئەوجا سواربووم و چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینەو بۆ ئەمە لێیم پرسی، فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) (چۆن دەبێ، تازە گوتراوە کەشیرتان بەیەکەوە خواردووە، ئەو ژنە بەقسەی خۆی دەڵێ گوایە مەمکی داوە بەهەردووکتان، واز لەو ئیشە بهێنە). عوقبەیش لێی جیادەبێتەوەو ژنەکە شوو دەکا بەمێردێکی تر. (تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٧٩ ج/٤ = چاپی چوارەم).

(ڕوونکردنەوە):

عوقبەی کوڕی حاریث (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەرە کە لەزاراوی سوننەتدا ناسراون بە (صەحابەی پێغەمبەر) (ڕەحمەتو صەڵاواتو

دروودو سلاوی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هەموو هاوەڵو پەیڕەوانی بێت). ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە موسوڵمان بووە، سێ فەرموودەی لەبوخاری نازداردا هەیە، لە موسلیمدا فەرموودەی نییە، بەم جۆرە کەسە دەگوترێ ئەفرادی بوخاری.

ئەم عوقبەیە خوبەیبی کوڕی عەدی کوشتەوە. {بڕوانە: تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی چوارەم لاپەڕە: ٨٣٤ هەتا ٨٤٠ن ج/٤ = چاپی چوارەم بۆ داستانی شەهید بوونی خوبەیب، هەروا بڕوانە (ریاض الصالحین بەکوردی بەرگی/٣، لاپەڕە: ٣٦٢، ژمارە: ١٥٠٩)}.

١١٦٧- {وَعَنْ زِيَادٍ اَلسَّهْمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {نَهَى رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَنْ تُسْتَرْضَعَ اَلْحَمْقَى} أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَهُوَ مُرْسَلٌ، وَلَيْسَتْ لِزِيَادٍ صُحْبَةٌ}:

زیادی سەهمی دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەوە کەمنداڵ بدرێ بەدایەنی گەوج.

(ڕوونکردنەوە):

١- چونکە منداڵەکەیش ڕەوشتی ئەو دەگرێو شیرەکەیش لەم لایەنەوە کاریگەیی هەیە.

٢- زیادی سەهمی صەحابی نییە، کەواتە ئەم فەرموودەیە مورسەلی تابیعییە.

٣- پوختەی بڕیارەکانی شیرخواردن.

٤- بۆ پوختەی بڕیارەکانی شیرخواردن بڕوانە فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٧٩٦ چاپی تەهران زنجیرە: ٢٩٣ هەروا تەجریدی بوخاری بەرگی پێنجەم، فەرموودەی ژمارە: ١٧٥٧ = ٥١٠٨ فەتحولباری.

٥- شیرخواردن‌و مەمکخواردن بابەتێکی زۆر وردو گرنگ‌و فرە قووڵ‌و فراوانە، زۆر لەکێشەکانی کۆمەڵگای پێ چارەسەر دەکرێ، پێویستە گرنگی پێ بدرێ.

٦- باشترین چارەسەر، بۆ منالی ناخۆیی (نامەحرەم) وەك منالی تەبەنّنی کە کەسێ منالێی نامەحرەم بکا بەمنالی خۆی وەك منالی زۆڵی شەرعی، باشترین چارەسەر بۆ کێشەی ناخۆیی ئەم جۆرە منالانە ئەوەیە کە لە ڕێگەی شیرپێدانەوە بکرێ بەمەحرەم‌و بەخۆیی، لەناو ئەو خێزانەدا کە هەڵی دەگرنەوەو دەیکەن بەمندالی خۆیان!.

٧- بە ئەزموون دەرکەوتووە، ئەو ژن‌و پیاوەی کەگوتراوە شیرخواردن لەنێوانیاندا هەیە، وە لەبەر ئەوەی کەشیرەکە بەپێی شەرع نەچەسپاوە، ئەگەر شوویان کردبێ بەیەکتری، یا وەجاخ کوێر بوون، یاتووشی دەردو بەلای گەورە گەورە بوون.

٨- سیلەی ڕەحم بەجێهێنان لەنێوان کەسوکاری شیریدا، کارێکی زۆر پەسەندە بەسەرکردنەوەو سەرلێدان‌و دیاری گۆڕینەوەو باشبوون بۆیان سوننەتێکی گەورەیە.

٩- بۆ ئەوەی کە گومانی بەد دروست نەبێ، بەهۆی دێنی‌و سەردان‌و هاموشۆی ئاساییەوە، وەها باشە کەشیرخواردن لەنێوانی دووکەسدا ئاشکرا بکرێ‌و باسی بکرێ (بڕوانە: بڕگەی:١٦).

١٠- شیردانی حەرامکەر ئەم سێ مەرجەی هەیە:

یەکەم: شیردەر، کەپێشی دەگوترێ دایەن، مەرجەکەی ئەوەیە کەژن بێ‌و زیندوو بێ‌و تەمەنی لەنۆساڵی هەیڤی کەمتر نەبێ، ئەگەر پیاوێ بێتە شیرو شیربدا بەمنالێ، بەوە نابێ بەباوکی شیری ئەو منالە، یان بەدایکی، یان ئەگەر دوو منال بەشیری یەك ئاژەڵ بژین بەوە نابن بە خوشك‌و برا، وەئاژەڵەکە نابی بەدایکیان.

دووەم: مەرجی شیرەکەیش ئەوەیە شیری ژنی زیندوو بێ، وەمنداڵەکە پێنج جار شیری ئەو ژنەی خوارد بێ.

سێیەم: مەرجی شیرەخۆریش ئەوەیە کەزیندوو بێو تەمەنی لەئاخر جارا، لەدوو ساڵ تێ نەپەڕی بێو لەڕێگەی مژینەوە بەدەم، یا لەڕێگەی دۆشینەوە کە بەمەمیەو شتی وا بیخوات، یا لەڕێگەی لووتەوە، وەك بەتکاندن یا بەسۆندە لەڕێگەی لووتەوە شیرەکەی بدەنێو بگاتە ناو بۆشایی گەدەی.

١١- ئەگەر لەڕێگەی کۆمەوە بەشاف منالەکە هەڵی بگرێ، یان بە سۆندەو شتی وا لەکۆمەوە یان لە چووکەوە شیرەکە بکرێتە ناو لەشی، ئەوە کاریگەری نییە، لەلای تێکڕای زانایان.

١٢- نابێ مێرد مەمکی ژنی خۆی بمژێ، شتی وا بێ کێشە نییە گەرچی لەلای جەماوەری زانایان بەشتی وا مارەبڕینەکە هەڵناوەشێتەوە.

١٣- مێردی منال، تەمەنی لەدوو ساڵ کەمتر بێ، شیری ژنی خۆی، یا شیری دایکی ژنی خۆی، یان شیری نەنکی ژنی خۆی بخوات ژنەکەی لێ حەرام دەبێ، چونکە لەیەکەما دەبێ بەکوڕی شیری، لەدووەما دەبێ بەبرای شیری، لەسێیەما دەبێ بەخاڵی ژنەکەی.

١٤- ئەگەر گومان لەم شتانەدا هەبوو شیر کاریگەری نابێ:

یەکەم: تەمەنی منالەکە، کەدڵنیا نەبوون لەوە کە لەکاتی هەر پێنج جارەکەدا، تەمەنی لەدوو ساڵی قەمەری تێ نەپەڕیوە.

دووەم: دڵنیا نەبوون کەپێنج جار بووە، یا زیاتر بووە.

سێیەم: کە هەر پێنج جارەکە، بەپێی عورف، تێرکەر بووە.

١٥- شیری کچ کەشووی نەکردبێ، یاشیری بێوەژن کەمێردی نەبێ، قەدەغەبوونو حورمەت پەخشەوە دەکاو کاریگەری هەیە.

١٦- له (تحفه المحتاج فى شرح المنهاج)دا، بەدەق دەفەرموێ: {اَلْوٰاجِبُ عَلَى النِسّاءِ أَنْ لايُرْضِعْنَ كُلَّ صَبِيٍ مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ، وَإِذا أَرْضَعْنَ فَلْيَحْفَظْنَ ذالِكَ وَيُشْهِرْنَهُ وَيَكْتُبْنَهُ إِحْتِياطاً} . واتە: پێویستە لەسەر ژنان کە مەمك نەدەن بەهیچ منالێ، مەگەر لەبەر پێویستیو ناچاری، کاتێکیش شتی وایان کرد، هەواڵەکە پەخشەوە بکەنو بۆ دووربینی بیشی نووسن.

١٧- کاتێ کەشیردان هاتە جێ:

یەکەم: منداڵەکە دەبێ بەمنداڵی شیری ئەو ژنو پیاوە کەشیرەکەیانی خواردووەو لەناو خۆیانا دەبن بەمەحرەمی یەکتری.

دووەم: ئەو مەحرەمیو حەرامییەی کەبەهۆی شیرخواردنەوە پەیدا دەبێ، لەژنو پیاوەکەوە دەڕواو دەتەنێتەوە بۆ باوكو دایكو باپیرو نەنکیان (کە بەمانە دەگوترێ: ئوصول، واتە: بنەچەو رەسەن) ئەمانە دەبن بەمەحرەم بۆ شیرخۆرەکە.

سێیەم: هەروا لەژنو مێردەکەیەوە، مەحرەمیو قەدەغە بوون دەتەنێتەوە بۆ منالو منالەزاشیان (کە بەمانە دەگوترێ: وەچەو نەوە) منالەکە دەبێ بەخۆیو بەمەحرەم بۆ ئەمانیش.

چوارەم: هەروا لەژنو مێردەکەوە دەتەنێتەوە بۆ براو خوشکیشیان (کە بەمانە دەگوترێ دەوروپشت، واتە: حەواشی).

پێنجەم: وە لەشیرخۆرەکەوە، مەحرەمی حەرامبوون هەر تەنیا دەڕوا بۆلای منالو منالەزای ئەو شیرخۆرەیە، ناڕواو ناتەنێتەوە بۆ بنەچەیو بۆ وەچەی بنەچەیو بۆ دەوروپشی.

شەشەم: ئەمەیش لیستی زۆرینەی ئەو کەسانەیە کە بەهۆی مەمکخواردنەوە، مەحرەمیو خۆیی بوون لەنێوانیانا دادەمەزرێ:

١٨- ژنە شیردەرەکە دەبێ بەدایکی منالە شیرخۆرەکە.

١٩- مێردەکەی دەبێ بەباوکی، چونکە ئەو ژنەکەی متوربە کردووە.

٢٠- منالّی ژنەکە، چی لەمێردی حازری بێ، چی لەمێردێکی تری بێ، ئەگەر کوڕ بێ دەبێ بەبرای شیریی منالّە شیرخۆرەکە، ئەگەر کچ بێ دەبێ بە خوشکی شیری ئەو.

٢١- منالّی باوکەشیرییەکەیش هەروەها، چی لەژنە شیردەرەکەی بێ، یان لەژنێکی تری بێ، کچ بێ دەبێ بەخوشکی شیرەخۆرەکە، کوڕ بێ دەبێ بەبرای، منالّی ئەوانیش یان دەبن بەبرازای یان خوشکەزای.

٢٢- ئاغای ژنەشیردەرەکە، دەبێ بەباوکی شیرەخۆرەکە، ئەگەر ژنەکە ئوممول وەلەدی بوو، مێردی نەبوو.

٢٣- دایکی ژنە شیردەرەکە دەبێ بە نەنکی شیریی شیرخۆرەکە، با بەرەو ژووریش بڕوات.

٢٤- خوشکی شیردەرەکە دەبی بەپووری شیرەخۆرەکە.

٢٥- کچی کچی شیردەرەکە دەبێ بەخوشکەزای، با بەرەو خواریش بڕوات.

٢٦- کچی کچی خاوەن شیرەکە خوشکەزای شیرییەتی، با بەرەو خواریش بڕوات.

٢٧- دایکی خاوەن شیرەکە دەبی بەنەنکی شیری منالّەکە، با بەرەو ژووریش بڕوات.

٢٨- خوشکی خاوەن شیرەکە پووری شیری منالّەکەیە.

٢٩- برای خاوەن شیرەکە مامی شیرییەتی.

٣٠- کوڕی خاوەن شیرەکە برای شیری منالّەکەیە.

٣١- باوکی خاوەن شیرەکە باپیرەی شیرییەتی.

٣٢- برای شیردەرەکە خالّی شیرەخۆرەکەیە.

٣٣- مەبەست لەخاوەن شیر یا مێردی ژنەشیردەرەکەیە، یان ئاغایەتیو خۆی چووتەلایو سکی پڕکردووەو ژنەکە بووە بەئوم وەلەدی خاوەنەکەی.

٣٤- شیرو بڕیارەکانی شیر لەنێوانی موسوڵمانو ناموسوڵمانیشدا دادەمەزرێ، گریمان شیردەر مەسیحی بوو، مناڵە شیرخۆرەکە موسوڵمان بوو، دەبن بەدایكو کوڕی شیریی یەکتری، وەهەروەها کەسەکانی تریش.

٣٥- شیرەکە بکرێ بەپەنیر، یان بەخامە، یان بەگێمەڕ، یان بەکەرێ، یان بەماست، لەلای شافیعیییەکان هەمان کاریگەری دەبینێ، بەمەرجێ لەدەمەوە بدرێن بەمناڵەکە، وە مەرجەکانی تریشیان تیادا بێتەجێ، وەك دووساڵو پێنج جارو.......تاد.

٣٦- باوكو دایكو براو خوشكو کەسی تری خۆیی مناڵە شیرەخۆرەکە، نابن بەهیچی ژنەشیردەرەکەو نابن بەهیچی خاوەن شیرەکەو نابن بەهیچی مناڵو کەسوکاری تریان، ئەگەر لەلایەکی ترەوە مەحرەمیان نەبنو نەبووبن بەخۆییو بەمەحرەمیان.

٣٧- ئێستا بەنکی شیر پەیدا بووە، ژنی شیردار شیری خۆی دادەنێ لەو بەنکانە، سایا بەفرۆشتن، یان بە بەخشین، لەسەر فەرمایشتەکەی توحفە.

یەکەم: دروست نییە بۆ ژنی موسوڵمان، کەشیری خۆی لەو جۆرە بەنکانەدا دابنێ، مەگەر بەم مەرجانە:

١- مێردەکەی ڕازی بێ، چونکە شتی وا ئەگەر بەپێی شەرع نەبێ بێ شەرعییە، وەخودایش دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا – التحريم – ٦٦ – الآية/٦}؛

٢- ناوی ژنە شیردەرەکە لەسەر دەفری شیرەکە بنووسرێ، وە هەروەها ناوی ئەو مناڵەی کەشیرەکەی پێ دەدرێ.

٣- کاتێ چەسپا کەشیرخواردنی شەرعی لەنێوانی مناڵەکەو ئەو ژنەدا کەشیرەکەی لەبەنك داناوە چەسپا، ژنەکەو خاوەنی مناڵەکە لەوە ئاگادار

بکرێ. وەلەتۆماری رەسمیو فەرمی ئەو بەنکەدا، ئەم بڕیارە تۆمار بکرێ، بۆ کاتی پرسینەوە لەم بابەتە.

٣٨- پوختەیێ لە نادروستبوونی کۆکردنەوەی دوو ژنی لەناو خۆیانا خۆیی، لەژنێتی یەك پیاودا.

١- حەرامە کۆکردنەوەی دایكو كچ، چی نەژادیو نەسەبی بن، چی شیری بن.

٢- حەرامەو نادروستە کۆکردنەوەی نەنكو نەوەی خۆی، چی نەسەبی، چی شیری.

٣- حەرامەو نادروستە کۆکردنەوەی دووکچ یان دوو ژن، لەژێر ڕکێفی یەك مێرددا، ئەگەر گریمان یەکێکیان پیاو بێو یەکێکیان ژن بێ، مارەیان لەیەکتری نەیێ، وەك دوو خوشك پێکەوە لە یەك کاتا ژنی پیاوێ بن، یان ژن لەگەڵ برازای خۆیدا، یان لەگەڵ خوشکەزای خۆیدا، لەیەك کاتا ژنی یەك کەس بن، یان کچی شیری لەگەڵ دایکی شیری خۆی، یان لەگەڵ خوشکی شیری خۆی، یان لەگەڵ نەنکی شیری خۆی، یان لەگەڵ برازای شیری خۆی، یان لەگەڵ خوشکەزای شیری خۆی، لەیەك کاتا، هەردووکیان ژنی یەك مێرد بن ئەمانە هەموو نادروستن.

٣٩- مناڵی شیرەخۆرەکەیش، دەبن بەمناڵەزای شیردەرو مێردەکەی، با بەرەو خواریش بڕوات، هەروا مناڵی شیرەخۆرەکە دەبن بە برازا، یان خوشکەزای براو خوشکی شیری مناڵەشیرەخۆرەکە.

٤٠- هەروا ژنی شیرەخۆرەکە دەبێ بەبووکی شیری باوكو دایكو باپیرو نەنکە شیرییەکانی!!

## پێڕستی سەرەباسەکان